# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

## بەرگی نۆیەم

### تەفسیری سوورەتی یونس

عەلی باپیر

# تەفسیری قورئانی

# بەرز و بەپێز

عەلی باپیر

بەرگی نۆیەم

تەفسیری سوورەتی (یونس)

# پێناسەی کتێب

ناوی کتێـــب : تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز.

نووســـەر : عەلـی باپـیـر.

نەخشەسازیی ناوەوە : عزالدین محمد عمر.

نۆرەو ساڵی چاپ : یەکەم ١٤٣٨ ک- ٢٠١٧ز.

تــیـراژ : ١٠٠٠ دانە.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتی

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ شُرُورِ أنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأشْهَدُ أن لاَ إلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران، ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء، ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب.

أمَّا بَعْدُ: فإنَّ أصْدَقَ الحَديث كَلاَمُ الله وَخَيْرَ الهَدي هَديُ مُحَمَّد ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار[1].

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!

هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - کە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین کتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لە

١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەکرد، پێش هەر قسەیەکی گرنگ، بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خِطْبة)و... هتد، وە ئەم وتارە، هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، والنسائي: (١١٠٤)، وابن ماجه: (١٨٩٢) وأحمد: (٣٧٢٠)، وطبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

خزمەتدابووندا بێ: خوێندنەوە، تێفکرین و رامان، فێرکردن، کارپێکردن ... هتد، بە باشترین جێگرتن جێگا دەگرێ و ، خاوەنەکەی لە دنیاو دواڕۆژدا لێی بەهرەمەندە.

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خوا (التحدّث بنعمة الله) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردووم و، بەر لە تەمەنی بیست ساڵییەوە هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەرێزو پێز لەبەر بکەم و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان و تێوەرامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان و چۆنیەتی جێبەجێکردن و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەرەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم و خۆمی بۆ یەکلایی (متفرِّغ) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە سابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم ، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون و ، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەرامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان : هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (القرآن يُفَسِّر بَعضُهُ بَعضاً)، پاشان سوونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (مُبَيِّن)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾

النحل، واتە: وە زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار ، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوەو ، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزنو تەفسیرەکانیو کتێبەکانی سوننەتدا خەریکمو ، دەیان کتێبو بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیستو دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا (تبارك و تعالى)، وە بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەکانییەوە ، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی : (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تعالى)دا زۆر چاك دەرەوشاوەتەوە[1]، بەلام هەڵبەتە ناڵێمو هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنووردارбوونی تواناو بڕستم ، لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕوویەکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشم ویستوە کە زۆر بەمەلاولادا بچمو بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو شارەزا نیم، یان خوێنەر پێویستی پێی نیە، لە کاتێکدا دەیەوێ لە قورئان تێبگات، بزانێ خوا (تبارك وتعالى) ڕاستەوخۆ چی پێ فەرمووە ؟!

ئنجا هەر لێرەشەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو برا گەنجە ڕووح سووكو گورجو گۆڵو دڵسۆزە بکەم (حەزی نەکرد ناوی بهێنم)، کە هەڵسا بە نووسینەوەو هێنانە سەر کاغەزو، پاشان تایپکردنو دوایی پێداچوونەوەو هەڵەگیریی، سەرجەم ئەم زنجیرە دەرسە، کە لە ئەسڵدا لە شێوەی وتار (محاضرة)دا پێشکەش کراون، هەروەها هەڵسا بە (تخريج)ی سەرجەم دەقەکانی سوننەت، لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانەوەو، زەحمەتو ماندووبوونێکی زۆری بە سەرجەم بەرگەکانی ئەم تەفسیرە

---

١) ئەو مەوسووعەیە کە ئێستا چاپ کراوەو ، کەوتۆتە بەردەستی خوێنەرانو، سەرجەم هەشت بەرگو دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەمو، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوننەت، کە لە هۆش (ذاكرة)دا بووون.
شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا ، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبی سەربەخۆ ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

کێشاوە، خوا بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوەو، هەر ساڵحو ساغو سەلامەتو سەربەرزبێ[1]، لە خوای بەرزو بێهاوتاش داواکارم ئەو جۆرە گەنجو لاوانە لە کوڕانو کچان ، لەنێو گەلەکەماندا ، زۆر بکات .

شایانی باسیشە کە ئێمە لەم تەفسیرەماندا باسی بەش (جزء)ەکانی قورئانو دابەشکردنەکانی دیکەی وەك: - (حزب) - ناکەین، چونکە هەر سوورەتێك بۆخۆی شتێکی سەربەخۆیەو ، سەرجەم ئایەتەکانی وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستنو، ئاشکراشە کە دابەشکرانی سەرجەم قورئان بۆ سی (٣٠) بەش (جزء) و شەست (٦٠) (حزب)، شتێکە لەلایەن زانایانەوە کراوە، بۆ ئاسانکاریی خوێندنی قورئان، دیارە ئێمە لە دابەشکردنی بەرگەکانی ئەم تەفسیرەشدا، دیسان حیساب بۆ بەشەکان (أجزاء)ی ناکەینو ، بە گوێرەی سوورەتەکان ، بەرگەکانی دیاریی دەکەین.

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرسو وتار پێشکەش کراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو، بەپێی پێویست دەستکارییم کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە ، ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشەکییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرەتای سەرجەم دەرسەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ، وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧ هەولێر

---

١) ئەو برا دڵسۆزە ئێستاش پاش سوورەتی (هود)، سەرگەرمی سوورەتی (یوسف)ەو عەزمیشی جەزم کردوە ، کە ئەگەر تەمەنمان بەردەوام بێ ، هەتا کۆتایی ئەم تەفسیرە سەرگەرمی کارەکەی بێ .

# پێشەکی ئەم بەرگە

بسْم الله الرَّحمن الرَّحيم

الحَمد لله رَبّ العَالَمِين ، وَالصَلاةُ والسلام والبَرَكاتُ عَلى مُحَمَدٍ المَبعُوث نَبيّاً ورَسولاً الى الإنسِ والجنّ ، وآلِهِ أَجْمَعِين، مِنَ الصَّحْبِ والأَزْوَاجِ وَالقَرَابَةِ وَالتابعِينَ لَهُمْ بإِحسَان وَ يَقين.

بەڕێزان ! ئەم تەفسیرو ڕوونکردنەوەی چەمكو واتای ئایەتە بەهێزو پێزەکانی سووڕەتی (یونس)ەو، بەرگی نۆیەمی کۆی ئەم تەفسیرە پێك دێنێ.

شایانی باسیشە لەم بەرگی نۆیەمەدا، وێڕای ڕوونکردنەوەی ماناو مەبەستی سەدو نۆ (١٠٩) ئایەتەکەی سووڕەتی (یونس)، چەند باسێکی تایبەتیش هەن، کە پەیوەستن بە نێوەرۆکی ئایەتەکانەوەو، هیوادارم جێی بەهرە وەرگرتنی خوێنەرانی سەنگین بن، کە بریتین لەمانە :

١/ کورتە باسێك لەبارەی (وحي)یەوە.

٢/ کورتە باسێك دەربارەی بوونەوەرو حیکمەتی خوا لە دروست کردنیدا.

٣/ کورتە باسێك لەبارەی شەفاعەتەوە.

٤/ کورتە باسێك لەبارەی خۆرو زەویو مانگەوە.

٥/ کورتە باسێك لەبارەی دۆستانی خوا (أولياء الله)وە.

٦/ بەسەرهاتی یونوس (عليه السلام)و گەلەکەی.

٧/ کورتە باسێك لەبارەی ئازادی بڕواهێناوە .

والسلام علينا وعلى عباد الله الصالحين

٢٤ ی رجب ١٤٣٨ ك

٢١ ی نیسانی ٢٠١٧ ز

# دەستپێک

بەڕێزان !

ئـەمرۆ کـە (١٢)ی ڕەمەزانی سـاڵی (١٤٣٧) کۆچییە، بەرانبـەر (١٧)ی حـوزەیرانی (٢٠١٦)ی زایینی، خوا پشتیوان بێ، دەست دەکەین بە تەفسیرکردنی سووڕەتی (یونس) واتە: ڕوونکردنەوەی چەمكو واتای ئایەتە بە پێزەکانی.

# پێناسەی سوورەتی (یونس) و بابەتەکانی لە هەشت بڕگەدا

سەرەتا پێناسەیەکی سووڕەتی (یونس) دەکەین، صەڵاتو سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەر (یونس) کە یەکێکە لە پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوا، لە هەشت (٨) بڕگەدا:

**یەکەم:** دیارە سووڕەتی (یونس) سووڕەتێکی مەککەییەو، لە ڕیزبەندیی موصحەفدا ژمارە (١٠)یەو، لە ڕیزبەندیی هاتنە خواردا زۆرێك لە زانایان ژمارە (٥٨)یان بۆ داناوە، واتە: لە پێش سووڕەتی (یونس)دا (٥٧) سووڕەت دابەزیون، ئەم پەنجاو هەشتەمینیانە، هەندێکیش ژمارە (٥٠)یان بۆ داناوە.

**دووەم:** وا پێدەچێ سووڕەتی (یونس) لە ساڵی یازدەی پێغەمبەرایەتییدا هاتبێتە خوار، یانی: یازدە (١١) ساڵ دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەحی بۆ کراوەو کراوەتە پێغەمبەری خوا ﷺ ساڵی یازدەیەمیش دوای ئەوە بووە، کە هەر کام لە خەدیجەی هاوسەری بەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبەر خوا لێی ڕازی بێ‌و، ئەبو طالیبی مامی کە پشتوانێکی باشی بوو، هەردووکیان لە ساڵی دەیەمدا کۆچی دواییان کردوەو، ساڵی یازدەیەم ساڵێکی زۆر سەختو نارەحەت بووە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ.

**سێیەم**: ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی (یونس)، سەدو نۆ (١٠٩)یە، هەندێکیش گوتوویانە: (١٠٨)ە، بەڵام زۆربەیان لەسەر ئەوەن کە ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی (یونس) سەدو نۆ (١٠٩)یە.

**چوارەم**: تەوەرە سەرەکییەکان سوورەتی (یونس)، وەك زۆربەی سوورەتە مەککەییەکان بریتین لەو چوار مەبەستە:

١- باسی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریێتی و خاوەنداریێتیی و پەرستراوێتیی خوا ﷻ و، خستنە ڕووی ژمارەیەکی زۆر لە ناوو سیفەتەکانی خوا سبحانەو تعالى.

٢- باسی ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشت و بەهەشت و دۆزەخ.

٣- باسی پێغەمبەرایەتیی و وەحی و، بەرپەرچدانەوەی تۆمەت و گومانی بێبڕوایان، لەوبارەوە.

٤- بەسەرهاتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لەگەڵ گەلەکانیاندا، کە لەم سوورەتەدا ئاماژەیەکی کورت بە بەسەرهاتی هەرکام لە (نوح)و (یونس) کراوە، تا ڕاددەیەك بە درێژییش باسی بەسەرهاتی مووسا (عَلَيْهِ السَّلاَم)و، هاروونی برای (عَلَيْهِ السَّلاَم) لەگەڵ فیرعەون و فیرعەونییەکاندا، کراوە.

**پێنجەم**: دیارە ئێمە بۆ ئاسانکردنی ڕوونکردنەوەی ماناو مەبەستی ئایەتەکان، دابەشمان کردوون بۆ دوازدە (١٢) دەرس :

دەرسی یەکەم : ئایەتەکانی (١- ١٠)یە.

دەرسی دووەم : ئایەتەکانی (١١- ٢٠)ە.

دەرسی سێیەم : ئایەتەکانی (٢١ - ٣٠)یە.

دەرسی چوارەم : ئایەتەکانی (٣١ - ٤٠)یە.

دەرسی پێنجەم : ئایەتەکانی (٤١ - ٤٧)ە.

دەرسی شەشەم : ئایەتەکانی (٤٨ - ٥٦)ە.

دەرسی حەوتەم: ئایەتەکانی (٥٧ - ٦١)ە.

دەرسی هەشتەم: ئایەتەکانی (٦٢ — ٧٠)یە.

دەرسی نۆیەم: ئایەتەکانی (٧١ - ٧٤)ە.

دەرسی دەیەم: ئایەتەکانی (٧٥ — ٩٣)یە.

دەرسی یازدەیەم: ئایەتەکانی (٩٤ - ١٠٣)یە.

دەرسی دوازدەیەمو کۆتایی: ئایەتەکانی (١٠٤ - ١٠٩)یە.

شەشەم: ئەم سووڕەتەو، سووڕەتی دوایی وی، کە سووڕەتی (هود)ە، (عَلَيْهِ السَّلاَم)، بەڕای من وەك هەردووك سووڕەتی (ئەنعام)و (ئەعراف) وان، لە چ ڕوویێکەوە؟ لەو ڕووەوە کە هەرکام لە سووڕەتی (الأنعام)و (یونس) باسی بابەتەکانی بووناسییو، ئیمانو عەقیدەو، عیبادەتو، پایەکانی ئیمانو عەقیدە دەکەن، بە شێوەی تیۆریی، بەڵام سووڕەتی (الأعراف)و (هود) باسی بەرجەستە کردنی ئەو بابەتانە دەکەن، لە میانەی بەسەرهاتی پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) واتە: (الأنعام)و (یونس) باسی خوا بەیەکگرتنو، باسی ڕۆژی دواییو باسی پێغەمبەرایەتییو وەحی دەکەن، بە شێوەی تیۆریی، بەڵام هەرکام لە (الأعراف) و (هود) ئەوەی کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) پێی ڕەوانە کراون، بە بەرجەستە کراویی لە ژیانو بەسەرهاتو هەڵوێستەکانی پێغەمبەراندا، لەگەڵ گەلەکەکانیاندا، دەیخەنە ڕوو.

حەوتەم: بیستو نۆ (٢٩) سووڕەت لە قورئاندا هەن، کە هەموویان بە پیتە پچڕ پچڕەکان (الحُرُوفُ المُقَطَّعَة) دەست پێدەکەن، واتە: ئەو پیتانەی کە دەبێ لە یەك بپچڕێنرێن لە کاتێکدا دەخوێنرێنەوە، (ألم)، نابێ بڵێین: (أَلَمْ)، بەڵکو: (ئەلیف، لام، میم)، وە (آلـر) دەخوێندرێتەوە: (ئەلیف، لام ڕا)، ئەو بیستو نۆ (٢٩) سووڕەتەش ئەمانەن، کە سەرجەم لە ڕووی ژمارەی پیتەکانی دەستپێکیانەوە، پێنج جۆرن:

جۆری یەکەمیان: بە یەك پیت (حرف) دەست پێ دەکەن، سێ سووڕەتن:

١) سووڕەتی (ص).

٢) سووڕەتی (ق).

٣) سووڕەتی (ن) یان (القلم).

جۆری دووەمیـان: بە دوو (٢) پیت دەست پێ دەکەن، ئەو (١٠) سووڕەتن:

١/ سووڕەتی (طه).

٢/ سوڕەتی (النمل)، (طس).

٣/ سووڕەتی (یس)، (یس).

٤/ سووڕەتی (غافر)، (حم).

٥/ سووڕەتی (فصلت)، (حم).

٦/ سووڕەتی (الشوری)، (حم ، عسق).

٧/ سووڕەتی (الزخرف)، (حم).

٨/ سووڕەتی (الدخان)، (حم).

٩/ سووڕەتی (الجاثیة)، (حم).

١٠/ سووڕەتی (الأحقاف)، (حم).

جۆری سـێیەمیـان: بە سێ پیت دەست پێ دەکەن، سێزدە (١٣) سووڕەتن:

١- سووڕەتی (البقرة)، (ألم).

٢- سووڕەتی (آل عمران)، (ألم).

٣- سووڕەتی (العنكبوت)، (ألم).

٤- سووڕەتی (الروم)، (ألم).

٥- سووڕەتی (لقمان)، (ألم).

٦- سووڕەتی (السجدة)، (ألم).

٧- سووڕەتی (یونس)، (ألم).

٨- سوورەتی (هود)، (ألم).

٩- سوورەتی (یوسف)، (ألم).

١٠- سوورەتی (إبراهیم)، (ألم).

١١- سوورەتی (الحجر)، (ألم).

١٢- سوورەتی (الشعراء)، (ألم).

١٣- سوورەتی (القصص)، (ألم).

جۆری چوارەم: بە چوار پیت دەست پێ دەکەن، دوو سوورەتن:

١) سوورەتی (الأعراف)، (ألمص).

٢) سوورەتی (الرعد)، (ألمر).

جۆری پێنجەم: بە پێنج پیت دەست پێدەکات، یەك سوورەتە:

سوورەتی (مریم) (کهیعص).

دیارە سوورەتی (الشوری)ش کە بە (حم) دەست پێ دەکات، دواتر سێ پیتی (عسق)یش بەدوایان دادێت: (حم عسق)، بەڵام ئێمە هەر لە ریزی دوو پیتیەکاندا هێنامان، چونکە ئەو پێنج پیتە کراونە دوو ئایەت.

کەواتە:

٣ + ١٠ + ١٣ + ٢ + ١ = ٢٩ سوورەت.

ئەوە کۆی ئەو بیستو نۆ (٢٩) سوورەتەیە کە بە پیتە پچڕ پچڕەکان دەست پێ دەکەن، هەڵبەتە پێشتر لەبارەی ماناو مەبەستی ئەو جۆرە پیتانەوە قسەو باسمان کردوە، لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (البقرة)دا، بەڵام ئێستاش ئاماژە بە قسەو بیروڕای زانایان دەکەین:

١/ هەندێك لە زانایان گوتوویانە، ئەو پیتانە مەبەست پێیان ئەوەیە کە دەستپێکی قسانە، واتە: کە دەگوترێ: (ص) بۆ ئەوەیە کە بیسەر وریا بێتەوە، چونکە هەرکات

پیتێك یان چەند پیتێك گوتران، مانای وایە قسە دەست پێ دەکات‌و، دەبێ بیسەر ئاگادار بێتەوەو هۆشیار بێتەوەو گوێ بگرێ.

٢/ هەندێك لە زانایان گوتوویانە: بۆ ئاگادار کردنەوەی پێغەمبەرە ﷺ، وەك چۆن خەڵك پێکەوە تەلەفۆن دەکەن دەڵێن: (ئەلو) لەم ڕۆژگارەدا.

٣/ هەندێکی دیکە گوتوویانە: ئەوە ئاگادارکردنەوەی خەڵکە، کە قورئان هەر لەو پیتانە پێکهاتوە کە ئێوە قسەیان پێ دەکەن، واتە: ئەگەر ڕاست دەکەن، قورئان موحەممەد ﷺ بۆ خۆی هێناویەتی، یان خەڵکێکی دیکە فێری کردوە، فەرموون : ئێوەش ئەوە ئەرزو ئەوە گەز، مەیدان مشکان نەیان کێڵاوە، فەرموون : ئەو پیتانە لەبەردەستی ئێوەشدا هەن (أ، ل، م، ح، م، ق، ن، ص، ...) ئەو پیتانە کە ڕۆژانە قسەیان پێ دەکەن‌و شتیان پێ دەنووسن، لەبەردەستی ئێوەشدا هەن، وەك کەرەسەیەك، دەی فەرموون ، ئەگەر موحەممەد ﷺ یان غەیری موحەممەد، ئەم قورئانەی لەو پیتانە پێکهێناوە ئێوەش فەرموون: وێنەی قورئان، یان وێنەی دە سوورەت، یان وێنەی یەك سوورەتی قورئان بێنن، ئەگەر ڕاست دەکەن.

٤/ هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: ئەوە ئاگادارکردنەوەیە لەوە کە قورئان نهێنییەکانی تەواو نابن، بۆ وێنە: زانایان زۆر مشت‌و مڕو لێکۆڵینەوەیان دەربارەی ئەو پیتانە کردوەو هەر بەردەوامیشە.

٥/ دەشگونجێ کە ئەو پیتانە ماناو مەبەستێکیان هەبێ، کە لە داهاتوودا بۆ بەشەر دەربکەوێ، وەك چۆن هەندێك لە نهێنییەکانی قورئان، کە دوایی ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین، ئێستا بۆ بەشەر دەرکەوتوون، دوای ئەوەی کە زانست قۆناغی زۆری بڕیون.

ئەوەی ماوەتەوە لێرەدا بیڵێین ئەوەیە کە، جێی سەرنجە :

**یەکەم** : هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ، هیچ پرسیارێکیان نەبووە لەبارەی ئەو پیتانەوەو، نەمزانیوە کە هەرگیز لە پێغەمبەر ﷺ یان پرسی بێ مانایان چییە؟ کەواتە: واپێدەچێ ئەوە عادەتێکی عەرەبەکان بووە، کە بە چەند

پیتێك دەستیان پێکردوە، یاخود شتێکی ئاسایی بووە لە لایان‌و جێی پرسیار نەبووە، بۆیە پرسیاریان نەکردوە.

دووەم: هەروەها کافرەکانیش لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر تۆمەتیان ئاڕاستەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردوون‌و، ئاڕاستەی قورئانیان کردوون، گوتوویانە: کە ئەوە قسەی پێشینانە، بەلاَم نەزانراوە ڕەخنەیان گرتبێ لە قورئان کە بۆچی هەندێك لە سوورەتەکانی کە (٢٩) سوورەتن، بەو پیتە پچڕ پچڕانە دەست پێ دەکەن، کەواتە: ئەوە حاڵەتێکی ئاسایی‌و بووە، دیاردەیەکی ئاسایی بووە، بۆیە نەیانکردوە بە جێی پرسیار.

**هەشتەم: نێوەڕۆك‌و مەبەستەکانی ئەم سوورەتە :**

بە پێویستی دەزانم کە بەر لەوەی بچینە سەر دەرسەکان، چاوێکی گشتی بە ماناو مەبەستەکانی ئەم سوورەتە موبارەکەدت بخشێنین، کە ئەوەی من بۆم دەرکەوتوە ئەم سوورەتە ماناو مەبەستی زۆر زۆری تێدان، بەلاَم دەگونجێ لە ژێر چل (٤٠) ناوونیشاندا کۆ بکرێنەوە، کە من بە خێرایی چاویان پێدا دەگێڕم:

١/ مەبەستی یەکەم: لە ئایەتی یەکەم دایە، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿الٓر تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ١﴾، کە ئەمە پێناسەی ئەم سوورەتەو ئایەتەکانی ئەم سوورەتە موبارەکەیە، کە ئەم ئایەتانە، چەند ئایەتێکن هی کتێبێکی قسە لەجێ‌و کاربەجێن.

٢/ مەبەستی دووەم: لە ئایەتی دووەم دایە، کە خوای زاناو توانا باسی سەرسوڕمانی خەڵك دەکات، کە خوا پەیامی ناردوەو سروشی کردوە بۆ پیاوێك، لە خۆیان کە خەڵك بترسێنێ‌و موژدە بدات بە بڕواداران کە لەلای خوای پەروەردگاریان جێگەو پاداشتێکی باشیان هەیە، کەچی کافرەکان کردوویانە بە جادووگەرێکی ئاشکرا، کە لە ڕاستییدا سەرسوڕمانەکەی ئەوان جێی سەرسوڕمانەو، پێ سەیر بوونەکەی ئەوان، سەیرە ! ئەگەرنا شتێکی زۆر ئاساییە، کە خاوەنی ئەم کەون‌و کائیناتە یەکێك لەو مرۆڤانە بکاتە نوێنەری خۆی‌و پەیامی خۆی پێدا بنێرێ.

٣/ مەبەستی سێیەم : لە ئایەتەکانی (٣و٤)دا خراوەتە ڕوو، کە خوای پەروەردگار باسی پەروەردگاریێتیی خۆیو، باسی بەدیهێنەرایەتیی خۆی بۆ ئاسمانەکانو زەویی، دەکات، کە بە شەش قۆناغان هێناونەدی، دوایی چۆتە سەر عەرش بەو شێوەیەی کە بۆ خوا شایستەیەو، سەرپەرشتیی کاروباری کەونو کائینات دەکات، هیچ کەسیش لەلای خوا، توانای تکا کردنی نیە، مەگەر دوای مۆڵەتی وی، کەواتە: ئا ئەوە پەروەردگارتانەو بەندایەتیی هەر بۆ وی بکەن، بۆچی پەند وەرناگرن!! دوایی باسی سەرەنجامی هەموویان دەکاو کە بۆ لای خوا دەگێڕدرێنەوە، ئەوەش بەڵێنی خوایەو دەیهێنێتە دیو، خوا شتەکانی دەست پێکردوەو دروستی کردوەو، دوایی دەیانگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی هەر کەسە سزاو پاداشتی پڕ بە پێستی خۆی وەربگرێتەوە، لە بڕواداران‌و لە بێبڕوایان.

٤/ مەبەستی چوارەم : لە ئایەتەکانی (٥ و ٦)دا خراوەتە ڕوو، کە خوای باڵادەست باسی خۆر دەکات، کە کردوویەتی بە چرایەکی تیشکدەر، ئنجا باسی مانگ دەکات، کە ڕووناکی کردوەو مەنزڵگاکانی بۆ داناون، تاکو مرۆڤەکان ژمارەی ساڵەکان‌و کاتەکان‌و ژمێرە بزانن، ئنجا خوا دەفەرموێ ئەوانەی بە هەق نەبێ دروست نەکردوون، وە ئایەتەکانی خۆی ڕوون دەکاتەوە، بۆ کەسانێك‌و بۆ کۆمەڵێك کە بزانن، دوایی باسی جیاوازیی‌و جێگۆڕکێی شەوو ڕۆژان دەکات‌و، ڕایدەگەیەنێ کە لە دروستکرانی ئەوەی لە ئاسمانەکان‌و زەویدا هەیەو، لە جیاوازیی شەوو ڕۆژاندا، نیشانەی زۆر هەن، بەڵام بۆ پارێزکاران.

٥/ مەبەستی پێنجەم : لە ئایەتەکانی (٧و ٨)دا خراوەتە ڕوو، کە باسی بێبڕوایان‌و ئەوانەی کە بە ئومێدی دیداری خوا نین، دەکات، ئایا سەرەنجامیان چۆن دەبێ؟

٦/ مەبەستی شەشەم : لە ئایەتەکانی (٩و ١٠)دا خراوەتە ڕوو، خوا باسی بڕوادارانی کردەوە باش دەکات، کە هەم لە دنیادا بە هۆی ئیمانەوە، ڕێ دەردەکەن‌و بەرپێی خۆیان دەبینن، لە دوارۆژیشدا بە بەهەشتەکانی خوا دەگەن‌و، لەوێدا خوا بە پاك دەگرن‌و، سەلام لە یەکدی دەکەن‌و، ستایشی خوای پەروەردگار دەکەن.

٧/ مەبەستی حەوتەم : لە ئایەتەکانی (١١و ١٢)دا خراوەتە ڕوو، کە خوا ﷻ باسی حاڵەتی دەروونی مرۆڤ دەکات بە گشتی، یاخود باسی مرۆڤی بێبڕوا دەکات، کە ئەگەر خوا ﷻ وەك ئەوان پەلە دەکەن لە خێرو چاکەو قازانجی خۆیاندا، پەلە بکات لە سزادانیاندا، ئەوە کۆتاییان پێ دێنێ، بەڵام خوای پەروەردگار زۆر میهرەبانە، زۆر بەکاوەخۆو هێدییو مەندە لەگەڵ مرۆڤەکاندا، پەلە لە سزادانیان دا ناکا.

دوایی خوای پەنهانزان باسی حاڵەتێکی دیکەی دەروونی مرۆڤ دەکات، کە هەر کاتێك تووشی ناڕەحەتییو ناخۆشیی دێ، ئەگەر بە دانیشتنەوە بێ، ئەگەر بە ڕاکشانەوە بێ، ئەگەر بە پێوە بێ، هاوار لە خوا دەبەستێ، بەڵام دوای ئەوەی کە خوای میهرەبان دەربازی دەکات، دەڕواتو هیچی لە بیر نامێنێ.

٨/ مەبەستی هەشتەم : لە ئایەتەکانی (١٣و ١٤)دا خراوەتە ڕوو، کە باسی مێژوومان بۆ دەکاتو، دەفەرموێ: لە پێش ئێوەدا زۆر سەدەو کۆمەڵگامان فەوتاندوون بەهۆی ستەمیانەوە، پێغەمبەرانیشیان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بە بەڵگە ڕوونو ئاشکرایەکانەوە هاتوون بۆ لایان، بەڵام بەهۆی ستەمو خراپەیانەوە، کە هێندە پێیدا ڕۆچووبوون، ڕێی ئیمان هێنانیان نەبووە، ئەوەش سزای تاوانبارانە، دوایی خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئێوەشمان کردۆتە جێنیشین لە شوێنی وان، تاکو بزانین داخۆ چی دەکەن؟ چۆن دەکەن؟ ئایا پەند لەوان وەردەگرن، یان هەمان هەڵەی ئەوان دووبارە دەکەنەوە؟

٩/ مەبەستی نۆیەم : لە ئایەتەکانی (١٥و ١٦و ١٧)دا خراوەتە ڕوو، کە بێبڕوایەکان داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد، دوای ئەوەی ئایەتەکانیان بە ڕوونیی بەسەردا دەخوێنرانەوە، داوایان لێ دەکرد : یان قورئانێکی دیکە بێنێ، یاخود ئەو قورئانە بگۆڕێو دەستکاریی بکات، بە شێوەیەك کە لەگەڵ ئارەزووی ئەواندا بگونجێ، خواش ﷻ پێغەمبەری خاتەم فێر دەکات کە وەڵامیان بداتەوە، وەڵامی ددان شکێن : کە ئەوە بەدەست من نیە، قورئان من لەلایەن خۆمەوە نەمهێناوە، من تەنیا شوێن ئەو سروشو نیگایە دەکەوم کە لە لایەن خواوە بۆم دەکرێو، من ئەگەر سەرپێچیی پەروەردگارم بکەم، لە سزای ڕۆژێکی مەزن دەترسێم.

دوایی دەفەرموێ: ئەگەر خوا ویستبای هەر بەسەرمدا نەدەخوێندنەوەمو ئێوەم لێ ئاگادار نەدەکرد، وە من پێش ئەوەی کە باسی قورئانو پێغەمبەرایەتیی بکەم تەمەنێکم لە نێو ئێوەدا گوزەراندوە، چل (٤٠) ساڵ ئەو باسو خواسانەم نەبووە، کەواتە: کە ئێستا لە دوای چل (٤٠) ساڵ ئەو قسانە دەکەم، هی خۆم نین، ئایا نازانن، نافامن؟ دوایی خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: کە پێیان بفەرموێ: کێ ستەمکارترە لەو کەسەی درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ، ئەگەر گریمان موحەممەد ﷺ وابێ، وە کێش ستەمکارترە، لە کەسێك کە ئایەتەکانی خوا بە درۆ دەزانێ، کە دیارە بێبڕوایەکانن، بێگومان تاوانباران سەرفراز نابن.

١٠/ مەبەستی دەیەم : لە ئایەتەکانی (١٨و ١٩)دا خراوەتە ڕوو، کە خوای زاناو توانا باسی ئەوە دەکات، ئەو شتانەی کە هاوبەش دانەران، بت پەرستەکان دەیان پەرستن، لە جیاتی خواو لە خوار خواوە ﷻ، نە زیانیان پێ دەگەیەنن، نە قازانجیان پێ دەگەیەنن، دەشڵێن: ئەوانە تکا کارمانن، بەڵام خوای تاك‌و پاك بە درۆیان دەخاتەوە کە زانیاریی خوا پەیوەست نەبووە بە هیچ شتێکەوە کە هاوبەشی خوایان، یاخود تکاکاربێ لە لای خوای، شتێکیش کە زانیاریی خوای پێوەی پەیوەست نەبێ، دیارە نیە.

ئنجا خوای دادگەر باسی ئەوە دەکات کە حاڵەتی ئاسایی مرۆڤایەتیی وابوو، کە یەك کۆمەڵ بوون لەسەر خوا بە یەکگرتن‌و تەنیا خواپەرستن، ئەوەش حاڵەتی خوارسکی مرۆڤایەتییە، بەڵام دوایی ناکۆکییان کەوتۆتە نێوان، ئنجا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە خوای کارزان تەصفیەی حیساب لەم ژیانە دنیاییەدا ناکات، دادوەرییان لە نێواندا دەکرا، لەسەر ئەوەی کە تێیدا کەوتوونەتە ڕاجیایی لە نێوانیاندا.

١١/ مەبەستی یازدەیەم : لە ئایەتی (٢٠)دا خراوەتە ڕوو، خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە ئەوانە داوایان دەکرد لە موحەممەد ﷺ، موعجیزەو نیشانەیەکی وەك هی پێغەمبەرانی پێشوو بێنێ، موعجیزەیەکی بەرهەست، وەك دەستی درەوشاوەی مووساو گۆچانەکەی، کە دەبوو بە حەزیاو ئەژدیها، یان حوشترەکەی صالح، یان ئەو شتانەی کە عیسا دەیکردن، (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کە مردووی

زیندوو دەکردەوە، بەڵەك و کوێرو کەڕی زگماکی چاك دەکردنەوە، بەڵام خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بڵێ: کە ئەوە پەنهان و نادیارەو، غەیبیش تەنیا لەلای خوایە، ئەوەی بە من دراوە وەك موعجیزەو بەڵگەی ڕاستیی من، ئەم قورئانەیە، کە دیارە ئەویش حیکمەتی خۆی هەیە، وەك دوایی باسی دەکەین.

١٢/ مەبەستی دوازدەیەم : لە ئایەتەکانی (٢١)دا خراوەتە ڕوو، کە باسی ئەوە دەکات خەڵك (دیارە مەبەستی خەڵکی بێبڕوایە)، کاتێك خوا ڕەحمەتی خۆیان پێ دەچێژێ و نیعمەتیان بەسەردا دەڕێژێ، دوای ئەوەی کە تووشی زیان و ناخۆشیی بوون، لە جیاتی ئەوەی سوپاسی خوا بکەن، دەست دەکەن بە پیلان گێڕیی لە دژی ئایەتەکانی خوا، بەڵام خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: با بزانن تەگبیری خواو، نەخشەی خوا خێراترە، نوێنەرو ڕەوانەکراوەکانی خواش، واتە: فریشتەکانی خوا، هەرچی ئەوان دەیکەن لە پیلان گێڕیی، دەینووسن، واتە: با چاوەڕێی سزا بن.

١٣/ مەبەستی سێزدەیەم : کە لە ئایەتەکانی (٢٢و ٢٣)دا خراوەتە ڕوو، خوای بێهاوەڵ، باسی ئەوە دەکات کە ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرو کافرانە، کاتێك کە خوا ﷻ بە وشکانیی و بە دەریادا هۆکاری هات و چۆی بۆ ڕەخساندوون، ئەوانە کاتێك کە سواری کەشتی دەبن، کەشتییەکە بە بایەکی خۆش دەڕوات و، پێی دڵخۆش دەبن، بەڵام دوایی هەر هێندە دەزانن : بایەکی زۆر بەهێزی تێکشکێنەر دێ و، لە هەموو لاوە شەپۆل دەوریان دەدات و، پێیان وایە کە دەرباز نابن، لەو کاتەدا زۆر بە دڵسۆزانەو لێبڕاوانە ملکەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ دەکەنەوە، لێی دەپاڕێنەوە کە ئەگەر بێت و لەمە دەربازمان بکەی، ئێمە لە سوپاسگوزاران دەبین، کەچی دوای ئەوەش کە دەربازیان دەکات، دیسان دەگەڕێنەوە سەر سنوورشکێنیی بە ناهەق.

ئنجا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەی خەڵکینە! ئەو سنوورشکێنیی و ستەم و خراپەیە، بێگومان زیانەکەی بۆ خۆتانە، ئەم ژیانە دنیاییە ڕابواردنێکی کەمە، دوایی بۆ لای ئێمە دەگێڕدرێنەوەو هەواڵتان پێ دەدەین.

١٤/ مەبەستی چواردەیەم : لە ئایەتی (٢٤)دا خراوەتە ڕوو، خوای کاربەجێ باسی وێنەی ژیانی دنیا دەکات، کە وەك ئەوە وایە: ئاوێك لە ئاسمان دەنێرێتە خوارو ڕووەك و شینایی پێ دەڕوێ، کێڵگەیەکی باشی پێ دەڕوێ و، سەر زەوی پێ دەڕازێتەوە، خەڵکەکەش پێیان وایە، ئەوە بەروبوومەکە لەبەردەستی خۆیاندایە، دوایی بەڵایەکی کتوپڕ لێی دەداو دەیکاتە پەرێزێکی ڕووت، وەك دوێنێ هیچی لێ نەبووبێ، ئاوا خوای بالادەست ئایەتەکانی خۆی بۆ خەڵك ڕۆشن دەکاتەوە، کەواتە: ژیانی دنیای ئێوەش، تەمەنی تاك تاکی ئێوەش ئاوایە، هەروەها ژیانی کۆی مرۆڤایەتییش بەو شێوەیە.

١٥/ مەبەستی پازدەیەم : لە ئایەتەکانی (٢٥و ٢٦)دا خراوەتە ڕوو، کە خوای پەروەردگار بانگی خەڵك دەکات بۆ مەنزڵگای ئاشتیی و، هەر کەسێك کە بیەوێ دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێی خۆی، دوایی باسی ئەوە دەکات، کە ئەوانەی چاکەکار بوون، پاداشتی هەرە باشیان هەیە، زیادەشیان بۆ دەخرێتە سەر، ئەوانە دەم و چاویان تەپ و تۆزو ڕەشایی خەم و زەبوونیی دایناگرێ، وە ئەوانە هاوەڵی بەهەشتن، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

١٦/ مەبەستی شازدەیەم : لە ئایەتی (٢٧)دا خراوەتە ڕوو، باسی ئەوانە دەکات کە خراپەیان وەدەست هێناوە، کە هەر خراپەیەك بە ئەندازەی خۆی سزای هەیە،

ئەوانە دەم و چاویان باری خەم و تەم لێی دەنیشێ، دەم و چاویان ڕەش دادەگەڕێ، وەك ئەوەی بە چەند پارچەیەك لەشەوی تاریك داپۆشرابێ، ئەوانەش هاوەڵی ئاگری دۆزەخن، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

١٧/ مەبەستی حەڤدەیەم : لە ئایەتەکانی (٢٨و ٢٩و ٣٠)دا خراوەتە ڕوو، کە خوای بەرزو مەزن باسی چۆنیەتی کۆکردنەوەی کافران دەکات لە ڕۆژی دواییداو دەفەرموێ: ئەو ڕۆژە هەموویان کۆ دەکەینەوە، دوایی بە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان و بەو شتانەی کە کردوویانن بە هاوبەش بۆ خوا، دەڵێین: بوەستن، دوایی لێکیان جیا دەکەینەوە، دوایی هاوبەشەکان (واتە: ئەوانەی کە لە خەیاڵی ئەواندا هاوبەشی خوا بوون)، حاشا دەکەن لە پەرستارەکانی خۆیان، دەڵێن: ئێمە لە ئێوە بەریین، ئێوە ئێمەتان نەپەرستوەو، ئێمە لە پەرستنی ئێوە بێئاگا

بووین، خواش بەسە کە شایەدییمان بۆ بدات، ئنجا خوا دەفەرموێ: لەو کاتەدا هەموو کەسێك لە خۆی حاڵی دەبێ، چی پێشخستوەو، دەگێڕدرێنەوە بۆ لای سەروەرو سەرپەرشتیاری هەقو ڕاستەقینەیان کە خوایەو، ئەوەی هەڵیاندەبەست، لێیان ون دەبێ.

١٨/ مەبەستی هەژدەیەم : لە ئایەتەکانی (٣١و ٣٢و ٣٣)دا خراوەتە ڕوو، کە خوای بەخشەر بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: پرسیاریان لێ بکە : کێ لە سەرێو خوارێو لە ئاسمانو زەوی یەوە، ڕۆزییتان دەدا؟ کێ خاوەنی بیستنەکانو دیتنەکانە؟ کێ زیندوو لە مردوو دەردێنێ؟ کێ مردوو لە زیندوو دەردێنێ؟ کێ سەرپەرشتیی کاروباری بوون دەکات؟ دەڵێن: خوا، بڵێ: ئەدی بۆچی پارێزی لێ ناکەن؟ تەنیا ئەو خوایەتان پەروەردگاری خاوەنی هەقو ڕاستەقینەتانە، لە دوای هەقیش تەنیا گومڕایی هەیە، بۆ کوێ لادەدرێن! دوایی خوای کارزان باسی یاسایەکی خۆی دەکاتو، دەفەرموێ: ئاوا بەو شێوەیە بڕیاری پەروەردگارت چەسپاوە بەسەر کەسانێك دا کە لاڕێن.

١٩/ مەبەستی نۆزدەیەم : لە ئایەتەکانی (٣٤و ٣٥و ٣٦)دا خراوەتە ڕوو، کە خوای بێ هاوەڵ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: چەند پرسیارێك لەوانە بکە کە غەیری خوا دەپەرستن، بڵێ: ئایا لە نێو ئەوانەدا کە دەیانکەنە هاوبەش بۆ خوا، کەس هەیە شت دروست بکاتو، دوای ئەوەی لە بەین دەچێ، دووبارە زیندووی بکاتەوە؟ بڵێ: هەر خوا بەدی دێنێو، هەر خواش دووبارە دەیهێنێتەوە، بەرەو کوێ لادەدرێن!

دوایی دەفەرموێ: پێیان بڵێ: ئایا لە نێو هاوبەشەکانی ئێوەدا، کەس هەیە کە ڕێنمایی بکات بەرەو هەق؟ دوایی دەفەرموێ: بڵێ هەر خوا خەڵك ڕێنمایی دەکات بەرەو ڕێی هەق، ئایا کەسێك کە خەڵك ڕێنمایی دەکات، شایستەترە شوێنی بکەون، بیپەرستن، یان کەسێك کە تەنانەت بۆ خۆشی بە ڕێیە نازانێ؟ کەواتە: چیتانە ! بەرەو کوێ لادەبرێن؟ دوایی خوای تاكوپاك ڕایدەگەیەنێ: کە ئەوانە تەنیا شوێن گومان دەکەون، گومانیش هیچ کەڵێنی هەق ناگرێ، خواش دەزانێ کە چی دەکەن.

٢٠/ مەبەستی بیستەم : لە ئایەتەکانی (٣٧و ٣٨و ٣٩و ٤٠)دا خراوەتە ڕوو، کە باسی قورئانە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەم قورئانە هەر ناگونجێ لە لایەن جگە لە خواوە هەڵبەسترابێ، ئەم قورئانە هەموو کتێبەکانی پێش خۆی بە ڕاست دەزانێ‌و وەك ئەسڵەکەیان، وە ئەم ڕوونکردنەوانەی لەم کتێبەدا هاتوون، هیچ گومانی تێدانیە لە لایەن خوای خاوەنی جیهانەکانەوەیە، جگە لە خوا هیچ کەس ئەوەی لە توانادا نیە، ئەو هەموو ڕاستییانەی کە لە قورئاندا هەن، بیانخاتە ڕوو.

دوایی دەفەرموێ: ئەگەر دەڵێن موحەممەد ﷺ قورئانی هەڵبەستوە، پێیان بڵێ: فەرموون: ئێوەش سوورەتێکی وەك قورئان بێنن، کێشتان دەست دەکەوێ‌و لە تواناتاندا هەیە، ئەگەر ڕاست دەکەن، هەمووان بێنن، با کۆمەکتان بن، دوایی دەفەرموێ: بەڵکو ئەوانە بێبڕوا بوون بەرانبەر بە کتێبێك کە زانیارییان دەربارەی نیە، تێی نەگەیشتوون ، نازانن چی تێدایەو، جارێ سەرەنجامی ئەو شتانەی کە ئەو قورئانە دەیانفەرموێ، بۆیان نەهاتۆتە دی.

ئنجا دەفەرموێ : هەروەها ئەوانەی پێش وانیش ئایەتەکانی خوایان‌و، پێغەمبەرەکانی خوایان بە درۆ دادەنا، بەڵام ئایا سەرەنجامی ستەمکاران چۆن بووە؟ تەماشا بکەن!

ئنجا دەفەرموێ ، لەوانە کەسانێکیان هەن، کە بڕوا بە قورئان دێنن‌و، کەسانێکیش هەن، بڕوای پێ ناهێنن، واتە: کەسانێکیان هەن کە دەزانن قورئان ڕاستە، بەڵام بۆی ملکەچ نابن. مانایەکی دی ئەوەیە: کەسانێکیان هەن، کە دوایی بڕوا دێنن، بەڵام کەسانێکیشیان هەن، دواییش هەر بڕوا ناهێنن، پەروەردگاریش زاناترە بە خراپەکاران.

٢١/ مەبەستی بیست‌و یەکەم : لە ئایەتەکانی (٤١و ٤٢و ٤٣و ٤٤)دا خراوەتە ڕوو، کە خوای بەخشەر پێغەمبەر دەفەرموێ: ئەوانە تۆیان بە درۆ دانا، بفەرموو: من کردەوەی خۆم بۆ خۆم، ئێوەش کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان، من دوورم لەوەی ئێوە ئەنجامی دەدەن، ئێوەش دوورن لەوەی کە من ئەنجامی دەدەم، ئێوە دوورن لە کردەوەی من‌و منیش دوورم لە کردەوەکانی ئێوە، دوایی دەفەرموێ: لەوانە

کەسانێکیان هەن، کە گوێت بۆ هەڵدەخەن، گوێی ڕواڵەتیی، بەڵام ئایا تۆ دەتوانی بە کەسانێك کە عەقڵیان بەکار نەهێنن، پێیان ببیستێنی؟ نەخێر، ناتوانی، هەروەها کەسانێکیان هەن، تەماشات دەکەن، بەڵام ئایا کەسێك کە بە عەقڵو هۆشەوە چاوی بەکارنەهێنێ، دەگونجێ تۆ ڕێنمایی بکەی؟ بە تەئکید ناتوانی، دوایی خوا دەفەرموێ: بێگومان خوا ستەم لە خەڵك ناکات، واتە: با وا نەزانن کە خوا ئەوانەی کەڕو کوێر کردوە، بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردوە، بە هۆی کردەوە خراپەکانی خۆیانەوە، وایان لێهاتوە، کە هەستەوەرەکانیان پەك بخات.

٢٢/ مەبەستی بیستو دووەم : لە ئایەتی (٤٥)دا خراوەتە ڕوو، خوای زاناو شارەزا باسی ئەوە دەکات کە لە ڕۆژی دواییدا کاتێك کە کۆدەکرێنەوە، وەك تەنیا سەعاتێك مابنەوە لە دنیاداو پێکەوە یەکتییان ناسی بێو تەواو، ئەوەندە ژیانی دنیایان لەلا کورت دەبێتەوە، دوایی خوا دەفەرموێ: ئەوانەی کە بڕوایان بە دیداری خوا نەبووو، ڕێ پێشاندراو نەبوون، لەسەر ڕێی ڕاست نەبوون، زیانبار بوون.

٢٣/ مەبەستی بیستو سێیەم : لە ئایەتەکانی (٤٦و ٤٧)دا خراوەتە ڕوو، کە خوای بەرز بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ئەگەر هەندێك لەوەی کە بەڵێنیان پێ دەدەی، بیهێنینە دیو پێشانی تۆی بدەین، یاخود تۆ بمرێنین، پێش ئەوەی هیچ لەوەی هەڕەشەی پێ لەوان دەکەین، بیهێنینە دی، ئەوە سەرەنجام هەر بۆ لای ئێمە دەگەڕێنەوە، خواش دەزانێ چییان کردوە، پاشان دەفەرموێ: هیچ کۆمەڵگایەك نەبووە، مەگەر پێغەمبەرێکی بووە، لە ڕۆژی دواییدا ئەو کۆمەڵە ئەو ئۆممەتەش دەهێنرێو پێغەمبەرەکەشیان دەهێنرێو، لە نێوانیاندا دادوەرانە دادوەریی دەکرێ، بێ ئەوەی ستەمیان لێ بکرێ.

٢٤/ مەبەستی بیستو چوارەم : لە ئایەتەکانی (٤٨و ٤٩و ٥٠و ٥١ و ٥٢)دا خراوەتە ڕوو، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەوانە دەڵێن: ئەگەر ڕاست دەکەن، ئەو بەڵێنە کەی دێتە دی، واتە: سزاو پاداشتو ڕۆژی دوایی؟ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: تۆ پێیان بڵێ: تەنانەت بۆ خۆشم هیچ زیانو سوودێکم بە دەست نیە، مەگەر خوا بیەوێ، بۆ هەر کۆمەڵگایەك کاتێك دیاریی کراوە، کۆتاییان پێ بێ، ئنجا هەر کاتێك ئەو ئەجەلەو ئەو کاتی کۆتاییەیان هات، نە سەعاتێك

دوا دەخرێن، نە پێش دەخرێن، ئێوەش بە هەمان شێوە دوایی دەفەرموێ: پێیان بڵێ: پێم بڵێن، هەواڵم پێ بدەن، ئەگەر سزای خوا بە شەوێ، یان بە ڕۆژی بێ (واتە: کاتێك کە غافڵن، خەوتوون بێ ئاگان، یاخود کاتێك کە بە خەبەرن و بە ئاگان (ئێوە وەزعتان چۆن دەبێ؟ چی دەکەن؟ بۆچی پەلە دەکەن؟ دوایی دەفەرموێ: ئایا کاتێك ئەوەی کە هەڕەشەی پێ لە ئێوە کراوە، هاتە دی، ئێستا بڕوای پێ دێنن! ئێستا کە پێشتر پەلەتان دەکرد، دوایی دەفەرموێ: ئەوانەی کە ستەمیان کردوە، پێیان دەگوترێ: سزای هەمیشەیی بچێژن، ئایا بە پێی ئەوەی کە ئەنجامتان دەدا سزاتان نادرێتەوە؟! واتە: ئەوە سزای کردەوەکانی خۆتانە.

٢٥/ مەبەستی بیست و پێنجەم : لە ئایەتەکانی (٥٣و ٥٤و ٥٥و ٥٦)دا خراوەتە ڕوو، کە دەفەرموێ: ئەوانە لێت دەپرسن دەڵێن: ئایا ئەوەی تۆ دەیڵێی هەقە، ڕاستە؟! ئەویش دەفەرموێ: بڵێ: با، سوێند بە پەروەردگارم ڕاستە، ئێوەش دەستەوسانکەری خوا نین، کە خوا ئەو بەڵێنە بێنێتە دی، کە هاتنی ڕۆژی سزاو پاداشتە، دوایی دەفەرموێ: ئەگەر هەر کەسێك کە ستەمی کردوەو خراپەیەکی کردوە، {لێرەدا (ظلم) مەبەست پێی شیرك و کوفرە وەك خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ١٣﴾لقمان، گەورەترین ستەم ئەوەیە کە ئینسان هاوبەش بۆ خوا دابنێ، خوا نەپەرستێ} ، ئەو نەفسەی کە ستەمی کردوە، ئەگەر هەرچی لەسەر زەوی دا هەیە، هی ئەو بێ، دەیکاتە بەلاگێڕەوەی خۆی لە ڕۆژی دواییدا، پەشێمانیشن لە دەروونی خۆیاندا، واتە: بۆشیان دەرنابڕدرێ لە دەروونی خۆیاندا پەنهانی دەکەن، کاتێك کە سزاو ئازار دەبینین سزای دادگەر دەبینین، بە دادگەرانەش دادوەرییان لە بەینیدا دەکرێ، بێئەوەی ستەمیان لێ بکرێ.

پاشان خوا دەفەرموێ: ئاگادار بن! هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە، هی خوایە، ئاگادارین! کە بەڵێنی خوا ڕاستە، بەلام زۆربەیان نازانن.

نازانن کە ناگونجێ ئەم کەون و کائیناتە، وەك ڕۆمانێکی بێتام و چیرۆکێکی بێ ئەنجام بێ، چاك و خراپ وەك یەك بڕۆن و، کەس بە چاکەکارەکە نەڵێ: دەستت خۆش بێ، بە خراپەکارەکەش نەڵێ: ئەرێ بۆ وات کرد؟ کە بە تەئکید

ئەو کاتە کە ژیانی بەشەر دەبێتە شتێکی پووچ، بۆیە خوای کارزان لە کۆتایی سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ١١٥ ﴾، واتە: ئایا پێتان وایە ئێوەمان بە گاڵتەو بە هەوەنتە دروست کردوەو بۆلامان ناگێڕدرێنەوە؟ واتە: ئەگەر بەشەر زیندوو نەکرێتەوە، سزاو پاداشتی لەگەڵدا نەبێ، ژیانەکەی دەبێتە شتێکی پووچو بێ مانا، خوای کاربەجێش شتی پووچو بێ مانا ناکات، دوایی دەفەرموێ: هەر خوا دەژێنێ‌و دەمرێنێ، هەر بۆ لای ئەویش دەگێڕدرێنەوە.

٢٦/ مەبەستی بیست‌و شەشەم : لە ئایەتەکانی (٥٧و ٥٨)دا خراوەتە ڕوو، کە باسی قورئانەو خوا بانگی مرۆڤایەتیی دەکات: ئەوە لە پەروەردگارتانەوە ئامۆژگارییتان بۆ هات‌و، شیفاو چارەسەری ئەوەی کە لە سینەکانتان دایە، بۆتان هات‌و، ڕێنماییتان بۆ هات‌و، ڕەحمەتتان بۆ هات، بەڵام ئەو هیدایەت‌و ڕەحمەتە بۆ بڕواداراندە، واتە: دوای ئەوەی کە خەڵك ئامۆژگاریی خوا وەردەگرێ‌و، ئەو ئامۆژگارییەی خوا - کە قورئانە- دەبێتە هۆی پاکبوونەوەو چاکبوونەوەی دڵ‌و دەروونیان، ئنجا بۆیان دەبێتە مایەی بەرپێی خۆ دیتن‌و، مایەی ئەوە کە شایستەی ڕەحمەت‌و بەزەیی خوا بن.

دوایی دەفەرموێ: پێیان بڵێ: با تەنیا بە بەخشش‌و بەزەیی خوا دڵخۆش بن، ئەوە باشترە لەوەی کە کۆی دەکەنەوە، کۆی دەکەنەوە لە خەڵك‌و لە خزم بە دەوری خۆیانەوە، لە سەروەت‌و سامان، لە هەر شتێك کە کۆ دەکرێتەوە.

٢٧/ مەبەستی بیست‌و حەوتەم : لە ئایەتەکانی (٥٩ و ٦٠)دا خراوەتە ڕوو، کە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: پێیان بفەرموو: ئایا ئەو ڕزق‌و ڕۆزیی‌و بژیوە دەبینن کە خوا بۆی ناردوونە خوار، کەچی هەر لە خۆتانەوە پۆلێنی دەکەن بۆ حەڵاڵ‌و حەرام! بڵێ: ئایا خوا مۆڵەتی داون، یاخود درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن؟ کە بە تەئکید دووەمیانە، ئایا ئەوانەی کە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن لە ڕۆژی قیامەتدا، گومانیان چییە؟ چی چاوەڕێ دەکەن؟ بێگومان خوا خاوەن بەخششە بەسەر خەڵکەوە، بەڵام زۆربەیان سوپاسگوزار نین.

ڕزق‌و ڕۆزی داون کەچی لە خۆوە دەڵێن: ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامە، دەستکاریی دەکەن بەبێ مۆڵەتی خوا، کە تەنیا ئەو کەسەی ڕزقەکەی پێداوی، ئەویش بۆی هەیە حەڵاڵ‌و حەرام، چاک‌و خراپ، پاک‌و پیسەکەیت بۆت دیاریی بکات، نەک لە خۆتەوەو بە گومان‌و، بە خەیاڵ.

٢٨/ مەبەستی بیست‌و هەشتەم : لە ئایەتی (٦١)دا خراوەتە ڕوو، کە خوا باسی ئاگاداریی خۆی‌و چاودێریی خۆی دەکات، دەفەرموێ : تۆ ئەی مرۆڤ! یاخود ئەی موحەممەد ﷺ! لە هەر حاڵێکدا بی، هەر قورئانێك بخوێنی، هەر ئەندازەیەك لە قورئان، هەر کردەوەیەك بکەن، ئێمە بەسەرتانەوە ئاگادارین، کاتێك دەچنە نێو کردەوەکەوە، بە قەدەر گرانایی گەردێك، نە لە زەوی‌و نە لە ئاسمان، لە خوا ون نابێ، نە لەوەش گچکەترو نە لەوەش گەورەتر، هەمووی لە لیستێکی ڕووندا سەرژمێر کراوە، کە مەبەست پێی زانیاریی بێ سنووری خوای زاناو شارەزایە.

٢٩/ مەبەستی بیست‌و نۆیەم، لە ئایەتەکانی (٦٢و ٦٣و ٦٤و ٦٥)دا خراوەتە ڕوو، کە خوای بەخشندە باسی دۆستەکانی‌و خۆشەویستەکانی خۆی دەکات، دەفەرموێ: ئاگاداربن! دۆستەکانی خوا نە ترسیان لەسەرە بۆ داهاتوو، نە خەم‌و پەژارە دادەگرن بۆ ڕابردوو، ئەوانیش کەسانێکن کە بڕوایان هێناوەو، پارێزیان دەکرد، ئەوانە لە ژیانی دنیاشدا مژدەو دڵخۆشییان بۆ هەیەو، لە دوا ڕۆژیشدا، بڕیارەکانی خوا گۆڕانیان بەسەردا نایەت، ئا ئەوە سەرکەوتنی هەرە مەزنە.

دوایی بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: با قسەی ئەوان تۆ دڵتەنگ نەکا (کە پێت دەڵێن: شێتە، دەڵێن: جادوو گەرە، دەڵێن: فاڵچییە، دەڵێن: قورئانی هەڵبەستوە) ئەو قسەو قاڵانە با تۆ دڵتەنگ نەکەن، بێگومان باڵا دەستیی هەمووی هی خوایەو، خوا بیسەری زانایە.

٣٠/ مەبەستی سییەم : لە ئایەتی (٦٦)دا خراوەتە ڕوو، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئاگادار بن! هەر کەس کە لە ئاسمانەکان‌و زەوی دا هەیە، هەموویان هی خوان، وە ئەوانەی کە جگە لە خوا دەکەنە هاوبەش بۆ خوا، لە ڕاستییدا بەدوای هاوبەشەکان ناکەون، بەڵکو تەنیا بە دوای گومان دەکەون، چونکە خوا هاوبەشی نین، تاکو بە دوایان بکەون، ئەوانەش تەنیا قسەی بێ بنەما دەکەن.

٣١/ مەبەستی سی‌و یەکەم : لە ئایەتی (٦٧)دا خراوەتە ڕوو، کە خوای بەشندە باسی ئەوە دەکات، کە شەوگاری گێڕاوە بە مایەی ئارام تێدا گرتن‌و تێدا پشوودان، ڕۆژگاریشی کردوە بە مایەی بینین، کە کارو کەسابەتی تێدا بکەن، بەرپێی خۆتان دەبینن، بێگومان لەوەدا (واتە: لە سروشتی شەوگارو ڕۆژگاردا کە یەکەمیان بۆ ئیسراحەت‌و پشوودانەو، ئەوی دیکەیان کە بۆ کارو هەوڵدانە) نیشانە هەن بۆ کەسانێك کە ببیستن، واتە: بە گوێی عەقڵ‌و دڵ ببیستن.

٣٢/ مەبەستی سی‌و دووەم : لە ئایەتەکانی (٦٨و ٦٩و ٧٠)دا خراوەتە ڕوو، کە خوا ﷻ باس لەبارەی شیرکەوە دەکات‌و دەفەرموێ: وە ئەوانە (واتە: موشریکەکان، بێبڕوایەکان) گوتیان: خوا ڕۆڵەی هەیە، ڕۆڵەی پەیدا کردوە، پاکیی‌و دووریی بۆ خوا لەوەی کە ڕۆڵەی هەبێ، خوا بێ نیازە، کەسێك پێویستی بە وەچەو ڕۆڵە هەیە، کە پێویستی بەوە بێ، لە دوای خۆی بوونەکەی لە وەچەکەیدا بەرجەستە ببێ، بەڵام خوای پەروەردگار نە نەبوونی پێشکەوتووە، نە نەبوونیشی بەسەردا دێ، هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەوی دا هەیە، هەمووی هی ئەوە، ئێوەش لەوبارەوە هیچ بەڵگەیەکتان نیە، ئنجا ئایا چۆن لەسەر خوا شتێك دەڵێن، کە زانیارییتان پێی نیە ! دوایی خوا دەفەرموێ: ئەوانەی کە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن، سەرفراز نابن، ژیانی دنیا ڕابواردنێکی کەمی دنیایە، دوایی گێڕرانەوەی بۆ لای ئێمەیەو، سزای سەختیان پێ دەچێژین، بە هۆی ئەوەوە کە بێبڕوا بوون.

٣٣/ مەبەستی سی‌و سێیەم : لە ئایەتەکانی (٧١و ٧٢و ٧٣)دا خراوەتە ڕوو، کە باسی نووح ﷺ دەکات دەفەرموێ: بەسەرهاتی نووحیان بەسەردا بخوێنەوە، کاتێك کە بە گەلەکەی خۆی گوت‌و بێ منەتی کردن‌و بۆی دەرخستن کە بێباکە گوتی: ئەگەر مانەوەی منتان لەسەر دڵ قورسەو، ئەوە کە من ئایەتەکانی خواتان بیر دەخەمەوە : هەرچیتان لە دەست دێ بیکەن، چاوەڕێشم مەکەن‌و، ئەگەر پشتتان هەڵکرد لەوە کە من لە ئێوەی داوا دەکەم : کە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، ئەوە من هیچ پارەو شتم لێ داوا نەکردوون، پاداشتم تەنیا لەلای خوایە، من فەرمانم پێکراوە کە لە مسوڵمانان بم‌و، هیچ بیانوویەکتان بە دەستەوە نیە کە پشت لەو پەیام‌و بەرنامەیە بکەن، کە من هێناومە.

بەلاّم ئەوان سەرەنجام بە درۆیان دانا.

ئنجا خوا دەفەرموێ: خۆیو ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون لە کەشتییەکەدا دەربازمان کردنو، کردمانن بە جێنیشین، ئەوانەش کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دەزانی، خنکاندمانن، تەماشا بکەن ئەوانەی کە ترسێنرا بوونو وریا کرابوونەوە، بەلاّم گوێیان پێ نەدا، سەرەنجامیان چۆن بوو!

٣٤/ مەبەستی سیو چوارەم، لە ئایەتی (٧٤)دا خراوەتە ڕوو، باسی ئەوە دەکات کە لە دوای (نووح)یش خوا پێغەمبەرانی زۆری ناردوون، بۆ لای گەلەکانیان، ئەوانیش بە بەڵگەی ڕوونو ئاشکراوە هاتوون بۆ لایان، بەلاّم، بۆیان نەلواوە بڕوا بە شتێك بێنن کە پێشتر پێی بێبڕوا بوون، ئاوا ئێمە مۆر بەسەر دڵی سنوور شکێنانەوە دەنێین، واتە: خوای کارزان لێرەدا بێبڕوایەکان هەموویان وەك کۆمەڵێك تەماشا دەکات، ئەوانەی پێشوویان کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان نەهێناوە ئەوانەی دواییش نە دەگونجا بڕوا بێنن، بۆچی؟ چونکە هەر بە دوای وان دەکەوتنو لاسایی وانیان دەکردەوەو دەیانگوت: ﴿ بَلْ قَالُوٓا۟ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ الزخرف، بەڵکو ئێمە پێشینانمان لەسەر ڕێیەك بینیوە ئێمەش هەر بە شوێنەواری وان دا دەڕۆین.

٣٥/ مەبەستی سیو پێنجەم، لە ئایەتەکانی (٧٥ تاکو ٩٣) نۆزدە (١٩) ئایەت هەمووی تەرخان کراوە بۆ بەسەرهاتی مووسا (عَلَيْهِ السَّلَام) لەگەڵ فیرعەون، ئەویش لە (٧) بڕگەدا:

بڕگەی یەکەم : ئایەتەکانی: (٥٧ – ٥٨)، خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات، کە دوای پێغەمبەرانێك (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) کە لە دوای نووحەوە هاتوون، ئنجا مووساو هاروونی بۆ لای فیرعەونو دارو دەستەکەی نارد، بە بەڵگە ئاشکرایەکانو بە نیشانەکانەوە، بەلاّم ئەوان خۆیان بە زلگرتو لە تاوانباران بوونو، کاتێك هەقیان لە لایەن ئێمەوە بۆ هات، گوتیان: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە، مووساش (عَلَيْهِ السَّلَام) فەرمووی: ئایا بەو هەقەی کە بۆتان هاتوە، دەڵێن: ئەوە جادووەو، جادووگەرانیش سەرفراز نابن؟! ئەوانیش

گوتیان: ئایا تۆ هاتووی لەوەی کە ئێمە، باب‌و باپیرانی خۆمانمان لەسەر بینیوە، لامان بدەی‌و، گەورەیی بۆ ئێوە بێ لەسەر زەویدا؟! ئێمە بڕوا بە ئێوە ناکەین.

برگەی دووەم ، ئایەتەکانی ، (٧٩ - ٨٢)، باسی ئەوە دەکات، کە فیرعەونیش گوتی: هەرچی جادووگەری شارەزایە بۆم بێنن، ئنجا کاتێك جادوو گەرەکان هاتن، مووسا (عَلَيْهِ السَّلَام) زۆر بێ منەتانەو بێ باکانەو زۆر خۆڕا دیتووانەو پشت ئەستوورانە بە خوا، گوتی: هەرچی لە دەستتان دێ لە جادوو بیکەن، گۆچان‌و پەتەکانتان فڕێ بدەن، کاتێك کە گۆچان‌و پەتەکانیان فڕێ دان، مووسا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) پێی فەرموون، ئەوەی کردتتان هەموو جادوویە، خوا هەڵی دەوەشێنێتەوەو دەیپووکێنێتەوەو پووچەڵی دەکاتەوە، بێگومان خوا کردەوەی خراپەکاران چاك ناکات، واتە: ناهێڵێ ئەنجامی ببێ، خوا بە وشەو بڕیارەکانی خۆی حەق دەچەسپێنێ، هەرچەندە تاوانباران پێیان ناخۆش بێ.

برگەی سێیەم ، ئایەتەکانی ، (٨٣ - ٨٦)، کە باسی ئەوە دەکات ، کێ بڕوای بە مووسا هێنا ؟ دەفەرموێ ، جگە لە وەچەیەك واتە: لە هەندێك کوڕو کاڵ‌و گەنج‌و تازە پێگەیشتوو لە گەلەکەی مووسا، کەس ئیمانی پێ نەهێنا، ئەویش کاتێك کە ئیمانیان پێهێنا، زۆر ترسیان هەبوو لە فیرعەون‌و داروودەستەکەی خۆیان، واتە: داروودەستەی گەلی ئیسرائیل (کە ئەوانە بوو بوونە کرێگرتەی فیرعەون) کە هەڵیان بگێڕنەوەو سزایان بدەن‌و، فیرعەون زۆر سەرکەش بوو لە زەویداو، زۆر لە زێدەڕۆیی کاران بوو، مووساش (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) پێی گوتن: ئەی گەلەکەم ! ئەگەر بڕواتان بە خوا هێناوە، پشت بە خوا ببەستن، ئەگەر بۆ خوا ملکەچن، ئەوانیش گوتیان: ئێمە پشتمان بە پەروەردگارمان بەستوە، پەروەردگارمان ! مەمانگێڕە بە مایەی فیتنە بۆ کۆمەڵی ستەمکاران، واتە: وامان لێ مەکە بەهۆی ئێمەوە کە بەسەرمان دا زاڵ دەبن، بکەونە گومانەوە، کە ئێمە لەسەر هەق نین، یاخود: با نەبینە شوێنی ئەشکەنجەدان‌و ئازار بۆ ئەوان، واتە: با سزامان نەدەن، بە بەزەیی خۆت دەربازمان بکە لە کۆمەڵی کافران.

بڕگەی چوارەم : لە ئایەتی (٨٧)دا دەیخاتە ڕوو، دەفەرموێ: ئێمە سروشمان کرد بۆ مووساو بۆ برایەکەی، واتە بۆ هاڕوون، پێمان گوتن: کە جێگاو ڕێگای تایبەتی خۆتان هەبێ لە میسر، با خانووەکانتان بەرانبەر یەکدی بن و، نوێژ بەرپا بکەن، موژدەش بدەن بە بڕوا داران کە (إِنْ شَاءَ الله) سەرەنجامیان خێرەو، خوا دەربازیان دەکات.

بڕگەی پێنجەم : لە ئایەتەکانی (٨٨ و ٨٩)دا خراوەتە ڕوو، کە مووسا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لە پەروەردگاری دەپاڕێتەوەو دەفەرموێ: پەروەردگارم! تۆ بە فیرعەون و دارو دەستەکەی جوانیی و سەروەت و سامانی زۆری ژیانی دنیات پێداون، کە سەرەنجام خەڵك لە ڕێی تۆ گومڕا دەکەن، بۆیە پەروەردگارم! هەرچی ماڵ و سامانیانە لە بەینی بەرە، دڵیشیان گرێ بدە، با ئیمان نەهێنن، تاکو سزای بە ئێش دەچێژن، دیارە مووسا زۆریان لێ بە ڕق دا چووە، خوای باڵادەستیش وەڵامی دانەوەو فەرموی: ئەوە داوایەکەتان وەڵام درایەوە، {هی هەردووکتان} ئێوەش ڕێك بوەستن لەسەر ڕێی ڕاست، بە دوای ڕێبازی ئەوانە مەکەون کە نازانن.

بڕگەی شەشەم : لە ئایەتەکانی (٩٠و ٩١و ٩٢)دا دەفەرموێ: بەنی ئیسرائیلمان لە دەریا پەڕاندەوە، واتە: دەریای سوور، فیرعەون و سەربازەکانیشی بە دوایان کەوتن بە دەستدرێژیی و سنوور شکێنانە (یاخود زۆر بە خێرایی) هەتا کاتێك کە فیرعەون خنکانی گەیشتە سەر، (واتە: کەوتە حاڵەتی گیانەلا) گوتی: بڕوام هێناوە، کە جگە لەو پەرستراوەی بەنو ئیسرائیل ئیمانیان پێهێناوە، هیچ کەسێکی دیکە پەرستراو نیە، (واتە: هەر خوا خوایە، ئەوی دیکە هەموو کایەو بایە)، من ئێستا لە موسوڵمانانم، خوای پەروەردگاریش یاخود، (ملک الموت)یش پێی دەڵێ: ﴿ ءَآلْـَٔنَ ﴿٩١﴾ ﴾، ئا ئێستا ! کە پێشتر سەرپێچیت دەکردو، لە خراپەکاران بووی، ئێستا بڕوا دێنی؟ ئێستا بەکەڵك نایەت.

چونکە ئینسان کە دەکەوێتە گیانەلا، هەموو شتێکی بۆ ئاشکرا دەبێ. ئنجا مووسا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ئەو هەموو موعجیزانەی پێشانی

فیرعەون داون، بێگومان دڵنیا بووە کە مووسا پێغەمبەری خوایە، ئەو دەریایە شەق بێ، هەر دیارە کە خوای بە بەزەیی بۆ مووسای شەق کردوە.

پاشان هەموو کەسیش لە گیانەڵادا فریشتەکان دەبینێ، بەڵکو هەندێك لە زانایان دەڵێن: بە پێی هەندێك لە فەرمایشتەکان: هەر کەسە شوێنی خۆی دەبینێ لە بەهەشتدا، یان لە دۆزەخدا، بۆیە لەو کاتەدا ئیمان هێنان هونەر نیەو، مرۆڤ لێی وەرناگیرێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: ئێستا ئێمە جەستەکەت دەرباز دەکەین، تاکو بۆ خەڵکی دوای خۆت ببی بە پەندو نیشانە، بێگومان زۆر کەس لە ئایەتەکانی ئێمە بێئاگایە.

بڕگەی حەوتەم‌و کۆتایی: ئایەتی (٩٣)، کە دەفەرموێ: ئێمە وەچەی ئیسرائیلمان باش جێگیر کرد، واتە: لەسەر زەمینێکی باش ڕزق‌و ڕۆزییەکی خۆش‌و بە تامیان پێدان، وە ئەوان نەکەوتنە ڕاجیایی، تاکو زانیارییان بۆ هات، یانی: لەبەر ڕۆشناییەوەو بە زانیارییەوە کەوتنە ڕاجیایی، نەفس‌و ئارەزوو بەسەریاندا زاڵ بوو، بێگومان پەروەردگارت لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، دادوەرییان لە بەینیدا دەکات، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونەتە کێشەوە.

٣٥/ مەبەستی سی‌و پێنجەم: لە ئایەتەکانی (٩٤و ٩٥و ٩٦و ٩٧)دا خراوەتە ڕوو، کە خوا ﷻ ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات‌و دەفەرموێ: ئەگەر تۆ لە دوو دڵیی دای لەوەدا کە ناردوومانەتە خوار، لەوانە بپرسە کە لە پێش تۆدا کتێبیان پێدراوە، چۆن لێیان بپرسێ؟ ئەو ڕاستییانەی کە لە قورئاندا هاتوون، لە کتێبە پێشووەکانیشدا زۆریان هاتوون، بە تایبەتی ئەوەی کە پەیوەندیی بە بەسەرهاتی پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هەیە، یاخود ئەو ڕاستییانەی کە هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لەسەریان کۆك بوون، کە بنچینەو بنەمایەکانی بوونناسیی‌و ئیمان‌و عەقیدەو، عیبادەت‌و، چۆنیەتی مامەڵەکردنی خەڵك لە نێو خۆیاندا، لە هێڵە گشتییەکانی دا، کە پێغەمبەران لەسەریان کۆك بوون، لەوان بپرسە.

دوایی دەفەرموێ: بێگومان تۆ لە لایەن پەروەردگارتەوە هەقت بۆ هاتووە لە دوو دڵان مەبە، هەڵبەتە دوایی باسی دەکەین کە لێرە خوای زاناو شارەزا، وەك

گوتراوە : (دیوار بە تۆ دەڵێم، گوێسوانە گوێت لێ بێ)، واتە: لێرەدا قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوایە ﷺ، بەڵام مەبەستی خەڵکی دیکەیە، لە پشت پێغەمبەری خواوە، واتە: لە دوو دڵان مەبن‌و، لەوانە مەبن کە ئایەتەکانی خوا بە درۆ دادەنێن، ئەگەرنا لە زیانباران دەبن، زانایان گوتوویانە: خوای کاربەجێ ئاوا پێغەمبەری خۆی نادوێنی، چونکە پێغەمبەر ﷺ هیچ ئەگەری نیە ئایەتەکانی خوا بە درۆ دابنێ، دوایی دەفەرموێ: ئەوانەی بڕیاری پەروەردگاریان لەسەر هاتۆتە دی، بڕواناهێنن، کێن ئەوانەی بڕیاری پەروەردگاریان لەسەر هاتۆتە دی؟ ئینسان ئەگەر کەللەڕەقیی بکات‌و بە دوای ئارەزووی خۆی کەوتبێ، بە دوای گومان کەوتبێ، وە کەیفی بە هەق نەهات، لەبەرئەوەی ئەو هەقە پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی ئەو بوو، ئینسانی وا ؛ بە پێی یاسای خوا، ناگونجێ ئیمان بێنێ، هێندە بە خراپەکارییدا چۆتە خوار، یاسای خوای بەسەردا هاتۆتەدی، بۆیە دەفەرموێ: ئەوانە بڕوا ناهێنن، ئەگەر هەرچی نیشانە هەیە بۆیان بێ‌و هەرچی موعجیزە هەیە بۆیان بێ، تاکو ئازاری بە ئێشی خوا نەچێژن، بڕوا ناهێنن.

٣٦/ مەبەستی سی‌و شەش : لە ئایەتی (٩٨)دا خراوەتە ڕوو کە بەسەرهاتی پێغەمبەر (یونس) (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کە خوا دەفەرموێ: دەبوایە شارێك، ئاوەدانییەك ئیمان بێنێ‌و ئیمانەکەشی سوودی پێ بگەیەنێ، کە جگە لە گەلی (یونس) کەس وانەبوو، گەلی (یونس) دوای ئەوەی (یونس) (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) چوو بۆلایان‌و دوایی لێیان زویر بووە، ڕۆیشت، وەك دوایی باسی دەکەین، خەڵکەکە گەڕانەوەو پەشێمان بوونەوەو، خوای پەروەردگاریش سزای ڕیسواکەری لەسەر لابردن‌و، لە ژیانی دنیادا هێشتنیەوە، تاکو کاتێکی دیاریکراو.

٣٨/ مەبەستی سی‌و هەشتەم : لە ئایەتەکانی (٩٩و ١٠٠و ١٠١و ١٠٢و ١٠٣)دا خراوەتە ڕوو، کە دەفەرموێ: ئەگەر خوا ویستبای زۆر لە خەڵك بکات، هەرچی خەڵکی سەر زەوییە ئیمانیان دەهێنا، ئایا تۆ زۆر لە خەڵك دەکەی بڕوا بێنن، دوایی دەفەرموێ : هیچ کەسێك ناتوانێ بڕوا بێنێ، مەگەر بە مۆڵەتی خوا، خوا پیسیی، (سزای بێبڕوایی) دەخاتە سەر ئەوانەی کە نافامن‌و عەقڵی خۆیان

بەکارناهێنن، دوایی دەفەرموێ: سەرنجی ئاسمانەکانو زەوی بدەن، نیشانەکانو وریاکەرەوەکان چ سوودێك دەگەیەنن بە کەسانێك کە نایەنەوێ ئیمان بێنن!

دوایی دەفەرموێ : ئایا چاوەڕێی چی دەکەن، جگە لەوەی کە بەسەر ئەوانەی پێش واندا هاتوە ! بڵێ : چاوەڕێ بن، منیش چاوەڕێ دەکەم، ئەگەر لەسەر هەمان ڕچەی ئەوان بڕۆن، هەمان سەرەنجامی ئەوانەی پێشوویان بەسەردا دێ.

دوایی هەر لەسەر ئەو بابەتە دەدوێو دەفەرموێ : دوایی ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانو ئەوانەی کە بڕوادار بوون، دەربازیان دەکەین، کە ئەوەش هەقە لەسەرمان، (خوا لەسەر خۆی کردوە بە هەق، کە ئیمانداران لە هەموو سەردەمو ڕۆژگارێکدا دەرباز بکات).

٣٩/ مەبەستی سیو نۆیەم: کە لە ئایەتەکانی (١٠٤و ١٠٥و ١٠٦و ١٠٧)دا، هاتوە خوا عزّوجل بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەی خەڵکینە! ئەگەر ئێوە لە دوودڵیی دان لەبارەی بەرنامەی منەوە، ئەو شتانەی ئێوە دەیانپەرستن، من نایانپەرستم، من ئەو خوایە دەپەرستم کە ئێوە دەمرێنێو، من فەرمانم پێکراوە کە لە بڕواداران بم.

دوایی خوا پێی دەفەرموێ: ڕووی خۆت بەرانبەر بە ئایینی خوا ڕاست ڕاگرەوە، لە هاوبەش بۆ خوا دانەران مەبەو، جگە لە خوا لە شتانێك مەپاڕێیەوە کە نە سوودت پێ دەگەیەنن، نە زیان، ئەگەر وا بکەی بێگومان لە ستەمکارانی.

دوایی خوا دەفەرموێ: ئەگەر خوا بیەوێ زیانێکت تووش بکا، جگە لەو کەس ناتوانێ لێت لابەرێ، ئەگەر بیەوێ چاکەیەکیشت بە نیسب بکات، هیچ کەس ناتوانێ بەخششی خوا ڕەت بکاتەوە، خوا ﷻ لێبووردەی میهرەبانە.

٤٠/ مەبەستی چلەمو کۆتایی : لە ئایەتەکانی (١٠٨و ١٠٩)دا خراوەتە ڕوو، ئەوەیە کە لە کۆتایی دا خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: بڵێ: ئەی خەڵکینە! لە پەروەردگارتانەوە هەقتان بۆ هات، هەر کەسێك ڕێی ڕاستی گرت، ئەوە بۆ خۆی ڕێی ڕاستی گرتوەو سوودەکەی بۆ خۆیەتی، هەرکەسێکیش گومڕا

بوو، گومڕاییەکەی بە زیانی خۆی تەواو دەبێ، من بەسەر ئێوەوە وەکیل و چاودێر نیم (نەهێڵم گومڕا بن، من بەس گەیاندنم لەسەرە) ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ : بە دوای ئەوە بکەوە کە بۆت سروش کراوەو، خۆڕاگربە لەسەر ئەو بەرنامەیە، تاکو خوا دادوەریی دەکات، بێگومان خوا باشترین بڕیاردەرو دادوەرە.

ئەوە کۆی ئەو چل مەبەستە بوو، کە ئەم (١٠٩)ی ئایەتەی سووڕەتی یونوس گرتوویاننە خۆیان.

# دەرسی یەکەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان دە (١٠) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی (١ تا ١٠)، وە ئەم دە (١٠) ئایەتە وەك پێشەکیی وان، بۆ کۆی بابەتەکانی ئەم سووڕەتە موبارەکە، خوای کاربەجێ لەم دە(١٠) ئایەتەدا، حەوت مەبەستی گەورەو گرنگ دەخاتە ڕوو:

یەکەم: پێناسەی ئایەتەکانی قورئان دەکات.

دووەم: خوا ﷻ بە نکوولّییەوە باسی سەرسوڕمانی بێجێی کافرەکان دەکات، کە خوا وەحی بۆ پیاوێك لە خۆیان بنێرێ، ئەویش هەڵسێ بە هۆشیارکردنەوەی خەڵك بە گشتیو، موژدە پێدانی بڕواداران بە تایبەت.

سێیەم: بریتیە لە ناساندنی خوای پەروەردگار، خوا ﷻ کێیە؟ چی کردوە؟ سیفەتەکانی چیو چین؟

چوارەم: بریتیە لە سەرەنجامی گەڕانەوەی بۆ لای خواو، پاشان سزاو پاداشتی پڕ بە پێست، بۆ هەر کام لە بڕوادارانی چاکە کارو، بێبڕوایانی خراپەکار.

پێنجەم: بریتیە لە باسی خۆرو مانگو شەوو ڕۆژو جیاوازییان، کە لەوانەدا نیشانە هەن لەسەر پەروەردگارێتیی خوا، ئەو بەڵگەو نیشانانەی کە لە دروستکراوەکانی خوادا بەرجەستە دەبن، بەڵام بۆ کێ؟ بۆ کەسانێك کە ئەهلی عیلمو تەقوابن، زانابنو پارێزکار بن.

شەشەم: بریتیە لە پێناسە بێبڕوایانو سەرەنجامیان.

حەوتەم: پێناسەی بڕوادارانو سەرەنجامی چاکیان.

﴿ الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ (١) أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ
رَجُلٖ مِّنۡهُمۡ أَنۡ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنَّ لَهُمۡ قَدَمَ صِدۡقٍ عِندَ رَبِّهِمۡۗ قَالَ
ٱلۡكَٰفِرُونَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٞ مُّبِينٌ (٢) إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَۖ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ
بَعۡدِ إِذۡنِهِۦۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ (٣) إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ
جَمِيعٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقًّاۚ إِنَّهُۥ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلۡقِسۡطِۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ شَرَابٞ مِّنۡ حَمِيمٖ وَعَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا
كَانُواْ يَكۡفُرُونَ (٤) هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلشَّمۡسَ ضِيَآءٗ وَٱلۡقَمَرَ نُورٗا وَقَدَّرَهُۥ
مَنَازِلَ لِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ يُفَصِّلُ
ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ (٥) إِنَّ فِي ٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِي
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَّقُونَ (٦) إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا
وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱطۡمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ (٧) أُوْلَٰٓئِكَ
مَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ (٨) إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهۡدِيهِمۡ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمۡۖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ فِي جَنَّٰتِ
ٱلنَّعِيمِ (٩) دَعۡوَىٰهُمۡ فِيهَا سُبۡحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٞۚ وَءَاخِرُ دَعۡوَىٰهُمۡ
أَنِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ (١٠) ﴾.

# مانای وشـە بە وشـەی ئایەتەکـان

{بەنـاوی خوای بە بەزەیی‌و بەخشـندە، ئـەلیف، لام، ڕا، ئەوانـە ئایەتـەکانی کتێبێکی کارزانن ﴿١﴾ ئایا بۆ خەڵك (ی کافـر) جێی سـەرسوڕمان بوو کە وەحی بـۆ لای پیاوێك لەوان بنێرین، کە : خەڵك وریـا بکـەوەو بتــرسێنە، مـوژدەش بـدە بەوانـەی کە بڕوایـان هێنــاوە، کـە پێگــەو پاداشــتی چاکـیان لـە لایـەن پـەروەردگاریان هەیـە، بێبــڕوایەکان گوتیان: ئەمە جادووگەرێکی ئاشکرایە ﴿٢﴾ بە دڵنیایی پەروەردگارتـان ئەو خوایەیـە کـە ئاسمانەکان‌و زەوی بە شەش ڕۆژان (بـە شـەش قۆنـاغ) هێنـاونە دی، پاشان چۆتە سـەر بـارەگـا (عـەرش) هەرچی کاروبـارە بـەڕێوەی دەبـات، هـیچ تکاکـارێك ڕێـی پـێ نـادرێ تکای لـەلا بکات، بۆ هیچ کەسێك، مەگەر دوای مۆڵەت دانی، ئا ئـەو خوایەتـان بـە تـەنیا پەروەردگارتــانە، دەجــا هــەر ئــەو بپەرســتن، ئایــا (ڕاســتییەکان) وەبیــر خۆتــان نـاهێننــەوە؟ ﴿٣﴾ گێڕرانەوەی هەمووانتـان بـەس بـۆ لای ویـە، بـەڵێنی خوایـەو ڕاسـتە، ئەو (خـوا) بـوون دێنێتـە دی، ئنجا دوای کۆتـایی پـێ هاتنیشی دووبـارە دەیگێڕێتـەوە، تـاکو ئەوانەی بڕوایان هێنـاوەو کردەوە باشەکانیان کردوون، پاداشـتی دادگەرانەو پـڕ بـە پێستیان بداتەوە، ئەوانەش کە بێبـڕوا بوون، لە شلەمەنییەکی داخ خواردنەوەیان هەیـە، هەروەها ئازارێکی بە ئێش بە هۆی بێبـڕواییانەوە ﴿٤﴾ خوا ئـەو کەسـەیە کـە خـۆری تیشــکدارو مـانگی ڕوونـاك کـردوەو، مەنزڵـگایەکانی بـۆ ئەنـدازەگیریی کـردوون، تــاکو ژمارەی ساڵان‌و ژمێرەی شتـان بزانن، خوا ئەو بوونەی تەنیا بە هـەق‌و بـۆ چەسـپاندنی هەق دروست کردوەو، ئایەتەکانی بۆ کۆمەڵێك کە بزانن، ڕوون دەکاتـەوە ﴿٥﴾ بێگومـان لە جیاوازیی شەوو ڕۆژداو، لەوەدا خوا لـە ئاسمانـەکان‌و زەویـدا دروسـتی کـردوە، نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێك پارێز بکەن ﴿٦﴾ مسۆگەر ئەوانەی بە ئومێدی دیدارمان نـین‌و، ژیـانی دنیایان پەسـند کردوەو ئۆخژنیان پێی هاتوەو، ئەوانەی لـە ئایەتـەکانمان بێئاگــان ﴿٧﴾

ئا ئەوانە پەناو شوێنی حەوانەوەیان ئاگری دۆزەخە، بەهۆی ئەوەوە کە دەیانکرد ﴿٨﴾ بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، پەروەردگاریان بەهۆی ئیمانەکەیانەوە، ڕاستە ڕێیان دەکات، لە نێو چەند باغێکی پڕ نازو نیعمەتدان کە ڕووبار گەلیان بە ژێردا دەڕۆن ﴿٩﴾ پاڕانەوەیان بریتیە لەوەی ئەی خوایە! تۆ پاکیی‌و، سڵاویان لەوێ سەلامەو، دوایین پاڕانەوەیان ئەوەیە، کە ستاییش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان ﴿١٠﴾} .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(عَجَبًا): (العَجِيبُ: مَا يُتَعَجَّبُ مِنْهُ، وما لَمْ يُعْهَد مِثْلُهُ)، وشەی (عَجِيب) و (عَجَب): هەر شتێکە کە سەرسوڕمانی لە بەرانبەردا پێشان بدرێ‌و، شتێك بێ کە وێنەی ئەوە نەنبینرابێ‌و نەبیسترابێ.

(أَوۡحَيۡنَآ ): واتە: وەحییمان نارد، سروشمان کرد، نیگامان کرد، (أَصْلُ الوَحِي الإِشَارَةُ السَّرِيعَة): ئاماژەی خێرا پێی دەگوترێ: (وحي)، ڕیشەکەی لەوەوە هاتوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ١١ ﴾مریم، زەکەریا (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کاتێك کە موژدەی یەحیای پێ دەدرێ، خوای پەروەردگار سێ شەوو سێ ڕۆژ وای لێدەکات قسەی بۆ نەکرێ، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ١١ ﴾مریم، واتە: لە شوێنی خواپەرستییەکەی هاتەدەرو ئاماژەی کرد بۆ گەلەکەی بە ئاماژە پێی گوتن، کە خوا بە پاك بگرن، بەیانیان‌و ئێواران.

هەروەها لە باسی (شیاطین)یشدا خوا دەفەرموێ: ﴿ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورٗا ١١٢ ﴾الأنعام، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ ١٢١ ﴾الأنعام، کەواتە: (وحي) بە مانای ئاماژەی خێراو قسەی پەنهان دێ.

(قَدَمَ صِدْقٍ ): (قَدَم) واتە: پێ، (صِدْق) واتە: ڕاستیی، بەڵام (قَدَم) لەبەر ئەوەی هۆكاری ڕۆیشتنە، هەر شتێك، یان هەر پلەیەك كە ئینسان پێی بگات، بە (قَدَم)، تەعبیر دەكرێ، (صِدْق)یش، واتە: ڕاستیی، هەر شتێكی باش لە زمانی عەرەبییدا بە (صِدْق) ناوزەند كراوە، دەڵێ: (يُعَبِّرُ عَنْ كُلِّ فِعْلٍ فَاضِلٍ ظَاهِراً وَبَاطِناً، بِالصِّدْقِ، فَيُضَافُ إِلَيْهِ، ذَلِكَ الَّذِي يُوْصَفُ بِهِ)، (قَدَمَ صِدْقٍ، مَقْعَدَ صِدْقٍ، مَخْرَجَ صِدْقٍ، مَدْخَلَ صِدْقٍ)، ئەوانە هەموویان لە قورئاندا هاتوون، واتە: بە وشەی (قَدَمَ صِدْق)، تەعبیر دەكرێ لە كردەوەیەكی باش، كە بە ڕواڵەتو بە پەنهان باش بێ، وشەی (صِدْق)، بۆ هەر شتێكی باش بەكاردەهێنرێ، دوایی ئەو شتەی پاڵ دەدرێتەلا، كە پێی وەسف دەكرێ، (قَدَمَ صِدْق) واتە: (سابِقَةُ صِدْق) مانای پێش دەستییەكی باشیان هەیە لەلای پەروەردگاریان، (مَقْعَدَ صِدْق) واتە: شوێنێكی نیشتەجێبوونی باشیان هەیە، (مَخْرَجَ صِدْق) واتە: دەرچوونێكی باش، (مُدْخَلَ صِدْق) واتە: چوونە ژوورێكی باش، كەواتە: (قَدَمَ صِدْق) دەبێتەوە بە (سابِقَةُ فَضِيْلَةٍ) یانی: پلەیەكی باش، كە پێشكەوتوە.

(يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ): واتە: سەرپەرشتیی كاروبار دەكات، بەڵام دەڵێ: (التَدَبُّرُ: هُوَ التَفَكُّرُ فِي الأُمُورِ): بیركردنەوە لە سەرەنجامی شتەكان (تدبُّر)ی پێ دەگوترێ، وە (تدبیر) كردن ئەوەیە كە بە شێوەیەك مشووری ئەو كاروبارە بخورێ، كە كاتێك دەست بە سەرەتاكەی دەكرێ، كۆتاییەكەشی ببینرێ، دیارە ئەوەش هەر خوای پەروەردگار دەتوانێ بیكات.

(شَفِيعٍ ): واتە: تكا كار، (الشَّفَاعَةُ: الإِنْضِمَام إِلى آخَر نَاصِراً لَهُ وَسَائِلاً عَنْهُ، وَأَكْثَرُ مَا يُستَعْمَلُ فِي انْضِمَامِ مَن هُوَ أَعْلَى حُرْمَةً وَمَرْتَبَةً إِلى مَنْ هُوَ أَدْنَى)، (شَفَاعَة) بریتییە لە پاڵدانی یەكێك بۆ لای یەكێكی دی، كە هاوكاری بێو، داوای بۆ بكات، بە زۆریی بۆ ئەوە بەكاردێ كە كەسێك حورمەتی زیاترەو پلەی بەرزترە بچێتە پاڵ كەسێكی دیكەوە، بۆ ئەوەی پشتگیریی‌و داوای بۆ بكاتو تكای بۆ بكات.

(بِٱلْقِسْطِ ): (القِسْطُ: النَّصِيبُ بِالعَدْلِ، كَالنِّصْفِ وَالنَّصَفَةِ) وشەی (قِسْط)، واتە: پشكو بەشێكی دادگەرانە، وەك (نَصَفُ و نَصَفَة).

(حَمِيمٍ ): (الحَمِيمُ: المَاءُ الشَّدِيدُ الحَرَارَةِ)، ئاوێك كە زۆر زۆر گەرم بێ، ئاوی داغو كوڵیو پێی دەگوترێ: (حميم)، هەروەها هەر شلەمەنییەكی دی، (وَالحَمَّةُ: المَاءُ الحَارُّ فِي خُرُوجِهِ مِنْ مَنْبَعِهِ)، ئاوێكی زۆر گەرم كە لە سەرچاوەكەی دەردەچێت.

(ضِيَآءً ): (مَا انْتَشَرَ مِنَ الأَجْسَامِ النَيِّرَةِ) (ضياء) ئەوەیە كە لە تەنە ڕووناكەكانو تەنە تیشكدەرەكانەوە دەردەچێ، پێی دەگوترێ: (ضِيَاء)، كە دەگوترێ: (ضَاءَت النَارُ وَأَضَاءَت)، ئاگرەكە ئایساو ڕووناكیی دا، تیشكی دا، هەندێك گوتوویانە: (ضیاء) كۆی (ضَوْء)ە، واتە: تیشكەكان، ڕووناكییەكان.

(مَنَازِلَ ): (جَمْعُ مَنْزِلْ: الدَّارُ وَالمَنْهَل)، (مَنَازِل) كۆی (مَنْزِل)ە، (مَنْزِل) واتە: خانوو، بە سەرچاوەی ئاویش دەگوترێ، (وَالمُنْزَلُ: النُّزُولُ وَكَذَا المَنْزَلُ)، بەڵام (مُنْزَلُ و مَنْزَلْ)، هەردووكیان بە مانای دابەزین دێن.

(وَٱلْحِسَابَ ): (حَسَبَهُ: عَدَّهُ، حَسَبَ يَحْسُبُ حِسَابا وحُسبانا، مِثْلُ: نَصَرَ وَكَتَبَ)[1] وشەی (حَسَبَ)، واتە: ژماردی، كە (مضارع)ەكەی (يَحْسُبُ)یە، (حَسَبَ، يَحْسُبُ)، چاوگەكەی (حِساباً)و (حُسْبانا)، هەردووكیان (مَصْدَر)ن، وەك: (نَصَرَ يَنْصُرُ)و (كَتَبَ، يَكْتُبُ).

(لَا يَرْجُونَ ): واتە: بە نومێد نین، بە هیوا نین، دەڵێ: (الرَّجَاءُ: ظَنٌّ يَقْتَضي حصُولَ مَا فِيهِ مَسَرَّةٌ)، (رَجَاء): بریتیە لە گومانێك كە خوازیاری ئەوەیە، جێی دڵخۆشیی بەهۆیەوە بێتە دی.

---

١) مختار الصحاح، لفظ: ح س ب.

(لِقَآءَنَا ): (اللِّقَاءُ: مُقَابَلَةُ شيءٍ وَمُصَادَفَتهُ مَعاً) وشەی (لِقَاء): هەم بە گەیشتن بە شتێك، واتە: ڕووبەڕوونەوەی شتێك، هەم پێگەیشتنیشی دەگوترێ‌و، بە هەر کامێکیشیان دەگوترێ.

(وَٱطۡمَأَنُّواْ بِهَا ): (الطُمَأْنِينَة: السُكونُ بَعْدَ الإنْزِعَاج)، واتە: بە هۆیەوە ئۆخژنیان بۆ هاتوە، ئارام بوون، داسەکناون، دەڵێ: (طُمَأْنِينَة): بریتیە لە ئارام گرتن، دوای جووڵە جووڵ، دوای بێزاریی ئۆخۆژن ئارامیی بێ.

(مَأۡوَىٰهُمُ ): (المَأْوَى: اسْمٌ لِلْمَكَانِ الَّذِي يَأْوِي إِلَيْهِ)، (مَأْوَى): ناوی ئەو شوێنەیە کە کەسێك پەنای پێ دەبات‌و لێی دەحەوێتەوە.

( دَعۡوَىٰهُمۡ ): (دُعَاؤهُم) واتە: پاڕانەوەکەیان.

(سُبۡحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ ): (سُبْحَانَ الله: مَعْنَاهُ التَّنْزِيهُ لِله، وَهُوَ نَصْبٌ عَلَى المَصْدَرِ)، (سُبْحَانَ الله)، مانایەکەی بریتیە لە بە پاك گرتنی خوا کە ئەمە (منصوب)ەو کە دەڵێی : (سبحانَ الله) بە چاوگ لە قەڵەم دراوە، ماناکەی ئاوای لێدێ: (أُسَبِّحُ، تَسْبحاً)، یان (أُبَرِّيءُ اللهَ مِنَ السوءِ بَرَاءَةً)[1]، خوا بە دوور دەگرم، بە پاکی دەگرم لە هەر شتێك کە خراپ بێ، بە پاکگرتن.

(وَتَحِيَّتُهُمۡ ): (التَحِيَّةُ: المُلْكُ، حَيَّاكَ اللهَ : مَلَّكَكَ الله)[2]، (تَحِيَّة)، واتە: خاوەندارێتیی، کە دەڵێی: (حَيَّاكَ الله)، خوا بتکاتە خاوەندار، بەڵام ڕاغیبی ئەصفهانیی دەڵێ: (أَصْلُ التحِيّة مِنَ الحَيَاةِ: أي جَعَلَ اللهُ لَك حَيَاةً)، کەواتە: (تَحِيّة)، یانی: (حَيَّاكَ الله)، خوا بتژیەنێ، هەردووکیشیان دەگونجێ مەبەست بن.

---

[1]) مختار الصحاح.

[2]) مختار الصحاح.

(سَلَـٰمٌ): (السَّلاَمُ: الإِستسْلاَم، وَالسَّلامُ : الإِسْم مِنَ التَّسْلِيم) وشەی (سلام): هەم بە مانای ملكەچیی دێ، هەم بە مانای ئەوەش دێ كە ناو بێ، لە (تسلیم) یانی : گەردنكەچیی و ملكەچ بوون، واتە: دەگونجێ چاوگ بێ، وە دەشگونجێ ناو بێ.

## مانـای گـشـتـی ئـایەتەکـــان

پێشتـر بـاسمان کـرد : ئـەم سـوورەتە کاتێك دابـەزیوە، کـە پێغـەمبـەری خـوا ﷺ و هـاوەڵانی بـەڕێزی خـوا لـێیان ڕازی بـێ، لـە قۆنـاغێکی زۆر سـەخت دا بـوون، کـەوا پێدەچێ لە ساڵی یازدەیەمی کۆچیی دا بووبێ، دیارە پێش دابەزینی سوورەتی (یونس) قورئـانی پیـرۆز زۆر دابـەزیوە، زۆربـەی قورئـانی مەککـەیی دابـەزیوە، ئەگـەر ئـەم سـوورەتە (٥٨)یـەمین سـوورەت بـێ، مانـای وایـە (٥٧) سـوورەت، لـەپێش سـوورەتی (یـونس)دا دابەزیون، هەر بۆیەش خوا ﷻ لەم سوورەتەدا، ئاماژەیەکی کورت دەکات بـە بەسـەرهاتی (نوح)و، بەسـەرهاتی (یونس) لەگەڵ گەلەکەیان (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، وە ئەندازەیەکی بـاش دەربـارەی بەسـەرهاتی مووسـا (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و هـاڕوونی بـرای لەگـەڵ فیـرعەون و گەلەکەیانـدا بـاس دەکـات، لەبـەر ئـەوەی هـاوەڵانی بـەڕێزی پێغـەمبـەر ﷺ و، مسوڵمانـان لـەو قۆنـاغ و هـەل و مەرجـەدا، کە ئـەو سـوورەتەی تێدا بـەزیوە، زۆر پێویسـتییان بـەوە بـووە، کـە تەماشـای صـەبرو خـۆڕاگریی پیـاوانی دەوری پێغـەمبـەری پایەداری وەك (نوح) بکەن (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، هـەروەها ئـەو گەلـەش کـە ئەوان لە نێوی دا بوون، زۆر پێویستییان بەوە بووە کە چاو لە گەلـی (یـونس) بکـەن، کـە بگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا، تـاکو بـەڵایان لەسـەر لابـەرێ، هـەروەك پێغـەمبـەری خاتەمیش ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزیشی، پێویستییان بەوە بووە کە چاو لە نووح بکەن بۆ خۆڕاگریی و، چـاو لە (یونس) بکەن، لـەوەدا کە دوایی گەڕاوەتەوە نێو خەڵکەکە.

هـەروەها چـاو لـە مووسـا لەگـەڵ هـاڕوونی بـرای (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بکـەن، لەسـەر خۆڕاگـر بوون، وە مسوڵمانـان چـاو لـە بـەنی ئیسـرائیل بکـەن، کـە زۆر خۆڕاگـر بـوون و، صـەبرو تەحەممولیـان زۆر بـووە و، سـەرەنجـام خـوای پـەروەردگار دەربـازی کردوون و دەرووی لـێ کردوونەوە.

جا سـەرەتـا خـوا ﷻ ئـاوا دەسـت پێدەکات، دەفـەرموێ: بـە نـاوی خـوای بـە بـەزەیی بەخشـندە، زۆر جـاری دیکـە گوتوومانـە : (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)، واتـە: ئـەو کـارە

دەست پێ دەکەم بە نـاوی خـوای بە بـەزەیی بەخشـندە، یـان بەخشندەی میهرەبـان، واتـە:

١- ئەم کارە بۆ ئەو دەکـەم.

٢- ئەم کارە بە پشتو پەنـای ئەو دەکـەم.

٣- وە ئەم کارە بە پێی شەریعەتی ئەو دەکـەم.

دەفـەرموێ: ﴿الٓر﴾، وەك لـە پێنـاسـەی ئـەم دەرسـەدا گوتمـان: بیسـتو نـۆ (٢٩) سـوورەت بـەم پیتـە پچـڕ پچـڕانە دەسـتیان پـێ کـردوە، ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ﴾، ئـا ئـەو ئایەتـانە هـی کتێبێکـی کـارزانن، یـاخود هـی کتێبێکـی خـاوەن حیکمەتن، یان ئایەتەکانی کتێبی خوایەکی کارزانو کاربەجێن.

دوایـی دەفـەرموێ: ﴿أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ﴾، لێرەدا ئـەو هەمزەیە: ﴿أَكَانَ﴾، هـەمزەی پرسـیار کردنـی نکـوولّیی لێکـەرانەی پـێ دەگـوترێ، (همـزة الإستفهام الإنكاري) واتە: ئایا بۆ خەڵك جێی سەرسووڕمان بوو، کە سروش بکەین بۆ پیاوێـك، لـە خۆیـان، کـە خەڵـك بتـرسێنـێو وریایـان بکاتـەوەو، مـوژدەش بـدات بـە بڕواداران، کە لە لایەن پەروەردگاریانەوە پلـەیەکی بـاشو پاداشـتێکی بـەرزیان هەیـە، ئایا ئەوە هیچ جێی سەرسـووڕمانێکی تێدایە؟ واتـە: لێرەدا خـوای بـێ وێنـە نکوولّیی دەکات لە سەرسووڕمانی ئەوان، کە نە دەبوو پێیان سـەیر بێ.

پاشـان دەفـەرموێ: ﴿قَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ مُّبِينٌ﴾، (ئەوانـەی کـە سـەریان سـووڕماوە) ئـەو بێبـڕوایانە گوتوویانـە: ﴿إِنَّ هَٰذَا﴾، یـانی: (إنَّ هـذا الرّجُل)، بێگومان ئـەم پیـاوە، ﴿لَسَٰحِرٌ مُّبِينٌ﴾، جادووگەرێکی ئاشکرایە، دیارە دوایـی

باس دەكەین لە مەسەلە گرنگەكاندا، كە لە ڕاستییدا قورئـان وەك لـە جادوو دوورە، لـە هـیچ شـتێك هێنـدە دوور نیـە، لـەو ڕووەوە كـە جادوو چاو بەسـتی خەڵـكە، بـەڵام قورئان چاوی خەڵـك ڕۆشـن دەكاتـەوە، جادوو خەڵـك هەڵدەخەڵەتێنـێ، بـەڵام قورئـان هەڵخـەتێنراوان هۆشـیار دەكاتـەوەو، دەیانخـاتەوە سـەر ڕاسـتە ڕێ، جـادوو كەسـانی ڕەوشت نزمو خراپەكارو مەبەست پیس پێی هەڵدەستن، بـەڵام ئـەم قورئانـە كەسێك هێنـاویەتی، كە بـە دان پێداهێنـانی كافرەكانی ڕۆژگـاری خـۆی، بـە دەسـتپاكو ڕاسـتگۆ (الأمین والصادق)، وە بە پیاوێكی ڕەوشت بەرز وەسفو پێناسـەیان كردوە.

دوایی خـوا ﷻ دێتـە سـەر بـاسی پێنـاسـەی خـۆی، دوای ئـەوەی پێناسـەی قورئـانی كردو، پێنـاسـەی پێغـەمبـەر ﷺی كرد، كە ئەركی پێغـەمبـەری خوا ئەومیـە خەڵـك بـە گشتی بێدار بكاتەوەو بیانتـرسێنـێ، لەو سەرەنجامەی كـە چاوەڕێیانە، وە بەتـایبەتیش مـوژدە بـدات بـە بـڕواداران، بـەوە كـە پلـەو پایـەو پێگـەو پاداشـتێكی بـاشیان بـۆ پێش خراوە، لە لایـەن خـوای پەروەردگـاریانەوە، وە دوای ئـەوە بـاسـی هەڵوێـستی كافرەكانی كـرد، لـە بەرانبـەر پێغـەمبـەردا ﷺ، لـە بەرانبــەر قورئانـدا، چونكـە ئـەم وشـەیە: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ مُّبِينٌ ﴾، وێـڕای: (سـاحر)، خوێنراویشـەتەوە (سِحْر)، (إِنَّ هَٰذَا لَسِحرٌ مُّبِينٌ )، كە بەپێی ئەم خوێندنەوەیە ئاماژەیە بۆ قورئان: ئەم قورئانـە جادوویـەكی ئاشكرایە، كە هەر كام لە موحەممـەد ﷺو، قورئـان، دوورتـرین كـەسو دوورتـرین شـت بوون لە جادووەوە!!

ئەوجار دێتە سـەر بـاسی خـۆی، خـوا ﷻ، پێنـاسـەی خۆی دەكات، ئایا ئەو كەسـەی كـە وەحی نـاردوە بۆ پێغـەمبـەری خاتەم ﷺ، وە بـۆ سـەرجەم پێغـەمبـەرانی پێش خـۆی، كێیــە؟ دەفــەرموێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ ﴾، بێگومـان پەروەردگارتـان، (خـاوەنو مشـوور خۆرتـانو ئـەو كەسـەی كە بەخێوتـان دەكاتو، پەروەردەتـان دەكاتو مشوورتـان لـێ دەخوات) ئـەو خوایەیە كە ئاسمانەكانو زەوی لە شـەش ڕۆژاندا هێنـاونە دی، واتە: بە شـەش قۆنـاغ، ﴿ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ ﴾، دوایی چۆتە سەر عـەرش.

وەك پێشتر باسمان كرد، ئێستاش تەئیكید دەكەینەوەو لە مەسەلە گرنگەكانیشدا باسی دەكەین: چوونە سەر عەرشی خوای پەروەردگار، سیفەتێكی خوایە، كردەوەیەكی خوایە، كە ماناكەی بۆ ئێمە بە پێی پێژەكانی زمانی عەرەبیی، زۆر روونە، بەڵام ئایا بۆ خوای پەروەردگار ئەو چوونە سەر عەرشە، یان ئەو وەستان لەسەر عەرشە، ئەو نیشتەجێبوونە لەسەر عەرش، چۆنە؟ چۆنیەتییەكەی بەس خوا دەیزانێ.

هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: ئەم تەعبیرە تەنیا رەمزێكە، خوای بێ وێنە دەیەوێ ئێمە حاڵی بكات، كە دوای ئەوەی خوا (عزّوجل) ئەم كەون و كائینات و وجوودەی هێناوەتە دی، خستوویەتە ژێر كۆنترۆڵ و ركێفی خۆیەوە، بۆیەش دوایی دەفەرموێ: ﴿ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ ﴾، خوا سەرپەرشتیی كاروبارەكان دەكات، واتە: هەڵبەتە رای راستترو سەلامەتتر ئەوەیە كە ئێمە چۆنیەتیی چوونە سەر عەرشی خوای پەروەردگار نازانین، بەڵام خوا بەوە وەسف دەكەین، كە خۆی پێ وەسف كردوە، بەڵام هەندێك لە زانایان دەڵێن : خوا ﷻ لێرەدا دەیەوێ عەقڵی ئێمە بدوێنێ و ئێمە حاڵی بكات، كە بە پێی عەقڵی ئێمە: كاتێك حوكمڕانێك، دەسەڵاتدارێك، وڵاتێك دەخاتە ژێر ركێفی خۆی و، دەچێتە سەر تەختی حوكمڕانیی، پاشان لەسەر ئەو كورسی و تەخت و بارەگایەوە سەرپەرشتیی ئەو وڵاتە دەكات، خوای پەروەردگاریش چۆتە سەر تەختی حوكمڕانیی خۆی و، لەوێوە سەرپەرشتیی هەموو بوون و بوونەوەر دەكات.

هەڵبەتە ئەو مانایەش، لەگەڵ ئەوەی كە زۆربەی زانایان گوتوویانە: كە عەرشێك هەیە، خوای پەروەردگار چۆتە سەری، یان بەرز بۆتەوە بۆ سەری، یان لەسەری نیشتەجێ بووە، بەو شێوەیە كە بۆ خوا شایستەیە، لەگەڵ ئەوەی كە گوتمان رای بەشێك لە زانایانەو، هیچ تێكگیرانێكیان نیە، چونكە مەبەست هەر ئەوەیە كە خوا ﷻ سەرپەشتیی دروستكراوەكانی خۆی دەكات و، كاروباریان بەرێوە دەبات.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ إِذۡنِهِۦ ﴾، هیچ تكا كارێك نیە، مەگەر دوای مۆڵەتی وی، واتە: نە هیچ كەس هیچی بە دەستە، نە هیچ كەس دەتوانێ تكاش لەلای خوا بكات، مەگەر خوا مۆڵەتی بدات.

ئەوەش بەرپەرچدانەوەی بیرۆکەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، کە دەیانگوت: بتو صەنەمەکان تکاو ڕەجامان بۆ دەکەن، کە بە داخەوە ئەو بیرۆکەی شیرکە هاتۆتە نێو بەشێك لە مسوڵمانانیشەوە، کە پێیان وایە هەندێك لە پیاوچاکان، یان هەندێك لەوانەی کە ئەوان بە پیاوچاکیان دەزانن، تکایان لەلای خوا بۆ دەکەن‌و لە خوا نیزیکیان دەخەنەوە، کە لە ڕاستییدا ئەو بیرۆکەیە، بیرۆکەی موشریکەکانە، کە خوای پەروەردگار زۆر بە سەختیی بەرپەرچی داوەتەوە، بۆیە مسوڵمانان دەبێ وریا بن، گیرۆدە نەبن بەو شتانەوە کە خوای زانا ڕەخنەی پێ لە کافرو موشریکەکان گرتوون، دوایش باسێك لەبارەی شەفاعەتەوە دەکەین.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ﴾، ئا ئەو خوایەتان پەروەردگارو خاوەنتانە، هەر ئەو بپەرستن‌و بەندایەتیی هەر بۆ وی بکەن، ﴿ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾، ئایا بیر ناکەنەوە، ئایا بیر خۆتانی ناهێننەوە، چی وەبیر خۆیان بێننەوە؟ ئەوە وەبیر خۆیان بێننەوە کە لەگەڵ فیطرەتیاندا تێکهەڵ شێلراوە، لەگەڵ سروشتیاندا ئاوێتەیە، کە بریتییە لە ناسینی خواو، بریتییە لەوەی کە تەنیا خوا شایستەی بەندایەتیی بۆ کران‌و پەرسترانە.

دوایی خوا ﷻ باسی سەرەنجامی ئەو دروستکراوانە دەکات بە تایبەتی مرۆڤ و جند، دەفەرموێ: ﴿ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا ﴾، گێڕدرانەوەی هەمووتان، تێکڕاتان بۆ لای ئەوە، لە زمانی عەرەبییدا وەختێك (جارو مجرور) پێش دەخرێ، مانای کورتهەڵهێنان دەگەیەنێ، واتە: گێڕدرانەوەی تێکڕاتان، تەنیا بۆ لای خوایە، بۆ لای کەسی دیکە نیە، هەر ئەو لێتان دەپرسێتەوەو دادوەرییتان لە نێواندا دەکات، ﴿ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا ﴾، بەڵێنی خوایەو ڕاستەو بەجێیە، ﴿ إِنَّهُۥ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ﴾، بێگومان خوا دروستکراوان دروست دەکات، ﴿ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ﴾، دوای ئەوەی کە لە بەین دەچن، دووبارەش دەیانگێڕێتەوە، بۆچی؟ ﴿ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلْقِسْطِ ﴾، تاکو پاداشتی ئەوانەی بڕوایان هێناوە، بە هەموو ئەو شتانەی کە

پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ‌و، کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداون، بە دادگەرانە (واتە: پڕ بە پێست) پاداشتیان بداتەوە، یاخود بە هۆی ئەو دادگەرییەی کە لە سەری بوون، بە هۆی ئەو ڕێیە ڕاستەی کە گرتوویانە، بەو هۆیەوە خوا پاداشتیان بداتەوە، ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ شَرَابٞ مِّنۡ حَمِيمٖ وَعَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ﴾، لێرەدا خوا ﷻ کە باسی بێبڕوایان دەکات، وەك شتێکی لاوەکیی، باسیان دەکات! واتە: خوای کاربەجێ ئەم بوونەی دروست کردوە، ئنجا دوای ئەوەی کە لە بەینی دەبات، دووبارە دروستی دەکاتەوە، بۆ ئەوەی کە پاداشتی بڕوادارانی چاکەکار بداتەوە، ئەوانەش کە بێبڕوان خواردنەوەیەکی داغیان هەیەو، سزاو ئازارێکی بەئێشیان هەیە، بەهۆی ئەو بێبڕواییەوە کە ئەنجامیان دەدا، واتە: ئەوان مەبەست نەبوون، لە دروستکرانی ئەم کەون‌و کائیناتەدا، بڕواداران مەبەست بوو، بەڵام ئەوانیش کە بەو شێوەیە بوون، بە هۆی بێ بڕوایی‌و کردەوە خراپەکانیانەوە، ئەوانیش دەبێ سزایەکیان بدرێتێ.

دوایی خوا ﷻ باسی هەندێك لە دیاردە سەرنج ڕاکێشەکانی بوونەوەرمان بۆ دەکات، بە تایبەت بە نسبەت ئێمەی مرۆڤەوە لەم سەر زەوییە، دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلشَّمۡسَ ضِيَآءٗ وَٱلۡقَمَرَ نُورٗا﴾، خوا ئەو کەسەیە کە خۆری بۆ کردوون بە تیشکدەر، یانی: ڕووناکییەکی تیشکدەر، ﴿وَٱلۡقَمَرَ نُورٗا﴾، وە مانگی بۆ کردوون بە ڕووناکییەکی هێمن، ﴿وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ﴾، وە چەند مەنزڵی بۆ ئەندازەگیریی کردوون، مانگ کە دوازدە مەنزڵی هەن، هەر مانگە لە مەنزڵێکدا دەبێ، بەپێی ئەو سوورەی کە بە دەوری زەوی دا دەیکات، ﴿لِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَ﴾، خوا بۆیەش بەو شێوەیەی لێکردوە، تاکو ژمارەی ساڵەکان‌و ژمێرە بزانن، شتەکان کە دەژمێرن بە ساڵ‌و مانگ‌و شەوو ڕۆژ ﴿مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ﴾، خوا ئەوەی بە هەق نەبێ، بۆ ئامانجێکی هەق نەبێ، بۆ چەسپاندنی هەق نەبێ، نەهێناوەتە دی، ﴿يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ﴾، ئایەتەکانی خۆی ڕۆشن دەکاتەوە، بۆ کەسانێك

کە بزانن، ئەدی ئەوەی نەزان بێ؟ دیارە بابای نەزان وەك چۆن کوێر ئەگەر خۆر بە نێوەڕاستی ئاسمانەوە بێ، نایبینێ، کەسێکیش کە نەزانێ هەرچەندە خوا ئایەتەکانی جوان ڕۆشن کردوونەوەو شیکردوونەوە، بەڵام بۆ خەڵکی زانا، بۆ کەسانێك کە خاوەن عیلمو عەقڵ بن، ئەگەرنا کەسانێك کە عەقڵی خۆیان بەکارنەهێنن‌و، لە جیاتی زانیاریی، نەزانییان هەبێ‌و، لە جیاتی بیرو هۆش، نەفامییان هەبێ، دیارە سوود نابینن.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي ٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَّقُونَ ﴾، بێگومان لە جێگۆڕکێو جیاوازیی شەوو ڕۆژدا، وە لەوەدا کە خوا دروستی کردوە لە ئاسمانەکان‌و زەویدا، نیشانە هەن، بۆ کۆمەڵێك کە پارێز بکەن، بۆ کۆمەڵێك کە خۆ بپارێزن لەو شتانەی کە خوا پێی ناخۆشن، خواش بە گشتی دوو شتی پێ ناخۆشن:

١/ ئەو شتانەی پێویستی کردوون بیانچووێنی.

٢/ ئەو شتانەی کە قەدەغەی کردوون بیانشکێنی.

ئنجا کەسانێك کە پارێزکاربن‌و خۆ لە قەدەغەکراوەکان بپارێزن‌و، خۆ لە چوواندنی ئەرکەکانیش بپارێزن، ئا ئەوانە بەهرەمەند دەبن لە سەرنجدانی جێگۆڕکەی شەووڕۆژو، جیاوازیی شەوو ڕۆژو، لەو شتانەی کە خوا لە ئاسمانەکان‌و زەویدا دروست کردوون، ئەوانە لە نهێنی دروستکراوەکانی خوا تێدەگەن، چونکە وەك نیشانەکانی خوا تەماشایان دەکەن، نەك هەر سروشتێکی کەڕو کوێر بێ هەست‌و بێ ئیرادە.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باس‌و پێناسەو ناساندنی بێبڕوایەکان، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱطۡمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ٧ أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾، بێگومان ئەوانەی کە بە ئومێدی دیداری ئێمە نین‌و، بە ژیانی دنیا ڕازی بوون، ژیانی

دنیایان پەسند کردوە، دڵیان پێوە چەسپیوەو بە هۆی ژیانی دنیاوە ئارامیان گرتوە، یانی: وەك چۆن کەسێك کە تاکە ئاواتێکی هەیە بۆی دێتە دی، ئەوانیش بە ئاواتی خۆیان گەیشتوون، چونکە لە دنیا دوورتریان نەدیوەو، لە دنیا چاکتریان پێ شك نەهاتوە، بە هۆی بێ بڕواییانەوە، ئنجا ئایا ئەوانە سەرەنجامیان چۆنە؟ ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ﴾، ئا ئەوانە جێگای حەوانەوەیان ئاگرە، ئاگری دۆزەخ ﴿ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴾، بەڵام بە هۆی چییەوە، خوا بۆچی ئەوەی بۆ داناون کە تێیدا بحەوێنەوە؟ کە لە ڕاستییدا ئەگەر ئاگر دابنرێ بە شوێنی حەوانەوە، ئەوە جۆرێکە لە توانج و بە تەوسەوە خوای کارزان دەفەرموێ، یاخود خوای دادگەر دەفەرموێ: ئەگەر شوێنێك هەبێ ئەوان تێیدا بحەوێنەوەو، پشووی تێدا بدەن، تەنیا نێو ئاگری دۆزەخە، بەڵام ئایا خوا بۆچی وایان لێ دەکات؟ ﴿ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە وەدەستیان دەهێنێ، کە بە تەئکید خراپترین کەسابەتیان کردوە، خراپترین شتیان بەدەست هێناوە، کە بریتیە لە ئاگری دۆزەخ.

لە کۆتایی دا خوا ﷻ باسی بڕواداران دەکات، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمْ ﴾، بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوەی باشەکانیان ئەنجامداون، بڕوایان بە چی هێناوە؟ بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ، وە کردەوە باشەکان، واتە: هەرچی کردەوەی باشەو سیفەتی باشەو خەسڵەتی باشە، هێناویانەتە دی لە خۆیاندا، بە پێی توانای خۆیان، ئا ئەوانە خوای بەخشەر چییان بۆ دەکات؟ دەفەرموێ: ﴿ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمْ ﴾، ئا ئەوانە پەروەردگاریان بە هۆی ئیمانەکەیانەوە، دەیانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، پێشتر ئیمانیان هێناوە، ڕێیەکەیان بینیوە، خوا ڕێنمایی کردوون، بەڵام ﴿ يَهْدِيهِمْ ﴾، لێرەدا واتە: دەیانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، چونکە ئینسان لە هەموو چرکەیەکی ژیانیدا پێویستی بەوە هەیە کە لە ئامانج بداو، پێویستی بەوە هەیە کە

هەڵوێستی دروست بنوێنێ، چ لە باری دەروونییەوە، چ لە باری دەربڕینەوە، چ لە باری کردەوەی ئەندامەکانەوە، ئنجا ئەوانەی ئیمان‌و کردەوەی باشیان هەیە، خوا بە هۆی ئیمانەکەیانەوە، لە بەرەکەتی ئیمانەکەیانەوە، هەمیشە ڕێنماییان دەکاتو، لە نیشانە دەدەن، دڵیان ڕاست دەکاو، زمانیان ڕاست دەکاو، ئەندامەکانیان بەرەو هەق‌و، بەرەو فەرمانبەریی بۆ خوا، ڕێ دادەگرن‌و ملکەچ دەبن، ئنجا ئەوانە پاداشتیان چۆنە؟ دەفەرموێ: ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَـٰرُ فِي جَنَّـٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، لە نێو چەند باغێکی پڕ نازو نیعمەتدا، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، واتە: بە ژێر کۆشکەکانیاندا دەڕۆن، ئنجا ئایا ئەوان چی دەڵێن‌و چی دەکەن؟ ﴿دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَـٰنَكَ ٱللَّهُمَّ﴾، پاڕانەوەیان لە وێدا، لە بەهەشتدا، هەر ئەوەیە کە دەڵێن: ئەی خوایە! پاکیی بۆ تۆ، تۆ دووری لە هەموو هەڵەو کەم‌و کوڕیی‌و ناتەواوییەك، ئەوە بە نسبەت مامەڵەیان لەگەڵ خوادا ﴿وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَـٰمٌ﴾، سڵاوکردنیان، سڵاو لە کێ دەکەن؟ سڵاو لە یەکدی دەکەن لە بەهەشتیەکان، سڵاو لە فریشتەکان دەکەن، تەنیا بە سەلام کردن دەڵێن: (السلام علیکم) (سلام)یش واتە: ئاشتیی، واتە: خێرو خۆشیی‌و دووریی لە نارەحەتیی‌و نیگەرانیی، ﴿وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾، وە دوا پاڕانەوەشیان ئەوەیە کە: ستایش‌و مەدح‌و سەنای پەسند دەربڕین، تەنیا بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە دەفەرموێ : ﴿ الٓر تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴾، (ئەلیف، لام، ڕا) ئا ئەوانە ئایەتەکانی کتێبێکی کارزانن، وشەی (تِلْكَ)، ئاماژەیە بۆ دوور، واتە: ئا ئەم ئایەتانەی کە دەیاخوێنیەوە، ئەی پێغەمبەر! ﷺ، یان ئەی هەر کەسێك کە قورئان دەخوێنێ ! یان هەر کەسێك کە ئاشنا دەبێ بە قورئان! ئەو ئایەتانە ئایەتەکانی کتێبێکی کارزانن.

وشەی (ءَايَٰتُ ) کۆی (آیـة)ە، کە بە مانای (علامة) واتە: نیشانە، دێ، وە وشەی (آیـة) لە قورئان دا، بە سێ واتای گشتی هاتوە:

١/ بە مانای ڕستەکانی قورئانو دێڕەکانی.

٢/ بە مانای دیاردە سروشتییەکان.

٣/ بە مانای موعجیزەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).

بەڵام لێرەدا بە پێی سیاق دەزانرێ کە مەبەست لە ئایەتەکان ڕستەکانی قورئانە، واتە: ئەم ئایەتانەی کە لەبەردەستتن، چەند ئایەتێکن هی کتێبێکی حەکیمن.

ئنجا وشەی (الحكيم) ئەگەر وەسف بێ بۆ (کتاب):

١) دەگونجێ (فعیل)ی، بە مانای (فاعل) بێ، واتە: قورئان، ماناو مەبەستەکان چاكو ڕێك دەکاتو بەسەریانەوە حوکمڕانە.

٢) ئەگەر (حکیم) (فعیل)ی بە مانای (مفعول) بێ، واتە: ئایەتەکان موحکەمکراوو ڕێكو پێکن، هیچ کەمو کورییەکیان تێدا نیە.

٣) یاخود (حكیم) بە مانای (ذو الحكمة) دێ، خاوەن حیكمەت.

ئەوە هەمووی ئەگەر (حكیم) سیفەتی (كتاب) بێ.

دەشگونجێ (حكیم) سیفەتی خوا بێ، كەواتە: ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴾، یانی: (تِلْكَ آيَات كِتَابِ الله الحَكِيم)، ئاوای لێدێ، ئەمانە ئایەتەكانی كتێبی خوای كاربەجێو كارزانن.

كورتەی مانای ئەم ئایەتە موبارەكەش، واتە: ئەم كتێبە پڕە لە حیكمەت، پڕە لە دانایی، پڕە لە كارامەیی، ئەوەش كە خوا فەرموویەتی: بە ڕاستیی وایە، وەك من لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يَتَجَلّى في كتاب الله عز وجل) لە پێشەكییەكەیدا باسم كردوە.

تۆ تەماشا بكە! چ لەسەر ئاستی تاكەكان، چ لەسەر ئاستی كۆمەڵگاو میللەتتان، هەر كەسێك لە قورئان: نیزیكتر بووبێو زیاتر كارلێكی لەگەڵ قورئاندا كردبێ، زیاتر لێی بەهرەمەند بووبێ: زیاتر حیكمەتی بۆ پەیدا بووە، چونكە قورئان سیفەتەكانی خۆی نەقڵ دەكات بۆ ئەو كەسانەی كە تەفاعولی لەگەڵدا دەكەن، بۆ هەڵگرانی، هەر بۆیەش پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ :

{إِنَّ اللهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٣٢)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٣٣٦٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٨١٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢١٨)، وَأَبُو عَوَانَة برقم: (٣٧٦٢)، وَابْنُ حِبانَ برقم: (٧٧٢)}.

واتە: بێگومان خوا بەهۆی ئەم كتێبەوە كەسانێك بەرز دەكاتەوە، كەسانێكیش نزم دەكاتەوە، ئەوانە بەرز دەكاتەوە كە بە چاكیی هەڵی دەگرن، وەك دەفەرموێ: ﴿ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ ﴿١٢١﴾ ﴾البقرة، باش دەیخوێننو باش پێوەی پابەند دەبن، ئەوانەش كە پشتی تێدەكەنو دژایەتیی دەكەن، خوای دادگەر، ئەوانە نزم دەكاتەوە، لە ئەنجامی دژایەتییان بۆ قورئان دا.

**مەســـەلەی دووەم :** کـە دەفــەرموێ : ﴿ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ قَالَ ٱلْكَـٰفِرُونَ إِنَّ هَـٰذَا لَسَـٰحِرٌ مُّبِينٌ ﴾.

## حەوت هەڵوەستە لەبەردەم ئەم ئایەتە موبارەکەدا

**هەڵوەستەی یەکـــەم :** کە دەفـەرموێ: ﴿ عَجَبًا ﴾، وشەی (عَجِیب) و (عَجَب): (مَا یُتَعَجَّبُ مِنْهُ) هەر شتێکە کە سەرسوڕمانی لە بەرانبەردا دەردەبڕدرێ، لەبەر ئەوەی شتێکی نامۆیە، یان شتێکە وێنەی نەبینراوەو نەبیستراوە، دیارە هەمزەی سەر ﴿ أَكَانَ ﴾، پێی دەگوترێ: (هَمْزة الإستفهام الإنكاري) پرسیارکردنێکی نکووڵییکەرانە، واتە: من نکووڵیی دەکەم کە خەڵك پێی سەیر بێ : خوا بۆ یەکێك لە پیاوەکانیان، نیگا بکاو سروش بنێرێ.

**هەڵوەستەی دووەم :** ﴿ لِلنَّاسِ ﴾، وشەی (ناس)، لێرەدا واتە: خەڵك بەگشتی، بەڵام خەڵکێك کە دەستی هیدایەتیان نەگەیشتبێ، واتە: هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان‌و، ئەهلی کوفر بەگشتی، چونکە ئەوانە پێیان سەیرە کە خوا وەحی بنێرێ‌و سروش بکات بۆ پیاوێك لە نێو خۆیاندا، واتە: بەشەر بێ وەك خۆیان، ئەوان پێیان سەیرە ئەگەرنا بڕواداران گومانی چاکیان بەرانبەر بە خوا هەیە، بەڵکو یەقینی چاکیان هەیە کە خوا وەك چۆن گرنگیی بە گەردیلە تا کەهکەشان داوەو، حیسابی بۆ هەموو شتێك کردوەو بەرنامەی بۆ داناوەو، هیچ شتێکی ئیهمال نەکردوە، ناگونجێ مشوورێکی مرۆڤیش نەخوات‌و بەرنامەی بۆ دانەنێ، لەو بەشەیدا کە تێیدا ئازاد کراوە، ئەگەرنا مرۆڤیش لە بەشە ئیجبارییەکەیدا مەحکوومی ئەو یاسا گەردوونییانەوە کە خوا دایناون، بۆ وێنە: ئینسان ناتوانێ بە چاو نەبینێ، ناتوانێ نەخەوێ، ناتوانێ ئاو نەخواتەوە، یان خواردن نەخوات، ناتوانێ هەوا

هەڵنەمژێ، بە کورتیی : مەحکوومی یاسا گەردوونییە جەبرییەکانی خوایە.

بەڵام لەو بەشەدا کە تێیدا ئازاد کراوە، خوا هیدایەتی خۆی بۆ ناردوە بە پێغەمبەران دا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بۆ ئەوەی کە ئەو بەشە ئیختیارییەشی کە تێیدا ئازادەو تێیدا دەستکراوەیە، ڕێك بێتەوە لەگەڵ کۆڕسی بوون (وجود)دا، کە هەمووی ملکەچە بۆ خوا، مرۆڤیش لە بەشە ئازادو سەربەستەکەشیدا، خۆی لەگەڵ دەنگو سەدای ملکەچانەی بوون دا بۆ خوا، ڕێکبخات، نەك ببێتە دەنگی بۆڕو نەگونجاوو لەو کۆڕسەدا، کە هەمووی ملکەچە بۆ خوای پەروەردگار.

<u>هەڵوەستەی سێیەم</u> : کە دەفەرموێ: ﴿أَنۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ رَجُلٖ مِّنۡهُمۡ﴾، ئایا پێیان سەیر بوو کە ئێمە سروش بکەین، بۆ پیاوێك لە خۆیان؟!

(وحي) بە مانایە زاراوەییەکەی، تایبەت بووە بە پیاوانەوە، وەك دوایی باسی دەکەین، بەو واتایە کە (وحي) پەیامی تایبەتیی خوایە بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، پێغەمبەرانیش تەنیا لە نێو پیاواندا نێدراون‌و هیچ کامیان ئافرەت نەبوون، ئەوەش بە دەقی ئایەت خوای پەروەردگار لە چەند شوێنان لە قورئاندا ڕایگەیاندوە، بۆ وێنە: دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۖ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٤٣﴾النحل، واتە: لە پێش تۆدا تەنیا پیاوانمان ڕەوانە کردوون، وەحییمان بۆ ناردوون، لە شارەزایان بپرسن، ئەگەر نازانن، واتە: ئەوانەی کە شارەزای کتێبە ئاسمانییەکانن، لێیان بپرسە، کە تەنیا خوا پیاوانی کردوونە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش حیکمەتەکەی ئەوەیە کە ئەرکی پێغەمبەرایەتیی ئەرکێکی قورسە، خوای پەروەردگاریش میهرەبان‌و بە لوتف‌و بەزەییە، ئەو ئەرکە قورسەی نەخستۆتە سەرشانی ئافرەتان، لەبەر ئەوەی لە توانایاندا نیە هەڵیبگرن، بەڵێ پێغەمبەران چەندان ئەرکی قورسیان هەن کە تەنیا پیاوان ــ ئەویش کەمێکیان ـ شایستەن‌و، لە بارانیاندا هەیە کە ئەو کارانە ئەنجام بدەن.

دیارە ئێمە دواتر باسێکی تایبەت لەبارەی (وحی)یەوە دەکەین، لێرەش هەر بەکورتی دەڵێین: (الوحي لغةً: الإِعْلاَم الخَفِيُّ، والإِعْلاَمُ السَّرِيع، والإِشَارَة

السَّرِيعَة)، بـە هـەموو ئەمانـە مانـا كـراوە: ئاگاداركردنەوەیـەكی پەنهـان، یـاخود ئاگاداركردنەوەیەكی خێـرا، یاخود ئامـاژەیەكی خێـرا.

هەڵوەستەی چوارەم : ئنجا ئەو پیاوە كە نیگـای بۆ كـراوە، سروشـی بۆ كـراوە، ئایـا نێوەڕۆكی سروشو پەیامەكە چییـە؟

خـوا دەفـەرموێ : ﴿ أَنۡ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ ﴾، بـە گشـتی خەڵـك هۆشـیار بكـەوەو بترسـێنە (الإِنـذَار: إعـلامٌ أَو إخْبـارٌ مَـعَ تَخْويـفٍ، والإسـم: النُّـذُر) واتـە: (إنْـذَار) بریتیە لە ئاگاداركردنەوەیەك، یـان هـەواڵ پێـدانێك كە ترسـاندنی لەگەڵ دابێ. (إنْذَار) بۆ خۆی چاوگە، نـاوەكەی بریتیـە (نُذُر) كە دەفـەرموێ: ﴿ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ١٦ ﴾القمر، واتە: ترسانو ئاگاداركردنەوەكەی من چۆن بوو؟

ئنجا ئایا پێغـەمبـەر ﷺ خەڵك لە چی بتـرسێنـێ؟ بـە پێی سـیاق دیـارە : لـەوە كە لێیـان دەپرسـرێتەوەو سـزا هەیـەو، پاداشـت هەیـەو، دنیـا شـاری بێ خاوەن نیە، لێیان دەپرسێتەوە چۆن ژیـان؟ چیتـان كرد؟ چـۆن بەرێوەچوون؟

هەڵوەسـتەی پێنجـەم : پێغـەمبـەر ﷺ ئەركـێكی دیكەشـی پـێ سـپێردراوە، دەفەرموێ : ﴿ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنَّ لَهُمۡ قَدَمَ صِدۡقٍ عِندَ رَبِّهِمۡ ﴾، هەروەها پێشیگوتراوە: مـوژدە بـدات بەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە، كـە پاداشـتو پێگـەیەكی باشـیان بۆ پێش خراوە، لە لایـەن پەروەردگـاریانەوە.

دەڵـێ: (البِشَـارَةُ الـمُطْلَقَةُ لا تَكُونُ إلاَّ بـالخَيْر)[1]، مـوژدە كە بـە ڕەهایی دێ، حەتمـەن لە شـتی چاك دایـە.

وشـەی ﴿ قَدَمَ ﴾یش، (القَـدَمُ : وَاحِـدَةُ الأَقْـدَامِ، والقَـدَمُ أَيْضَـاً السـابِقَةُ فِـي الأَمْـرِ، يُقَـالُ: فُـلَانٌ لَـهُ قَـدَمُ صِـدْقٍ، أَي أَثَـرَةٌ حَسـنَةٌ، قَـالَ الأَخْفَشُ: هُـوَ التَّقْـدِيمُ

---

١) مختار الصحاح، ص٧٣.

كَأَنَّهُ قَدَّمَ خَيْراً وَكَانَ لَهُ فِيهِ تَقْدِيمٌ)[1]، (قدم)، تاکی (أَقْدام)ە، واتە: پێ، پێیەکان، وە (قدم) بە شتێك دەگوترێ کە پێشخرابێ، دەگوترێ: فلانکەس (لَهُ قَدَمُ صِدْقٍ)، واتە: شوێنەوارێکی باشی هەیە، پێگەیەکی باشی هەیە، ئەخفەش گوتوویەتی: (قَدَمُ صِدْقٍ: هُوَ التَّقْدِيمُ)، مانای پێشخستن دێ، چونکە چاکەی خۆی پێشخستووە، بۆتە هۆی ئەوەی کە پێش بکەوێ.

هەڵوەستەی شەشەم : کە دەفەرموێ: ﴿عِندَ رَبِّهِمۡ﴾، لەلای پەروەردگاریان، لەلای خاوەنیان، وشەی: (رَبّ) بە مانای پەروەردگارو خاوەنو سەروەر، دێ، (الرَّب فِي الأَصْلِ: التَربِيَةَ وَهوَ إِنشاءُ الشَيءِ حَالاً فحَالاً إِلى حَدِّ التَّمَام، فَالْرَبُّ مَصْدَرٌ مُستعَارٌ لِلْفَاعِلِ، وَجَمْعُهُ أَرْبَاب) واتە: وشەی (رَبّ) لە ئەسڵدا لە تەربیەوە هاتوە، ئەمیش ئەوەیە کە شتێك قۆناغ بە قۆناغ پێبگەیەنی، هەتا رادەی کامڵبوون، خواش پەروەردگاری جیهانەکانە، (واتە سەرپەرشتییان دەکاتو مشووریان دەخوات پێیان دەگەیەنێ).

وشەی (رَبّ) لە ئەسڵدا چاوگە، بەڵام خوازراوەتەوە بۆ بکەرو، کۆیەکەی (أَرْباب)ە، (رَبَّهُ، وَ رَباهُ، وَ رَبَّبَهُ)، هەرسێکیان بۆ بەکاردێن، بە مانای پەروەردەی کردو بەخێوی کردو مشووری لێ خوارد.

صەفوانی کوڕی ئومەییە لە جەنگی حونەین دا هەرچەندە خۆشحاڵ بووە کە لە سەرەتای جەنگەکەوە مسوڵمانان شکاونو، بە ئەبو سوفیانی گوتوە ناگیرسێنەوە تاکو دەریای سوور، ئنجا صەفوان کە ئەو کاتی هاوبەش بۆ خوا دانەریش بووە، گوتوویەتی: (لأَنْ يَرُبَّنِي رَجُلٌ مِنْ قُرَيْش أَحَبّ إِلَيّ مِنْ أَنْ يَرُبَّنِي رَجُلٌ مِنْ هَوَازِن)، ئەگەر پیاوێك لە قورەیش سەرپەرشتیارم بێو مشوورم لێ بخواتو سەرافەتیی کاروبارەکانم بکات، پێم باشترە لەوەی کە پیاوێك لە هۆزی هەوازن (کە لە جەنگی حونەیندا بەرەنگاری مسوڵمانان بوونەوە) ببێتە سەرپەرشتیارم.

---

١) مختار الصحاح، ص٥٦٠.

واتـە: لـە ڕووی تیـرەگەریی‌و دەمارگیـریی بـۆ هـۆزەوە (صـفوان) گوتوویـەتی: (محمـد)م ﷺ پـێ باشـترە لەبـەر ئـەوەی کـە قوڕەیشییە، لـە کەسێك لـە هـۆزی هەوازن.

(ولا يقال الرب مطلقاً إلاّ لله تَعَالى الـمُتَكَفِّل بمَصْلَحَةِ الـمَوْجُودَاتِ)، وشـەی (رب) بە ڕەهایی تـەنیا بـۆ خـوای بـەرز بەکـاردێ، کـە سەرپەرشـتی بەرژەوەنـدیی هەموو بوونەوەرەکانی دەکـات‌و، مشـووریان لـێ دەخواو بە سـەریان ڕا دەگـات.

<u>هەڵوەسـتەی حـەوتـەم</u> : ئنجـا کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿قَالَ ٱلْكَـٰفِرُونَ إِنَّ هَـٰذَا لَسَـٰحِرٌ مُّبِينٌ ﴾، بێبـڕوایەکان گوتوویانـە: ئەمـە جادووگـەرێکی ئاشـکرایە، دیـارە خوێنراویشـەتەوە: (إِنَّ هَـٰذَا لَسِـحْرٌ مُّبِينٌ )، واتـە: جادوویـەکی ئاشکرایە، ئنجا ئەگەر (سـحر) بەکاربـێ، واتـە: قوڕئانەکـەو، ئەگـەر بشڵـێن (سـاحر)، واتـە: پێغـەمبـەر ﷺ.

ئنجـا ئایـا (سِـحْر) لە چییەوە هـاتوە؟

دەڵـێ: (السَّحْرُ : طَرَفُ الحُلْقُومِ، وَالرِّئَة، وَقِيْل انْتَفَخَ سَحْرُهُ، وَقِيلَ مِنْـهُ اشـتقَّ السِّحْرُ، وَهُوَ إِصَابَةُ السَّحْرِ).

(سَحْر) بـە قـوڕگ دەگـوترێ، یـاخود بـە لای قـوڕگ دەگـوترێ، یـانی بـە سـیی (رئـة)دەگـوترێ، بۆیە کەسێك بە کەسێك دەڵـێ: (انْتَفَخَ سَحْرُهُ)، واتـە: سـیپەلاکی ئاوساوە، یانی: ترسنۆك، ئنجـا (سِحْر)یش، لەبەر ئەوەی شتێکی پەنهانە، لەوێوە هــاتوە، واتـە: ئــەو جـادووە کاریگـەریی کردۆتـە سـەر سـیپەلاکی‌و، نەخۆشـی کردوەو وەزعـی تێکـداوە.

وشـەی (مُّبِينٌ )، لێرەدا لە (أبانَ، يُبِين)ەوە هـاتوە، کە (لازم)ە، چونکە (أبـان) دوو حـاڵـەتی هـەن :

١/ (أبـانَ، يُـبين)، واتـە: ڕوونـی کـردەوە، ڕوونـی دەکاتـەوە، ئـەوە (متعـدِّي)یـەو پێویسـتی بە (مفعول) دەکـات.

٢/ بـەڵام (أبـان) دەگونجـێ (لازم)بـێ، واتـە: پێویسـتی بـە (مفعـول بـە) نەکـات، (أَبـان يُـبين) ئـەو شـتە ڕوون بـوو، ڕوون دەبێتـەوە (فهـو مـبين)، ئنجـا وشـەی (مُبين) ئەگـەر لە (أبـانَ، يُـبين)ی (لازم)، بێ، واتە: ڕوونو ئاشکرا، بەڵام ئەگەر لـە (أبـانَ، يُـبين)ی (متعـدِّي) بـێ، ئـەو کـاتە (مُـبين) دەبێتــە ڕوونکــەرەوە، هەڵبەتـە لێـرەدا نـاگونجـێ بڵـێین: ڕوونکــەرەوە، چونکە ئـەوەی مەبەسـتیان بـووە، ئەوەیــە کــە (محمــد) جـادووگەرێکــی ئاشـکرایە، یـاخود قورئـــان جادوویـەکی ئاشکرایە، مەبەسـتیان ئـەوە نـەبووە کە (محمـد) جـادووگـەرێکی ئاشـکراکەر، یان (قورئـان) جـادوویەکی ئاشـکراکـەرە.

ئێمـە لـە بـەرگی یەکـەمی ئـەم تەفسیـرەدا، واتـە: لـە تەفسیـری سـوورەتی (البقـرة)و تـەفسیـری ئایەتی ژمارە (١٠٢)دا، بە درێـژیی بـاسـی جادوومـان کـردوە، بۆیـە لێرە بـاسی نـاکـەین.

# کورتە باسێک لەبارەی (وحی)یەوە

ئەم کورتە باسە ڕاستەوخۆ لە مەوسووعەی (الإِسْلاَمُ كَمَا يَتَجَلَّى فِي كِتَابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ)، وەردەگرم، لە چاپی یەکەمی لە بەرگی چوارەم، لە لاپەڕە (١٤٨ تا ١٧٢)، هەڵبەتە لە کتێبەکەدا فراوانتر باسم کردوە، لەوێدا لە چوار (مطلب)دا هێناومە، بەڵام لێرەدا جێی مەست لەم سێ بڕگەیەدا دێنین، دیارە ئەویش بە کورتکردنەوەو پوخت کردنەوەوە:

**بڕگەی یەکەم** : پێناسەی وەحی.

**بڕگەی دووەم** : ڕێیەکانی هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).

**بڕگەی سێیەم** : چۆنیەتی دابەزینی وەحی بۆ سەر پێغەمبەری کۆتایی ﷺ، نێردراوی هەرە مەزنی خوا موحەممەد ﷺ.

**بڕگەی یەکەم: پێناسەی وەحی :**

سەرەتا بە چاکی دەزانم پێشێ، سەرنجی چەند ئایەتێکی قورئانی بەپێز بدەین، کە لە ژێر ڕۆشنایی ئەو ئایەتە بە پێزانەدا، بۆمان دەردەکەوێ : وشەی (وحي) لە قورئاندا بۆ چ واتایەك بەکارهێنراوە :

١ - لە سوورەتی (النحل)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾، واتە: پەروەردگارت وەحی کرد بۆ هەنگ: کە لە چیاکان خانوو دروست بکە، هەروەها لە درەختەکانو، لەو کەپرو ساباتەی (کە مرۆڤەکان) دروستی دەکەن.

٢ - له سـووڕەتی (القصص)دا خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ ﴾، واتـه: وه ئێمـه سروشـمان كـرد بـۆ دایكی مووسا كه شیـری پێبده! هەر كاتێك لێی ترسای، فڕێی بده نێو ڕووبارەوه، وه مەترسێو خەفەتباریش مەبه، ئێمه به سەلامەتیی بۆ لای تۆ دەیگێڕینەوه، له داهاتووشدا، دەیكەین به یەكێك له ڕەوانه كراوان، (یەكێك له پێغەمبەرەكان).

٣ - لـه سـووڕەتی (مـریم)دا خـوا ﷻ دەربـارەی زەكـەریـیا دوای ئـەوەی خـوا مـوژدەی یەحیای پێ دەدات، كه كوڕێكیان دەبێ به نـاوی یەحیـا، دەفـەرموێ: ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ ٱلْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿١١﴾ ﴾ واتـــــه: زەكـەریـیـا له میحرابەكـەوه دەرچوو بەرەو ڕووی خەڵكەكەیو، وەحـی بـۆ كـردن، (كه وەحی لێرەدا واته: ئاماژەی بۆ كردن)، كه بەیانیانو ئێواران (پەروەردگـارتـان) به پـاك بگـرن.

٤ - لـه سـووڕەتی (الأنعـام)یش دا خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿ شَيَـٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ... ﴿١١٢﴾ ﴾، واتـه: شەیتـانەكانی مرۆڤ و جند، هەندێكیان قسەی ڕازاوەو فریودەر فێری یەكدی دەكـەن.

دیـاره ئێمـه دوایـی بـاس دەكـەین، كـه ئـەم چـوار ئایەتـه موبـاڕەكه، وشـەی (وحي)یان تێدا بەكارهاتوه، به مانـای گشتییەكەی، كه بریتیه لـه ئاڕاسـتەكردنو فێركردنـی بـه پـەنهان، یـاخود خێـرا، یـاخود بـه ئامـاژه، جـا چ لەلایـەن خـوای پـەروەردگارەوه بـێ، بـۆ زینـدەوەرێكی وەك هـەنگ، وه چ لەلایـەن خـوای پەروەردگارەوه بۆ غەیری پێغەمبەران وەك دایكی مووسا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، وه چ بـه ئامـاژەی دەسـت بـێ، كـه زەكەریـیا بـه ئامـاژەی دەسـت ئامـاژەی بـۆ خەڵكەكـه كـرد، كـه خـوا بـه پـاك بگـرن، وه چ لەلایـەن شـەیتانەكانی مرۆڤـ و جندەوه با بۆ یەكدی، كه مەبەست پێی: خوتخوته (وسوسة)ی جنده بۆ مرۆڤ.

٥ - وە لە سوورەتی (الأنفال)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ ﴿١٢﴾﴾، واتە: یاد بکەوە کاتێک پەروەردگارت سروشی دەکرد بۆ فریشتەکان، کە من لەگەڵتانم، دە جا ئێوە بڕواداران پێ چەسپاو بکەن، لەمەودا ترس و بیم دەخەمە دڵی ئەوانەی بێبڕوان.

لێرەشدا وشەی (وحي) بەکارهاتوە، بۆ ناردنی پەیام و ئاڕاستەی خوای پەروەردگار بۆ فریشتەکان.

٦ - وە لە سوورەتی (الشورى)دا خوای ﷻ دەفەرموێ: ﴿ كَذَلِكَ يُوحِي إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ اللَّهُ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٣﴾﴾، واتە: ئاوا بەو شێوەیە خوای زاڵی کاربەجێ وەحی بۆ لای تۆو ئەوانەی پێش تۆش دەنێرێ.

٧ - وە لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِنْ بَعْدِهِ ﴿١٦٣﴾﴾، واتە: ئێمە وەحییمان بۆ لای تۆ نارد، سروشمان بۆ تۆ کرد، وەک چۆن سروشمان بۆ نووح و پێغەمبەرانی دوای ویش، کرد.

٨ - وە لە سوورەتی (النحل)دا خوا دەفەرموێ : ﴿ يُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ بِالرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ عَلَى مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ أَنْ أَنْذِرُوا أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاتَّقُونِ ﴿٢﴾﴾، واتە: خوا فریشتەکان بە ڕووح لە فەرمانی خۆیەوە (یانی وەحی) دادەبەزێنێ، بۆ سەر هەر کام لە بەندەکانی کە بیەوێ، نێوەڕۆکی وەحییەکەش بریتیە لەوە کە خەڵک وریا بکەنەوە (بترسێنن) کە بێجگە لە من هیچ پەرستراو نین، پارێزی لێ بکەن، (لەوەی کە هاوبەشی بۆ دابنێن).

ئنجا لەبەر ڕۆشنایی ئەم هەشت دەقەی قورئاندا (ئەم هەشت ئایەتە)دا ئەگەر سەرنجیان بدەین، بۆمان دەردەکەوێ، کە وشەی (وحي) بە سێ واتای سەرەکیی لە قورئاندا هاتوە:

یەك: واتایەکی گشتی کە بریتیە لە ئاڕاستەکردنو فێرکردنو خەم لێخواردنێکی خێرا، یاخود بە پەنهان، یاخود بە ئاماژە.

دوو: واتایەکی تایبەت، کە بریتیە لە ئاڕاستەکردنی خواو، فێرکردنی بۆ فریشتەکانو، بۆ بەندە چاکەکان، لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و غەیری پێغەمبەرانیش، بۆ وێنە: دایکی مووساو مریم (خوا لێیان ڕازی بێ).

سێ: واتایەکی تایبەتتر، کە بریتیە لە فێرکردنی خوا ﷻو، فەرمایشتکردنی لەگەڵ پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) چ ڕاستەوخۆ، چ لە پشت پەردەوە، چ لە ڕێی فریشتەکانەوە، کە جوبریل (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) سەرپەرشتییان دەکات.

کەواتە : وەحی بەو سێ واتایە بەکارهاتوە لە قورئاندا، بەلام ئەوەی کە زیاتر وەك مانایەکی زاراوەیی زانایان لەسەری ڕێککەوتوون، کە هەرکات وشەی (وحي) بەکارهێنرا، خەڵك ئەو چەمکەی دێتە زەینەوە، کە بریتیە لەو پەیامە تایبەتەی کە خوا بۆ پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دەنێرێ، چ لە پشت پەردەوە، وەك خوا قسەی لەگەڵ مووسادا کردو، قسەی لەگەڵ موحەممەددا ﷺ کرد، لە شەوی (الإسراء والمعراج)دا، چ لە ڕێی جبریلەوە، کە دواتر باس دەکەین، ڕێیەکانی دابەزینی وەحی چەندنو چۆنن؟

**برگەی دووەم : ڕێیەکانی هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).**

خوا ﷻ دەربارەی چۆنیەتی ناردنی سروشو نیگای خۆی، بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لە ئایەتی ژمارە (٥١)ی سوورەتی (الشورى)دا دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾، واتە: وە هیچ مرۆڤێك بۆی

نیە خوا بیدوێنێ، مەگەر سروشی بۆ بکات، یاخود لە پشت پەردەوە بیدوێنێ، یاخود نوێنەرێک بنێرێ {کە مەبەست پێی فریشتەیە (جبریل)} ئەویش بە مۆڵەتی خوا ئەوەی کە خوا دەیەوێ، پێی ڕادەگەیەنێ، بێگومان خوا بەرزی کارزانە.

وەك دەبینین خوا ﷻ ڕێیەکانی ناردنی سروش‌و وەحی خۆی بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) لە سێ ڕێگادا کورت هەڵدێنێ:

**یەکەم** : (الإيحاء)، سروش کردن: ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحۡيًا ﴿٥١﴾﴾الشورى، کە مەبەست پێی خستنە دڵ‌و فێرکردنی تایبەتی خوایە.

**دووەم** : (الكَلاَم مِنْ وَرَاء الحِجَاب) دواندن لە پشت پەردەوە: ﴿أَوۡ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ ﴿٥١﴾﴾، وەك چۆن خوا مووسای (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم)ی دواندو، موحەممەدیشی ﷺ دواند لە شوێنی(إسراء ومعراج)دا.

**سێیەم** : (إرْسالُ المَلَك فَيُوحِي إلى المُرْسَل إليه ما أُمِرَ به)، ناردنی فریشتە کە ئەوەی فەرمانی پێکراوە، دەیگەیەنێ بۆ لای ئەو کەسەی کە بۆ لای ڕەوانە کراوە: ﴿أَوۡ يُرۡسِلَ رَسُولٗا فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُ ﴿٥١﴾﴾الشورى.

ئنجا لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ ﴿٥١﴾﴾الشورى، نەیفەرمووە: (وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ)، بۆچی؟ چونکە چەمکی ئایەتەکە فراوانترە لە ناردنی وەحی بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم)و فەرمایشت کردنی لەگەڵیاندا، بەڵێ، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) بە مانای تایبەتتری وەحی‌و مانا زاراوەییەکەی، ئەوە خوا تایبەتی کردوە بە پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم)، بەڵام وشەی (وحي) بۆ غەیری پێغەمبەرانیش بەکارهاتوە، وەك: بەندە صالحەکان، بەڵکو دروست کراوەکانی دیکەش، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار باسی هەنگی کردوە، فەرموویەتی:

﴿وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ ﴿٦٨﴾﴾النحل.

وە لـە سـوورەتی (الزلـزال)دا، بـاسکراوە کـە خـوا وەحـی دەنێـرێ بـۆ زەوی، دەفـــەرموێ: ﴿ إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ۝١ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ۝٢ وَقَالَ ٱلْإِنسَـٰنُ مَا لَهَا ۝٣ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ۝٤ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ۝٥ ﴾ الزلزلة، واتە: ..... زەوی ئەو ڕۆژە هەواڵو دەنگو بـاسی خۆی دەخوێنێتـەوە، دەڵێ: پەروەردگاری تۆ ئەی مرۆڤـ! پێی ڕاگەیاندووم، سروشی بۆ کردووم کە بەو شێوەیە بکەم. کەواتە: بۆیە خوای زانـا وشەی (بشـر)ی بەکارهێنـاوە، چونکە بە گشتی خوا، ئیلهامی دڵی دۆسـتـانی خـۆی دەکـات، لـە ڕێـی فریشـتـەکانەوە، یـاخود ڕاسـتـەوخۆ، بەو شێوەیەی خوا بۆ خۆی دەزانێ، وەك پێغـەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: {لَقَـدْ كَانَ فِيمَا قَبْلَكُمْ مِنَ الأُمَمِ مُحَدَّثُونَ، فَإِنْ كَان فِي أُمَّتِي أَحَـدٌ فَإِنَّهُ عُمَرُ} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٤٣٣٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣٩٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٦٩٣)، وَالنَّسـائِي فِي "الكبرى" برقم: (٨١١٩)، قَالَ ابن وهب: (مُحَدَّثُون) أيْ مُلْهَمُـونَ}، واتـە: لـە ئۆممەتـانی پێش ئێوە دا کەسانێك هـەبوون کە ئیلهـامیان بۆ کـراوە، خورپەیـان بۆ کـراوە (واتـە: شتیان خراوەتە نێـو دڵ لەلایەن خوای پەروەردگـارەوە) ئەگەر کەسێك هەبێ لە ئۆممەتی من، ئەوە عومـەرە (خـوا لـێی ڕازی بـێ).

کە چەندان جار پێشـنیاری کردوە بـۆ پێغـەمبـەری خـوا ﷺ، دوایـیش وەحـی هـاتۆتـە خوار پێشـنیارەکەی بە ڕاست دانـاوە.

ئنجـا بـا تۆزێك ئەو سـێ ڕێیـە شـی بکـەینەوە:

یەکـــەم: کـە خـــوا دەفــــەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا ۝٥١ ﴾، وەحی قسەی پەنهانو، قسەی خێراو، ئاماژە پێکردنو، ئاڕاسـتـەکـردن، هـەمووی دەگرێتـەوە، بـەڵام ئایـا لێـرەدا مەبەسـت پێـی چیو چییە؟ وا دێتـە بەرچـاو، مەبەستی پێی دوو شت بێ:

یـــەك: خستنە دڵ لە حاڵـەتی بێدارییـدا (الإِلْـهَامُ فِي اليَقْظَـة).

دوو: خـەو بینیـن لـە حاڵـەتی خەوتنـدا (الرُّؤْيَـا فِي المَنَـام).

دیاره هەرکام لە خرانە دڵی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) (خوا شتێکی خستبنە دڵ) یان خەون بینیان، بە وەحی دادەنرێ، زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن.

دیاره پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لەوە پارێزراو بوون کە شەیطانەکان زەفەریان پێ ببەن‌و خورپەو خەیاڵی خراپیان بخەنە دڵ، ئەگەر گریمان شەیطان خوتخوتەیەکیشی بۆ کردبن، دڵیان هێندە پڕ لە ئیمان‌و، پڕ مەعریفەت‌و زانست بووەو، هێندە بە خواوە پەیوەست بوون، یەکسەر زانیویانە، کامە وەسوەسەی شەیطانەو، کامە خورپەو ئیلهامی خوای پەروەردگارە.

**دووەم:** فەرمایشت کردنی خوا لەگەڵ پێغەمبەران دا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لە پشت پەردەوە: ﴿ أَوْ مِن وَرَآيِ حِجَابٍ ﴿٥١﴾ ﴾، مەبەست ئەوەیە کە خوای بەرزو مەزن یەکێك لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ڕاستەوخۆ بدوێنێ، بە بێ هۆکارێك لە بەیندا، بەڵام لە پشت پەردەوەو بێ ئەوەی ئەوان خوای بەرزو مەزن ببینن، کە ئەوەش بۆ مووسا هەبووە، خوا ﷻ لە سوورەتی (النساء)، ئایەتی (١٦٤)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ ﴾، باسی ژمارەیەك لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دەکات، نووح‌و ئەوانەی دوا وی، دوایی دەفەرموێ: پێغەمبەرانێکی دیکە هەن (جگە لەوانەی لێرە باسکراون) بەسەرهاتەکانمان بەسەر تۆدا خوێندووتەوەو، هەندێك پێغەمبەرانی دیکەش هەن بەسەرهاتەکانمان بەسەر تۆدا نەخوێندووتەوە، وە خوا بە قسەکردن فەرمایشتی کرد لەگەڵ مووسا.

هەروەها لە سوورەتی (الأعراف)دا خوای پەروەردگار لەوبارەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِى وَلَٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ

تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٤٣ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ١٤٤﴾، خوا عزَّوجلَّ باس دەكا كە كاتێك مووسا (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) چووە بۆ ئەو ژوانگەیەی ﷻ خوای پەروەردگاری بۆی دیاریی کردوە، فەرمایشت لەگەڵ خوادا دەکا، دوایی وەتەماع دەکەوێ و دەڵێ: پەروەردگارم! خۆتم پیشان بدە با تەماشات بکەم، خوای بێ هاوتاش دەفەرموێ: نامبینی، وەك بە تەفصیلێ لە تەفسیری سوورەتی (الأنعام)دا دەربارەی ئەم ئایەتەو، ئایەتی (١٠٣)دا کە دەفەرموێ: ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَ ١٠٣﴾، باسێکی خەستو خۆڵم لەوبارەوە کردوە، پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە.

کەواتە: خوا ﷻ لە پشت پەردەوە قسەی لەگەڵ مووسادا (عَلَيْهِ السَّلاَم)دا کردوە.

یەکێکی دیکە لە پێغەمبەران کە خوا لە پشت پەردەوە قسەی لەگەڵدا کردوە، کە تەنیا ئەوم پێ شك دێ، وێڕای پێغەمبەر مووسا، پێغەمبەری خاتەم موحەممەدە ﷺ، وەك لە صەحیحی بوخارییدا بە ژمارە (٣٢٠٧)و، لە صەحیحی موسلیم دا بە ژمارە (٣٢٥٩) هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ باسی ئەو سەفەری شەوڕۆو بەرز بوونەوە (الإسراء والمِعْراج)ی خۆی دەکات، دوایی لە کۆتاییەکەیدا دەفەرموێ:

{... فَأَوْحَى اللهُ عَزَّ وَجَلَّ إِلَيَّ مَا أَوْحَى، وَفَرَضَ عَلَيَّ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ خَمْسِينَ صَلاةً، فَنَزَلْتُ حَتَّى انْتَهَيْتُ إِلَى مُوسَى، فَقَالَ: مَا فَرَضَ رَبُّكَ عَلَى أُمَّتِكَ؟ قَالَ: قُلْتُ خَمْسِينَ صَلاةً فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ قَالَ: ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ

فَاسأَلْهُ التَّخْفِيفَ، فَإِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ ذَلِكَ، وَإِنِّي قَدْ بَلَوْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَخَبَرْتُهُمْ، قَالَ: فَرَجَعْتُ إِلَى رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ فَقُلْتُ: أَيْ رَبِّ خَفِّفْ عَنْ أُمَّتِي فَحَطَّ عَنِّي خَمْسًا، فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى، فَقَالَ: مَا فَعَلْتَ؟ قُلْتُ حَطَّ عَنِّي خَمْسًا، قَالَ: إِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ ذَلِكَ، فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسأَلْهُ التَّخْفِيفَ لِأُمَّتِكَ، قَالَ: فَلَمْ أَزَلْ أَرْجِعُ بَيْنَ رَبِّي وَبَيْنَ مُوسَى، وَيَحُطُّ عَنِّي خَمْسًا خَمْسًا، حَتَّى قَالَ: يَا مُحَمَّدُ! هِيَ خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، بِكُلِّ صَلَاةٍ عَشْرٌ، فَتِلْكَ خَمْسُونَ صَلَاةً﴾.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتایی باسی ئەو سەفەرە موبارەکە سەرسوڕهێنەرەی خۆی دا، کە بە (الإسراء والمعراج)، ناسراوە، واتە: شەوڕۆیی و بەرزبوونەوە، گوتراوە شەوڕۆیی (الإسراء) چونکە سەفەرەکە بە شەوێ بووە، وە گوتراوە: بەرز بوونەوە (المعراج)، چونکە بەرزبوونەوە بەرەو ئاسمانەکان و سەرووتریش هەبووە، ئنجا هەرچی شەوڕۆییەکەیە لە سەرەتای سووڕەتی (الإسراء)دا، ئامـاژەی پێکراوە: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾﴾، واتە: پاکیی بۆ ئەو کەسەی کە شەوڕۆیی (سەفەری شەوی) بە بەندەکەی کرد، لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ مزگەوتی ئەقصا،(واتە: مزگەوتی دوورتر بەنسبەت عەرەبەکانەوە، یان بەنسبەت خەڵکی مەککەو مەدینەوە) ئەو شوێنەی کە بەرەکەت و پێزمان تێدا دانا (واتە: زەوییەکی بە پێزو بەرەکەتە)، بۆ ئەوەی لە نیشانەکانی خۆمانی پێشان بدەین. واتە: تەنیا ئەوە نەبووە کە سەفەرەکە بەس بۆ ئەوێ بێ، بەڵکو بەرزیش بۆتەوە، وەك لە فەرمایشتەکاندا هاتووە، لە سەرەتای سووڕەتی (النجم)یشدا، زۆر بە ڕوونیی خوای پەروەردگار ئاماژەی پێداوە، وەك فەرموویەتی: ﴿وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴿٥﴾ ذُو

مِرَّةٖ فَٱسۡتَوَىٰ ۝٦ وَهُوَ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ۝٧ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ۝٨ فَكَانَ قَابَ قَوۡسَيۡنِ
أَوۡ أَدۡنَىٰ ۝٩ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَىٰ عَبۡدِهِۦ مَآ أَوۡحَىٰ ۝١٠ مَا كَذَبَ ٱلۡفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ۝١١
أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ۝١٢ وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ ۝١٣ عِندَ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ ۝١٤
عِندَهَا جَنَّةُ ٱلۡمَأۡوَىٰٓ ۝١٥ إِذۡ يَغۡشَى ٱلسِّدۡرَةَ مَا يَغۡشَىٰ ۝١٦ مَا زَاغَ ٱلۡبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ
۝١٧ لَقَدۡ رَأَىٰ مِنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ ۝١٨ ﴾. النجم.

**کە دوایی ئـەو هـەژدە ئایـەتە تەرجەمـە دەکـەین.**

**ئێستـاش بـابگەڕێینەوە سـەر مانـاکردنی فەرمایشـتەکەی پێغـەمبـەری خـوا ﷺ، کە تێیدا بـاسی قسـەکردنی خۆی لەخزمـەت خـوادا دەکـات: دەفـەرموێ: خوا ئەوەی کە دەیویست سروشی بۆ کردم وەحی بۆ نـاردم، وە لـە هـەر شـەوو ڕۆژێکدا پەنجـا نوێژی لەسـەر پێویست کردم، منـیش دابـەزیم هەتـا گەیشـتمە مووسـا، (مووسـا لـە ئاسـمانی شەشـەم بـووە)، لێـی پرسـیم: پـەروەردگارت چی لەســەر ئۆممەتەکـەت پێویسـت کـرد؟ گوتـم: پەنجـا نوێـژ لـە شـەوو ڕۆژێکدا، گـوتی: بگـەڕێوە بـۆ لای پەروەردگـارت، داوای سووکــکردنی لـێبکە، چـونکە ئۆممەتەکەت ئەوەندەی لە توانـادا نیـە! من لەگـەڵ بـەنی ئیسرائیلـدا ئـەزموونم هەیــەو شــارەزایانم، دەفــەرموێ: گەڕامــەوە بــۆ لای پــەروەردگارم، گــوتم: پەروەردگــارم! لەســـەر ئۆممەتەکــەم ســووک بکــە؟ ئــەویش پێــنج نوێــژی دابەزانـدن، (واتـە: مانـەوە چلو پێـنج نوێـژ) گەڕامـەوە بۆ لای مووسـا، گوتی: چیــت کــرد؟ گوتــم: پێــنج نوێــژی کــەم کردنــەوە، ســووک کــردن، گــوتی: ئۆممەتەکـەت ئەوەنـدە نـاتوانـێ بگـەڕێوە بـۆ لای پەروەردگـارت، داوای سـووک کردنـی لـێبکـە؟ دەفـەرموێ: ئیـدی بـەو شـێوەیە مـن لـە نێوان پەروەردگـارمو مووسادا (عَلَيْهِ السَّلَام) دەهاتمو دەچووم، پێـنج پێـنج خوا نوێـژەکانی سـووک دەکـردن، هەتـا مانـەوە پێـنج، خـوا ﷻ فـەرمووی: ئـەی موحەممـەد! ئەوانـە لـە شـەوو ڕۆژێکـدا پێنج نوێـژن، وە هەر نوێـژێك بـە دەیـە {واتـە: (٥ × ١٠) = (٥٠)، واتە: پاداشـتی پەنجـا (٥٠) نوێژیـان بۆ هەیە}.**

هەڵبەتە خوای پەروەردگار هەر ﷻ سەرەتاوە پێنج نوێژی داناوە، بەڵام کە پێشتر باسی پەنجا نوێژ (٥٠) کراوە، بۆ ئەوە بووە کە :

١/ مەکانەت و رێزی مووسا دەرکەوێ ﷺ کە پێغەمبەری خاتەم راوێژی پێدەکا، لەبەر ئەوەی مووسا ئەزموونێکی هەبووە، ئەزموونی حوکمڕانیی و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا، کە جارێ پێغەمبەری خاتەم، کە لە قۆناغی مەککە دابوو، ئەو ئەزموونەی نەبووە.

٢/ بۆ ئەوەش کە رێزو مەکانەتی پێغەمبەری خاتەمیش دەربکەوێ، کە ئەو پێغەمبەرە هێندە لەلای خوا بەرێزو حورمەتە، کە داوای لە خوای پەروەردگار کردووەو، ئەو ئەرکەی لەسەر ئۆممەتەکەی سووک کردوە.

<u>سێیەم</u>/ ناردنی فریشتەو گەیاندنی پەیامی خوا بەو کەسەی بۆ لای نێردراوە: وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَوۡ يُرۡسِلَ رَسُولٗا فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٞ ٥١﴾الشورى، کە ئایەتەکە زۆر بە روونیی باسی دەکات، دیارە ئەم رێبازی سێیەم، بڵاوترین رێبازە لە شێوازی وەحی ناردنی خوای کارزان بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) وەك لە قورئان و سوننەتدا دیارە.

<u>برگەی سێیەم و کۆتایی : چۆنیەتی دابەزینی وەحی بۆ سەر پێغەمبەری کۆتایی ﷺ و، نێردراوی هەرە مەزنی خوا موحەممەد ﷺ:</u>

ئەم باسە لە سێ خاڵ دا بە کورتیی دەخەمە روو:

<u>خاڵی یەکەم: (جبریل) ئەو فریشتەیە بووە کە وەحی لە خوای بەرزەوە هێناوە بۆ موحەممەد ﷺ، وەك سەرجەم پێغەمبەرانی دیکە:</u>

هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) خوای بەرزو مەزن بە جبریلدا پەیام و وەحی بۆ ناردوون، خوا ﷻ لەوبارەوە لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿قُلۡ مَن كَانَ عَدُوّٗا لِّجِبۡرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلۡبِكَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِ

مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾﴾، واتە: بڵێ: هەر کەسێك دوژمنە بۆ جبریل، ئەوە جبریل ئەو پەیامو وەحییەی دابەزاندۆتە سەر دڵی تۆ، بە مۆڵەتی خوا، کە کتێبەکانی پێش خۆی بە ڕاست دەزانێو، ڕێنمایی‌و موژدەیە بۆ بڕواداران.

بوخاریی لە صەحیحی خۆیدا لە (كتاب تفسير القرآن)دا، (باب: قول من كان عدواً لجبريل)، بە ژمارە: (٤٤٨٠) ئەوەی هێناوە:

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ عَبْدَ اللهِ بنِ سَلاَمٍ، قَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ بَعْدَ أَنْ ذَكَرَ جِبْرِيل، هو عَدُوُّ اليَهودِ مِنَ المَلاَئِكَةِ}، ئەنەس دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی سەلام (یەکێك بووە لە زانایانی جوولەکەو، مسوڵمان بووە)، دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ باسی جبریل دەکات، عەبدوڵڵای کوڕی سەلام دەڵێ: (هو عدو اليهود من الملائكة) جبریل بریتیە لە دوژمنی جولەکەکان لە نێو فریشتەکاندا، هەڵبەتە: نەك جبریل دوژمنایەتییان بکات، بەڵکو ئەوان بە دوژمنی خۆیانی دەزانن، بە بیانووی ئەوە کە گوایە: (جبریل فەرمانی خوا دێنێ بۆ وێرانکردنی ئەو کۆمەڵگایانەی کە خوا بڕیاری وێرانکردن‌و کاولکردنیان دەدات) بەڵام ئەگەر وا بێ، دەبوو دوژمنایەتیی خوای دادگەریش بکەن، چونکە جبریل تەنیا فەرمانی خوای جێبەجێ کردوە !!

لەوبارەوە (النّيسابوري) بەسەرهاتێکی درێژ لە عومەری کوڕی خەتتابەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دێنێ، بەبۆنەی ئەو سێ ئایەتانەوە: ئایەتی (٩٧و ٩٨و ٩٩) لە سووڕەتی (البقرة) پوختەکەی ئاوایە:

عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێ: من دەچوومە لای جوولەکەکان کاتێك کە تەوراتیان دەخوێندەوە، منیش سەرسام دەبووم بەوەی کە لە زۆر شتان دا تەورات‌و قورئان وەك یەك بوون، (واتە: پشتگیریی یەکدییان دەکرد) جوولەکەکان گوتیان: ئەی عومەر! تۆ خۆشەویستترین کەسی لە لامان، گوتم: بۆچی؟ گوتیان: چونکە تۆ سەردانمان دەکەی، دێی بۆ لامان، گوتم: من بۆیە دێم بۆ ئەوەی کە سەرسامم بە کتێبی خوا هەندێکی پشتگیریی هەندێکی دەکات، تەورات پشتگیریی قورئان دەکات، قورئانیش پشتگیریی تەورات دەکات.

دەڵـێ: ڕۆژێـك كاتێـك مـن لـە لایـان بـووم لـەو كاتـەدا پێغـەمبـەری خـوا ﷺ بەوێدا بە پشتی منـدا ڕابرد (دیارە شـوێنەكەی وابووە كە پشتی لە پێغـەمبـەری خـوا بووە)، جوولەكەكان گوتیان: ئەوە هـاوەڵەكەتە، واتە: پێغـەمبـەری خـوا ﷺ بچۆ بۆ لای، دەڵـێ: منیش ئاوڕم دایەوە، تەماشام كرد پێغـەمبـەر ﷺ چووە نێـو خانوولكەیەكی خاكیی سـادەوە، لـە مەدینـەدا، (دیـارە سـەردانی ماڵـێكی كـردوە)، دەڵێ: منیش ڕووم لە جوولەكەكان كـرد پێم گـوتن: خواتـان بـە گـژدا دەكـەم، بـە ناوی خوا داواتان لـێدەكەمو، بە ناوی ئەو كـتێبەی كە خوا دایبەزاندۆتە سـەرتان، ئایا نـازانن كە موحەممەد ﷺ پێغـەمبـەری خوایە؟ گەورەكـەیان گـوتی: بـا، ئێمە دەزانین كە پێغـەمبـەری خوایە، دەڵێ، گوتم: كەواتە: تۆ لە هەموویان فەوتـاوتری، ئەگـەر دەزانن پێغـەمبـەری خوایە بۆچی شوێنی ناكـەون؟ دەڵـێ، گوتیـان: لەبـەر ئەوەی ئێمە لـە نێـو فریشـتەكاندا دوژمنێكمـان هەیـەو دۆسـتێكمان هەیـە، دەڵـێ، گوتم: دوژمنەكەتان كێیەو؟ دۆستەكەتـان كـێیە؟ گوتیان: دوژمنەكـەمان جبـریلە، ئـەوە ئـەو فریشـتەیە كـە سـزاكانی خـوا جێبـەجـێ دەكات، ئـەو سزایانەی خـوا بڕیاریـان لەسـەر دەدا، دەڵـێ، گـوتم: ئـەدی دۆستەكەتـان كـێیە؟ لەگـەڵ كـێدا تەبـان؟ گوتیـان: میكائیـل، چونكە فریشـتەی ڕەحـمو بـەزەیی‌و نـەرمو نیـانیی‌و ئاسـانییە دەڵێ، منیش پێم گـوتن: جـا من ئێوە دەكەمە شـایەد، نـە بـۆ جبــریل دروستە دژایەتیی كەسـێك بكات، كە میكائیل لەگەڵـی دۆسـتو تەبـایەو، نـە بـۆ میكائیلـیش دروسـتە كـە دۆسـتـایەتیی كەسێك بكـات، كـە دژی جبــریلە، ئـەوان هـەردووكیان پێكـەوە دژایـەتیی دەكـــەنو، پێكـەوەش تەبــایی دەكــەن، (واتـە: هـەردووكیان ئەگـەر كەسـێك دژایەتییـان بكـات، دژایـەتیی دەكـەن، كەسێكـیش دۆسـتـایەتییان بكـات، دۆسـتـایەتیی دەكـەن) دوایـی دەڵـێ: هەڵسـامو چوومە ئـەو ماڵەی كـە پێغـەمبــەری خـوا ﷺ چـوو بـۆ نێـوی، ئـەویش پێشـوازیی لـێكردمو گوتی: ئەی كوڕی خەتتاب! هەندێك ئایەت كە ئێستا پێش تۆ بۆ سـەرم دابەزیون، بەسەرتدا بخوێنمەوە؟ گوتم: بەڵـێ، ئەی پێغـەمبەری خوا! بۆم بخوێنەوە؟ ئەویش خوێندیـــــەوە : ﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾

مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٩٨﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾ البقـرة .

**دەڵێ: گوتـم: سوێند بەو کەسـەی کە تۆی بە هـەق ناردوە، منیش تەنیـا بۆ ئەوە هـاتم کە هەواڵی قسـەی جوولەکـانت پـێ ڕابگەیـەنم، تەماشا دەکـەم خـوای پەنهانکاری شـارەزا، هەواڵەکـەی پێش من بە تۆ گەیانـدوە، عومـەر دەڵـێ : دوای ئەوە لە دینـی خوای پەروەردگاردا ﷻ بەرد سـەختتر بووم، واتە: ئیمانو یەقیـنم زیاتر پتـەو بوو کە خـوا ﷻ ئاگـاداری هەموو شتێکە.**

**لەوبـارەوە دەقێکی دی هـاتوە، کە وەك گوتمان جبـریل وەحـیو پـەیامی خـوای بـۆ پێغـەمبـەری خـاتەم هێنـاو، وەك بـاقی پێغـەمبـەران، بوخـاریی بـە ژمـارە (٣٢١٨) هێنـاویەتی: {عَنْ ابْنِ عَباسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ لِجِبْرِيلَ أَلا تَزُورُنـا أَكْثَرَ مِمَّا تَزُورُنـا، قَالَ: فَنَزَلَتْ:** ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ ۖ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ ۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ ﴾**مريم}، واتـە: عەبدوڵـلای کـوڕی عەببـاس خـوا لـە خـۆی بـابی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغـەمبـەری خـوا ﷺ بـە جبـریلی فـەرموو: بـۆ لـەوە زیـاتر کـە سـەردانمان دەکـەی، سـەردانمان نـاکـەی؟**

**ئنجـا لـە وەڵام دا ئـەم ئایەتـە هاتـەخوار، کـە لـە سـەر زاری فریشـتەکان دەفـەرموێ: وە ئێمە دانـابەزین مەگەر بـە فـەرمانی پـەروەردگارت ئـەوەی کە لە پێشمانەوەیەو ئـەوەی لە دوامانەوەیـە، موڵکی خوایـە.**

**هەر لەوبـارەوە ئـەم دەقـەش هەیـە {عَن ابْنِ عَبـاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَـا، قَـالَ: قَـالَ رَسـولُ اللهِ ﷺ: أَقْرَأَنِي جِبْرِيـلُ عَلَـى حَرْفٍ، فَلَمْ أَزَلْ أَسـتَزِيدُهُ، حَتَّـى انْتَهَـى إِلَـى سَبْعَةِ أَحْـرُفٍ} (أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (٢٣٧٥)، وَالبُخَـارِيُّ بـرقم: (٣٠٤٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٧٠٥)).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی بابی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جبریل بە یەك شێوە قورئانی بۆ خوێندمەوە، منیش هەر داوام لێکرد بۆم زیاد بکات، (بۆ ئەوەی ئاسانتر بێ بۆ ئوممەتی) هەتا گەیشتە حەوت پیت، (دیارە مەبەستی حەوت شێوازە).

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: مەبەست پێی حەوت جۆرە خوێندنەوەکان (القراءات السَّبع) وە هەندێك دەڵێن: ئەوە وانیە چونکە جۆرەکانی قورئان خوێندن تەنیا حەوت نین و زیاترن، کە هەمووشیان کە لەگەڵ ئەو ئیملایەدا کە قورئانی پێ نووسراوە، ڕێکن، بۆ ئەوەی مانای زیاتر بەدەستەوە بدات، وە ئاسانکاریی زیاتر بێ، بە پێی لەهجەو زارەکان.

هەروەها لەوبارەوە ئەم دەقەش هاتوە: {قَالَ : كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَجْوَدَ النَاسِ، وَكَانَ أَجْوَدَ مَا يَكُونُ فِي رَمَضَانَ حِيْنَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ، وَكَانَ جِبْرِيلُ يَلْقَاهُ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْ رَمَضَانَ، فَيُدَارِسُهُ الْقُرْآنَ، فَلَرَسُولُ اللهِ ﷺ، حِيْنَ يَلْقَاهُ جِبرِيلُ أَجْوَدُ بِالْخَيْرِ مِن الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ} {مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٦)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٦١٤٩)}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشندەترین کەس بوو (زۆر سەخی بوو)، وە بەتایبەت لە مانگی ڕەمەزاندا زیاتریش بەخشندەیی دەکرد، لە کاتێکدا کە جبریل پێی دەگەیشت، هەموو شەوێکی مانگی هەر ڕەمەزانێك، پێی دەگەیشت و لەگەڵیدا بە قورئاندا دەچۆوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی ڕەمەزانەکاندا، وەك چۆن با شت دێنێ و ڕای دەدات، ئاوا بەو شێوەیە هەر شتێکی کەوتبایە دەستی دەیبەخشی.

**خاڵی دووەم: جۆرەکانی پەیوەندیکردنی جبریل بە پێغەمبەرەوە بۆ گەیاندنی وەحی خوا :**

وەك گوتم جبریل وەحی خوای بۆ هەموو پێغەمبەران هێناوە، هەروەها بۆ پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ ئنجا شێوەی پەیوەندیی کردنی جبریل بە پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ سێ جۆر بووە :

أ/ یان ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ جبریلی بینیوە لەسەر شێوە ئەسڵییەكەی خۆی.

ب/ یاخود جبریل چۆتە سەر شێوەی پیاوێك.

ج/ یاخود پێغەمبەری خوا ﷺ دەنگی جبریلی بیستوە بێئەوەی بیبینێ.

جۆری یەكەمیان: كە پێغەمبەری خوا ﷺ جبریلی بە شێوەی ڕاستەقینەی خۆی بینیوە، ئەوەی بۆ من دەركەوتوە، دووجاران پێغەمبەری خاتەم ﷺ جبریلی بەو شێوەیە بینیوە، جارێكیان لەسەر زەوی ئەویش لە سەرەتای پێغەمبەرایەتییدا، وە جارێكیان لە ئاسمان شەوی شەوڕۆیی و بەرزبوونەوە (الإسراء والمعراج)، كە ئایەتەكانی : (١ - ١٨) لە سووڕەتی (النجم) دەربارەی هەردوو جارەكە بۆمان دەدوێن، خوا سبحان وتعالی دەفەرموێ :

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ
﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴿٥﴾ ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ﴿٦﴾ وَهُوَ
بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٧﴾ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ
عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾
وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ
يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ
ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾ ﴾ النجم.

ئەم هەژدە ئایەتە زۆر بە ڕوونیی باسی ئەو دووجارەمان بۆ دەكەن، كە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ جبریلی لەسەر شێوەی خۆی بینیوە، من بە خێرایی ئایەتەكان تەفسیر دەكەم :

خـوا ﷻ دەفـەرموێ :

{بـە نـاوی خـوای بـەزەیی بەخشندە، (سـوێند) بـە ئەسـتێرە کاتێـك کـە ئـاوا دەبـێ، هاوەڵەکەتـان (واتـە: موحەممـەد ﷺ) نـە گومڕا بـووەو نـە بـێ مـرادیش بووە، وە لـە ئـارەزووەوە قسـە نـاکـات، بەڵـکو سروشـە بـۆی دەکرێ، کەسێك کـە فێـری دەکـات (مەبەسـت جبـریلـە) زۆر بـەهێزەو، شێوەی زۆر جوانـە کـە بـۆی چووە سـەر شێوەی خـۆی، کاتێك کە لە ئاسـۆی بەرز بوو، (مەبەست پێی بینینـی پێغـەمبـەرە ﷺ بۆ جبـریل لـە ئاسـمان)، دوایـی نیزیـك بـۆوە، شـۆڕ بـۆوە، تـاکـو وەك دوو کەوانـەیان لێهـات، یـاخود نیزیکتـریش (جبــریل لەگـەڵ پێغـەمبــەر هێنـدە نیزیـك بـۆوە، وەك دوو کەوانـە بەرانبــەر یــەك)، وە سروشـی کـرد بـۆ بەنـدەی خـوا، ئەوەی کە سروشی کرد (ئەوەی کە خـوا پێی ڕاگـەیاند بوو)، دڵو عـەقڵی (پێغـەمبــەر ﷺ) بـە هەڵــەدا نەچـوو لـەوەدا کـە بینـی، ئایـا ئێـوە لـە گومانـدان لـەوەی کـە (موحەممـەد ﷺ) دەیبینــێ؟ بێگومـان جـارێکی دیکـەش بینیویەتـی (موحەممەد جبـریلی بینیوە، لەسـەر شێوەی خـۆی) لـە لای درەختـی کۆتـایی، کە بەهەشـتی جێگـای پشـوودانو ئیسـڕاحەت لـەوێیە (لە لای درەختـی کۆتــاییە) کاتێـك ئـەو درەختـە دادەپۆشـێ، ئـەوەی کـە دایدەپۆشـێ، وە چـاوی (پێغـەمبــەر ﷺ) لای نـەداو، لـە سـنووریش دەرنەچـوو، بێگومـان لـە نیشـانە گەورەکانی پەروەردگاری خۆی بینـی}.

شـایانی بـاسیشــە لـە ئایـەتی (٥)ەوە تـا ئایـەتی (١١) هـەمووی بـاسـی جـاری یەکـەمی بینینـی پێغـەمبــەری خـوا (محمـد) بـۆ(جبریـل) دەکـاتو، لـە ئایـەتی (١٣)ش تـاکو (١٨) بـاسی جاری دووەمە.

کەواتـە : ئەوە جۆری یەکەمی پەیوەندیی کردنی جبـریل (عَلَيْهِ السَّلَام) بـووە بە پێغـەمبـەری خواوە ﷺ، کە دیارە لە (صحيح البخاري)شدا بە ژمارە (٣٢٣٨) لەوبـارەوە بـاسکراوە کە پێغـەمبــەر ﷺ فەرموویـەتی: جبـریلـم بینیـوە، لەسـەر کورسـییەك دانیشـتوە لـەنێوان ئاسـمانو زەوی داو منـیش لـێی ترسـام هەتـا کەوتمە سـەر زەویو هاتمـەوە لای خێـزانم گـوتم: دامپۆشـن، دامپۆشـن (زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي).

هەروەها هەر لەوبارەوە بوخاریی هێناویەتی دەڵێ :

{حَدَّثَنا قُتَيْبَةُ حَدَّثَنا أَبُو عَوانَةَ، حَدثنـا أَبُو إِسْحاقَ الشَّيْبـانِيُّ، قَالَ: سـألْتُ زِرَّ بْنَ حُبَيْشٍ عَنْ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ ﴾، قَالَ حدثنـا ابْنُ مَسْعُودٍ أَنَّهُ رَأَى جِبْرِيـلَ لَـهُ سـت مِائَةِ جَنـاحٍ}.

واتـە: ئـەبو ئیسحـاقی شـەیبـانیی دەڵـێ: پرسـیارم لـە (زِرَّ بْـنَ حُبَـیْش) كـرد، دەربـارەی قسـەی خـوای بـەرز كـە دەفـەرموێ : جبـریل لەگـەڵ موحەممـەد ﷺ وەك دوو كـەوان، یـاخود نیزیكتـریش بـوون، وە ئـەوەی كـە خـوا مەبەسـتی بـوو جبـریل بـۆ بەنـدەی خـوا سروشـی كـرد، پێـی ڕاگەیانـد؟ دەڵـێ: ئـەویش گـوتی: عەبدوڵـڵای كـوڕی مەسـعوود بـۆی بـاسكردووین كـە پێغـەمبـەر ﷺ جبـریلی بینیوە كە شەسسـەد (٦٠٠) بـاڵی هەبووە (واتە: لەسـەر شێوەی خۆی).

هەروەها (بخاري) بە ژمارە (٣٢٣٥) هێنـاویەتی كـە مەسـرووق پرسـیار دەكـات لە دایكمـان عائیشـە خوا لێی ڕازی بێ، دەربـارەی چەند شتێك.

ئنجا ئەوەی جێی مەبەسـتە لێرەدا ئەومیە كە مەسرووق دەڵێ:

{قَالَ قُلْتُ: لِعَائِشَةَ : يَا أُمَّتَـاهْ ! هَلْ رَأَى مُحَمَّـدٌ رَبَّهُ؟ فَقَالَـتْ لَقَدْ قَفَّ شَعَرِي مِمَّـا قُلْـتَ، قُلْـتُ لِعَائِشَـةَ: فَـأَيْنَ قَوْلُـهُ: ﴿ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ ﴾، قَالَـتْ: ذَاكَ جِبْرِيـلُ كَـانَ يَأْتِيـهِ فِـي صُـورَةِ الرَّجُـلِ، وَإِنَّـهُ أَتَـاهُ هَـذِهِ الْمَرَّةَ فِي صُورَتِهِ الَّتِي هِيَ صُورَتُهُ، فَسَدَّ الأُفُقَ} .

گوتمـە عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دایە گـیان ! ئایا موحەممـەد ﷺ (لـە كـاتی شەوڕۆیی و بەرزبوونەوەدا) پەروەردگـاری خۆی بینیـوە؟ ئـەویش گـوتی: بەهـۆی ئـەوەی كـە گـوتـت، مووەكانم وەسـتـان (واتـە: چۆن شـتی وا دەپرسـی ! نـەخێر)، منیش گوتـم: ئەدی چی لە قسـەی خـوای بـەرز دەكـەی كـە دەفـەرموێ: ﴿ ثُمَّ دَنَا

فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ ﴾؟! واتە: دوایی نیزیك كەوتەوەو شۆڕ بۆوە، تاكو وەك دوو كەوانە بوون، یاخود كەمتریش، (وایزانیوە ئەوە قسە لەسەر نیزیكبوونەوەی خوای پەروەردگار دەكات لە پێغەمبەر ﷺ ! دایكمان عائیشەش خوا لێی ڕازی بێ، زۆر شارەزا بووە، بۆی ڕاست كردەوە) گوتی: ئەوە جبریل بوو (لێرەدا قسە لە نیزیك كەوتنەوەی جبریل دەكات لە پێغەمبەر ﷺ) چونكە (جبریل) هەر لەسەر شێوەی پیاوێك دەهات بۆ لای پێغەمبەر ﷺو، وەحی بۆ دەهێنا، بەلام ئەو جارەیان لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی هات بۆ لای، كە ئاسۆی ئاسمانی پڕ كرد بوو. (دیارە جبریل لە ڕووی قەبارەو لە ڕووی هێزەوە، زۆر زۆر بەرزو گەورەیە، خوای پەروەردگار لە چەندان ئایەتدا باسی دەكات).

واشی تێدەگەم بۆیە خوا ﷻ بەلای كەمەوە دووجار جبریلی لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی پیشانی موحەممەد ﷺ داوە، تاكو (محمد المصطفى) ئەو كەسەی كە پەیامو وەحی لێ وەردەگرێ، كە جبریلە (عَلَيْهِ السَّلَامُ) ئەو فریشتەیە، لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی ببینێو بیناسێ.

جۆری دووەمیان: لە جۆرەكانی پەیوەندیی جبریل بە پێغەمبەر ﷺەوە كە پێشتر ئاماژەمان پێدا، ئەوەیە كە بۆی بچێتە سەر شێوەی پیاوێك، دیارە لەوبارەشەوە خوا ﷻ ئاماژەی پێ دەكات، هەر لە سوورەتی (النجم)دا كە دەفەرموێ: ﴿ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ ﴾، ئایا ئێوە لێی لە گوماندان، یاخود مشتومڕی لەگەڵ دەكەن، لەسەر ئەوەی كە دەیبینێ؟ (یانی: جبریل لەسەر شێوەی پیاوێك، یاخود لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی، دەبینێ).

فەرمایشتی پێغەمبەریش لەوبارەوە زۆرن:

١ـ یەكێك لە هاوەڵان لێی پرسی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ چۆن وەحییت بۆ دێ ؟

ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: {أَحيَانا يأتيني مِثْلُ صَلصَلَةِ الجَرَسِ، وَهُوَ أشَدُّهُ عَلَيَّ، فَيُفْصَمُ عَنِّي وَقدْ وَعَيْتُ عَنْهُ مَا قَالَ، وَأحيَانا يَتمَثَّلُ لِيَ المَلَك رَجُلاً، فَيُكَلِّمُني فَأَعِيَ مَا يَقُولُ} {رَوَاهُ البُخاري برقم : (٢) عَن الحَارث بْن هِشَام}.

واتە : هەندێك جار وەك دەنگی زەنگوڵەو جەرەس بۆم دێ، كە ئەوە لە هەموو حاڵەتەكان قورسترە (واتە: دەنگەكە وەك دەنگی زەنگوڵو جەرەس دێ، بەلاَم من تێیدەگەم) دوای ئەوەی كۆتایی دێت، وەریدەگرم و تێی دەگەم، جاری واش هەیە فریشتە دەچێتە سەر شێوەی ئینسانێكو قسەم لەگەڵدا دەكاتو، ئەوەی كە دەیڵێ لێی تێدەگەم.

٢ـ لە دایكمان عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێ هاتوە، هەر لە (حارث بن هشام)ەوە ئەو ڕیوایەتەش هاتوە:

{كَيْفَ يَأْتِيكَ الْوَحْيُ؟ قَالَ كُلُّ ذَاكَ، يَأْتِينِي الْمَلَكُ أَحْيَانا فِي مِثْلِ صَلْصَلَةِ الجَرَسِ، فَيُفْصَمُ عَنِّي وَقَدْ وَعِيتُ مَا قَالَ، وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ، وَيَتَمَثَّلُ لِي المَلَكُ أَحْيَانا رَجُلاً فَيُكَلِّمُنِي فَأَعِي مَا يَقُولُ} {رَوَاهُ البُخَاري برقم: (٢)}.

واتە: دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: حارسی كوڕی هیشام پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، چۆن وەحییت بۆ دێ؟ ئەویش فەرمووی: بە هەموو شێوەكان بۆم دێ، (واتە: بە هەر سێ شێوەكان) هەندێك جار فریشتەكە دێ، لە شێوەی دەنگی جەرەسدا، كاتێك كە تەواو دەبێ دەزانم چی گوتوە، وەریدەگرم، بەلاَم ئەوە زۆر لەسەرم قورسە، هەندێك جاریش فریشتەكە بۆم دەچێتە سەر شێوەی پیاوێك، دەمدوێنێو قسەم لەگەڵدا دەكاو لێی وەردەگرم.

٣ـ هەر لەوبارەوە كە جبریل كە شێوەی چۆتە سەر پیاوێك، ئەم دەقەش هەیە:

{عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ أُنْبِئْتُ أَنَّ جِبْرِيلَ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ وَعِنْدَهُ أُمُّ سَلَمَةَ، فَجَعَلَ يَتَحَدَّثُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِأُمِّ سَلَمَةَ: مَنْ هَذَا ؟ أَوْ كَمَا قَالَ، قَالَتْ:

هَذَا دِحْيَةُ، فَلَمَّا قَامَ، قَالَتْ: وَاللهِ مَا حَسِبْتُهُ إِلاَّ إِيَّاهُ، حَتَّى سَمِعْتُ خُطْبَةَ النَّبِيِّ ﷺ يُخْبِرُ خَبَرَ جِبْرِيلَ أَوْ كَمَا، قَالَ، قَالَ أَبِي قُلْتُ: لِأَبِي عُثْمَانَ مِمَّنْ سَمِعْتَ هَذَا؟ قَالَ: مِنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ} {أخرجه البخاري برقم: (٤١٨٠)}.

واتە: ئەبی عوسمان، دەڵێ: هەواڵم پێدراوە کە جبریل هاتۆتە لای پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا کە (أم سلمة)ی لەلا بووە، (دیارە جبریل لە شێوەی (دِحْية الكلبي)دا بووە کە هاوەڵێك بووە لە هاوەڵانو شێوەیەکی جوانی هەبووە) قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کردوە، دوای ئەوەی کە هەڵساوەو ڕۆیشتوە {بە حیساب ئەوە (دِحْية الكلبي)یە} پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی (أم سلمة) ئەوە کێیە؟ دەڵێ، گوتم: ئەوە (دِحْية)یە، دەڵێ: بە خوا هەر وامزانی کە ئەوە، تاکو گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو، وتاریدا، باسی هەواڵی جبریلی کرد، کە جبریل فلان شتەی پێ ڕاگەیاندوە، ئنجا دەڵێ: بابم بە (أبو عثمان)ی گوت: ئەمەت لە کێ بیوستوە؟ گوتی: لە ئوسامەی کوڕی زەیدم بیستوە.

٤ـ هەروەها ئەم فەرموودەیەش هەیە کە لە (عومەری کوڕی خەتتاب)ەوە گێڕدراوەتەوە خوا لێی ڕازی بێ:

{عَنْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ إِذْ طَلَعَ علينا رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ، شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعَرِ، لاَ يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ، وَلاَ نَعْرِفُهُ حَتَّى جَلَسَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ ... (ذَاكَ جِبْرِيلَ أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ)} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٦٧)، والبخاري برقم: ٥٠، بلفظ قريب منه، وَمُسْلِمٌ برقم: (٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٩٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦١٠)، وَقَالَ: حَسَن صَحِيحٌ، وَالنَّسائِي فِي الكُبْرَى برقم: (١١٧٢١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٦٣)، وَابْنُ خُزَيْمَة برقم: (٢٥٠٤)، وَابْنُ حبان برقم: (١٦٨)}.

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ڕۆژێکیان لە لای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، پیاوێك هات بەرگەکەی زۆر سپی بوو، مووەکانی زۆر ڕەش بوون، شوێنەواری سەفەری پێوە نەدەبینرا (پێوەمان نەدەبینی)،

نەماندەناسی، دوایی لە کۆتاییەکەیدا پێغەمبەر ﷺ لە عومەر دەپرسێ دەزانی ئەوە کێ بوو؟ دەڵێ: نەخێر، دەفەرموێ : ئەوە جبریل بوو، هاتبوو دینەکەتانی فێر دەکردن، (کەواتە: جبریل چۆتە سەر پیاوێکی بەرگ سپی، موو ڕەش، کە شوێنەواری سەفەرو تۆزو خۆری پێوە دیار نەبووە).

٥- هەروەها لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە :

{عن عائشة أن النبي ﷺ قال لها: يا عائشة هذا جبريلُ يقرأ عليك السلام، فقالت: وعليه السلام ورحمة الله وبركاته، ترى ما لا أرى، تريدُ النَّبيَّ} رواه البخاري: ٣٢١٧.

واتە : لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێ، گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: ئەی عائیشە ! ئەمە جبریلە سەلامت لێ دەکات، ئەویش گوتوویەتی: سەلام‌و ڕەحمەت‌و بەرەکاتی خوای لەسەر بێ، ئەوەی تۆ دەیبنی، ئێمە نایبینین، مەبەستی پێغەمبەر بوو.

کەواتە : کاتێك جبریل چۆتە سەر شێوەی پیاوێك بۆ گەیاندنی وەحی خوا، هاوەڵانیش بینیویانە، بەڵام نەیانزانیوە کە ئەوە جیبریلە.

<u>جۆری سێیەمیان</u> : لە جۆرەکانی پەیوەندیی کردنی جیبریل بە پێغەمبەرەوە بۆ گەیاندنی وەحی :

بریتی بووە لەوە کە لە میانی دەنگی زەنگوڵەو جەرەس دا، پەیامی خوای پێ بگەیەنێ، وەك لەم فەرموودەیە دا هاتوە کە پێشتریش هێناومانە :

{عن عائشة أم المؤمنين أن الحارث بن هشام سال رسول الله فقال يا رسول الله كيف يأتيك الوحي؟} .

{فقال رسول الله: أحيانا يأتيني مثلُ صَلْصلة الجرس، وهو أَشَدُّه عليَّ فَيُفْصَمُ عنيَّ وقد وَعَيْتُ عنه ماقال، وأحيانا يتَمثَّلُ لي الملَك رجلاً فَيُكلِّمني فأَعي ما يقول} { البخاري برقم : ٢ وبرقم: ٣٢١٥} .

کە پێشتر مانامان کردوەو لێرە دووبارەی ناکەینەوە.

**خاڵی سێیەم: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا وەحی وەردەگرت، بە تایبەت ئەگەر لە شێوەی دەنگی جەرسێکدا هاتبایە بەرگوێی، زۆر ماندوو دەبوو:**

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (المزمل) دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ١ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ٢ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ٣ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ٤ إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ٥ ﴾، هەڵبەتە وەحیو پەیامی خوا هەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ قورس بووە، کاتێك جیبریل بۆی هێناوەو لێی وەرگرتوە، هەم قورسو گرانیشەو، جێبەجێ کردنی ئینسان ئارەقی پێوە دەکاتو، دەبێ خوێنو ئارەقەی لە پێناودا برێژێ، تاکو بچەسپێ لەسەر ئەرزی واقیع.

لەوبارەوەش کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە زەحمەتو قورسی وەحیو پەیامی خوای وەرگرتوە، دەقی سوننەت زۆرن :

یەك : {عَن ابْنِ عَباسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسولُ اللهِ ﷺ يُعَالِجُ مِنَ التَّنْزِيلِ شِدَّةً} {رواه البخاري برقم: (٥)}.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك کە وەحی بۆ دادەبەزی، زۆر تووشی نارەحەتیی دەبوو، ماندوو دەبوو.

دوو : {عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَتْ: وَلَقَدْ رَأَيتُهُ يَنزِلُ عَلَيهِ الوَحِيُ فِي اليَوْمِ الشَّدِيدِ البَرْدِ، فَيُفْصَمُ عَنْهُ، وَإِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقاً} {رَوَاهُ البُخاري برقم: (٢)}.

واتە: دایکی بڕواداران عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ دەبینی لە ڕۆژی ساردی زستاندا، وەحی دادەبەزیە سەر، دوای ئەوەی کە وەحی کۆتایی دەهات، زەنگوڵ زەنگوڵ نێوچاوانی ئارەقی دەردەدا، (واتە: تووشی نارەحەتییو ماندوویێتی دەبوو).

سێ : هەروەها لە دەقێکی دیکەدا، کە دایکمان عائیشە لە باسی بوختان پێکرانەکەی خۆیدا، بە تەفصیل بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە، ئنجا لە بڕگە

(مقطع)یەکدا دەڵێ: {فَوَاللَّهِ مَا رَامَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ مَجْلِسَهُ، وَلاَ خَرَجَ مِنْ أَهْلِ الْبَيْتِ أَحَدٌ، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى نَبِيِّهِ، فَأَخَذَهُ مَا كَانَ يَأْخُذُهُ مِنَ الْبُرَحَاءِ عِنْدَ الْوَحْيِ، حَتَّى إِنَّهُ لَيَتَحَدَّرُ مِنْهُ مِثْلُ الْجُمَانِ مِنَ الْعَرَقِ فِي الْيَوْمِ الشَّاتِي، مِنْ ثِقَلِ الْقَوْلِ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَيْهِ} {رواه البخاري برقم: (٣٩١٠)، ومسلم برقم: (٧١٩٦)}.

واتە: سوێند بە خوا پێغەمبەر ﷺ نەچووە دەرو، کەسیش لەو شوێنەدا کە تێیدا بوون، نەچوو دەر، تاکو وەحی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دانەبەزیو، ئەو حاڵەتە سەختە تووشی پێغەمبەری خوا بوو، کە لە کاتی وەحی بۆهاتنی دا تووشی دەبوو، کە پێغەمبەر ﷺ لەو حاڵەدا زۆر تووشی سەغڵەتیی دەبوو، تا وەك شێوەی گەوهەرو مرواری ئارەقە لە نێو چەوانی دەچۆڕا، ئەگەر لە ڕۆژی ساردی زستانیش دابووایە، بەهۆی قورسیی ئەو فەرمایشتەوە کە بۆی دادەبەزێنرا.

چوار: هەر لەوبارەوە سەعیدی کوڕی جوبەیر لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە خوا لێی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: {كَانَ رَسولُ اللهِ ﷺ يُعَالِجُ مِنَ التَّنْزِيلِ شِدَّةً، وَكَانَ مِمَّا يُحَرِّكُ شَفَتَيْهِ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَأَنَا أُحَرِّكُهُمَا لَكُمْ كَمَا كَانَ رَسولُ اللهِ ﷺ يُحَرِّكُهُمَا، وَقَالَ سَعِيدٌ (هُوَ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ رَاوِي الْحَدِيثِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ): وأنَا أُحَرِّكُهُمَا كَمَا رَأَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ يُحَرِّكُهُمَا، فَحَرَّكَ شَفَتَيْهِ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾﴾ القيامة، قَالَ جَمْعُهُ لَهُ فِي صَدْرِكَ وَتَقْرَأَهُ، ﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾﴾ قَالَ: فَاستَمِعْ لَهُ وَأَنْصِتْ ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾﴾ (ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنا أَنْ تَقْرَأَهُ) القيامة ١٦- ١٩. فَكَانَ رَسولُ اللهِ ﷺ، بَعْدَ ذَلِكَ، إِذَا أَتَاهُ جِبْرِيلُ، استَمَعَ، فَإِذَا انْطَلَقَ جِبْرِيلُ، قَرَأَهُ النَّبِيُّ ﷺ كَمَا قَرَأَهُ} {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥)}.

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە خوا لە هەموویان ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کە وەحی بۆ دادەبەزی زۆر تووشی سەغڵەتیی‌و ماندوو بوون دەبوو (ئارەقەی دەکرد)، وە پەلەی دەکردو لێوەکانی خۆی دەجووڵاندن تاکو ئەوەی کە لە جبریلەوە بیستبووی، یەکسەر بیڵێتەوە، (دڵنیا بێ وەك ئەو دەیڵێتەوە) ئنجا عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوتی: منیش لێوەکانی خۆم بۆ ئێوە دەجووڵێنم، وەك پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە کە لێوەکانی خۆی جووڵاندوون، وە سەعیدی کوڕی جوبەیریش دەڵێ: وەك چۆن عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسم بینی، منیش ئاوا لێوم دەجووڵێنم.

ئنجا خوا ﷻ دوایی ئەو ئایەتانەی سووڕەتی (القیامة)ی ناردنە خوار، دەفەرموێ: بۆئەوەی پەلە بکەی، لە وەرگرتنی قورئاندا، زمانتی پێ مەجووڵێنە (پەلە مەکە) چونکە بە تەئکید کۆکردنەوەی قورئان لە نێو سینەی تۆداو، خوێندنەوەی بەسەرتدا، لەسەر ئێمەیە (واتە: لەو دڵ‌و سینەی تۆدا کۆی دەکەینەوە، بیخوێنەوە) دوایی دەفەرموێ: هەرکات ئێمە خوێندمانەوە تۆش بە دوای خوێندنەوەکەی بکەوە، (واتە: بێدەنگبەو گوێ هەڵخە)، دوایی بۆتی ڕوون دەکەینەوە (واتە: بۆت دەخوێنینەوە) دەڵێ: دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە، پێغەمبەر ﷺ کاتێك جبریل دەهات بۆ لای، گوێی بۆ ڕادەگرت‌و هیچ لێوی نە دەجووڵاندن، بە شێنەیی گوێی بۆ دەگرت، ئنجا کاتێك جبریل دەڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ وەك لە (جبریل)ی وەرگرتوە، ئاوای دەیخوێندەوە.

دیارە پێشێ پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە سوور بووە کە وەك چۆن (جبریل) دەیڵێ، ئاوا دووبارەی بکاتەوە، بەڵام خوای پەروەردگار ئامۆژگاریی کردوە کە وا نەکاتو، دڵنیا بێ کە پێویست بەو خۆ ماندووکردن‌و مشەوەش کردنە ناکات، چونکە خوای بە بەزەیی لە دڵ‌و عەقڵی دا دەیچەسپێنێ.

پێنج : یەکێکی دیکە لەوانە: {عَنْ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمْلَى عَلَيْهِ: ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ...﴿٩٥﴾﴾ النساء، قَالَ: فَجَاءَهُ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَهُوَ يُمْلِيهَا عَلَيَّ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! لَوْ

أَستطِيعُ الْجِهَادَ، لَجَاهَدْتُ، وَكَانَ رَجُلاً أَعْمَى، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ ﷺ، وَفَخِذُهُ عَلَى فَخِذِي، فَثَقُلَتْ عَلَيَّ حَتَّى خِفْتُ أن تَرُضَّ فَخِذِي، ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ: ﴿ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ﴾} {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٢٦٧٧)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٢٥٠٧)،وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٣٠٣٣)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٣٠٩٩)، وَصَحَّحَهُ الألباني} .

واتە: زەیدی كوڕی ثابت خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندمەوە، پێشێ بەو شێوەیە بوو: ﴿ لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ...﴿٩٥﴾ ﴾ النساء، ئیماندارانی دانیشتوو لەگەڵ تێكۆشەرانی ڕێی خوادا، وەك یەك نین، دەڵێ: عەبدوڵڵای كوڕی ئوممی مەكتوومیش خوا لێی ڕازی بێ، هات لەو كاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی بەسەردا دەخوێندمەوە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! بە خوا ئەگەر توانیبام جیهاد بكەم، منیش دەچووم بۆ جەنگو جیهاد، (دیارە كوێر بووە) ئیدی خوای بە بەزەیی دوایی ئەم وشەیەی ناردە خوار بۆ سەر پێغەمبەرەكەی، كە (زەید) دەڵێ: لەوكاتەدا ڕانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕانم بوو، هێندە ڕانی قورس بوو، هەتا ترسام كە ڕانم وردبێ لە ژێر ڕانی دا، (پێغەمبەری خوا ﷺ كە وەحی بۆ هاتوە بەدەنی زۆر قورس بووە)، دوایی حاڵەتەكە لاچوو، وە خوای كارزان ئەم وشەیەی ناردە خوار ، ﴿ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ﴾ سەرەنجام ئایەتەكە ئاوای لێهات : ﴿ لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ...﴿٩٥﴾ ﴾ النساء، واتە: ئیماندارانی دانیشتووی كە خاوەن زیان نەبن (پەككەوتە نەبنو جەستەیان تەواوبێ) یەكسان نین لەگەڵ تێكۆشەرانی ڕێی خوادا، واتە: ئیماندارانێكی دانیشتووی بێ زیانی بێ عوزر، لەگەڵ موجاهیداندا، پاداشتیان وەك یەك نیە، پلەیان وەك یەك نیە، بەڵام

ئەوەی کە بە عوزرێکەوە نەتوانێ بچێتە جەنگو جیهاد، وەك عەبدوڵڵای کوڕی ئوممی مەکتووم کوێربێ، یاخود شەل بێ، یاخود بێهێز بێ، یان نەخۆش بێ، ئەوەی عوزرێکی هەبێ، بەپێی نیەتەکەی خۆی پاداشتەکەی خۆی هەر هەیە.

شەش : هەر لەوبارەوە ئەم دەقەش هاتوە:

{عن صفوان بن يعلى قال: ليتني أرى رسول الله ﷺ حين يُنْزَلُ عليه الوحي.

فلما كان النبي ﷺ بالجعْرانة وعليه ثوبٌ قد أُظِلَّ عليه، ومَعَه ناسٌ من أصحابه، إذْ جاءه رجلٌ مُتَضَمِّخٌ بطيبٍ، فقال: يا رسول الله ! كيف ترى في رَجُلٍ أحرم في جُبَّةٍ بعد ما تَضَمَّخ بطيبٍ ؟!

فنظر النبي ﷺ ساعةً، فجاءه الوحي، فأشار (عمر) إلى (يعْلى) أنْ تعال، فجاء يَعْلى، فأدْخَلَ رَأْسَهُ، فإذا هو مُحْمَرُّ الوجه، يَغِطُّ كذلك ساعة ثم سُرِّيَ عنه، فقال: أين الذي يسألني عن العمرة آنِفاً ؟!

أما الطِّيبُ الذي بك فاغْسِلْه ثلاث مرَّات، وأما الجُبَّةُ فانْزِعْها، ثم اصنَعْ في عُمرتك كما تصنَعُ في حَجِّك}[1].

واتە : صەفوانی کوڕی یەعلای کوڕی ئومەییە، ڕۆژێك دەڵێ: خۆزگە پێغەمبەری خوام ببینیبایە، کاتێك وەحی بۆ دادەبەزی.

جا دەڵێ: ئێمە لە جیعرانە بووین (جیعرانە شوێنێکە) کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە قوماشێك سێبەری بۆ کرا بوو، وەك نیمچە چادرێك، خۆیو هەندێك لە هاوەڵانی لە سێبەری دابوون، کاتێك کابرایەکی دەشتەکی هات، جوببەیەك کە بۆنی خۆشی لێدرا بوو، لەبەری دابوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا کەسێك کە دوای ئەوەی جوببەکەی بۆن خۆش کردووەو ئیحرامی عومرەی تێدا بەستوە، تۆ پێت چۆنە؟

---

١) رواه البخاري رقم: ٤٩٨٥ .

پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەیەك تەماشای كرد (تەماشای سەرێی كرد)و وەحی بۆ هات، عومەریش ئاماژەی كرد بۆ یەعلا، گوتی: وەرە تەماشا بكە (بزانە پێغەمبەر ﷺ چۆن وەحی بۆ دێ؟) ئنجا یەعلا سەری خۆی بردە بن چادرەكە، تەماشای كرد: پێغەمبەر خوا ﷺ دەمو چاوی موبارەكی سوور هەڵگەڕاوەو، پرخەی دێ، (وەك كەسێك كە بە زەحمەت هەناسە دەدات) هەتا دوایی وەحییەكە تەواو بوو، پێغەمبەر پرسیاری كرد، فەرمووی: كێ بوو دەربارەی عومرە لێی پرسیم، پێش ئێستا؟ لە كابرا گەڕان دۆزیانەوەو هێنایان، فەرمووی: ئەو بۆنە خۆشەی كە لە خۆتت داوە، سێ جاران بیشۆ، جوببەكەشت دابنێ، دوایی لە حەجدا چۆن دەكەی، عومرەكەشت بەو شێوەیە بكە، (واتە: بەرگی ئیحرام بپۆشەو، بەرگە ئاساییەكەت دابنێو...).

ئەمە كورتەیەك بوو دەربارەی وەحی.

<u>**مەسەلەی سێیەم**</u>: كە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۖ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ إِذْنِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾، دیارە ئێمە پێشتر لە سوورەتی (الأعراف) لە تەفسیری ئایەتی (٥٤)دا، باسی چوونە سەر عەرشی خواو بەرزبوونەوەی خوا بۆ سەر عەرشمان كردوە، بۆیە لێرەدا بە خێرایی بەسەری دا دەڕۆین.

كە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ﴾، واتە: بێگومان پەروەردگاری ئێوە ئەو خوایەیە كە ئاسمانەكانو زەوی بە شەش ڕۆژان (واتە: بە شەش قۆناغ) هێناونە دی، ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴾، دوایی بەرز بۆتەوە بۆ سەر عەرش، یان سەقامگیر بووە لەسەر عەرش، یان چۆتە سەر عەرش، بەو شێوەیەی كە بۆ خوا شایستەیە، ﴿ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ﴾، خوا لەسەر

عـەرشی خۆیـەوە كاروبـارەكان بـەڕێوە دەبـات، كاروبـاری بـوون (وجـود)، كاروبـاری هـەموو ئەو شـتـانەی كە لە نەبوون هێنـاونیـە دی.

ئنجا بـاسی ئەوە دەكات كە هیچ كام لە دروسـتكراوەكان توانـای تكاكردنی ڕەهـایان لەلای خـوا نیـە؟! دەفـەرموێ: ﴿مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ إِذۡنِهِۦ﴾، واتـه : نـەك هـەر هیچ دروسـتكراوێك هاوبەشی خوا نیـە، بەڵكو هیچ كەس توانـای تكاكردنیشـی نیـە، لە لای خوا، مەگەر پاش مۆڵەتی خوا ﷻ، وەك لـە سـوورەتی (البقـرة)دا، دەفـەرموێ: ﴿...مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦ... ٢٥٥﴾، دیـارە ئێمـە دوایـی بـاسـێكی تـایبەت دەكەین دەربـارەی تكاكـردنو (شفاعة).

دوایـی دەفـەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُ﴾، ئـا ئـەوەتان ئـەو خوایەتان پەروەردگارتانە، خاوەنتانە، هەر ئەو بپەرستن، هـەر ئـەو شایستەی ئەوەیە كە بەندایەتیی بۆ بكەن، ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾، ئایا بیـر خۆتـانی نـاهێننەوە.

(تَذَكُّر)، ئەوەیە كە ئینسـان شـتێكی زانیبـێ، دوایی لەبیـری چووبێتەوە، ئنجا بیـر خۆی بهێنێتـەوە، واتـە: بۆچی ئـەو شـتە كە لـە فیطـرەتتـان دا دانـراوە، ئـەو حەقیقەتە: كە تەنیا خوا ﷻ شایستەی پەرستنە، بۆچی نایانهێننـەوە بیـر خۆتـان؟ ئێمە لێرەدا پێویستە دوو كورتە بـاسـان بكەین :

١/ كورتە بـاسێكیان دەربـارەی بوونەوەرو، حیكمـەتی خوا لە دروست كردنیـدا.

٢/ كورتە بـاسێكیش دەربـارەی شـەفاعەتو تكاكـردن لـە لای خـوا ﷻ چییەو؟ چۆنـە؟

# کورتە باسێک دەربارەی بوونەوەرو حیکمەتی خوا لە دروست کردنیدا

ئێمە لە چوار بڕگەدا ئەم بابەتە دەخەینە ڕوو:

**بڕگەی یەکەم:** چەمك و مەبەستی وشەی بوونەوەر (كَوْن):

ئێمە وشەی (وجود)مان هەیە بە عەرەبی، کە بە کوردیی پێی دەڵێن: (بوون)، وشەی (كَوْن)یش هەیە، بەکوردیی (بوونەوەر) هەڵبەتە لێکیش نیزیکن، بەڵام وشەی بوون واتە: هەرچی کە هەیە، کە ئەوکاتە دەگونجێ بڵێین: (الخالق والمخلوق) بەدیهێنەرو بەدیهێنراو، هەمووی، بەڵام (كَوْن) واتە: ئەوەی کە خوا دروستی کردوە، بەڵام بۆ ئێمەش بۆتە شتێکی زانراوو پەی پێ براو.

دیارە ئێستا وشەی (كَوْن) کە لە زمانی عەرەبیی دا بەکاردەهێنرێ، یاخود (گەردوون) یان (بوونەوەر) لە کوردیی دا، یان (گیتی) لە فارسییدا، بۆ هەموو ئەوە بەکاردەهێنرێ کە خوا دروستی کردوە، واتە: بۆ مانای (خلق) یان (مخلوق) هەرچی خوا دروستی کردوە، ئنجا بۆ ئەوەی بزانین ئەو بوونەوەرەی کە هەتا ئێستا لە لایەن مرۆڤەوە، بە هۆی ئەو ئامرازانەوە کە خوای بەدیهێنەر بۆی ڕەخساندوون، ئەو ئەندازەیە لە بوون، کە پەی پێ براوە، چەندەو چۆنە؟! با تەماشا بکەین:

(د. زغلول راغب محمد النجار) لە کتێبێکی دا بە ناوی (السماء في القرآن الكريم)[1] دا، دەڵێ: (زانایانی گەردووناس تیرەی ئەو بەشەی لە بوونەوەر پەی

١) ص ٢٧٩.

پێبراوەو زانراوە، مەزەندەی دەکەن بە (٢٤,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) بیستو چوار ملیار ساڵی تیشکیی، ئنجا ئایا ساڵی تیشکی چەندە؟ ساڵی تیشکیی بریتیە لە (٩,٥) نۆو نیو تریلیۆن کیلۆمەتر، واتە: نیزیکەی دە (١٠) تریلیۆن، تریلیۆن، واتە: (١٠٠٠) ملیار، کە بلیۆنیشی پێ دەڵێن، واتە: (١٠٠٠) بلیۆن، بە نووسین: دەبێتە (٩,٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)کم، ئەوە ئەو ماوەیەیە کە تیشك لە ساڵێكدا دەیبڕێ.

دیارە تیشك لە چرکەیەکدا (٣٠٠,٠٠٠)کم سێ سەد هەزار کیلۆمەتر دەبڕێ، ئنجا بۆ ئەوەی بزانین ئەو ماوەیەی تیشك لە ساڵێك دا دەیبڕێت چەندە؟ دەبێ بێنین (٣٠٠,٠٠٠) سێ سەد هەزار کیلۆمەتر، کە تیشك لە چرکەیەکدا دەیبڕێ جاران (×)ی (٦٠)ی بکەین، بۆ ئەوەی بزانین تیشك لە خولەکێك دا چەند دەبڕێ، چونکە هەر خولەکێك بریتیە لە (٦٠) چرکە، ئنجا ئەویش جاران (×)ی (٦٠) بۆ ئەوەی سەعاتێکمان بۆ دەرکەوێ، دواییش ئەنجامەکەی جاران (×)ی (٢٤) دەکەین، بۆ ئەوەی شەوو ڕۆژێکمان بۆ دەرکەوێ، دواییش ئەنجامەکەی جاران (×)ی (٣٦٥) دەکەین، بۆ ئەوەی ساڵێکیمان بۆ دەرکەوێ، کە هەمووی دەکاتە: (٩) ترلیۆنو نیو کیلۆمەتر، ئەو ماوەیە تیشك لە ساڵێکدا دەیبڕێ.

ئنجا تیرەی ئەو بوونەوەرە کە تا ئێستا بۆ ئێمە زانراوە، بریتیە لە بیستو چوار ملیار (٢٤) ساڵی تیشکیی، یانی: تیشك بە (٢٤) ملیار ساڵ ئەوجار ئەو تیرەیە دەبڕێ[1]، ساڵی تیشکیش هەروەك گوتمان (٩,٥) ترلیۆنو نیو کیلۆمەترە، مانای وایە حیسابەکە زۆر زۆرە، چونکە دەبێ بڵێین:

٩.٥ تریلیۆن کلم × ٢٤ ملیار ساڵ =

ئنجا ئەو بەشەش کە تا ئێستا لە بوونەوەر، دۆزراوەتەوە بەردەوام لە فراوان بوون دایە، بەرەو کۆتاییەك کە تەنیا خوا دەیزانێ، وە بە خێراییەك کە ئینسان هەر دەفریای ناکەوێ! چونکە خێرایی هەندێك لە کەهکەشانەکان بۆ دوورکەوتنەوەیان لە یەکدی، نیزیك دەبێتەوە لە سێ لەسەر چوار (٤/٣)ی خێرایی تیشك، واتە:

(١) یانی: تیشك بە (٢٤) ملیار ساڵ ئنجا لەمسەری گەردوون دەچێتە ئەوسەری، لە حاڵێکدا کە تیشك (٩,٥) تریلیۆن کیلۆمەتر لە ساڵێکدا دەبڕێ!.

کەهکەشانەکان هەندێکـیان بە خێرایی یەك، کە بریتیە لە سێ لەسـەر چوار (٣/٤)ی خێرایی تیشـك، لە یەك دوور دەکـەونەوە.

هەڵبەتە پێویسـتە ئـەوەش بزانـرێ: کە هەرچی دەبینـرێ لـە کەهکەشانەکان، کـە کەهکەشانەکانیش لە ئەستێرەکان پێك دێن، هەرچی دەبینرێ، هـەمووی لـە سـنووری ئاسمانی یەکەمدایە، ئنجا نـاشزانین ئەو سنوورە لـە کوێ کۆتـایی دێ؟ وە لـە دوایـی ئەویشـەوە، ئنجـا شـەش ئاسـمانەکانی دیکە چۆنن‌و لە کـوێن؟!

هەر لە سـەرچاوەی نـاوبراودا[1] (زغلول النجار) دەڵێ: زانـایانی گەردوونـناس لـەو بەشـەی بوونەوەر کە لە سنووری ئاسمانی نیزیك لـە ئێمـەوە، (واتـە: ئاسـمانی دنیـا دایە) تـا ئێستـا دووسـەد هەزار ملیۆن (٢٠٠,٠٠٠)، واتە: (٢٠٠) ملیار (٢٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) کەهکەشانیان بەلای کـەمەوە سـەرژمێر کـردوە، کـە هەندێکـیان لـە کەهکەشانەکەی ئێمـە زۆر گـەورەترن، هەندێکیشـیان وەك ئـەون، هەندێکیشـیان کـەمێك بچووکتـرن، کەهکەشـانیش بـریتین لـە کـۆمەڵە ئەسـتێرەیەکی زۆر، کـە دووکــەڵی گـەردوونیی (الـدخان الکوني) کەوتۆتـە نێوانیـان، دیـارە لـە نێـو ئـەو کەهکەشـانەدا، ملیۆنـان ئەسـتێرە هـەن، بـۆ وێنـە: کەهکەشانی ئێمـە کە پێـی دەگوترێ: ( galaxy; Milky Way) واتـە: (مُجَـرَّةُ الـدَّرْب اللَّبَنِـي)، یـان فـارس دەڵـێن: (ڕاهـی شیـری)، کـوردیش دەڵـێن: (ڕێـی کاکێشـان) ئـەم کـا کێشـانەی ئێمـە، کـە کـۆمەڵەی خـۆر دەکەوێتـە سـووچێکیەوە، کـۆمەڵەی خـۆریش نـۆ خرۆکـەی هـەن بەدەوریـدا دەسـووڕێنەوە کـە یەکێکـیان زەوییە، ئنجا ئەو ئەستێرانەی کە لە نێو کەهکەشانەکەی ئێمەدا هـەن، بـە تریلـیۆنێك (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) کـە دەشـتوانین بڵـێین: ملیـۆن ملیـۆن، ئەسـتێرە مەزەنـدە دەکـرێن، وە تـیرەی کەهکەشـانەکەی ئێمـەش بـە (١٠٠,٠٠٠) سـاڵ تیشـکی ئەوجار تەواو دەبێ! کۆمەڵەی خۆری ئێمـەش دەکەوێتـە سـووچێکیەوە کـە (٣٠,٠٠٠) ساڵی تیشکی لە چەقی کەهکەشـانەوە دوورە.

ئنجا ئـەو کەهکەشانـانەش لـە نێـو خۆیانـدا کـۆمەڵی دیکـە پێکدەهێنن، بـۆ وێنـە: هەندێکیان کە نیزیکتـرن پێیان دەگوترێ: (المجموعة المحلیة للمجرات)، ( The Local Galaxies Group) واتـە: کـۆمەڵەی نـاوچەیی کەهکەشانەکان، بـۆ وێنـە:

---

[1] ص ٢٨٦.

کەهکەشانی ئێمە، واتە: کەهکەشانی کاکێشان، لەگەڵ کۆمەڵێکی دیکەدا کە لە بیست (٢٠) کەهکەشان زیاترن، لە گەلە کەهکەشانێکدا کۆدەبنەوە، ئنجا ئەو گەلە کەهکەشانە: تیرەکەی سێ ملیۆن‌و دوو سەدو شەست‌و یەك هەزارو پێنج سەد (٣,٢٦١,٥٠٠) ساڵی تیشکییە، (واتە: بەوەندە تیشك تیرەکەی دەبڕێ).

ئنجا ئەو کۆمەڵە کەهکەشانە ناوچەییەش، ژمارەیەکیان شتێکی دیکەی گەورەتر پێکدێنن، کە پێی دەگوترێ: (الحشود المجرية العظمى)، واتە: گەلە کەهکەشانی مەزن، کە هی وایان هەیە تیرەکەی (شەش ملیۆن‌و نیو) ساڵی تیشکییە، واتە: (٦,٥٠٣,٠٠٠) ساڵی تیشکی بەس تیرەکەی ئەستوورە.

(د. زغلول النجار) دەڵێ: تاکو ئێستا دەوری سەد (١٠٠) لەو گەلە کەهکەشانانە دۆزراونەتەوە: گەلە کەهکەشانە مەزنەکان، کە بە هەموویان شتێکی گەورەتر پێکدێنن، کە تیرەکەی (٢) ملیار ساڵی تیشکییە، وە ئەستورییەکەی (٢٠٠) ملیۆن ساڵی تیشکییە[1].

ئنجا دیارە وەك پێشتر باسم کرد، بە پێی ئەوە کە خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ ... ﴿٥﴾﴾ الملك، واتە: ئاسمانی نیزیك لە ئێوەمان بە چرایان ڕازاندۆتەوە، هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفْظًا ﴿١٢﴾﴾ فصلت، بە پێی ئەوە دیارە هەرچی دەبینرێ لە کەهکەشانەکان‌و ئەستێرەکان، هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەکەمدایەو، ئەویش هەتا ئێستا نازانین کۆتاییەکەی لە کوێیە؟

ئنجا لە سەرووی ئاسمانی یەکەمیشەوە: ئاسمانەکانی: دووەم‌و سێیەم‌و چوارەم‌و پێنجەم‌و شەشەم‌و حەوتەم، هەن، دواییش (عرش)و (سدرة المنتهى)و، بەهەشت‌و دۆزەخ‌و، ئەوەی کە خوای پەروەردگار دەیزانێ، دێن.

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ص ٢٨٩.

**برگەی دووەم: سەرەتای دروستبوونی بوونەوەر:**

ئەگەر تەماشای قورئانی بەرزو بەپێز بکەین، خوای بەدیهێنەرو پەروەردگار چەند ئاماژەیەکی فەرموون، بۆ سەرەتای ئەوە کە بە زاراوەی ئەمڕۆ پێی دەگوترێ: بوونەوەر، کە خوا ﷻ لە قورئاندا، بە: ﴿ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، یاخود (السماء والأرض)، تەعبیری لێ دەکات:

١/ یەکێك لەو ئاماژانە لە سووڕەتی (فصلت)دا خوا ﷻ لە درێژەی باسکردنی دروستکردنی ئاسمانەکانو زەویدا، پێشێ باسی دروستکردنی زەوی دەکات، لەبەر گرنگیی‌و بایەخی زێدەی بە نسبەت ئێمەوە، ئەگەرنا زەوی خڕۆکەیەکە لە نۆ خڕۆکە، کە بە هەموویان کۆمەڵەی خۆر پێکدێننو بە دەوری خۆردا دەخولێنەوە، خۆریش بۆ خۆی ئەستێرەیەکە لە یەك تریلیۆن ئەستێرە (١٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)، واتە: ملیۆن، ملیۆن ئەستێرە، کە لە کەهکەشانی کاکێشاندا هەن، وە زانایان دەڵێن: تا ئێستا زیاتر لە دوو سەد ملیار (٢٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)، کەهکەشان دۆزراونەوە.

جا خوا ﷻ کە باسی ئاسمان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ ﴿١١﴾﴾ فصلت، واتە: دوایی خوا ویستی ئاسمان دروست بکات، کە لەو کاتەدا دووکەڵ بوو، لێرە ئەو ئاماژەیە هەیە.

٢/ وە لە سووڕەتی (هود)یشدا ئاماژەیەك هەیە کە خوا ﷻ، دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ﴿٧﴾﴾، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە ئاسمانەکانو زەوی دروست کردوون لە شەش ڕۆژدا (واتە: لە شەش قۆناغدا) لەو کاتەدا بارەگای خوا لەسەر ئاو بوو.

ئێستاش نوێترین بیردۆزی زانستی، دەربارەی سەرەتای دروستبوونی بوونەوەر پشتگیری چەمكو واتای ئەم دوو ئایەتە موبارەکە دەکات، هەڵبەتە شتێك کە ئێمە لێی دڵنیا بین: خوای پەروەردگار مەبەستیەتی، پێویستییمان

نەك بە بیردۆزە، بەڵكو بە حەقیقەتی زانستیش نیە پشتگیریی بكات، چونكە ئەوەی كە خوا ﷻ دەیفەرمویٚ: خاوەنی ئەم بوون (وجود)ە، هەر هەمووی هەقەو ڕاستە، بەڵام جاری وایە چەمكو واتای ئایەتەكان بۆ ئێمە ڕۆشن نیەو، نازانین بە وردیی خوای پەنهانزان مەبەستی چییە؟ بۆیە ئەگەر بیردۆزەیەكی زانستیی، یان لێكۆڵینەوەیەكی زانستیی هەبیٚ پشتگیریی بكات، دەتوانین بڵێین: وا پێدەچیٚ ئەمە واتای ئەم ئایەتە بیٚ.

ئنجا كە لێرەدا دەفەرمویٚ: خوا ویستی ئاسمان دروست بكات، لەوكاتەدا دووكەڵ بوو، ئێستا بیردۆزەیەكی زانستیی هەیە، بەڵكو گەورەترین و پشت پیٚبەستراوترین بیردۆزەیە، دەربارەی سەرەتای دروستبوونی بوونەوەر، كە پێی دەگوتریٚ: بیردۆزەی تەقینەوەی گەورە، (نظرية الإنفجار الكبير)، ( Big banke) كە ئەم بیردۆزەیە دەڵیٚ: ئەم بوونەوەرە كاتی خۆی هەمووی ماددەی زۆر چڕ بووە، ڕژاوەتە نێو یەك، هەتا هەندێك لە زانایان دەڵێن: قەبارەی ئەو ماددەیە هەمووی لە هیچ (صفر)ەوە نیزیك بووە! ئنجا لە ئەنجامی پاڵەپەستۆی زۆر زۆری نێو خۆی دا، تەقینەوەیەكی گەورە لیٚ ڕوویداوەو، بۆتە هۆی دروستبوونی هەموو ئەو كەهكەشانانەی كە دەیانبینین، بە تەلسكۆبو دووربینەكان.

ئنجا كە خوا دەفەرمویٚ: ﴿...وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ ۝٧﴾ هود، وە بارەگای خوا لەسەر ئاو بوو، هەندێك لە زانایان دەڵێن: زۆرترین ماددە، یاخود سادەترین توخم كە بوونەوەری لیٚ دروست بووە، بریتیە لە هایدرۆجین، هایدرۆجین لە نێوكەكەیدا یەك پرۆتۆنو یەك نیو ترۆن هەیە، وە لە سوورگەكەشیدا یەك ئیلیكترۆن دەخولێتەوە، وە ئێستا خۆری ئێمەو، هەموو ئەستێرەكان كە دەسووتێن، ئەو تیشكو گەرمییە، هەمووی گازی هایدرۆجینە دەسووتیٚو دەگۆڕیٚ بۆ گازی هیلیۆم، هیلیۆمیش زیاتر لە پرۆتۆنێكو نیوترۆنێك لە نێوكەكەیدا هەیەو، زیاتر لە ئەلیكترۆنێك بە دەوری نێوكەكەیدا دەخولێتەوە.

٣/ وە لە سوورەتی (الأنبیاء)یشدا کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا ﴿٣٠﴾ ﴾، واتە: ئایا ئەوانەی بێبڕوان، نازانن کە ئاسمانەکانو زەوی پێکەوە پەیوەست بوون (پێکەوە لکاو بوون)، ﴿ فَفَتَقْنَاهُمَا ﴾، لێکمان جیا کردنەوە، کە ئەمەش ئاماژەیە بەو تەقینەوە گەورەیەی کە زانایان پێی دەڵێن: (Big banke)، تەقینەوەی گەورە، کە بە مەزندە دەڵێن: (١٥) ملیار (١٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش بووە!

ئنجا وەك گوتم خوای پەروەردگار ئاماژە بەو مەسەلەیە دەکات، کە ئەو بیردۆزە گەردوونییە گوتوویەتی، ئنجا ئەو بیردۆزە گەردوونییەش، کە وەك گوتم: پشت پێ بەستراوترین بیردۆزەیە، بۆ چۆنیەتی دروستبوونی بوونەوەرو، بۆ چۆنیەتی کۆتایی پێهاتنی بوونەوەریش، چونکە هەر خاوەنانی ئەو بیردۆزەیە، کە زۆربەی زانایانی گەردووناسن، دەڵێن: چونکە لە ئەنجامی ئەم تەقینەوەیەدا، کەهکەشانەکان بە خێراییەکی زۆری نیزیك لە سێ لەسەر چواری (٤/٣)ی خێرایی تیشك، تیشکیش لە یەك چرکەدا (٣٠٠,٠٠٠) کیلۆمەتر دەبڕێ کەهکەشانەکان لێك دوور دەکەونەوەو، لەوکاتەوە کە ئەو تەقینەوەیە بووە، کەهکەشانەکان هەر لێك دوور دەکەونەوە، دەڵێن: نازانین تا کەیو بۆ کوێ؟ بەلام دوایی جارێکی دیکە دیسان لێك نیزیك دەکەونەوە، کە ئەمەش خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأنبیاء)دا ئاماژەی پێدەدات، دەفەرموێ : ﴿ يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَا ۚ إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ ﴿١٠٤﴾ ﴾، ئەو ڕۆژەی کە ئاسمان (ئاسمانیش یانی: هەموو دروستکراوەکانی خوا، بە زەویشەوە، کە زەوی بەشێکی بچووکە لە ئاسمان، چونکە وشەی: ﴿ السَّمَاءَ ﴾، یان ﴿ السَّمَاوَاتِ ﴾، یان ﴿ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ ﴾، هەموو ئەوەی کە ئێمە پێی دەڵێن: دروستکراوی خوا (خلق الله) هەمووی دەگرێتەوە، خوا دەفەرموێ: ئەو ڕۆژەی کە هەموو ئەم بوون (وجود)ە،

دەپێچینەوە وەك چۆن تۆمارێك كە شتی تێدا دەنووسرێتەوە، دەپێچرێتەوە، وەك چۆن یەكەم جار دروستمان كردوە، دوای ئەوەی كە دەپێچرێتەوە، جارێكی دیكە دەیگێڕینەوە ﴿نُّعِيدُهُۥ﴾، ئنجا بێگومان (إعادة)، بۆ ئەوەیە كە شتێك كە دروست بووە، لەبەین دەچێ، یان گۆڕانێكی بەسەردا دێ، بەڵام دووبارە وەك پێشێ، هەڵبەتە بە شێوەیەكی دیكە، دروست دەبێتەوە، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿وَعْدًا عَلَيْنَآ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾، ئەوە گفتی ئێمەیەو لە سەرمانە كە جێبەجێی دەكەین.

چونكە خوای كارزان پێش ئەوەی ئەم بوونەوەرە بخوڵقێنێ، پێش ئەوەی ئەم دروستكراوانە بخوڵقێنێ، بەرنامەو نەخشەیەكی بۆ داناوەو بەرنامەو نەخشەی خوای پەروەردگاریش گۆڕانی بەسەردا نایەت، وەك دەفەرموێ: ﴿لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ﴿٦٤﴾﴾یونس، واتە: بڕیارەكانی خوا گۆڕانیان بەسەردا نایەت، چونكە بڕیارەكانی خوا ﷻ، نەخشەی خوا، بە پێی زانیاریی بێسنووری خوا، دانراوە، شتێكیش بە پێی زانیارییەكی تەواو دانرابێ، گۆڕانی بەسەر دانایەت، ئەوانە گۆڕان بەسەر پلانو نەخشەی خۆیاندا دێنن، كە نەزانیی تێكەڵ بە زانستەكەی خۆیان دەكەن، یاخود لەسەر بناغەی نەزانییو بێئاگایی دایاننـاوە، بۆیە دوایی كە بۆیان دەردەكەوێ هەڵەن، بە ناچاریی چاوی پێدا دەگێڕنو نەخشەكەیان دەگۆڕن، بەڵام خوا ﷻ هیچ شتێك نیە كە نەیزانێ، هەموو شتێكی زانیوەو، پێش ئەوەی ئەم دروستكراوانە دروست بكات، سەرەنجامەكەیانی لێ دیار بووە.

زانایانی گەردوونناس، وەك (زەغلول نەجار) و (هاروون یەحیا) و خەڵكی دیكەش باس دەكەن، دەڵێن: دوای یەك چركە لەو تەقینەوە گەورەیە ( Big banke) پلەی گەرمیی بوونەوەر لە یەك تریلیۆن (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) پلەی ڕەهاوە، دوای چركەیەك دابەزی بۆ (١٠) ملیار (١٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) پلەی ڕەها، وە لەو كاتەدا دووكەڵ پەیدابوو، ئنجا ئایا ماددەیەك كە خوا بە دووكەڵ (الدخان) تەعبیری لێ كردوە، لە چی پێكهاتوە؟ لە فۆتۆنەكانو ئەلیكترۆنەكانو

نیوتریۆنەکان، کەمێکیش لە نیوترۆنو پرۆتۆنەکان، بەڵام پاش دابەزینی پلەی گەرمی بۆ ملیارێك، واتە: پێشێ لە یەك تریلیۆن پلەی ڕەهاوە دابەزی بۆ (١٠) ملیار، دوایی لە (١٠) ملیارەکەش دابەزی بۆ ملیارێك پلەی گەرمیی، ئنجا پرۆتۆنو نیوترۆنەکان یەکیان گرتو، نێوکی هایدرۆجینیان پێك هێنا، پاشان هیلیۆم پێکهات، دوایی توخمەکانی دیکەش.

بەڵێ سەرەتای دروستبوونی بوونەوەر، بە پێی ئاماژەکانی قورئانو، بە پێی نوێترین بیردۆزەی زانستیی، کە تیشکی زیاتر دەخەنە سەر ئاماژەکانی قورئان، دروستبوونی ئەم ئاسمانو زەوییە، ئەم سەرو خواری دروستکراوانە، بەو شێوەیە بووە.

هەڵبەتە شت زۆر زۆرە لەوبارەوە بگوترێ، بەڵام ئێمە هەوڵدەدەین بە کورتیی‌و پوختی‌و بە شێوەیەکی واش کە بۆ هەموو کەس جێی لێ تێگەیشتن بێ، باسی ئەو جۆرە مەسەلانە بکەین.

**<u>برگەی سێیەم:</u> ئایا ئەم بوونەوەرە، هەمووی بە مرۆڤەوە پەیوەستە؟**

بە پێی چەند ئایەتێك لە قورئانی بەرزو مەزن دا، دەردەکەوێ کە هەموو بوون (وجود) بە مرۆڤەوە پەیوەستە، نەك تەنیا بوونەوەر واتە: ئەوەی کە تا ئێستا بۆ بەشەر دەرك کراوە لە دروستکراوەکانی خوا، کە وەك گوتم: وا پێدەچێ هەرچی دەرك کراوە بە هۆی تەلەسکۆبەکانەوە، هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەکەم دابێ، بەڵگەمان لەوبارەوە چییە ؟!

یەکەم: بە بەڵگەی ئەوە کە لە سوورەتی (الملك)دا کە خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَـٰبِيحَ وَجَعَلْنَـٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَـٰطِينِ ۖ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ﴿٥﴾ ﴾، واتە: وە ئێمە ئاسمانی نیزیکمان (یانی: ئەو ئاسمانەی کە لە ئێوە نیزیکترە) ڕازاندۆتەوە بە چرایەکان (کە مەبەست پێیان ئەستێرەکانە) کەواتە: هەرچی ئەستێرەیەو، هەرچی کەهکەشانە کە لە ئەستێرەکان پێك دێن‌و،

وە هەرچی كۆمەڵە كەهكەشانە، هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەكەمدایە، بە پێی ئەم ئایەتە.

دووەم: هەروەها بە پێی ئایەتی ژمارە (١٢) لە سوورەتی (فصلت) لەوێش دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗا ﴿١٢﴾﴾، وە ئاسمانی نیزیكی ئێوەمان بە چرایان ڕازاندۆتەوەو، كردوومانە بە مایەی پاراستنیشی.

كەواتە: هەرچی پەی پێبراوە، هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەكەمدایە، ئنجا ئایا ئەو ئاسمانی یەكەمەش لە كوێ كۆتایی پێ دێ؟ تا ئێستا زانست هیچی لێ نازانێ، چونكە خوای پەروەردگار لە چەندان ئایەت دا هەواڵی پێداوین كە حەوت ئاسمانی دروست كردوون، ئنجا دەشفەرموێ: كە ئاسمانی نیزیك لە ئێوەمان بە چرایان ڕازاندۆتەوە، كەواتە: دەبێ ئاسمانەكانی: دووەمو سێیەمو چوارەم پێنجەمو شەشەمو حەوتەم، جۆرێكی دیكە بن، چونكە هەرچی ئەستێرەیە كە خوای زاناو شارەزا بە ﴿بِمَصَٰبِيحَ﴾، تەعبیری لێكردوون، یانی: چرایەكان، هەرچی ئەستێرەیەو دەبینرێ، هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەكەمدایە، ئنجا ئەوەش لە كوێ كۆتایی پێ دێ؟ هەر خوا دەیزانێ، كە ڕەنگە دوایی زانست بۆ دەربكەوێ.

ئنجا ئایا ئەو دروستكراوانە هەموویان، ئەو ئاسمانو زەوییە، هەمووی پەیوەستە بە ژیانی مرۆڤەوە؟ بە پێی چەند ئایەتێك، دەڵێین: بەڵێ، با بزانین چۆن؟

یەكەم: لە ئایەتی ژمارەی (٧)ی سوورەتی (هود) دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۗ ﴿٧﴾﴾، واتە: خوا ئەو كەسەیە كە ئاسمانەكانو زەوی دروست كردوون، لە شەش ڕۆژاندا، (بە شەش قۆناغ) وە بارەگای خوا لەسەر ئاو بوو، تاكو تاقیتان بكاتەوە كامەتان كردەوەی باشترە.

زانایان دەڵێن: هەر گەرد (Molcol) (جُزء)ێكی ئاو لە دوو گەردیلەی هایدرۆجینو گەردیلەیەكی ئۆكسجین پێك دێ، واتە: ڕەمزە كیمیاییەكەی

($H_2O$)یــە، کەواتــە: زۆربــەی، یــان دوو لەســـەر ســێی (٣/٢) پێکــهێنەری ئــاو هایدرۆجینە، ئنجا کە خوای بەدیهێنــەر دەفەرموێ: عەرشی خـوا لەســەر ئـاو بـوو، ئــاویش: پێکــهێنەرە سـەرکییەکــەی هایدرۆجینــە، زانــایانیش دەڵــێن: ئەوکاتــە توخمی (هایـدرۆجیـن) زۆربەی هـەرەزۆری ماددەی پێك دەهێنـا، کە دیــارە ئــەویش لە قورئـان دا بـە هـەرکـام لـە وشـەی (الـدخان)و ئـاو (الـماء) تەعبیـری لێکراوە، واتە: کەرەسـەی خـاوی بوونەوەر.

هەڵبەتـە ئـەوە بۆچـوونی هەنـدێك لـە زانــایانە کـە: تەعبیــری (عەرشی خــوا لەسـەر ئــاو بـوون) واتـە: ئەوکــاتە موڵــك‌و سـەڵــتەنەتی خـوای پەروەردگــار، لــەو ماددە خــاوەدا بەرجەسـتە دەبـوو، وە دەشگونجــێ مەبەســت ئەوەبــێ، کـە: عەرشـی خوا ﷻ لـەسـەر ئــاو (الـماء) ڕاوەســتابــێ‌و قـەراری گرتبـێ.

ئنجـا کە خـوا عزّ وجلّ دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾

خـوا ئەو کەسـەیە کە ئاسمانەکان‌و زەوی لە شـەش ڕۆژان دا (بـە شـەش قۆنــاغ) هێنــاونەدی لــە حاڵــێك دا کــە بــارەگــایەکەی لەســـەر ئــاوێ بــوو، تــاکو تــاقییتــان بکاتەوە، کامەتــانە کردەوەی بــاشــترە..

کەواتە: بــوون (وجـود) ســەرلەبەری بــە مرۆڤــەوە پەیوەســـتە، هــەموو بــوون بــە مەبەســتی تــاقیکرانەوەی مرۆڤ ، هێنراوەتــەدی.

دووەم : لــە ئایــەتی ژمــارە (١٣)ی ســوورەتی (الجاثیــة)یــش دا خــوا ﷻ دەفــەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: وە هــەرچی لــە ئاســمانەکان‌و زەویــدایــە خــوا (لەلایەن خۆیــەوە) بـۆ ئێــوەی دەســتەمۆو ڕامکــردوە، بــۆ ئێــوەی ملکــەچ کــردوە، کــەواتە: هەرچــی لــە ئاســـمانەکان‌و زەویــدا هەیــە، پەیوەندیی هەیە بە ژیانی مرۆڤــەوە.

**سێیەم :** هەروەها لە سوورەتی (لقمان)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً ﴿٢٠﴾ ﴾، واتە: ئایا نابینن! ئایا سەرنج نادەن! (بە چاوی عەقڵو دڵ نابینن) کە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوی دا هەیە، خوا بۆ ئێوەی دەستەمۆ کردوە (واتە: بۆی وا لێکردوون کە لێی بەهرەمەند بن)، وە چاکەو نیعمەتەکانی خۆی بە پەنهانییو بە ئاشکرا بەسەر ئێوە دارشتوون، کەواتە: هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە، هەمووی پەیوەستە بە ژیانی مرۆڤەوەو، بەو ئەرکەی کە بە مرۆڤ سپێردراوە، کە بریتیە لە جێنیشینایەتیی خوا لەسەر زەوی‌و، هەڵگرتنی ئەمانەتی خواو تاقی کردنەوەی.

**چوارەم :** خوا لە سوورەتی (الملك)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ ... ﴿٢﴾ ﴾، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە مەرگو ژیانی هێناونە دی، تاکو تاقیتان بکاتەوە.

**پێنجەم :** هەروەها خوا لە سوورەتی (الكهف)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾، واتە: ئێمە ئەوەی کە لەسەر زەوییە، کردوومانە بە جوانییو ڕازاندنەوەی، تاکو تاقییان بکەینەوە، کامەیان کردەوەی باشترە.

کەواتە: هەم دروستکرانی ئاسمانەکانو، هەم دروستکرانی زەوی‌و، هەر دروستکراوێکی دیکەش، هەمووی پەیوەستە بە ژیانی مرۆڤەوە، کە ئەوەش بەڕاستی وا لە مرۆڤ دەکات، خۆی زۆر لەلا گرنگو گەورەو جێی بایەخ بێ، نەك وەك بیردۆزە ماددییەکانو بیردۆزە ئاژەڵییەکان دەڵێن، کە تەنیا وەك دروستکراوێکی ئاسایی مەیموون زادەو، درێژکراوەی ئەو زیندەوارانەی کە لە ئەنجامی گەشەسەندنو پەرەسەندن دا، دروست بوون، وەك بیردۆزەی گەشەسەندنو پەرەسەندنی (تشارلز داروین) باسی دەکات، بەڵکو لە ڕوانگەی

قورئـانەوە، ئینسـان جێنشـینی خوایەو، ئەم ئاسـمانـانەو ئەم زەوییـەو، هەرچی دروسـتکراوە، هـەمووی بـۆ ئەوەیـە کـە مرۆڤ لێـی بەهرەمەنـد بـێ، کـەواتە: لـە ئیسـلام دا مرۆڤ پێگـەو پایەیەکی زۆر بـەرزو گـەورەی هەیـە.

بەڵـێ، کـاتێك کـە خـوای پەروەردگـار دەفـەرموێ: ئێـوەم کـردوە بـە جێنشـین لەسـەر زەوی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ ... ﴿١٦٥﴾﴾الأنعـام، ئـەوە وا لە مرۆڤ دەکـات کە بـە شـێوەیەکی دیکە تەماشـای خـۆی بکـات، نـەك خـۆی بـە مـەیموون زادەو درێـژکراوەی ئەمیبـاو بۆقـۆ قـرژاڵ بزانـێ! کە وردە وردە گەشـەی کردبـێ، تـاکـو بۆتـە مـەیموون‌و دوایـی جۆرەکـانی ئینسـانی: نیاندەرتـاڵ‌و جـاوەو پەککـین، تـاکـو گـەیشـتوە بـە مرۆڤـی ئێسـتـا، وەك بـیردۆزەی داروین دەڵـێ، کـە زانـایانی ڕۆژئـاوایی هەر لە مێـژە ئەو بیـردۆزەیـان هەڵوەشـاندۆتەوە.

<u>**بڕگـەی چوارەم‌و کـۆتـایی**</u> : حیکمـەتی خوا لە دروستکردنی بوونەوەردا چییە؟

خـوا بۆچـی ئـەم بوونـەوەرەی هێنـاوەتە دی؟ ئـەوەی کـە دەیبیـنین‌و ئـەوەی کـە نـایبینین؟! چونکە خـوای بەدیهێنـەر بـاسی ئـەوە دەکـات‌و لـە سـوورەتی (الحاقة)دا دەفەرموێ: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿٤٠﴾﴾ واتە: نەخێر (ڕاست نـاکەن، ئەی بێبڕوایەکـان) سوێند دەخـۆم بـەوەی کـە دەیبیـنن‌و، بـەوەی کـە نـایبینن، ئـەم قـورئانە قسـەی نوێنـەرێ ڕەوانـەکراوێکی بـەڕێزە (کـە جبـریلەو ئـەویش دەیگەیـەنێ بـە پێغـەمبەری خاتـەم ﷺ) کەواتـە: ئـەم دروستکراوانەی خوای بەخشـەر، هەم بەرهەست‌و بینـراویان هەیە، هەم نابەرهەسـت‌و نـابینراویشـیان هەیـە.

ئنجا خـوا ﷻ ئەوەندەی من سـەرنجی قورئـانم داوە، ئـەو حەقیقەتـە مەزنـەی زۆر جەخـت لەسـەر کـردۆتـەوە، کـە ئـەم دروسـتکراوانە، ئەم حەوت ئاسمان‌و زەوییەی بە هەق دروسـت کـردوون، مـن کـەم حەقیقـەتم بینیـوون لـە قورئانـدا، هێنـدە جەختیـان لەسـەر کرابێتـەوە، چونکـە جاری وایـە خـوای زانـاو شـارەزا یـەك حەقیقـەت، یـەك ئایـەتی بۆ تـەرخـان دەکـات، بۆ وێنـە:

١) ئـەوە كـە دوای هـاتنی (سـاعة)یـانی: تێكچوونی ئـەم كـەون‌و كائینـاتە، وە هاتنـی (قیامـة) یانی: هەڵسانەوەی خەڵك بـۆ لێپرسینەوەو سزاو پاداشـت، خـوا هەواڵـی پێـداوین كـە: نـە زەوی‌و نـە ئاسمانـەكان هیچیان وەك خۆیـان نـامێنن، وەك لـە سـوورەتی (إبـراهیم)دا دەفـەرموێ: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتـە: ئـەو ڕۆژەی كـە، زەوی‌و نـە ئاسـمانەكان وەك خۆیـان نـامێنن، واتـە: بـە جۆرێكـی دیكـە دروسـت دەكرێنـەوە. كـە ئـەوە ڕوونكردنـەوەكەی لـە ئایەتەكـەی سـوورەتی (الأنبیـاء)دا هـاتوە، كـە دەفـەرموێ: ﴿ يَوْمَ نَطْوِى ٱلسَّمَآءَ كَطَىِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾ ﴾، خـوای كـارزان لـە یـەك ئایـەت دا ئامـاژەی كـردوە بـۆ ئـەم بـابەتە، كـە ئـەم بـازاڕو وەزعـەی كـە ئێسـتا دەیبینین لـە ڕۆژی دواییـدا بە شـێوەیەكی دیكە دایدەڕێژێتـەوە، خـوا یـەك ئایەتی بە بەس زانیوە.

٢) هەروەهـا ئـەوە كـە ئێمـە بـە جۆرێكی دیكـە دروسـت دەكرێینـەوە لـە قیامەتـداو، مەرج نیـە هـەر بەو شـێوەو جەستەیەی ئێسـتامان بێ، چونكە جۆرە ماددەیـەكی دیكەمان دەبێ‌و، جۆرە پێكهاتەیەكی دیكـەمان دەبێ، خوای كاربەجێ لـە سـوورەتی (الواقعـة)دا یـەك ئامـاژەی بـە كافـی زانیـوە، دەفـەرموێ: ﴿ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ ﴾، واتـە: وە بـە شـێوەیەك دروستتـان دەكەینـەوە، كـە نـازانن، واتـە: پێكهـاتەی جەسـتەیی ئێسـتاتـان دەگـۆڕێ، چـونكە لـە بەهەشـتدا وەك لـە فەرمایشتەكانی پێغـەمبـەردا ﷺ زۆر بـە ڕاشكاویی باسـكراوە كـە: لـە بەهەشـتدا ئـەو پاشـەڕۆكـانەی كـە لـە ئینسـان پەیـدا دەبـن: چڵـم‌و بەڵـغەم‌و تـف‌و میـزو پیسایی‌و ئەوانە نابن، كەواتە: جۆری پێكهاتەی جەستە دەگۆڕێ، ئنجا خوای زاناو توانا یەك ڕستەی بە بەس زانیوە بۆ ئـەوە، ﴿ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ ﴾، بـە جۆرێكی دیكە دروستتـان دەكەینـەوە، كـە ئێوە نـازانـن چۆنـە؟ بـەڵام بۆ ڕاگـەیاندنی ئـەوە كـە ئـەم بـوون (وجـود)ە هـەمووی، بـە هـەق دروسـتكراوە، وە

حیکمەتی تێدایە، بە لای کەمەوە وەك من سەرنجی قورئانم داوە، لە شازدە (١٦) شوێندا خوای پەروەردگار ئەوەی باس کردوە. کە ئەمانەن:

کە بە پێی ڕیزبەندیی سوورەتەکان هێناومن:

١ - لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ﴿٧٣﴾ ﴾، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە ئاسمانەکانو زەوی بە هەق دروست کردوون. واتە: بە حیکمەت بۆ ئامانجێك.

٢ - لە سوورەتی (یونس)دا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴿٥﴾ ﴾، کە پێشتر تەفسیرمان کرد.

٣ - لە سوورەتی (هود)دا پێشتر خوێندمانەوە، کە خوا عزّ وجل فەرمووی: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۗ ﴿٧﴾ ﴾، واتە: وە (خوا) ئەو کەسەیە کە ئاسمانەکانو زەوی بە شەش ڕۆژان دروستکردوونو، لەوکاتەدا عەرشەکەی لەسەر ئاوێ بوو، تاکو خوا تاقیتان بکاتەوە، داخۆ کامەتان کردەوەی چاکترە! واتە: حیکمەتی تێدایە کە ئاسمانەکانو زەوی دروست کردوون.

٤ - لە سوورەتی (إبراهیم)دا دیسان خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ ﴿١٩﴾ ﴾، واتە: ئایا نابینی (نازانی) کە خوا ئاسمانەکانو زەوی بە هەق دروست کردوون (نەك بە بەتاڵو پووچو بێ حیکمەت).

٥ - هەروەها لە سوورەتی (الحجر) ئایەتی (٨٥)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ ۖ فَٱصْفَحِ

ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ ﴿٨٥﴾ ﴾، واتە: ئێمە ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی دەکەوێتە نێوانیشانەوە، بە هەق نەبێ دروستمان نەکردوون، بێگومان (ساعة)ش دێ (واتە: ئەوکاتەی کە تۆماری ئەم بوونەوەرەی ئێستای تێدا دەپێچرێتەوە دێ). دەجا تۆش (ئەی موحەممەد!) چاوپۆشیی جوان بکە.

٦ - هەروەها لە سوورەتی (النحل)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ تَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٣﴾ ﴾. واتە: (خوا) ئاسمانەکانو زەوی بەهەق هێناونەدی، بەرزیی (بۆ خوا) لەوەی دەیکەنە هاوبەشی.

٧ - لە سوورەتی (الأنبياء)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿١٦﴾ ﴾، واتە: ئێمە ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، بە گاڵتە دروستمان نەکردوون.

٨ - لە سوورەتی (المؤمنون)، ئایەتەکانی: (١١٥و ١١٦)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَحَسِبۡتُمۡ أَنَّمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ عَبَثٗا وَأَنَّكُمۡ إِلَيۡنَا لَا تُرۡجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۖ ﴿١١٦﴾ ﴾، واتە: ئایا پێتان وایە ئێوەمان بە هەومنتەو بێ حیکمەت دروست کردوەو، بۆ لای ئێمە ناگێڕرێنەوە؟ بەرزیی بۆ خوای پادشای هەق (کە شتی بێ حیکمەت بکات).

٩ - لە سوورەتی (العنكبوت)دا، دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾، واتە: خوا ئاسمانەکانو زەوی بە هەق دروست کردوون، لەوەدا نیشانە هەیە بۆ بڕواداران.

١٠ - لە سوورەتی (الروم)دا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَأَجَلٖ مُّسَمّٗىۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ

بِلِقَآيِ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ ﴾، واتە: ئایا سەرنجیان نەداوە، بیریان نەکردۆتەوە، ڕانەماون، کە خوا ئاسمانەکانو زەوی ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، بە هەقو بۆ کاتێکی دیاریکراو نەبێ دروستی نەکردوون ! بەڵام زۆر لە خەڵکی بێبڕوان بە دیداری پەروەردگاریان.

١١ - لە سوورەتی (ص)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: ئێمە ئاسمانو زەویو ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە بێ حیکمەتو بە هەوەنتە دروستمان نەکردوون، ئەوە گومانی ئەوانەیە کە بێبڕوان، (پێیان وایە دنیا شاری بێ خاوەنە).

وەك یەکێکیان بە عەرەبی گوتبووی: (الأَرْحَام تَدْفَعُ وَالقُبُورُ تَبْلَع) مندالّدان دەر داوێن، گۆڕەکانیش قووت دەدەن، هەموو شتێك کۆتایی پێ دێ، ئەوە گومانی بێبڕوایەکانە لەبەر ئەوەی تەنیا ڕواڵەتێك دەبینن‌و، کە تەماشای ئەو دیاردە سروشتییانەو ئەو بوونەوەرە دەکەن، وەك نیشانەکانی خوا نایبینن، دیوە پەنهانەکەی نابینن، هەر ڕواڵەتەکەی دەبینن، وەك چۆن ئاژەڵێك تەماشای شتێك دەکا، تەنیا ڕواڵەتەکەی دەبینێ، هیچ لە دیوە پەنهانەکەی تێناگات.

١٢ - لە سوورەتی (الزمر)دا دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ﴿٥﴾ ﴾، واتە: خوا ئاسمانەکان‌و زەوی بە هەق دروست کردوون.

١٣ - وە لە سوورەتی (الدخان)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾، واتە: ئێمە ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئەوەی نێوانیانمان بە گاڵتەو یاریی دروست نەکردوون، تەنیا بە هەق دروستمان کردوون، بەڵام زۆربەیان (واتە: زۆربەی بێبڕوایان) نازانن.

١٤ - هەروەها لە سوورەتی (الجاثیة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾،
واتە: وە خوا ئاسمانەکانو زەوی بە هەق دروست کردوونو، تاکو هەر کەسە سزاو پاداشتی خۆی وەربگرێ، بێ ئەوەی کە ستەمیان لێ بکرێ.

١٥ - لە سوورەتی (الأحقاف)دا خوا فەرموویەتی : ﴿ مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ
وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَمَّآ أُنذِرُوا۟ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ ﴾ ،
واتە: وە ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی نێوانیانمان بەس بەهەقو بۆ کاتێکی دیارییکراو هێناوەتەدی، وە ئەوانەی بێبڕوان لەوەی لێی ترسێنراون، پشت هەڵکردوون.

١٦ - لە سوورەتی (القیامة)دا دەفەرموێ: ﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾ ﴾،
ئایا مرۆڤ پێی وایە ئاوا وازی لێ دەهێنرێ (لێی ناپرسرێتەوە) ؟!

ئەمە شازدە (١٦) ئایەت، کە هەموویان ئەو حەقیقەتە دووپات دەکەنەوەو، جەخت لەسەر ئەو حەقیقەتە دەکەنەوە: کە ئەم کەونو کائیناتە، ئەم بوونەوەرە، ئەم دروستکراوانە بەهەقو حیکمەت دروست کراون.

ئنجا ئایا حیکمەتەکە چییە؟ هەقەکە چییە؟

خوای پەروەردگار ڕوونی کردۆتەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾الجاثیة، واتە: تاکو هەرکەسە بەپێی ئەوەی کردوویەتی، سزاو پاداشت بدرێتەوەو، ئەوان ستەمیان لێ ناکرێ.

کەواتە: هەقو حیکمەتەکە ئەوەیە بە نسبەت ئێمەی مرۆڤەوە، کە هەر کەسە دەبێ پڕ بە پێستی خۆی سزا، یاخود پاداشت وەربگرێ، چونکە وشەی (جزاء)، لە قورئاندا هەم سزا دەگرێتەوە، هەم پاداشت، (ثواب)و (عقاب).

لە کۆتایی ئەم کورتە بابەتەدا، دەپرسین: ئایا بوونەوەر تەنیا بە ژیانی ئێمەوە پەیوەستە؟ ئایا بێجگە لە ئێمە کەسی دیکە لەم بوونەوەرەدا نیە؟ ئنجا ئایا پێش ئێمە خوا کێی دیکەی دروست کردوە؟ ئایا پێش ئەم بوونەوەرە خوا چی دیکەی دروست کردوە؟ ئایا دوای ئێمە، خوای زاناو توانا، چی دیکە دروست دەکات؟!

خوشك‌و برایانی بەرێز!

ئەم پرسیارانە ـ بە بۆچوونی من ـ زۆر لەوە گەورەترن، کە بەو ئەندازە کەمە زانیارییەی کە بە ئێمە دراوە، وەڵام بدرێنەوە، چونکە بە دەقی ئایەت خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾ الإسراء، واتە: دەربارەی ڕووح، پرسیارت لێ دەکەن، بڵێ: ڕووح لە فەرمانی پەروەردگارمە (واتە: بە فەرمانی ڕاستەوخۆی خوا دروست بووە) ئێوەش تەنیا ئەندازەیەکی کەم زانیارییتان پێدراوە، واتە: بەو ئەندازە کەمە زانیارییە، ناتوانن چییەتو نێوەڕۆکی ڕووح دەرك بکەن.

ئنجا ئینسان دەبێ خۆی بناسێ، وەك گوتراوە: (رَحِمَ اللهُ آمْرِءاً عَرَفَ قَدْرَ نَفْسِهِ، فَوَقَفَ عِنْدَ حَدِّهِ)، واتە: خوا بەزەیی بە کەسێکدا بێتەوە، کە ئەندازەی خۆی دەزانێ‌و لە سنووری خۆی دەوەستێ.

با تەماشا بکەین :

١) خوای پەروەردگار لە سوورەتی (غافر) ئایەتی (٥٧)دا دەفەرموێ: ﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾، واتە: دروستکرانی ئاسمانەکان‌و زەوی، گەورەترە لە دروستکردنی خەڵك، بەڵام زۆربەی خەڵك نازانن (هەر دەوروبەرو ڕواڵەتی خۆیان دەبینن‌و، کورت ببینن).

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە مەرج نیە تەنیا ئێمە لەم بوونەوەرەدا هەبین، بەڵێ ئەم بوونەوەرە پەیوەستە بە ئێمەوە، بەڵام مەرج نیە تەنیا پەیوەست بێ بە

ئێمەوە ئەوە دیارە کە فریشتەو جندیش هەن، بەڵام ئایا ئەم بوونەوەرە تاکە ئامانجو حیکمەت لێی تەنیا ئەوەیە کە ئێمە تاقی بکرێینەوە، بەڵێ، حیکمەتو ئامانج لەم بوونەوەرە بە پێی ئەم ئایەتانە کە باسم کردن، بە تایبەتی ئایەتی (٧)ی سوورەتی (هود) ئەوەیە کە ئێمەی تێدا تاقی بکرێتەوە، بەڵام ئایا تەنیا بۆ ئەوەیە؟ ناتوانین بڵێین، بەڵێ، بۆچی؟

چونکە بۆ ئێمە، ئەوە شتێکی نەزانراوە، بەڵێ دەزانین کە یەکێك لەو حیکمەتو ئامانجانەی خوا ﷻ کە ئەم دروستکراوانەی بۆ دروست کردوون، تاکو ببنە شوێنی تێدا تاقیکرانەوەی مرۆڤ، هەمووشی پەیوەستە بە ژیانی مرۆڤەوە، بە پێی ئایەتەکان کە زۆر بە ڕوونیی دەیگەیەنن، بەڵام ئایا دروستکراوەکان تەنیا پەیوەستن بە مرۆڤەو، تەنیا بۆ ئەوەن کە مرۆڤیان تێدا تاقی بکرێتەوەو، هیچ ئامانجو حیکمەتی دیکەیان تێدا نیە؟ ئایا دەبێ دروستکراوی دیکەی وەك ئێمەش نەبن، ئایا دەبێ حیکمەتو ئامانجی دیکەش جیا لەوە، یاخود وێڕای ئەوە، کە ئێمە تاقی دەکرێینەوە، لەم بوونەوەرەدا، دەبێ شتێکی دیکەش نەبێ؟ نازانین.

٢) لە سوورەتی (الکهف) ئایەتی (٥١)دا، خوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا ٥١﴾، واتە: من بۆ دروستکرانی ئاسمانەکانو زەویو، تەنانەت دروستکرانی خۆشیان، ئامادەم نەکردوون لەو کاتەدا (پێشانم نەداون، پرسم پێ نەکردوون)، وە ئەوانەی کە خەڵك گومڕا دەکەن نایانکەم بە پشتیوان.

ئەمەش وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە، کە هەندێك لە مولحیدەکان دەیکەن، جارێك کابرایەکی مولحید دەیگوت: خوا بۆچی منی دروست کردوە، بۆچی پرسی پێ نەکردووم؟

منیش گوتم: ئاخر تۆ زۆر لەوە بچووکتر بووی پرس بە تۆ بکات، جارێ کە تۆ نەبی، پرسی چیت پێ بکات! پاشان ئێمە زۆر لەوە بچووکترین کە خوا

ﷺ یەك بە یەك ئەو خەڵکە بێنێ بفەرمویٚ: ئەریٚ فلاّن کەس! دروستت بکەم یان نا؟!

ئاخر جاریٚ کە تۆ نەبی، خوا چۆنت پرس پیٚ بکات؟

بەدڵنیایی ئەوە مەحاڵە، ئنجا لە فەرزی مەحاڵیش دا، گریمان ئەگەر گونجا بووایە، خوا عزّ وجلّ پرس بکات: ئەریٚ فلاّن کەس دروستت بکەم، یان دروستت نەکەم! کیٚ دەڵیٚ هەموومان دروستکردنو بوونمان هەڵنەدەبژارد، بەسەر نەبوونماندا؟! بەهەرحاڵ، بەلاّم هەر چۆنێك بیٚ، مرۆڤ لەوە بچووکترە، وەك خوا لە سوورەتی (الأنبیاء)دا دەفەرمویٚ: ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ واتە: خوا لێی ناپرسریٚ بۆ ئەوەی کە دەیکات، بەلاّم ئەومیان لێیان دەپرسیٚ. {خوا لێیان دەپرسیٚ}.

بەڵیٚ پایەی بەرزی خوا، زۆر لەوە بەرزترە کە ئاوا بیری لیٚ بکرێتەوە، کە تۆ وەك مرۆڤێك تەماشای بکەی، بۆچی ئەومت کردوەو بۆچی ئەومت بۆ نەکردوە، بۆچی پرست پیٚ نەکردم؟! مرۆڤ ئاوا لە کەولّی خۆی دەرنەچیٚ باشترە، خۆی بناسیٚ باشە.

کەواتە: ئەوەی من تێی دەگەم، ئەوەیە کە: بەڵیٚ ئەم بوون (وجود)ە، کە مەبەستم پێی ئاسمانەکانو زەوی هەموویەتی، پەیوەستە بە مرۆڤەوە، بەلاّم مەرج نیە تەنیا پەیوەست بیٚ بە مرۆڤەوە، بەلاّم ئایا چی دیکە هەیە؟! ئەوە مەگەر دوایی خوای پەنهانزان مرۆڤ زیاتر بەرەو پێش بەریٚ لە رووی زانستییەوەو، نهێنییەکانی ئەم بوونەی زیاتر بۆ کەشف بن، وەك بەڵێنی داوە لە کۆتایی سوورەتی (فصلت)دا، کە دەفەرمویٚ: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾، واتە: بە تەئکید لەمەو دوا نیشانەکانی خۆمانیان (واتە: نیشانەکانی کە دەیانگەیەنن بەوەی کە ئەم کەونو کائیناتە خاوەنو بەدیهێنەرو مشورخۆرێکی هەیە) پێشان دەدەینو بۆیان دەردەخەین لە ئاسۆیەکانداو، لە

خودی خۆشیاندا، تاکو بۆیان دەردەکەوێ کە خوا هەقە، یاخود قورئان هەقە، کە ئەو هەموو نیهێنییانەی تێدان، ﴿أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾، ئایا بەس نیە بۆ پەروەردگارت کە لەسەر هەموو شتێك ئاگادارەو، هیچ شتێك لە زانیاری وی ون نابێ‌و، هەموو شتێك لە ژێر ڕکێف‌و کۆنتڕۆڵی ئەودایە!

کەواتە: لە داهاتوودا، وەڵامی ئەو پرسیارانەو، زۆر پرسیاری دیکەش بۆ ئێمە ڕوون دەبنەوە، بەڵام ئێستا کە دیارە قسە لەسەر تێگەیشتنی خۆم دەکەم – وەڵامی هیچ کام لەو پرسیارانەی کە باسم کردن، بۆ من ڕوون نین، بە تایبەتی ئەوە کە ئایا خوا ﷻ پێش ئەم بوونەوەرە، کە وەك گوتم: زانایان دەڵێن: مێژووی تەقینەوە گەورەکە دەگەڕێتەوە بۆ (١٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) پازدە ملیار ساڵ، ئایا پێش پازدە ملیار ساڵ لەمەو پێش، خوا عزّ وجلّ کە سەرەتا نیە بۆ بوونی، خوایەکی بێ سەرەتا، ﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْـَٔاخِرُ ۝٣﴾الحدید، (أَوَّلٌ بلاَ بِدَايَة، وَآخِرٌ بلاَ نِهَايَة)، خوا یەکەمە بە بێ دەست پێکردن‌و، کۆتاییە، واتە: لە دواییە بەبێ کۆتایی، زانایان دەڵێن: ئەو پازدە (١٥) ملیار ساڵە، لە چاو ئەزەل، واتە: لە چاو بوونێکی بێ سەرەتا، وەك چاو ترووکانێك وایە.

ئنجا ئایا خوا ﷻ هیچی دیکەی دروست نەکردوە؟ پێش ئەم حەوت ئاسمان‌و زەوییە، پێش ئەوەی کە ئێستا ئێمە دەیبینین، کە زانایانی گەردووناس دەڵێن: پازدە (١٥) ملیار لەمەو پێش، لە ئەنجامی ئەو تەقینەوەیە گەورەیەدا پەیدابووە، یان وەك تەعبیرەکەی قورئان دەفەرموێ: ﴿كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا﴾، ئاسمان‌و زەوی پێکەوە لکاو بوون، دوایی لێکمان جیا کردوونەوە، ئایا پێش ئەوە، خوای پەروەردگار هیچی دیکەی دروست نەکردوە؟!

پاشان ئایا دوای ئەوەی ئەم بوونەوەرە کۆتایی پێ دێ، خوای بەدیهێنەری کارزان، چی دیکە دروست دەکات؟ جگە لە بەهەشت‌و دۆزەخ‌و سزاو پاداشتی بێبڕوایان‌و بڕواداران لە بەهەشت‌و دۆزەخدا؟!

بەڕاستیی عەقڵی ئینسان لەوە بچووکترە کە بتوانێ ئیستیعابی ئەوانە بکات، جگە لەوەی کە خوای پەروەردگار هەواڵی پێداوین، چونکە: وەك لە ڕوونکردنەوەی عەقیدەی (طحاوي)دا، گوتوومە: زانایان دەڵێن: دەگونجێ خوا ﷻ پێش ئەم بوونەوەرە چەندان بوونەوەری دیکەی دروست کردبن، هەڵبەتە خوای پەروەردگار تەنها باسی ئەم بوونەوەرەی کردوە، بەڵام بەهەر حاڵ ناشتوانین بە دڵنیایی بڵێین : کە خوا ﷻ جگە لە باس و خواسی ئەم بوونەوەرەی لە قورئان دا بە ئێمە نەگوتوە ! زانستیی مرۆڤیش لەو بوارەدا لەوە بچووکترە، چونکە زانستیی مرۆڤ تەنیا هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەوەدا دەکات، کە ئێستا هەیە، بەڵام پێشتر نازانین چی بووەو چۆن بووە؟ هەروەها دواتر نازانین چی دەبێ؟

# كورتە باسێک لەبارەی شەفاعەتەوە

سەرەتا دەڵێم: بە سەرنجدانی ئەو ئایەتانەی كە لەبارەی شەفاعەتەوە هاتوون، بۆمان دەردەكەوێ، كە زۆرێك لە مسوڵمانان لەو مەسەلەیەشدا، وەك زۆر مەسەلەی دیكە، تووشی زێدەڕۆییو كورت هێنان (إفراط و تفريط) بوو ون، ئێمە لە حەوت خاڵدا باسی شەفاعەت دەكەین:

## یەكەم/ پێناسە:

ڕاغیبی ئەصفەهانیی لە كتێبەكەی خۆی[1]دا ئاوا پێناسەی (شَفاعَة) دەكات، دەڵێ: (الشَّفَاعَةُ: الإنْضِمَام إلى آخَر ناصِراً لَهُ وَسائِلاً عَنْهُ، وَأَكْثَرُ مَا يُستعْمَلُ فِي انْضِمَامِ من هُوَ أَعْلَى حُرْمَةً وَمَرْتَبَةً إِلى مَنْ هُوَ أَدْنَى)، واتە: (شَفَاعَة) بریتییە لە پاڵدانی یەكێك بۆ لای یەكێكی دی، كە هاوكاری بێ‌و، داوای بۆ بكاتو، بە زۆریی بۆ ئەوە بەكاردێ كە كەسێك حورمەتی زیاترەو پلەی بەرزترە، بچێتە پاڵ كەسێكی دیكەوە (بۆ ئەوەی پشتگیریی بكاتو داوای بۆ بكات).

وشەی شەفاعەت لە (شَفْع)ەوە هاتوە (شَفْع) یانی: جووت، واتە: كەسێك كە تەنیایە، كەسێكی دیكە دەچێتە پاڵی، دەچێتە تەنیشتی بۆ بەرگریی لێكردنیو پشتیوانیی لێكردنیو تكا بۆ كردنی، بە زۆرییش وایە، كەسێك كە پلەی بەرزترە، تكا دەكات بۆ كەسێك كە پلەی نزمترە، كە دیارە ئەویش تكا دەكات، لە كەسێكی لە خۆی لە سەرەوەتر، كە مەبەست پێی تكا كردنی فریشتەكانو، پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) و قورئانە، ـ وەك دوایی باسی دەكەین ـ بۆ مسوڵمانان بەگشتیی‌و، بۆ كەسانی گوناهبار، بەتایبەت.

---

١) معجم مفردات القرآن، ص ٤٥٨.

**دووەم/ تکاکردن (الشَّفَاعَة) دەگونجێ چاك و بەجێ بێ و، دەشگونجێ خراپ و بێجێ بێ:**

بە پێی ئایەتی ژمارە (٨٥) لە سوورەتی (النساء) کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ مَّن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفْلٌ مِّنْهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقِيتًا ﴿٨٥﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێك تکایەکی باش بکات، پشك و بەشی تێیدا هەیە، (واتە: لە پاداشتەکەی دا)، هەر کەسێك تکایەکی خراپ بکات، پشك و بەشی تێیدا (لە گوناهەکەیدا) هەیە، خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

کەواتە: هەموو تکا کردنێك باش نیە، هەروەك هەمووشی خراپ نیە، ئەو تکاکردنە باشە کە لە چوارچێوەی شەرعدا بێ و، داوایەکە ڕەوا بێ، بە مەرجەکانی خۆی بێ، تکاکردنی خراپیش، ئەوەیە کە پێچەوانەی ئەوە بێ و، پێچەوانەی مەرجەکان بێ و، ڕەوا نەبێ و لە جێی خۆیدا نەبێ.

**سێیەم/ تکا کردن (الشَّفَاعَة) بە بێ مۆڵەتی خوا نابێ:**

دیارە مەبەست لە شەفاعەت واتە: تکا کردن و داوا کردنی فریشتەکان، یان پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بۆ مسوڵمانان کە خوا لێیان خۆش بێ و، لێیان ببووری، ئنجا ئەوانەیان کە شایستەی چوونە بەهەشتن، خوا پلەیان بەرز بکاتەوەو، ئەوانەش کە شایستەی سزا درانن، خوای دادگەر سزاکەیان لەسەر لابەرێ، یاخود لەسەریان سووك بکات.

ئا ئەو شەفاعەتە بەبێ مۆڵەتی خوا نابێ، خوای پەروەردگار لە سوورەتی (البقرة) لە ئایەتی (٢٥٥)دا دەفەرموێ: ﴿ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ﴾، واتە: کێیە ئەو کەسەی کە تکای لەلا دەکات، مەگەر بە مۆڵەتی خۆی، واتە: هیچ کەس توانای ئەوەی نیەو شایستەیی ئەوەی نیە، کە بە بێ مۆڵەتی خواو بە بێ ئیزنی خوا، تکا لە لای خوا بکات، بۆ کەسێکی دی.

هەروەها لە سوورەتی (یونس)دا، ئەو ئایەتەی کە لەبەر تیشکی ئەودا، ئەم کورتە باسە دەخەینە ڕوو، لە ئایەتی ژمارە (٣)دا دەفەرموێ: ﴿ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ إِذۡنِهِۦ ﴾، واتە: هیچ تکاکەرێك نیە، مەگەر دوای مۆڵەتی وی، (واتە: خوا ﷻ).

**چوارەم/ فریشتەکان شەفاعەت دەکەن:**

فریشتەکانی خوا تکا دەکەن، بەڵام بە مۆڵەتی خواو، بۆ کەسێك کە خوا لێی ڕازی بێ، ئەمە لە چەند ئایەتێکی قورئاندا هاتوە ئەو حەقیقەتە کە فریشتەکان بە مۆڵەتی خواو بۆ کەسێك ڕازی بێ، تکا دەکەن، بۆ وێنە:

١/ لە سوورەتی (الأنبیاء) لە ئایەتی (٢٨)دا دەفەرموێ : ﴿ وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ ﴾ واتە: فریشتەکان تکا ناکەن، مەگەر بۆ کەسێك کە خوا لێی ڕازی بێو پەسندی بکاتو، ئەوان لە سامو هەیبەتی خوا لە حاڵەتی ڕاچڵەکینو ترسو لەرز دان.

٢/ لە سوورەتی (طه)دا خوای بەخشندە، دەفەرموێ: ﴿ يَوۡمَئِذٖ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُۥ قَوۡلٗا ١٠٩ ﴾، واتە : لەو ڕۆژەدا، (ڕۆژی دوایی) تکا کردن هیچ سوودی نیە، مەگەر بۆ کەسێك کە خوای خاوەن بەزەیی، مۆڵەتی دابێو، ڕازیش بوو بێ کە ئەو کەسە تکا بکات، واتە: دەبێ ئەو کەسەی تکای بۆ دەکرێ، خوا مۆڵەت بدا تکای بۆ بکرێ، وە ئەو کەسەش کە تکا دەکات، خوای کارزان ڕازی بێ کە قسە بکات.

٣/ لە سوورەتی (النجم)دا خوا ﷻ لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ أَن يَأۡذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرۡضَىٰٓ ٢٦ ﴾، واتە: زۆر فریشتە هەن لە ئاسمانەکاندا، کە تکا کردنی ئەوان، هیچ

سـوودێك نـاگەیەنــێ بـە كـەس، مەگـەر دوای ئـەوەی كـە خـوا مۆڵـەت دەدات، بـۆ كەسێك كە بیـەوێ‌و، بۆ كەسـێك كە پەسـندی بكـات (تكـای بۆ بكـرێ).

كــە دەفــەرموێ: (تكــا كــردن ســوود ناگەیــەنێ) (لا تنفــع الشــفاعة) دیــارە فریشتەكانیش قسەیەك ناكەن‌و، تكایەك ناكەن، جێگا نـەگرێ، كەواتـە: فریشـتەكان مەگەر بۆ كەسێك كە خوا مۆڵەت بـدات‌و بیـەوێ لێـی ڕازی بـێ، ئەگەرنـا ئەسـڵەن تكا نـاكەن، چونكە فریشتەكان زۆر چاك سنووری خۆیان دەزانن، پاشان زۆر ئاشـنان بە خوای كـاربەجێ‌و هەرگیز سەرپێچیی لە فەرمانەكانی خوا نـاكەن‌و، داوایـەك لـە خوا ناكەن، كە جێگیـر نەبێ‌و جێگا نەگرێ، كوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (قسە بكە جێ بگـرێ، ڕبـە بپێوە سـەر بگرێ).

## پێـنـجـەم/ قـورئـانـیـش شـەفـاعـەت دەكـات:

قـورئـان تكـا دەكـات بـۆ كەسـانێك هەڵگـری قـورئـانن‌و كەسـانێك كـە هـاودەم‌و هـاوڕازی قـورئانن، كەسـانێك كە لەگـەڵ قورئانـدا كارلێـك دەكەن، پێغـەمبـەر ﷺ لەوبـارەوە فەرموویـەتی: {الْقُرْآنُ شَافِعٌ مُشَفَّعٌ وَمَاحِلٌ مُصَدَّقٌ ، فَمَنْ جَعَلَهُ إِمَامَهُ قَادَهُ إِلَى الْجَنَّةِ ، وَمَنْ جَعَلَهُ خَلْفَ ظَهْرِهِ، قَادَهُ إِلَى النَارِ} {أَخْرَجَهُ ابْنُ حِبانَ بـرقم: (١٢٤)، وَالبَيْهَقِيُّ فِي ("شُعَب الإِيْمَان) بـرقم: (٢٠١٠)، قـال شـعيب الأرنـؤوط: إسناده جيد} .

واتـە: قورئـان تكـا كـارێكی تكـا وەرگیـراوە، لـە بەینـبەری كەسـێكە كـە شـوێنی نـاكـەوێ‌و پێوەی پابەنـد نـابـێ‌و، بە ڕاست دانراوە، هەر كەسێك قورئان بخاتە پـێش خۆی‌و بیكـاتە پێشـەوای خـۆی، بـەرەو بەهەشـتی دەبـات‌و، هـەر كەسـێك بیخـاتە پشـت خۆی، ئەوە بـەرەو دۆزەخی دەبات. (خـوا پەنـامان بـدات).

## شەشەم/ پـێـغـەمـبـەری خـاتـەم موحـەمـەد ﷺ شـەفـاعـەت دەكـات:

دیارە لەوبارەوە فەرمایشت زۆرن‌و، زۆر لە زانـایان دەڵـێن: ئـەم ئایەتـە موبارەكـەی كە لە سورەتی (الإسراء)دایە، كە دەفـەرموێ: ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ إِلَىٰ

غَسَقِ ٱلَّيۡلِ وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا ٧٨ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ٧٩ ﴾، واتــە: لــە کـاتێك دا کـە خۆر لە نێوە ڕاستی ئاسمان لادەدات، نوێژ بکـە، تـاکو شەو تـاریك دادێ، وە قورئـان خوێندنی بەیـانیان ئامادەیی لـەلا دەکرێ (واتــە: فریشتـەکان لە لای ئامادە دەبن) دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ ﴾، وە لـە شـەوگاردا شـەونوێژ بکە، زیـادە لەو پێنج نوێژەی کە لەسـەرت فەرز کـراون ﴿ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴾، نیزیکە پەروەردگارت هەڵتسێنێتەوە لـەو پـایەو مەقـامەدا کە ستـایش دەکـرێ، یاخـود سـتـایش دەکرێی، کە زۆربەی هەرە زۆری زانـایان دەڵێن: مەبەست پێ مەقامی تکا کردنی مەزن (الشَّفَاعَة العُظمَى)یە، کە لە فەرموودەکانـدا بە درێژیی هاتوە، وەك ئاماژە بە هەندێکیان دەکـەین:

١) {عَنْ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ إِنَّ الشَّمْسَ تَدْنُو يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يَبْلُغَ الْعَرَقُ نِصْفَ الأُذُنِ، فَبَيْنَا هُمْ كَذَلِكَ، اسْتَغَاثُوا بِآدَمَ، ثُمَّ بِمُوسَى، ثُمَّ بِمُحَمَّدٍ ﷺ، فَيَشْفَعُ لِيُقْضَى بَيْنَ الْخَلْقِ، فَيَمْشِي حَتَّى يَأْخُذَ بِحَلْقَةِ الْبَابِ، فَيَوْمَئِذٍ يَبْعَثُهُ اللهُ مَقَامًا مَحْمُودًا، يَحْمَدُهُ أَهْلُ الْجَمْعِ كُلُّهُمْ} {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (١٤٠٥)، وغيره}.

واتـە: عەبدوڵڵای کوڕی عومـەر خـوا لێیـان ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغـەمبـەر ﷺ فـەرمووی: خۆر نیزیك دەکەوێتەوە لە ڕۆژی دوایـی دا، تـاکـو ئارەقـەی جەستـەی خەڵـك دەگـاتە نیـوەی گوێیـان، جا ئـەوان (واتـە: خەڵـك، مرۆڤایـەتیی لـە ڕۆژی کۆکـردنەوەو لێپرسـینەوەو ڕۆژی قیامـەت دا) لـەو حاڵـەتەدا دان هـاوار دەبەنـە بـەر ئـادەم {کـە تکایـان بـۆ بکـات، بـۆ ئـەوەی خـوا ﷻ لـەو گەرمایـە لـەو حاڵەتـە دەربـازیان بکـات، وە دەسـت بکرێ بـە لێپرسینەوەو سزاو پاداشـت، بـەڵام ئـادەم دەڵــێ: مـن خـاوەنی ئـەوە نـیم، واتــە: مـن شـایستـەی ئـەوە نـیم کـە تکا کـردن دەسـت پێ بکەم} دوایی هـاوار دەبەنە بەر (مووسا ئەویش هـەروا دەڵــێ) {دیـارە لــە فەرمایشـتـی دیکــەدا هـاتوە کــە خەڵکەکــە دەچــن بــۆ لای زۆرێــك لــە

پێغەمبەران، بەڵام هەموویان هەر پاساو دێننەوە} ، بەڵام دوایی کە هاوار دەبەنە بەر موحەممەد ﷺ ئەو تکا دەکات بۆ خەڵك، دەڕوات تاکو ئاڵقە ڕێزی دەرگای بەهەشت دەگرێ (وە لە خوای پەروەردگار دەپاڕێتەوە) ئنجا لەو کاتەدا خوا ﷻ بۆ ئەو پایە ستایش کراوەی کە بەڵێنی پێداوە هەڵیدەستێنێ، وە هەموو ئەو خەڵکەی کە کۆبوونەتەوە (هەموو مرۆڤایەتیی) سوپاس و ستایشی (پێغەمبەر ﷺ) دەکەن. (کە دە فریایان هاتوەو، تکای بۆ لە خوا کردوون، کە لێپرسینەوەو سزاو پاداشت دەست پێ بکات).

٢) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هذِهِ الدَّعْوَةِ التَامَّةِ، وَالصَّلاةِ القَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّداً الوَسِيلَةَ، وَالفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَاماً مَحْمُوداً الَّذِي وَعَدْتَهُ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ القِيَامَةِ} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٤٨٥٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦١٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥٢٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢١١) وَقَالَ: صَحِيحٌ حَسَن غَرِيب، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٧٢٢)، وَابْنُ خُزَيْمَة برقم: (٤٢٠)، وَابْنُ حِبانَ برقم: (١٦٨٩) عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ}.

واتە: هەر کەسێك کاتێك گوێی لە بانگ دەبێ، بڵێ: ئەی خوایە! پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تێرو تەواوە، وە ئەم نوێژە بەرپاکراوە! وەسیلەو فەضیلە، بە موحەممەد ببەخشەو، ئەو پێگەیەی کە تێیدا ستایش دەکرێ کە بەڵێنت پێداوە پێی ببەخشە، (هەر کەسێك ئەو دووعایە بکات دوای بانگ) ئەوە شەفاعەتی منی پێویست دەبێ، لەڕۆژی دواییدا، (واتە: شایستەی ئەوە دەبێ کە پێغەمبەر ﷺ شەفاعەت و تکای بۆ بکات).

٣) بوخاریی فەرموودەیەکی دیکە دێنێ، کە کتێبەکانی دیکەی سوونەتیش دەیهێنن، کە ئەمە دەقەکەیەتی و بە چەند ڕیوایەتێك هاتوە:

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ ﷺ قَالَ: إِذَا كَانَ يَوْمُ القِيَامَةِ مَاجَ النَاسُ بَعْضُهُمْ فِي بَعْضٍ، فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ: اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ فَيَقُولُ: لَست لَهَا وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِإبْرَاهِيمَ فَإِنَّهُ خَلِيلُ الرَّحْمنِ؛ فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ، فَيَقُولُ: لَست لَهَا وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِمُوسَى فَإِنَّهُ كَلِيمُ اللهِ؛ فَيَأْتُونَ مُوسَى فَيَقُولُ: لَست لَهَا وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِعِيسَى فَإِنَّهُ رُوحُ اللهِ وَكَلِمَتُهُ؛ فَيَأْتُونَ عِيسَى فَيَقُولُ: لَست لَهَا

وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِمحَمَّدٍ ﷺ ؛ فَيَأْتُونِي فَأَقُولُ: أَنَا لَهَا، فَأَسْتَاذِنُ عَلَى رَبِّي فَيُؤْذَنُ لِي، وَيُلْهِمُنِي مَحَامِدَ أَحْمَدُهُ بِهَا لاَ تَحْضُرُنِي الآنَ، فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ وَأَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا، فَيُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ! ارْفَعْ رَأْسَكَ وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ، وَسَلْ تُعْطَ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ؛ فَأَقُولُ: يَا رَبِّ أُمَّتِي، أُمَّتِي، فَيُقَالُ: انْطَلِقْ فَأَخْرِجْ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ شَعِيرَةٍ مِنْ إِيمَانٍ، فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ ثُمَّ أَعُودُ فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ، ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا؛ فَيُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ، وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ، وَسَلْ تُعْطَ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ؛ فَأَقُولُ: يَا رَبِّ أُمَّتِي، أُمَّتِي فَيُقَالُ: انْطَلِقْ فَأَخْرِجْ مِنْهَا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ أَوْ خَرْدَلَةٍ مِنْ إِيمَانٍ؛ فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ؛ ثُمَّ أَعُودُ فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا؛ فَيُقَالُ يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ، وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ، وَسَلْ تُعْطَ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ؛ فَأَقُولُ يَا رَبِّ أُمَّتِي، أُمَّتِي فَيُقَالُ انْطَلِقْ فَأَخْرِجْ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ أَدْنَى أَدْنَى أَدْنَى مِثْقَالِ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجْهُ مِنَ النَّارِ؛ فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ ثُمَّ أَعُودُ الرَّابِعَةَ فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ، ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا؛ فَيُقَالُ يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ، وَقُلْ يُسْمَعْ، وَسَلْ تُعْطَهْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ؛ فَأَقُولُ يَا رَبِّ ائْذَنْ لِي فِيمَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَيَقُولُ : وَعِزَّتِي وَجَلاَلِي وَكِبْرِيَائِي وَعَظَمَتِي لأُخْرِجَنَّ مِنْهَا مَنْ قَالَ : لا إِله إِلاَّ اللهُ} أخرجه البخاري في : ٩٧ كتاب التوحيد : ٣٦ باب كلام الرب عزّ وجلّ يوم القيامة مع الأنبياء وغيرهم.

واتە: لە ڕۆژی قیامەت دا خەڵك پێكدا دێن‌و دەچن (سەرگەردان دەبن)، ئیدی دەچنە لای ئادەم، پێی دەڵێن: تكامان لەلای پەروەردگارت بۆ بكە، دەڵێ: من شایستەی ئەو كارە نیم، بەڵام بچنە لای ئیبراهیم ئەو خۆشەویستیی خوای بە بەزمییە.

ئنجا دەچنە لای ئیبراهیم، ئەویش دەڵێ: من شایستەی ئەوە نیم، بەڵام بچنە لای مووسا ئەو دوێنەر (كلیم)ی خوایە، ئنجا دەچنە لای مووسا ئەویش دەڵێ : من شایستەی ئەوە نیم بچنە لای عیسا ئەو گیان‌و وشەی خوایە.

ئنجا دەچنە لای عیسا ئەویش دەڵێ: من شایستەی ئەوەنیم، بەڵام بچنە لای موحەممەد.

ئنجا دێنە لای منو منیش دەڵێم: ئەوە کاری منە، ئیدی مۆڵەت لە پەروەردگارم وەردەگرمو، مۆڵەتم دەدرێو، چەند جۆرە ستایشکردنێکم فێر دەکات کە ئێستا نایانزانم، ستایشی خوایان پێ دەکەمو، کڕنووشی بۆ دەبەم.

ئنجا پێم دەگوترێ: ئەی موحەممەد! سەرت بەرز بکەوەو، قسە بکە، لێت دەبیسترێو، داوابکە پێت دەدرێو، تکا بکە، تکات وەردەگیرێ....

هەڵبەتە دواییش هەرکام لە پێغەمبەرانی دیکە هەر کەسە لەقەدەر خۆی تکای خۆی دەکات، بەڵام ئەوە کە دەست بکرێ بە لێپرسینەوەی خەڵك، ئەو تکا گەورەیە کە پێی دەگوترێ: تکا کردنی مەزن (الشفاعة العُظمى) ئائەوەیان هی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ ئەگەرنا دواتر نەك هەر پێغەمبەران، بەڵکو (صديق)ان و (شهيد)ان و (صالح)ان و زانایان، هەرکەسە لە قەدەر خۆی، بە ڕای زۆربەی زانایان دەگونجێ تکا بکاتو خوای پەروەردگاریش تکاکەی وەربگرێ، هەرکەسە بە پێی خۆی.

بەڵام لێرەدا نابێ بە هەڵە حاڵی بینو پێمان وابێ کە مەبەست لەم فەرموودەیەدا لە گوتنی (لا إِله إلاَّ اللهُ) گوتنی ڕووتە ! یان گوتنێکە کردەوەی لەگەڵ نەبێ !!

## حەوتەمو کۆتایی/ بێگومان لە مەسەلەی شەفاعەتدا کە تێپەڕاندن هەیەو کورت هێنان هەیە:

تێپەڕاندنەکە ئەوەیە کە ئەفسانەی زۆر خراونەنێو ئەو بابەتەوە، کەسانێکی زۆر هەن لە مسوڵمانان لە عەوام، لە شیعە، لە شوێنکەوتووەکانی ئەهلی تەصەووف کە وەك گوتراوە: ئیمانێ بە نیسکێ دەسپێرنو بە خۆزگەو بریا لێیگەڕاون، وەك لە شیعرێکدا هاتوە:

بۆیە لە دنیا دەستم گرت بە تۆ      تاکو لە قیامەت نەمکەی ڕەنجەڕۆ

ئەوە دەروێشێك وا بە شێخەکەی خۆیدا هەڵدەڵێ، کە بێگومان زۆری زێدەڕۆیی تێدایە، جارێ بەس خوا دەزانێ ئەو ئینسانە داخۆ یەکێکە لە دۆستانی خوا، یان

نا؟ بەڵکو ئەسڵەن بۆ خۆی بەهەشتیی دەبێت یان نا؟ بە تایبەتی ئەوانەی کە لەم ڕۆژگاری ئێمەدا خۆیان کردوە بە شێخی تەریقەتو خۆیان لە شوێنی ئەو گەورە پیاوانەی پێشی داناوە، وەك عەبدولقادری گەیلانییو شێخ جونەیدی بەغدادیی و ئەبو حامیدیی غەززالیو بەهائەدین نەقشبەندییو سەید ئەحمدی سەرهەندییو مەولانا خالیدو کاك ئەحمدی شێخو... هتد، کە خەڵکێکی زۆر لە زانایان شایەدییان بۆ داون: شایستەی ئەو پلەو پایەو مەقامە بوون کە ئامۆژگاریی مسوڵمانان بکەن، شارەزاش بوون لە ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ، کە نەخۆشییە دەروونییەکانی خەڵك چارەسەر بکەن بە قورئان، قورئان لەسەر دەستی وان ببێتە شیفا بۆ ئەوەی لە سینەی خەڵکدا هەیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ ﴿٥٧﴾ ﴾یونس.

چونکە هەزاران کەس لەسەر دەستیان تەوبەی کردوەو گەڕاوەتەوەو، بۆتە ئینسانی باش، ئەوان بە ڕێی خۆیان.

بەڵام دوای ئەوانە کەسانێك لەجێیان دانیشتوون، کە هیچ لیاقەتو کەفائەتێکیان نیە، خەڵکێکی زۆریش بە تەمایە کە ئەوانە شەفاعەتیان بۆ بکەن! کورتهێنانیش ئەوەیە کە لە بەرانبەر ئەوەدا، هەندێ کەس هەر نکووڵیی دەکەن لەوەی شەفاعەت هەر هەبێ، تەنانەت هی پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ!! کە ئەمەشیان کورتهێنانەو ئەوی دیکەش تێپەڕاندنو زێدەڕۆییە، خەتی نێوەڕاستیش ئەوەیە کە شەفاعەتو تکا کردن هەیە: بۆ فریشتەکان، بۆ پێغەمبەران، بۆ قورئان، بۆ دۆستانی خواو، بۆ زانایانو پێشەوایانی ڕەسەن، بەڵام هەر کەسە بەپێی خۆی.

بەڵێ، ئەوە خەتە نێوەڕاستەکەیەتی، تێپەڕاندنەکە ئەوەیە کە تەنیا بە تەمای شەفاعەت لێبگەڕێیو دەست بە خۆتدا بەردەیەوە، لە حاڵێکدا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ ﴿٢٨﴾ ﴾الأنبیاء، واتە: (ئەوانەی کە تکا دەکەن فریشتەکانو پێغەمبەران) تکا ناکەن، مەگەر بۆ کەسێك خوا لێی ڕازی بێ.

کەواتە: جارێ دەبێ تۆ خۆت وا لێبکەی، خوا لێت ڕازی بێ، ئنجا تکای تکاکارانت بە کەڵك دێ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴿٤٨﴾ ﴾ المدثر،

واتە: تکای تکاکاران بەکەڵکیان نایەت، تۆ ئەگەر بۆخۆت بناغەت نەبێ، دیوار دانانرێ، پاشان بە ڕاستیی نابێ هەر کەسێك ڕاست بۆوە پێت وابێ دەگونجێ تکاو شەفاعەت بکات.

بە نسبەت فریشتەکانەوە، ئەوە خوا فەرموویەتی، بە نسبەت پێغەمبەرانەوە، ئەوە دیارە، بە نسبەت قورئانەوە، هەر دیارە، بەڵام غەیری ئەو سێیانە: غەیری فریشتەکانو پێغەمبەرانو قورئان، ئایا فلان کەس شەفاعەت دەکا، یان ناکات؟ بەس دەتوانی بڵێی: گومانی چاكو ئومێدی خێرم پێیەتی، ئەویش بە مەرجێك کە حاڵو باروودۆخەکەی وابێو، پابەند بێ بە شەریعەتەوەو، شارەزا بێ لە شەریعەت، وە بەبێ تەماع پێش خەڵك بکەوێ بە ڕێی خواو پێغەمبەردا ﷺ، وە ئیسلامەتییو دینداریی لە خۆیدا بەرجەستە کردبێ، ئنجا تۆ دەڵێی: ئومێدی خێرمان پێیەتیو گومانی چاکی پێ دەبەین.

**مەسەلەی چوارەم** : کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقًّاۚ إِنَّهُۥ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلۡقِسۡطِۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ شَرَابٞ مِّنۡ حَمِيمٖ وَعَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ﴾.

گێڕانەوەی هەمووتان بۆ لای خوایە، تەنیا بۆ لای خوا دەگێڕدرێنەوە، بەڵێنی خوایەو هەقەو ڕاستەو چەسپاوە، خوا ئەو کەسەیە کە دروستکراوەکانی دەستپێکردن.

لە زمانی عەرەبییدا (بَدَءَ الخَلْقَ) واتە لە سەرەتاوە دروستی کرد، لە حاڵێکدا کە نەبوو، واتە: لە نەبوون هێناونیە دی، خوا دروستکراوەکانی لە نەبوون هێناوەتە دی، ﴿ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ﴾، دوای ئەوەش کە لەبەینیان دەبات، جارێکی دیکە دەیانگێڕێتەوە، واتە: ئێمەی لە نەبوون هێناوەتە دی، دوا ئەوەش کە دەمرینو لەبەین دەچین، لە قیامەتو کاتی هەڵسانەوەدا، دووبارە خوا دەمانگێڕێتەوەو زیندوومان دەکاتەوە.

ئنجا ئایا بۆچی خوا ﷻ ئەوەی کردوە؟ دەفەرموێ: ﴿ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلۡقِسۡطِ ﴾، بۆ ئەوەی کە پاداشتی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجامداون، بە دادگەرانە بداتەوە.

با سەرنجێكی ئەو چەند وشەیە بدەین :

١- دەفەرموێ : ﴿ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا ﴾، لە زمانی عەرەبیدا هەر كاتێك (الجار والـمجرور) پێشكەوتن، ئـەوە كـورت هەڵهێنـان دەگەیـەنێ، ﴿ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ﴾، گێڕانەوەكەتان تەنیا بۆ لای ئەوە، واتە: تەنیا بۆ لای خوا دەچنەوە، بۆ لای خـوا دەگێڕدرێنـەوە.

٢- دوایـی دەفـەرموێ :﴿ وَعْدَ اللَّهِ حَقًّا ﴾، ئەوە بەڵێنی خوایەو ڕاستەو چەسپاوە، واتە: هیچ گومانتـان تێیدا نەبێ، وشەی (حق) واتە: چەسپاوو پێكەڵپێك لەگـەڵ واقیعـدا.

دەفـــەرموێ : ﴿ إِنَّهُ يَبْدَؤُا الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ﴾، خـــوا ئـــەو كەســـەیە كـــە دروسـتكراوەكانی دەسـت پێكردوەو، دەیانهـێنێتـە دی لە نـەبوون، ﴿ ثُمَّ يُعِيدُهُ ﴾، دوایـیش دوای ئـەوەی كـە دەفـەوتێنو لەبەیـن دەچن، هـەر كاتێـك بـە پێویسـتی زانی، لە كاتی خۆیدا دووبـارە دەیانگێڕێتـەوە بۆ بـوون (يُعيدُهُ بعدَ إفنـائهِ إياهُ)، واتە: دەیگێڕێتـەوە دوای ئـەوەی كـە لە بەینـی بـردوە.

٤- ﴿ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ بِالْقِسْطِ ﴾، بۆ ئـەوەی پاداشـتی ئەوانـە بداتـەوە كـە ئیمانیـان هێنـاوە (بـە هـەموو ئـەو شتـانەی كـە پێویسـتە ئیمانیـان پێبهێنـرێ) وە كـردەوە باشـەكـانیان ئەنجـام داون، بـە دادگـەریی ﴿ بِالْقِسْطِ ﴾، زانـایان سـێ واتـایان بۆ ئەو وشـەیە لێكـداوەتـەوە:

١) هــەندێك دەڵێــن: ﴿ بِالْقِسْطِ ﴾، یـانی (بـالعدل) واتــە: بــە شـێوەیەك كــە ستەمیان لـێ نـاكرێو تـەواو مافی خۆیـان پـێ دەدرێ.

٢) واتـایەكی دیكـەی ﴿ بِالْقِسْطِ ﴾، یانی: بە هۆی ئەو دادگـەرییەی كـە لەسـەری بوون، كە بریتیـە لـە ڕێبـازو بەرنـامەی دادگـەرانـەی خـوا.

٣) هەندێك گوتوویانە: ﴿ بِٱلْقِسْطِ ﴾، واتە: خوا ﷻ بە شێوەی دادگەرانە، وەك هەقی خۆیان دەیانداتەوە، بەڵام دوایی بە شێوەی بەخشەرانە، بۆشیان زیاد دەكات، وەك هەر لە ئایەتی (٢٦)ی سوورەتی (یونس)دا دوایی دەیگەیەنێ دەفەرموێ: ﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ﴾، واتە: ئەوانەی چاكەیان كردوە، پاداشتی هەرە چاكیان هەیەو، زێدەیشی دەخرێتە سەر.

پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُواْ يَكْفُرُونَ ﴾، وە ئەوانەی بێبڕوا بوون، خواردنەوەیەك و شلەمەنییەكی زۆر داغ و كوڵاویان بۆ هەیە، ﴿ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُواْ يَكْفُرُونَ ﴾، وە سزایەكی بەئێش، بە هۆی ئەوەوە كە بێبڕوا بوون.

شایانی باسە: لێرەدا ئەم تەعبیرە قورئانییە، وا دەگەیەنێ كە خوا بوونەوەری دروستكردوەو هێناوەتە دی بەتایبەت بۆ ئەوەی پاداشتی بڕوادارانی چاكەكار بداتەوە، بەڵام لە لا ڕا، وەك شتێكی لاوەكییش، ئەوانەی كە بێبڕوان سزا، دەدات، بە چی؟ بەوە كە خواردنەوەیەكی گەرم و داغیان دەدرێتێ و، سزایەكی بەئێشیشیان بۆ هەیە، بەهۆی بێبڕواییانەوە.

واتە: خوا ﷻ ئەم بوونەی بۆیە هەڵنەخستبوو، خەڵك سزا بدات، بەڵام ئەوانەی كە بێبڕوا بوون و، لە ڕێی خوا لایان دابوو، دەبوو هەر سزا بدرێن، ئەگەرنا هەر لە ئەسڵدا خوای پەروەردگار ئەم بوونەی بۆیە هێناوەتە دی، تاكو پاداشتی بڕواداران بداتەوە، بۆیەش وا دەڵێین: چونكە خوا ﷻ دوای ئەوەی باس دەكات دەفەرموێ: ﴿ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ﴿ لِيَجْزِىَ ﴾، ئەو (ل)ە، لامی عیللەتە، واتە: ئەوە كە خوا بونەوەری دروستكردوە، پاشان خەڵك لەبەین دەبات و، دوایی زیندوویان دەكاتەوە، عیللەت و هۆكارەكەی و ئامانجەكەی ئەوەیە كە پاداشتی ئەوانە بداتەوە، كە ئیمانیان هێناوەو كردەوە باشەكان ئەنجام دەدەن، بەڵام بەنسبەت بێبڕوایانەوە نافەرموێ: بۆ ئەوەی ئەوانیش سزا بدات، بەڵكو هەر دەفەرموێ ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، ئەوانەش كە بێبڕوا بوون خواردنەوەیەكی گەرم و داغیان هەیەو سزایەكی بەئێشیان

هەیـە، بـە هـۆی كوفرەكەیانـەوە، وشـەی ﴿ حَمِيمٍ ﴾، ڕاغیبـی ئەصـفەهانیی دەڵـێ: (الماءُ الشَّديد الحرارة) واتە: ئاوێكـی زۆر گــەرم.

بـەڵام مـن پـێم وایـە ﴿ حَمِيمٍ ﴾، هـەر شـلەمەنییەكی زۆر گـەرمو داغـە، بـە پێـی ئایەتــەكان، چــونكە لــە چــەند شــوێنــان دا خــوا ﷻ بــاسی ئــەوەی كــردوە كــە خواردنەوەیـەك كـە دەدرێ بـە بێـبڕوایان لـە دۆزەخـدا، خواردنـەوەیـەكی زۆر گـەرمو داغـە، شلەمەنییـەكی زۆر گـەرمو داغـە، كـە مەرج نیـە هـەر ئـاو بێ، بۆ وێنـە:

١/ لـە سـوورەتی (محمـد) ئایـەتی (١٥)دا خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿ وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ ﴾، ئـاوێكی زۆر داغو كوڵــیویان درایــە، ڕیخـۆڵەكــانی پچــڕاندن، (هێنـدە گـەرم بـوو).

٢/ لــە ســـوورەتی (النبــأ)دا دەفــەرموێ: ﴿ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ ﴾، واتــە: لــە دۆزەخـدا بێــبڕوایان هـیچ فێنكـایەتیو هـیچ خواردنەوەیـەكیان نیـەو تـامی نـاكـەنو لێـی نـاچێـژن، جگـە لـە شلەمەنیـی داغو كوڵیـوو، كـێمو زوخـاو.

٣/ هەروەهــا لــە ســـوورەتی (الحـج)دا دەفــەرموی : ﴿ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ ﴾، واتــە: شلەمەنییەكـــی زۆر داغو كـوڵیــو، (یـاخود ئـاوی زۆر داغو كوڵــیو)یـان بەســەر ســەردا دەكـرێ، هەرچـی لـە سكـیانو نێـو هەنـاویاندا هەیـە، پێـی دەتوێتـەوەو قـاڵ دەبێتـەوەو، پێستـەكانیشـیان هـەمووی دادەماڵـێ و دەتـوێتـەوە.

٤/ لــە ســـوورەتی (الصـافات)دا، دەفــەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ﴾، واتــە: دوایـی شــلەمەنییەكی داغو كوڵیویشــیان بـۆ لەگـەڵ خواردنەكـە دەكـرێ.

٥/ لە سووڕەتی (ص)دا، دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴿٥٧﴾ ﴾، واتە: ئەوە با بیچێژن ئاوی (یاخود شلەمەنیی) زۆر داغو کوڵیوو، کێمو زوخاو.

ئنجا ئایا (حمیم) لە چییەوە هاتوە؟

(سُمِّيَ الحمّامُ حَمّاماً، إمّا لأنَّهُ يُعَرِّقُ وَإمّا لِما فِيهِ مِنَ المَاءِ الحَارِّ)، واتە: حەممام بۆیە وای پێ دەگوترێ، یان لەبەرئەوەیە کە وا دەکات خەڵك تێیدا گەرمای بێو ئارەقە بکاتەوە، یان لەبەر ئەوەیە کە ئاوی داغ و کوڵیوی تێدایە.

ئنجا وشەی ﴿ حَمِيمٍ ﴾، لە قورئاندا بە مانای دیکەش هاتوە، وەك خوا لە سووڕەتی (المعارج)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَسْأَلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا ﴿١٠﴾ ﴾، واتە: هیچ خزمو نیزیکێکی ناپرسێ.

(حمیم) یانی: کەسێك کە نیزیك بێ، وە خاوەن عەتف بێ، چونکە کەسی خۆمو دڵسۆزو نیزیك، دڵی گەرم دەبێ، بۆ خزمو نیزیکی کە بەرگریی لێ بکاتو بە خەمییەوە بێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَعَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، ئازارێکی بە ئێش، ئازار هەمووی هەر بەئێشە، بەڵام یانی دیارە ئەو ئازارە زۆر زۆر بەئێشە.

ئنجا ئایا بۆچی وایان لێدەکرێ؟ دەفەرموێ : ﴿ بِمَا كَانُوا يَكْفُرُونَ ﴾، بەهۆی ئەوەی کە بێبروا بوون.

**مەسەلەی پێنجەم:** خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ ۚ مَا خَلَقَ اللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِالْحَقِّ ۚ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥﴾ ﴾.

واتە: خوا ئەو کەسەیە کە خۆری وا لێکردوە تیشکدەر بێو، مانگی وا لێ کردوە ڕووناك بێو، چەندان قۆناغی بۆ ئەندازە کردوون، تاکو ژمارەی ساڵەکانو ژمێرە

بزانن، خوا ئەوەی بە هەق نەبێ دروست نەکردوە، ئایەتەکانی خۆی بۆ کەسانێك کە بزانن، ڕوون دەکاتەوە.

واتە: کەسانێك کە زاناو شارەزا بن، قەدری ئایەتەکانی خوا دەزانن‌و، لێیان تێدەگەن.

وشەی ﴿ضِيَآءً﴾ هەندێك لە زانایانی زمانی عەرەبی گوتوویانە: (ضياء يعني ضوء) تیشك، هەندێکیش گوتوویانە: (ضياء جمعُ ضوءٍ)، (ضياء) کۆی (ضوء)ە، واتە: تیشکەکان، دیارە ئەو دوو تەعبیرەی کە خوای پەنهانزان بۆ مانگ‌و خۆر بەکاری هێناون، هیچ گومانی تێدانیە ئەوە دەگەیەنن کە خۆر تیشکەکەی زاتییەو لە خۆیەوەیەتی، بەڵام مانگ ڕووناکییەکەی وەرگیراوە، لە هەموو قورئاندا خوای باڵادەست کە باسی خۆری کردوە، وای باسکردوە کە تیشکەکەی زاتییە، ئەوەش دیارە ئیعجازێکی عیلمییەو دەرکەوتوە، وە مانگ ڕووناکییەکەی هی خۆرەو عەکسی دەکاتەوە، وەك دواتر باسی دەکەین.

کە دەفەرموێ: ﴿وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ﴾ زانایان گوتوویانە: مەبەست پێی مانگە، واتە: خوای کاربەجێ چەند قۆناغێکی بۆ مانگ داناون: دوازدە قۆناغ، کە هەر قۆناغێك بە مانگێك دەبڕێ، چونکە مانگ بە ساڵێك ئنجا جارێك بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ﴾ واتە: بۆ مانگیش‌و بۆ خۆریش، چونکە هەردووکیان بە کۆمەڵێك مەنزڵدا دەڕۆن، دیارە لەبەرچاوی ئێمە، وەك لە سوورەتی (الإسراء) ئایەتی (١٢)دا خوای پەروەردگار لەوبارەوە دەفەرموێ ﴿وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيْنِ ۖ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً لِّتَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ وَكُلَّ شَىْءٍ فَصَّلْنَٰهُ تَفْصِيلًا ﴿١٢﴾﴾، واتە: وە شەوو ڕۆژمان کردوون بە دوو نیشانە، نیشانەی شەومان کوژاندۆتەوە، خەفەمان کردوە، (وەك چۆن چرایەك یان گڵۆپی سفر، کز دەکرێ لە کاتی خەوتندا، کە مەبەست پێی مانگە، واتە: مانگمان خەفە

کردوە، شەوقەکەیمان کەم کردوە)، وە نیشانەی ڕۆژگارمان (کە خۆرە) وا لێکردوە کە بینەر بێ، واتە: بەهۆیەوە خەڵك بەرپێی خۆی ببینێ، بۆ ئەوەی دنیا ڕووناك بکاتەوە، بۆچی؟ ﴿ لِّتَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡ ﴾، تاکو لە ڕۆژێدا لە بەخششی پەروەردگارتان داوا بکەن، بە کارو کەسابەتتانو، بەرپێی خۆتان ببینن﴿ وَلِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَ ﴾، وە تاکو بە هۆی مانگو خۆرەوە، ژمارەی ساڵەکانو، ژمێرەو، مەوعیدی کارەکان، کاتەکانیان بزانن، ﴿ وَكُلَّ شَيۡءٖ فَصَّلۡنَٰهُ تَفۡصِيلٗا ﴾ وە هەموو شتێکمان جوان ڕوون کردۆتەوەو شیکردۆتەوە.

لێرەش خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ لِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴾، بۆ ئەوەی ژمارەی ساڵەکانو ژمێرە بزانن، خوا ئەوەی بە هەق نەبێ دروست نەکردوە، (خوا) ئایەتەکانی خۆی بۆ کەسانێك کە بزانن، ڕوون دەکاتەوە.

بەڵام کەسێك کە زانیاری نەبێو شارەزایی نەبێ، نازانێ خوا چی کردوە! بۆیە مەلای گەورەی کۆیی قسەیەکی جوانی هەیە دەڵێ:

عیلمی کیمیات گەر نەخوێندوە　　　بە خوا نازانی خوا چی کردوە

یان دەڵێ:

(قالَ) و (قَولَ) گشتی هەبایە　　　عیلمی تەبیعەت عیلمی خودایە

هەڵبەتە من ناڵێم: (قال و قَوَل گشتی هەبایە)، چونکە شارەزایی لە زمانی عەرەبیش دا پێویستە، بەڵام بێگومان شارەزابوون بە دروستکراوەکانی خوا، وە دۆزینەوەی یاساکانی خوا لە بوونەوەردا، لە دەوروبەردا، وا لە ئینسان دەکات، زیاتر خاوەنی ئەو بوونەوەرو دەوروبەرە بناسێ، مسوڵمانان کاتی خۆی لەپێش مرۆڤایەتییەوە بوون، مسوڵمانان خەڵکیان فێری ئەو زانستە کرد، بەڵام دوایی کە

مسوڵمانـــان لـــە قورئـــانو ســـوننەت دوور كەوتنـــەوەو، عـــادەتی لاســـایی كردنـــەوەی كوێرانەی پێشینـانیان ڕەچاو كرد، وە عەقڵی خۆیان داخســت، وە چاوی خۆیـــان چڕ داگرت، لەسەر ئەوەی كە زانایان بۆ ڕۆژگاری خۆیان گوتوویانەو، خۆیان لە نـوورو ڕۆشنایی، بەكەڵكی هەموو كـاتو سەردەمێك هاتوو، كە قورئانو سوننەت، بێبەش كرد، لەوكاتەوە دواكەوتن، ئێستاش ئەوە دەبینین چۆن مسوڵمانـان بۆ هەموو شـتێك پێویسـتییان بـە غـەیری خۆیانـــەو، بەهـۆی دووركـەوتنەوەیان لـە ڕوونـاكی وەحـی، وایان لێهاتوە كە لە ڕووی دنیاداریـیەوە لەوپـەڕی بەجێمانو دواكەوتوویی دا بن.

# کورتە باسێک لەبارەی خۆرو زەوی و مانگەوە

پێشەکی:

وشەی (سماء)، سێ سەدو دە (٣١٠) جار لە قورئاندا هاتوە، سەدو نەوەد (١٩٠) جار بە ﴿ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾، وە سەدوبیست (١٢٠) جار بە ﴿ٱلسَّمَآءِ﴾.

بەڵام وشەی (الأرض) چوار سەدو شەستو یەك (٤٦١) جار لە قورئاندا هاتوە.

وشەی (الشمس) سی (٣٠) جار لە قورئاندا هاتوە.

وشەی (القَمَر)یش بیستو هەشت (٢٨) جار هاتوە (٢٧) جار بە وشەی (القَمَر)و یەك جاریش بە (أهِلَّة) کە کۆی (هِلال)ە، واتە: مانگی یەك شەوە.

هەڵبەتە ئێمە لە تەفسیری سوورەتەکانی پێشووشدا، کەمو زۆر باسی هەندێك زانیارییمان کردوە دەربارەی خۆر زەویو مانگ، بەڵام بە پێویستی دەزانم کە لەم کورتە باسەدا، کۆمەڵێك زانیاریی تازە دەربارەی هەر کام لە: خۆر (الشمس)و زەوی (الأرض)و مانگ (القَمَر) بخەینە ڕوو، تاکو دوایی لە هەر شوێنێك کە باسی خۆرو زەویو مانگ هاتەوە پێش، ئیرە بکەین بە شوێنێك کە بۆی بگەڕێینەوە بیکەینە مەرجیعێك.

هەروەها لە هەر شوێنێك باسی بوونەوەرو ئاسمانەکانو زەوی هاتەوە پێشێ، بگەڕێینەوە بۆ ئەو کورتە باسەی پێشوو، کە دەربارەی بوون (وجود)و، دروستکراوەکانی خوا، دەربارەی ئاسمانەکانو زەوی، خستمانە ڕوو.

## (خـــۆر)

چەند زانیارییەکی خێرا دەربارەی خۆر دەخەینە ڕوو:

١/ قەبارەی خۆر: سەدو چل دوو هەزار تریلیۆن کیلۆمەتر سێجایە، (١٤٢,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) کم[٣]، وە خۆر ملیۆنێك‌و سێ سەد هەزار (١,٣٠٠,٠٠٠) جار هێندەی زەوییە.

٢/ تیرە (قُطر)ی خۆر: ملیۆنێك‌و چوار سەد هەزار کیلۆمەترە (١,٤٠٠,٠٠٠)، واتە: سەدو دە جار (١١٠) جار لە تیرەی زەوی گەورەترە.

٣/ چڕیی (کثافة)ی خۆر: (١,٤) یەك‌و لە دەیا چوار بۆ هەر سانتیمەتر دووجایە، واتە: هەر سانتیمەتر دووجایەك، کیلۆیەك‌و چوار سەد گرامی بەردەکەوێ.

٤/ کێش (وزن)ی خۆر: دوو هەزار تریلیۆن تریلیۆن، تەنە {واتە: دوو (٢) بیست‌و حەوت (٢٧) سفری لە پێشەوە بێ، دوو هەزار تریلیۆن تریلیۆن تەن (طن) قورسە، کە دەکاتە (٣٣٣,٠٠٠) هەزار جار هێندەی زەوی، ئنجا لە (٩٩٪)ی کێشی کۆمەڵەی خۆر، لەنێو خۆردایە، ئەوی دیکەشی (١٪)ی بۆ خڕۆکەکانی دەورنی.

٥/ دووریی خۆر لە زەوی، سەدو پەنجا ملیۆن (١٥٠,٠٠٠,٠٠٠) کیلۆمەتر لە زەوییەوە دوورە.

٦/ کێش کردن (جاذبیة)ی خۆر: بیست‌و هەشت (٢٨) هێندەی هی زەوییە.

٧/ گەرمیی خۆر: پازدە ملیۆن (١٥,٠٠٠,٠٠٠) پلە گەرمە لە نێویدا، لە دیوی دەرەوەی: شەش هەزار (٦٠٠٠) پلە گەرمە.

٨/ سووتەمەنی خۆر: خۆر لە هەر چرکەیەکدا شەشسەدو پەنجاو پێنج (٦٥٥) ملیۆن تەن (طن) هایدرۆجین دەگۆڕێ بۆ شەشسەدو پەنجا (٦٥٠) ملیۆن (طن)

هیلیۆم، وە پێنج ملیۆن (طن) وزە بەرهەم دێنێ، کە یەك لەسەر هەزار، یان یەك لەسەر دوو هەزاری وزەی خۆرە، کە بۆ زەوی دێ، دیارە نێوکی هەر چوار گەردیلەی هایدرۆجین یەك دەگرن، وە نێوکی یەك گەردیلەی هێلیۆم پێکدێنن.

٩/ پێکهاتەی خۆر: لە (٧٦، ٨١٪)ی هایدرۆجینە، وە (١٧، ١٨٪)ی هێلیۆمە، وە توخمەکانی دیکەش لە (٠،٧٪) پێکدێنن، واتە: خۆر لە هەر چرکەیەکدا: چوار ملیۆنو شەش سەد هەزار (٤٦٠٠٠٠٠) تەن دەسووتێنێو لە کێشی کەم دەکات، لە هایدرۆجینەوە دەیگۆڕێ بۆ هێلیۆم.

١٠/ تەمەنی خۆر: بە پێی مەزەندەی زانایان دە (١٠) ملیار ساڵ زیاترە، وە دەڵێن: ئەوەندەشی تەمەن ماوەو دەگونجێ ئەگەر خوا عزّو جلّ لێی گەڕێ، خۆر (١٠) ملیار ساڵی دیکەش تەمەن دەکات، شایانی باسیشە بە بێ خۆر، زەوی دەبێتە بەستەڵەکێك، یان گۆڕێکی بەستەڵەك، کە (٣٥٠) پلە لە ژێر سفر بێ.

١١/ جووڵەکانی خۆر: خۆر چەند جووڵەیەکی هەن، چەند خولانەوەی هەن:

١ـ (٢٠) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا بەرەو داڵی وەستاو دەڕوات.

٢ـ (٢٠٦) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا کە دەکاتە (٧٤١،٦٠٠) کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا، بە دەوری چەقی کاکێشاندا دەخولێتەوە، کە هەر خولێکی (٢٥٠) ملیۆن ساڵی پێدەچێ.

٣ـ خولانەوەیەکی دیکەی خۆر ئەوەیە کە لەگەڵ کاکێشاندا بە خێرایی (٩٨٠) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا، واتە: سێ ملیۆنو پێنج سەدو بیستو هەشت هەزار (٣،٥٢٨،٠٠٠) کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا دەبڕێ[1].

---

١) الأرض، د. زغلول النجار، ص ٢٧٢ - ٢٧٥.

## (زەوی)

چەند زانیارییەكی خێرا دەربارەی زەوی دەخەینە ڕوو:

١/ وشەی (الأرض) (٤٦١) جار لە قورئاندا دووبارە بۆتەوە.

٢/ ڕووبەری زەوی : پێنج سەدو دە ملیۆن كیلۆمەتر دووجایە، (٥١٠,٠٠٠,٠٠٠) كم[٢]، سەدو چلو نۆ ملیۆن كیلۆمەتر (١٤٩,٠٠٠,٠٠٠) كم[٢] وشكانییە، سێسەدو شەستو یەك ملیۆن كیلۆمەتر دووجا (٣٦١,٠٠٠,٠٠٠)ی ئاوە.

٣/ قەبارەی ئەو ئاوە: هەزارو سێسەدو شەست ملیۆن كیلۆمەتر سێجا (١,١٣٦,٠٠٠,٠٠٠ كم[٣])، سالأنە سێسەدو هەشتا هەزار كیلۆمەتر سێجا (٣٨٠٠٠٠)كم[٣] ئاو لە هەوادا هەڵدەگیرێ، كە دوایی دەبێتە هەورو بارانو بەفرو تەرزە، واتە: سالأنە موعەددەلەكەی لێك نیزیكە، وەك ﷲ شوێنەوارێكدا هاتوە (ابن عباس) گوتوویەتی: {مَا مِنْ عَامٍ بِاقَلَّ مَطَرًا مِنْ عَامٍ} {أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ بِرقم: (٣٥٢٠)، وَقَالَ هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ وَلَم يخرجاه، قال الذَّهَبِيّ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ البُخَارِيُّ وَمُسْلِمٍ}، واتە: هیچ سالێك لە سالێكی دیكە بارانی كەمتر نیە، {بەلأم لە شوێنێك زۆر دەبارێ، لە شوێنێك كەم دەبارێ، سالێكی دیكە، پانتاییو شوێنەكان دەگۆڕێن}.

ئاوی سوێری زەریاكان، ئۆقیانووسەكان لە (٩٧٪)ی ئاوی سەر زەوی پێكدێنن، دیارە لە (٣٪)ش ئاوی شیرینە.

٤/ قەبارەی زەوی: (١٨٠,٠٠٠,٠٠٠ كم[٣]) سەدو هەشت ملیۆن كیلۆمەتر سێجایە، كە (٧١٪)ی ئاوەو (٢٩٪)ی وشكانیی و خاكە، بە چیاو خاكو بەستەڵەك هەموویەوە.

٥/ كێشی زەوی: (٦٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) هەزار ملیۆن ملیۆن ملیۆن (طن)ە، واتە: شەش (٢١) سفری لە پێشەوە بێ.

٦/ هێزی کێشکردن: (قوة الجاذبیة)ی زەوی: یازدەو لە دەیا دوو (١١,٢) کیلۆمەتر لە چرکەیەدا.

٧/ هێزی کێشکردنی زەوی: هەتا پەنجا هەزار (٥٠,٠٠٠) کیلۆمەتر بەرەو سەرووی دەڕوات، بەڵام وردە وردە ئەو هێزی کێشکردنە، کەم دەبێتەوە، تاکو دوایی زۆر دوور دەکەوێتەوەو دەبێتەوە بە سفر.

٨/ جووڵەکانی زەوی: زەوی بە لای کەمەوە پێنج جۆرە سووڕانەوەو جووڵەی هەن:

أ ـ جووڵەی یەکەمیان بە دەوری خۆیدا، دیارە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، بە خێرایی سی (٣٠) کیلۆمەتر لە خولەکێک دا، واتە: (١,٦٧٤) کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا دەبڕێ، ئەگەر بە وردیی بیڵێین: (٢٧) کیلۆمەترو (٨٠٠) مەتر، لە خولەکێکدا دەبڕێ، وە زەوی لە ماوەی (٢٤) سەعاتدا خولانەوەی دەوری خۆی تەواو دەکات، واتە: شەوو ڕۆژێک.

ب ـ جووڵەی دووەمی زەوی بە دەوری خۆردایە، بە خێرایی سی (٣٠) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا، ئەگەر بە وردیی بگوترێ: (٢٩) کیلۆمەترو (٦٠٠) مەتر لە چرکەیەکدا، واتە: سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا (٦٠) هێندەی خێرایی خولانەوەیەتی بە دەوری خۆیدا، دیارە زەوی کە بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بە شێوەیەکی ڕێك ناخولێتەوە، بەڵکو بە شێوەیەکی لار (٢٣,٥) بیستو سێ پلەو نیو لە هێڵی شاقۆڵییەوە لارە، وە کە بە دەوری خۆریشدا دەخولێتەوەی دیسان لە خولگەیەکی هێلکەییدا بە لاری (٦٦,٥) شەستو شەش پلەو نیو، وە ئەو لارییەی لە سوورگەی دەوری خۆیدا، دەبێتە هۆی کورتو درێژیی شەوو ڕۆژو، ئەو لارییەی کە لە خولگەی سووڕانەوەی بە دەوری خۆر دایە، دەبێتە هۆی پەیدا بوونی چوار وەرزەکان، خولێکی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا، بە (١٢) مانگ تەواو دەکات، بە (٣٦٥) ڕۆژو لە (٢٤٪)ی ڕۆژێك.

ج ـ جووڵەی سێیەمی زەوی: ئەوەیە کە لەگەڵ کۆمەڵەی خۆردا، بەرەو دالی وەستاو، بە خێرایی بیست کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا دەڕوات.

د ـ سـووڕانـەوەی چـوارەمی زەوی: دیسـان لەگـەڵ کـۆمەڵەی خـۆردا بـە دەوری چەقی کاکێشـاندا، بەخێرایی (٢٠٦) کیلۆمەتر لە چرکەیەکـدا، واتـە: (٧٤١,٦٠٠) کیلۆمـەتر لـە سەعاتێکـدا، وە خولێـك واتـە: خـولێکی خـۆر لەگـەڵ خـۆرو کۆمەڵەکـەیدا بـە دەوری چـەقی کاکێشـاندا، بـە (٢٥٠,٠٠٠,٠٠٠) ملیـۆن سـاڵ تەواو دەبـێ، وەك لە باسی سووڕانەوەی خۆریشـدا باسـمان کرد.

هـ ـ سووڕانەوەیەکی دیکەی زەوی، ئەوەیە کە لەگەڵ کەهکەشانەکەی خۆمان دا کە پێی دەگوترێ: ڕێی کاکێشـان، بـە خێرایـی (٩٨٠) کیلـۆمەتر لـە چرکـەیەکـدا، واتە: لە سـەعـاتێکدا (٣,٥٢٨,٠٠٠) کیلۆمەتـر دەبـڕێ.

٨/ چینـەکـانی زەوی :

زەوی لە حـەوت چین (طَبَقـة) پێکـدێ :

دیـارە هـەرکـام لەو چینـانەش نـاوی خۆی هەیـە، بـەڵام مـن بـۆ کورتـکردنەوە هـەندێ لە چینـەکانم خستووتە نێو یـەك:

چینەکـانی: ١و ٢: بەرگـی بەردیـن (الغِـلافُ الصَّـخْرِي): ئـەم دوو چـینە لـەژێر دەریـــاوە هـەتـا مـاوەی (٦٥) کیلــۆمەتر دەڕۆن، وە لـە ژێـر خـــاکەوە تـاکـو مـاوەی (١٢٠) کیلۆمەتر درێژ دەبنـەوە.

چینەکـانی: ٣و ٤و ٥: ئـەو سـێ چـینە بـە نسبەت دەریـاوە لـە قـووڵایی (١٢٠) کیلۆمەتـرەوە دەسـت پـێ دەکـەنو تـاکو قـووڵایی (٢,٨٨٥) کیلۆمـەتر درێـژ دەبنـەوە، واتە: ئەسـتوورییەکەیان (٢,٧٦٥) کیلۆمەترە.

چینی ٦: کـرۆکی زەوی، بەڵام کرۆکە شلەکەی کە هەمووی ئاسنو کانزای تـواوەی زۆر زۆر گەرمە، ئەویش لە قووڵایی (٢,٨٨٥) کیلۆمەترەوە دەڕواتە خوار، تـاکـو سـنووری (٥,١٧٠) کیلۆمەتـر، وە ئـەو کرۆکـە شـلەی زەوی لـە (٣١٪)ی زەوی پێکدێنێ، کە ئەستووریی (سُمك)ەکەی، ئەندازەی (٢,٢٨٥) کیلۆمەترە.

چینی ٧: کـە پێـی دەگـوترێ: کرۆکی ڕەقـی زەوی (لُب الأرض الصَّلْب) ئـەویان ئەسـتووریی (سُمك)ەکـەی (٢,٤٢٠) کیلۆمـەترە، کـە لـە قـووڵیی: (٥,١٧٠)

کیلۆمەترەوە دەست پێ دەکات، تاکو (٦,٣٧١) کیلۆمەتر، وە ئەم کرۆکە ڕەق و پتەوەی زەوی لە (٩٠٪)ی ئاسنە، وە (٩٪)ی نیکلە، وە هەندێك ماددەی دیکەش.

٩/ هەوای دەوری زەوی: ئەو بەرگە هەوایەی کە دەوری زەوی داوە، چونکە وەك چۆن زەوی بەرگێکی ئاویی هەیە، کە ئۆقیانووسەکانن، بەرگێکی هەواییشی هەیە، ئنجا ئەو هەوایەی دەوری زەوی :

أ) ڕێژەی (٧٨٪)ی نایترۆجینە، واتە: زۆربەی هەرە زۆری، وە (٢١٪)ی ئۆکسجینە، وە (٠,٣٪)ی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنە، وە ئەوانی دیکەش کە ڕێژەی کەمتر پێکدێنن.

ب) قورسایی بەرگە هەوا: (٦,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) شەش هەزار تریلیۆن تەنە، واتە: شەش پازدە سفری لە پێشەوە بێ، چونکە تریلیۆن بریتیە لە یەك ملیۆن ملیۆن، واتە: یەك دوازدە سفری لەپێش بێ.

ج) بە نسبەت قورسایی ئەو هەوایە، یەك (١) کیلۆگرام لەسەر یەك (١)سم$^{٢}$ سانتیمەتر دووجا لەسەر ئاستی دەریا قورسایی هەیە. وە هەتا بیست (٢٠) کیلۆمەتر بەرزیی، کە بەرز دەبێتەوە لە ئاستی دەریاوە، (٦٦٪)ی کێشی بەرگە هەوایەکە پێکدێنێ. وە هەتا بەرزتر دەبێتەوە، بەرگە هەوایەکە کێشی کەمتر دەبێتەوە.

## (مـــانگ)

**چەند زانیارییەك دەربارەی مانگ:**

**١/ مانگ (٢٧) جار لە قورئـاندا بە نـاوی (القمـر) هـاتوە، واتە: مانگ، وە جـارێکیش وشەی (أهلـة) کە کۆی (هلال)ە، (هلال) واتە: مانگی یەك شـەوە، کە بە قەد دەمە داسـێکە ئـەویش جارێـك هـاتوەو هـەمووی دەکاتـە (٢٨) جـار، وە ئـەو (٢٨) جـارە، جێی سـەرنج ئەوەیە کە ژمارەی ئەو ڕۆژانەیە کە مانگیان تێـدا دەبینــرێ، چونکە مانگ واتـە: (القمر) لە مانگ (شَهْر)ێکـدا (٢٨) جار دەردەکـەوێ، دوو شــەوەکەی دیکە دەکەوێتە حاڵەتی (مَحاق)ەوە واتە: ون بوون.**

**٢/ جـووڵەی مـانگ: مـانگ (٣,٦٧٥) کیلـۆمەتر لە سـەعـاتێکدا دەبڕێ، لە سـووڕانەوە بـە دەوری زەویـدا، وە بـە (٢٩) شــەو جارێـك بـە دەوری زەویـدا دەخولێتـەوە، وە ئەگـەر بـە وردیـی تەعبیـری لــێ بکــەین: بـە (٢٩) ڕۆژو (١٢) ســەعاتو (٤٤) دەقیقـە، ئنجـا بـە خێرایـی یــەك کیلـۆمەتر لـە چرکەیەکـدا، ئەمـە بـە دەوری زەویـدا.**

**٣/ دووریـی مانگ لە زەوییـەوە (٣٨٣,٩٤٢) کیلۆمەترە وەك موعــەددەل.**

**٤/ کێشـی مـانگ : (٧٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) حـەوت نـۆزدە سفری لـە پێشـەوە بـێ، کە دەکاتە حەفتا ملیار ملیار تـەن، ئەوەنـدە کێشـەکەیـەتی، کـە دەکـاتە لـە (١٢٪)ی کـێشی زەوی.**

**٥/ قەبـارەی مـانگ: بیســتو دوو تریلیـۆن (٢٢٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) کـم[٣] کیلۆمەتــر سێجایـە، واتە: (٢٢) دوازدە سفری لـە پێشـەوە بـێ، واتـە: یـەك لەســەر پەنجـای قەبـارەی زەوییـە.**

**٦/ تیـرەی مـانگ : (٣,٤٧٤) کیلـۆمـەترە، واتە: یەك لەسـەر چـواری تیـرەی زەوی.**

٧/ ڕووبەرو پانتایی (مساحة)ی مانگ: سی‌و هەشت (٣٨) ملیۆن کیلۆمەتر دووجایە، واتە: لە سەدا حەوت‌و لە سەدا چل‌و پێنج (٧،٤٥٪)ی زەوی.

٨/ هێزی کێشکردنی مانگ: بە قەدەر یەك لەسەر شەش (١/٦)ی هی زەوییە، واتە: ئەگەر شتێك لەسەر زەوی شەش کیلۆ بێ، لەسەر مانگ یەك کیلۆیە، هەر بۆیە ئەوانەی کە دەچنە سەر مانگ، ئەگەر بەرگی قورسیان لەبەر نەبێ، کە باز دەدەن، زۆر بەرز دەبنەوە، چونکە مانگ هێزی کێشکردنی کەمە.

٩/ پلەی گەرمیی مانگ: ئەو ڕووەی کە ڕووی لە خۆرە، سەدو دە (١١٠) پلە بە ڕۆژ گەرمە، وە لە شەودا کە پشتی لە خۆر دەبێ، سەدو بیست (١٢٠) پلەی ژێر سفر ساردە.

١٠/ چڕیی بەرگە هەوای دەوری مانگ، کە جۆرێك لە هەوای لێیە، چڕییەکەی (١/١٠٠٠) یەك لەسەر هەزاری چڕیی بەرگە هەوای زەوییە، هەر بۆیە هەر شتێك بەرەو مانگ بێ لە وردە بەردو، وردە ئەستێرەو، وردە خڕۆکەو نیازیك‌و ئەوانە، هیچی ناگێڕدرێتەوە، بۆیەش بەردەوام سەر مانگ بەرد باران دەکرێ، وە چاڵی وای تێدایە چەندان کیلۆمەتر قووڵە، وە چاڵی وای لێیە کە زارەکەی پێنج کیلۆمەتر فراوانە، ئەگەر ئینسان سەرنجی مانگ بدات ئەوە دەبینێ.

بەڵێ مانگ وەك زەوی نییە، وەك ئەو بەرگە هەوایەی دەوری زەوی، هەرچی دێ، دەکەوێتە نێو مەجالی بەرگە هەوایەکەوە، دەسووتێ‌و دەبێتە خۆڵەمێش، بۆیە ژیان لەسەر زەوی هەیە، بەڵام لەسەر مانگ نییە.

١١/ گڵ (خۆڵ)ی سەر مانگ، یاخود ئەوەی لەسەر مانگە، ئنجا مەوادی کلسییە، هەرچی هەیە، تەمەنەکەی چوار ملیارو شەش سەد ملیۆن (٤،٦٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ساڵە، بە پێی مەزەندەی زانایان.

١٢/ وە شەوو ڕۆژی مانگ (١٤،٥) چواردە شەوو ڕۆژو نیوی زەوییە، یانی: شەوێك لەسەر مانگ، بە قەدەر چواردە شەوو نیوو، ڕۆژێك لەسەر مانگ، بەقەدەر چواردە ڕۆژو نیوی زەوییە.

١٣/ جـوولەی مـانگ لـە ڕۆژئـاواوە بـۆ ڕۆژهـەڵاتە، وە هـەموو ڕۆژێـك (٤٠ تـا ٥٠) خولـەك دوا دەکـەوێ، هەر ئەو هۆکارەشە کە مـانگی مانگی مانگـیی (قمـري) لە مـانگی خـۆریی، سـاڵانە دەوری ـ (١٠) ڕۆژ دوادەکـەوێو ئـەو کاتـانەی کـە خواپەرستییەکانیـان تێـدا ئەنجـام دەدرێـن، وەك حـەجو ڕۆژووی مـانگی ڕەمـەزان، حیکمـەتی دانرانیـان بـە مـانگی مـانگیی، ئەوەیە کـە لـە هـەموو کـەش (فصـل)ەکـانی سـاڵـدا بسـوورێنو، سـەرەنجام مرۆڤ لـە هـەموو کـاتە جـۆراو جۆرەکـان داو، لە هەر چـوار کەشـەکانی سـاڵدا: زسـتـان، بەهـار، هـاوین، پاییـز، خـوا پەرستییەکـان ئەنجـام بـدات، چونکـە هـەر بـە سـیو شـەش (٣٦) جارێـك مانگـی مانگـیی (قمـري) ڕەمـەزانو کـاتی حـەجو سـەرجەم مانگـە مانگییەکـان (الشـهور القمـرية) لە سـاڵ دا سوورێك دەکـەن.

١٤/ مـانگ بـە چـوارده شـەوو ڕۆژو نیـو جارێـك بـە دەوری خۆیـدا دەخولێتـەوە، هـەروەها مانگ خولانەوەشی هەیە بە دەوری زەوییدا، ـ لە ماوەی یەك مانگ دا ـ وە خولانەوەی هەیە لەگەڵ زەوییـدا بە دەوری خۆردا، ـ لە ماوەی یـەك سـاڵ دا ـ ، وە لەگـەڵ خۆردا بەرەو چـەقی کاکێشـان، ـ بە (٢٥٠) ملیۆن سـاڵ ـ ، وە لەگـەڵ کەهکەشـاندا، وە هەموو ئەو جووڵانەی کە زەوییو خۆر هـەیـانن، دیـارە مانگـیش هەییتـی، چونکـە مانگ بە دەوری زەوییـەوەیـەو زەویـی بۆ هەر شوێنێـك بچـێ، مانگیش لەگەڵ خۆی دا دەبات، هەروەك چۆن خۆر بۆ هەر شوێنێك بچێ، زەوییش لەگـەڵ خـۆی دا دەبـات، وە هەشـت (٨) خرۆکـەکەی دیکـەش کـە بـە هـەموویان کۆمەڵەی خۆر پێکدێنـن، لەگەڵ خۆی دا دەبـات.

١٥/ هێـزی کێشـکردنی مـانگ، زانـایان وایـان مەزەنـدە کـردوە، کـە بـە قـەدەر کێبڵـێکی پۆڵایـی کـە تیـرەکەی پەنجـا (٥٠) کیلـۆمەتر بـێ، هێـزی کێشکردنی مـانگ بۆ زەوی هێنـدە بە قووەتـە، کـە کێبڵـی وا هـەر نیـە، بەڵـکو چیـای واش کە ئەستوورییەکـەی هێنـدە بـێ، ڕەنگـە لەسـەر زەوی زۆر نەبـێ.

١٦/ ئەگـەر ڕاکێشـانی مانـگ نەبووایـە بـۆ زەوی، هەروەهـا زەوی بـۆ مـانگ، ئـەوە زەوی بە چـوار سـەعات جـارێك بە دەوری خۆیـدا دەخولایـەوە، یـانی: مـانگ زەوی کێش دەکـات، هـەروەك زەویش مانگ کـێش دەکـات، ئـەوەش دەبێتـە هـۆی ئـەوە

کە سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا سست بێ، ئنجا ئەگەر مانگ نەبووایە، زەوی هەر چوار سەعات جارێك بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە، واتە: شەو دەبوو بە دوو سەعاتو ڕۆژیش دەبوو بە دوو سەعات، کە دیارە ئینسان فریای هیچ نەدەکەوت، نە خەو، نە کارو کاسبیی.

١٧/ وە ئەگەر مانگ نیو هێندەی ئێستای دوور بووایە، لە زەویی، کە وەك گوتمان مانگ (٣٨٣,٩٤٢) کیلۆمەتر لە زەوییەوە دوورە، ئەگەر مانگ نیوەی ئەوە دوور بووایە، هەڵکشانو داکشان (مَد و جَزر)ی دەریاکان، شەستو چوار (٦٤) هێندە دەبوو، ئێستا چەندە! ئێستا (٢٠) مەتر ئاستی ئاو هەڵدەکشێ بەهۆی ڕاکێشانی مانگەوە بۆ دەریاکان، ئەو کاتە (٦٤) هێندە، واتە: (٦٤) جارانی (٢٠) مەترت کردبایە، دەبوو بە (١٢٠٠) مەتر، کیلۆمەترێكو دووسەد مەتر دەریاکان، لە ئاستی خۆیان بەرز دەبوونەوە، بە هۆی هێزی کێشکردنی مانگەوە، لە هەر شەوو ڕۆژێکدا، دیارە لە حاڵێکی واشدا هەموو ئەو وڵاتانەی کە لە دەوری دەریاکانن، تێکڕا نقوم دەبوون، کیلۆمەترێكو دووسەد مەتر بە قەد چیایەکی زۆر بەرزە.

<u>مەسەلەی شەشەم</u>: دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي اخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَّقُونَ ﴿٦﴾ ﴾، بێگومان لە جیاوازیی شەوو ڕۆژاندا، یاخود لە جێگۆڕەکەیاندا، (اختلاف) هەم بە مانای جیاوازیی دێ، واتە: لێك جیان، هەم بە مانای جێگۆڕکەشیان دێ، وەك لە سوورەتی (الفرقان)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ خِلْفَةً ... ﴿٦٢﴾ ﴾، واتە: وە خوا ئەو کەسەیە کە شەوو ڕۆژی کردوون بە جێنشینی یەکدی، یانی: بە دوای یەکدا دێن.

ئنجا خوا دەفەرموێ: لە جێگۆڕەکەی شەوو ڕۆژاندا، یاخود لە جیاوازییاندا، وە لەوەی کە خوا لە ئاسمانەکانو زەویدا خوڵقاندوویەتی، نیشانە هەن، بۆ کەسانێك پارێز بکەن.

ئینسـان ئەگـەر ئەهلـی تەقـوا بـێ، بـە چـاوی عـەقڵو دڵ شـتەکان دەبینـێ، وە کاتێـك دیـاردەو دیمەنـە سـەرنج ڕاکێشـەکانی بوونـەوەرو دەوروبـەر دەبینـێ، وەك نیشـانەکانی خوا سـەرنجیان دەدات، نـەك وەك سروشـتێکی کەڕو لاڵو بـێ خاوەنو بـێ نهێنیی، کە نەزانێ کێ دروستی کردوە؟ کێ بەڕێوەی دەبات؟ بۆ کوێ دەچێ؟ چۆن هـاتوە؟

لە ئایـەتی پێشـێ دا دەفـەرموێ: (لآيَـاتٍ لِقَـوْمٍ يَعْلَمُـون)، بـۆ کەسـانێك کە بـزانن، ئینسان ئەگەر زانیاریی نەبێ، بەو وردەکارییانە نازانێو، هەر وا دەزانێ کە بوونەوەر شـتێکی زۆر سـادەیە، وە کـاتی خـۆی بـە پێـی گـەردوون نـاسـیی (بەتلـیمۆس) و (ئیقلیدس) گوتوویانە: زەوی وەك سینییەك وایە لەسەر ئاو، ئاسـمانیش گومبـەزێکی شینە گلۆپی تێ چەقێنـراونو بەسەر زەویدا دراوە! هـەر ئەوەندەیـان لـێ زانیـوە، بەڵام قورئـان بە جۆرێکـی دیکـە باسی بوونـەوەری کـردوە، بـۆ وێنـە: لـە سـوورەتی (الواقعـــة)دا دەفـــەرموێ: ﴿ فَـلَآ أُقۡسِـمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيـمٌ ﴿٧٦﴾ ﴾، واتە: نەخێـر (وەك ئێوە دەڵێن وا نیـە، ئـەی کافرەکـان !) سـوێند دەخـۆم بـە جێگـاو ڕێگـا (شـوێنی خـولانەوەو سـووڕانەوەو جووڵـە)ی ئەستێرەکان، وە بێگـومان ئەگــەر ئێوە بزانن ئەمـە سـوێندێکی مەزنـە، یانی: دوای ئـەوەی کـە زانیارییت دەبێ لەبـارەی دروسـتکراوەکانی خـواوە، ئنجـا لـە گـەورەیی سوێندەکانی خوا حـاڵی دەبـی، ئنجـا خـوا دەفـەرموێ: لە جێگـۆڕکـەی شەوو ڕۆژو جیاوازییاندا، وە لـەوەدا کـە خـوا دروسـتی کـردوە لـە ئاسـمانەکانو زەویـدا، نیشـانە هەن بۆ کەسانێك، بۆ کۆمەڵێـك کە پارێز بکـەن، ئینسـان ئەگـەر تەقـوای هـەبوو، چاوی عەقڵو دڵی ڕوونتر دەبێتـەوە، دیـوی پەنهانی شتەکانیش دەبینـێ، نـەك هـەر ڕواڵەتەکـەیان ببینـێ، وەك خـوا دەفـەرموێ: ﴿ يَعۡلَمُونَ ظَـٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ ﴾الـروم، واتـە: ڕواڵەتێـك لـە ژیـانی دنیـا دەزانـن، بـەڵام ئەوان لە دواڕۆژ بـێئاگـان.

هەروەها هەر لە سوورەتی (یونس)دا ـ کە دوایی دەیگەینێ ـ لە ئایەتی (٦٧)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾، کە وەك پێشتر گوتمان: یەکێك لە واتایەکانی (إختلاف) بریتیە لە : (جیاوازیی) شەو تاریکە، ڕۆژ ڕووناکە، خوا دەفەرموێ: خوا ئەو کەسەیە کە شەوگاری بۆ گێڕاون بە مایەی تێدا پشوودان، ڕۆژگاریشی بۆ گێڕاون بە مایەی بینین، لە ئائەوەدا نیشانە هەن بۆ کەسانێك ببیستن.

شەوگار پشووی تێدا دەدەن، خوای کارزان تاریکی کردوە، بۆ ئەوەی ئیسراحەتی تێدا بکەن، خەڵکی وا بەتەماع هەیە، ئەگەر هەموو دەمێ شەویش وەك ڕۆژێ ڕووناك بووایە، خۆی دەپساند، هەر خەریکی کارو کەسابەتو خۆ ماندوو بوون کردن دەبوو، بەڵام خوای پەروەردگار بە ئیجباریی پشوویان پێ دەدات، شەو تاریك دادێنێ، بۆ ئەوەی خەڵك پشوو بدات، ڕۆژیش ڕووناکە تاکو کەسابەتو جموجوڵی تێدا بکەن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، هەرچی خوا لە ئاسمانەکانو زەویدا دروستی کردوە، ئەوە هەموو شتێك دەگرێتەوە وردو درشت، ﴿ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَّقُونَ ﴾، (آیاتٍ) یانی: (عَلامَاتٍ) واتە: نیشانەن، ئەوانە هەموویان بۆ ئەو کەسانەی پارێز لە خوای پەروەردگار بکەن، پەیوەندیی بەندایەتییان لەگەڵ خوادا بەهێز بێ، ئەوانە نهێنیی دروستکراوەکان دەزانن، ئەوانە حیکمەتی دروستکراوەکان دەزانن، ئەوانە دیوی پەنهانی دروستکراوەکان دەبینن، و کاتێك سەرنجی ئەو دیمەنە سروشتییانە دەدەن، وەك نیشانەکانی خوا دەیانبینن، وەك یەکێك لە شاعیرەکان دەڵێ:

وَفِي كُلِّ شَيءٍ لَهُ آيَةٌ تَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ وَاحِدٌ

لە هەر شتێکدا نیشانەیەك هەیە بۆ خوا

بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە تاکەو تەنیا

کاتی خۆشیی کە جاروبار شیعرم دەنووسی، لە شیعرێکدا گوتوومە:

سروشت ئاوێنەی تەجەللای خوایە     باش سەرنجی بدە بزانە چی تیایە!
لە ڕێی (کر)ەوە کردگار دەناسرێ     سروشت کرێکە کردگاری خوایە

**مەسەلەی حەوتەم**: کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱطۡمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ٧ أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ٨﴾، لێرەدا خوا ﷻ پێناسەی بێبڕوایانمان بۆ دەکات، کورتەی مانایەکەی ئاوایە: بێگومان ئەوانەی کە بە ئومێدی دیداری ئێمە نین و، ژیانی دنیایان پەسند کردووەو، دڵیان پێوەی نووساوەو ئۆخژنیان پێی هاتوە، وە ئەوانەی کە لە نیشانەکانی ئێمە بێئاگان، ئەوانە جێگای حەوانەوەیان ئاگرە بەهۆی ئەو کردەوە (خراپانە)وە کە ئەنجامیان دەدان.

**پێناسەی بێبڕواییان بە چوار سیفەتیی بنەڕەتییان:**

لێرەدا خوای کارزان باسی بێبڕوایان دەکات و بە چوار وەسف باسی کردوون:

سیفەتی یەکەم: ﴿لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا﴾، یانی: بە هیوا نین، بە ئومێد نین بگەنە دیداری ئێمە، (الرّجاءُ: طَلَبُ شَيءٍ مُتَوَقَّع) (رَجاء) بریتیە لەوە کە تۆ بەدوای شتێکدا بچی کە بگونجێ بێتە دەستت، بەڵام (أمَل) ئەوەیە کە تۆ بەدوای شتێکی وەهمییدا بڕۆی، یان شتێك کە نەگونجێ پەیدابێ، بۆیە هەمیشە (رَجاء) شتێکی پەسندە، ئنجا ئەوانە: ﴿لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا﴾، بە ئومێدی دیداری ئێمە نین، ئنجا کەسێك بە ئومێدی دیداری خوا نەبوو، دیارە خۆی ئامادە ناکات بۆ دیداری خوا، بەڵام کەسێك بزانێ دەچێتەوە دیداری خوا، بۆ خزمەت خوای پەروەردگاری خۆی ئامادە دەکات، توێشوو بۆ ئەو سەفەرە دادەنێ، هەوڵ دەدا بزانێ بە چ ڕووێکەوە بچێتە خزمەت خوا ﷻ، بۆیە لە قورئاندا ئیمان

بە خواو، ئیمان بە ڕۆژی دوایی، زۆر پێکەوە هاتوون، چونکە کەسێك ئیمانیشی بە خوا هەبێ، بەڵام ئیمانی بە ڕۆژی دواییو بە دیداری خوا نەبێ، وە پێی وا نەبێ کە خوا زیندووی دەکاتەوەو لێی دەپرسێتەوەو لێی دەپێچێتەوە، ئەوە هاندەرێکی نابێ کە خۆی ئامادە بکات بۆ دیداری خوای پەروەردگار.

هەڵبەتە هەندێك لە خواناسان، ئەوانەی کە باش خوایان ناسیوەو خوا پەرستنو زۆر صاڵحن، گوتوویانە: ئەگەر خوا بەهەشتیشی دروست نەکردبایەو دۆزەخیشی دروست نەکردبایە، هەر نەدەبوو سەرپێچیی لێ کرابایە، هەر دەبوو بەندایەتیی بۆکرابایە، بۆچی؟ لەبەر ئەوەی مەقامی بەرزو مەزنی خوا، بەخشندەیی خوا، سیفەتەکانی خوا، شایستەی ئەوەن کە خوا هەموو جۆرە بەندایەتییەکی بۆ بکرێ، ئەگەر لەبەر خۆشیی بەهەشتەکەیو لە ترسی دۆزەخەکەشی نەبێ، کە بێگومان ئەوە ڕاستە، بۆیەش خوا ﷻ لە سووڕەتی (التوبة)دا دەفەرموێ : ﴿ ...وَرِضْوَانٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ... ﴿٧٢﴾ ﴾، واتە: وە ڕەزامەندییەك لە خواوە، گەورەترە، واتە: گەورەترە لە بەهەشتو لەوەی کە لە بەهەشت دا هەیە، وەك دوایی دەیگەینێ، کە خوا ﷻ بە ئەهلی بەهەشت دەفەرموێ: بەڵێنێکم پێداون، با بۆتان جێبەجێ بکەم، دەڵێن: خوایە! تۆ هەموو شتێکت داوە بە ئێمە، ئنجا کە: پەردە لادەدات خۆییان پێشان دەدات، کاتێك تەماشای خوای بەرزو بێ هاوەڵ دەکەنو بە دیداری خوا شاد دەبن، پێیان لە هەموو نیعمەتەکانی بەهەشت پاشترە.

<u>سیفەتی دووەم</u> : ﴿ وَرَضُواْ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، وە ژیانی دنیایان پەسند کردوە، یانی هەڵیانبژاردوەو بەس (إکتفاء)یان پێ کردوەو بەهۆیەوە خواو خەڵكو قیامەتو بگرە خۆیشیان لەبیرکردوە.

<u>سیفەتی سێیەم</u> : ﴿ وَٱطْمَأَنُّواْ بِهَا ﴾، یانی: دڵیان پێوەی پەیوەست بووەو، ئۆخژنیان پێی هاتوەو، دڵیان پێیەوە چەسپیوە، وەك بڵێی دڵیان بە هۆی ئەو ژیانی دنیاییەوە، ئارامی گرتوە، سبحان الله خوا لە سووڕەتی (الرعد)دا دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ٢٨ ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوەو بە یادی خوا دڵیان ئارام دەگرێ، ئاگادار بن! وریابن! تەنیا دڵان بە یادی خوا ئارام دەگرن، واتە: ئارام گرتنی ڕاستەقینە، بەڵام جاری واش هەیە جۆرێك لە ئارامگرتنو ئۆخژنی وەهمییش هەیە، مرۆڤ پێی وایە ئەگەر سەروەتو سامانی زۆر هەبوو دڵخۆش دەبێ، بەڵام ئەوە لە حەقیقەتدا وەهمەو سەرابە، چونكە دوایی هەر هەست بە تینوێتیی دەكات، وەك پیرەمێردی شاعیر دەڵێ:

تەماع وەك ئاوی سوێری دەریایە هەر دەیخۆیتەوە تەسەللات نایە

باباى وا هەیە ملیۆنێكی[1] هەیە، بەڵام پێویستی بە ملیۆنێكی دیكەش هەیە، چەندی هەبێ، پێویستی بە زیاتر هەیە، تەنیا شتێك كە دڵی ئینسانو لایەنە مەعنەوییەكەی ئینسان تێرو تەسەل دەكات، بریتیە لە پەیوەندیی بە خواوە ﷻ، وە بەندایەتیی بۆ خوا.

<u>سیفەتی چوارەم</u>: ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ﴾، وە ئەوانەی كە لە ئایەتەكانو نیشانەكانی ئێمە بێئاگان، جاری دیكەش باسمان كردوە: وشەی (آيَة) واتە: (عَلامَة) نیشانە، (آيات) كۆیەكەیەتی، واتە: نیشانەكانی خوا، ئایەتەكانی خواش بە گشتی سێ جۆرن :

١/ ڕستەكانی فەرمایشتەكەی واتە : (ڕستەكانی قورئان).

وەك خوا فەرموویەتی : ﴿ الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ وَقُرۡءَانٖ مُّبِينٖ ١ ﴾ الحجر .

---

١) واتە: ملیۆنێك دۆلار.

٢/ دیاردەو دیمەنە سروشتییەکان، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾ یوسف، واتە: وە زۆر نیشانە هەن، لە ئاسمانو زەوییدا، بە لایاندا ڕەت دەبن، بەڵام پشتیان تێدەکەن، واتە: سەرنجیان نادەن، بە چاوی سەر دەیبینن، بەڵام سەرنجیان نادەن بە چاوی عەقڵو دڵ.

٣/ بەڵگەو موعجیزەکانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍ بَيِّنَٰتٍ ... ﴿١٠١﴾ ﴾الإسراء، واتە: وە بێگومان ئێمە نۆ ئایەتی ڕۆشنمان بە مووسا دابوون.

کە مەبەست پێی موعجیزەکانییەتی، وەك: گۆچانەکەیو دەستی، وە ئەو حەوتەی دیکە کە لە سووڕەتی ئەعرافدا باسکراون.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ئەوانەی بەو شێوەیە ئەو چوار سیفەتەیان هەن، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٨﴾ ﴾یونس، ئەوانە جێگای حەوانەوە (مأوی)یان ئاگرە، (مأوی) ئەو شوێنەیە کە دەبێ تێیدا بحەوێیەوە، ئەو شوێنەی کە دەبێ لێ بپارێزرێی، ئەو شوێنەی کە تۆ دەبێ تێیدا پشوو بدەی، جا ئەگەر ئاگری دۆزەخ، شوێنێك بێ بێبڕوایەکان تێیدا پشوو بدەن، مانای وایە ماڵ وێرانن، چونکە نێو ئاگر بە حەقیقەت شوێنی پشوودانو شوێنی حەوانەوەو شوێنی ئیسراحەت تێدا کردنو شوێنی پارێزران نییە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە دەیانکرد، خوا ستەمیان لێ ناکات، بەڵکو بە هۆی کردەوەکانیانەوەو، بە هۆی ئەو جۆرە ئیعتیقادو بۆچوونە غەڵەتەیان، وە ئەو ئاکارو سیفەتە خراپانەیانو، ئەو کردەوەو ڕەفتارە ناشەرعییو دزێوانەیانەوە، بەو مەرەدە چوونو تووشی ئەو چارەنووسە تاڵە بوون، ئەگەرنا خوای دادگەر ستەمی لێ نەکردوون.

مەسەلەی هەشتەمو کۆتایی، ئنجا خوا ﷻ پێناسەی بڕواداران دەکات، دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهۡدِيهِمۡ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمۡۖ تَجۡرِي
مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٩﴾ دَعۡوَىٰهُمۡ فِيهَا سُبۡحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمۡ
فِيهَا سَلَٰمٞۚ وَءَاخِرُ دَعۡوَىٰهُمۡ أَنِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾.

ماناکەی بە کورتی ئاوایە: بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داون، پەروەردگاریان بە هۆی ئیمانەکەیانەوە دەیانخاتە سەر ڕێی ڕاست، ئەوانە لە دوارۆژدا لە بەهەشتەکانی خوادا دەبن، کە ڕووبارگەل بە ژێریاندا (واتە: بە ژێر کۆشکەکانیاندا) دەڕۆن، لە نێو چەند باغو بێستانێکی پڕ نازو نیعمەت دان، لەوێدا پاڕانەوەیان بریتییە لە (سُبۡحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ ) پاکیی‌و دووریی بۆ تۆ ئەی خوایە! لە هەر کەمو کوڕییەك (وَتَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٞ ) وە سڵاو کردنیان لە نێو خۆیاندا، (وە لەگەڵ فریشتەکان دا) بریتییە لە سەلام، (وَءَاخِرُ دَعۡوَىٰهُمۡ أَنِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ )، وە دوایین پاڕانەوەیان بریتییە لە ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان.

کە دەفەرموێ :﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، بێگومان ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە، بڕوایان بە چی هێناوە؟ بڕوایان بە هەموو ئەو شتانە هێناوە کە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، واتە: بڕوایان هێناوە بە خوا ﷻ، بە فریشتەکانی، بە کتێبەکانی، بە ڕۆژی دوایی، وە بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، وە بە هەرچی کە پێغەمبەران هەواڵیان پێداوە لە خواوە.

﴿ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، وە کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، واتە: تێکڕای ئەو کردەوانەی کە بە پێوەری خوا بە باش لە قەڵەم دەدرێ، هەوڵیان داوە هەمووی جێبەجێ بکەن.

ئا ئەوانە خوا ﷻ چییان بۆ دەکات :

یـەك / ﴿ يَهۡدِيهِمۡ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمۡ ﴾، پەروەردگاریـان بـەهۆی ئیمانەکەیـانەوە هیـدایەتیان دەدات، لێرەدا ئەوان بێگومان ڕێنمایی خوایان وەرگرتووە بۆیە ئیمانیـان هێنـاوە، کەواتە: ئەم وشەی: (یهدیهم) مانای دووەمـی هیدایـەت دەگرێتـەوە، یـانی: خـوا دەیانخـاتە سـەر ڕێـی ڕاسـت، بەهـۆی ئیمانەکەیانـەوە، واتـە: لـە هـەموو هەڵسوکەوتەکانیاندا لەسەر ڕێی ڕاستن، چونکە ئینسان یەکجار پێویسـتی بـەوە هـەیە ڕێی خوا بدۆزێتەوە، کە ئەوە هیدایەتە، بەڵام دوایی بـەردەوام پێویسـتی بـە هیـدایـەتی خوا هـەیە، بۆ ئەوەی لە هەموو کارو کـردەوەکانی دا:

أ / لـە هـەموو نیـەتو مەبەسـتەکانـی.

ب/ لـە هـەموو قسـەو تەعبیـرەکـانـی دا.

ج/ لـە هەموو هەڵسووکەوتەکانی دا، ئەندامـەکانی پێویسـتی بـەوە هەیـە، کـە بـە پێی شەرع ڕەفتار بکات، وەك لە سووڕەتی (محمد)دا خوا دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدًى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ١٧ ﴾، واتـە: ئەوانـەی هیـدایەتی خوایان وەرگرتـوە، (واتە: یەکەمجار کەوتوونە سەر ڕێی ڕاسـت) خـوا بـەردەوام هیـدایەتو خسـتنە سـەر ڕێـی ڕاسـتیان بـۆ زیـاد دەکـات، وە تەقواشـیان پـێ دەبەخشێ.

ئەوانـە سـەرەنجامیـان چۆنـە؟

دوو / ﴿ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾، ڕووبـاریان بە ژێـردا دەڕۆن، واتـە: ڕووبـار بە ژێـر کۆشـكو تـەلارەکـانیـاندا دەڕۆن.

ئنجـا ئایـا لە بەهەشـت دا چی دەڵێـن ؟:

سـێ/ ﴿ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴾، لە نێـو بـاغو بێسـتـانو گوڵزارێکی پڕ نیعمـەتدا.

١) ﴿ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ ﴾، (دعوى) واتە: (دُعاء) پاڕانەوە، پاڕانەوەیان چییە؟ بریتییە لە: ئەی خوایە! پاكیی‌و، دووریی بۆ تۆ لە هەر كەم‌و كورپیی‌و هەڵەو پەڵەیەك.

٢) ﴿ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴾ وە سڵاو كردنیان لەوێدا، بریتییە لە سەلام (سَلام) یانی: چی؟

(السَّلاَمُ: التَبَرِّي مِنَ الآفَاتِ والعُيُوب)، واتە: سەلام بریتیە لە بێ بەڵایی‌و بێ گرفت‌و كەم‌و كورپیی‌و سەلامەت بوون لە ناخۆشیی‌و دەردەسەریی‌و عەیب‌و عارەكان، كە بێگومان بەهەشت بەو شێوەیەیە.

كەواتە: هەر ئەوە شێوەی سڵاوكردنیانە لە یەكدی، وشەی سەلام بەكاردێنن، خوای پەروەردگار هەم لە سووڕەتی (مریم) ئایەتی (٦٢)، هەم لە سووڕەتی (الواقعة) ئایەتی (٢٥)دا یەك تەعبیر دەفەرموێ: ﴿ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا إِلَّا سَلَٰمًا ۖ وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴾، واتە: قسەی پووچ، قسەیەك كە خەڵك گوناهبار بكات، تێیدا نابیستن، هیچ نابیستن جگە لە سەلام، سەلام، هەر ئەوە دەبیستن لە بەهەشتدا، واتە: قسەی خراپ‌و پووچ‌و بێ‌مانای تێدا نیە.

٣) ﴿ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، وە دوایین پاڕانەوەشیان ئەوەیە كە ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییەكان. (واتە: ستایشی خوا دەكەن).

كەواتە: لەگەڵ خوای پەروەردگاردا هەر بە پاك گرتن‌و ستایش كردن شێوەی تەعبیرو قسەیانە، وە لەگەڵ خەڵكدا تەنیا سەلام كردن قسەیانە.

كۆتایی ئەم دەرسە بەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین: {إنَّ أَهْلَ الجَنَّةَ يَـأْكُلُونَ فِيهَـا وَيَشْـرَبُونَ، وَلاَيَتْفِلُـونَ، ولاَيبُولُـونَ، ولاَيَتَغوَّطُـونَ، ولاَ يَمْتَخِطُـون. قَالُوا: فَمَا بَـالُ الطَّعَام والشَّرَاب؟! قَالَ: جُشَاءٌ وَرَشحٌ كَرَشحِ المِسكِ، يُلْهَمُون التَسْبِيح والتَحمِيد، كَمَا تُلْهَمُونَ النَّفَسَ} {رَوَاهُ مُسْلِم برقم: (٧٠٨١)}.

واتــە: خەڵکــی بەهەشــت دەخــۆن‌و دەخۆنــەوە، بــەڵام نەتفیــان هەیــە، نــە میزیـان هەیـە، نە پیسایییان هەیە، نە بەڵغـەم‌و چڵمیـان هەیە، گوتیان: ئەدی ئـەو خواردن‌و خـواردنـەوەی دەیخـۆن چـی لێـدێ؟ فـەرمووی: دەبێتـە قـرپ‌و ئارەقــە، وەك بۆنی میسك وایـە، (کـە قرپیـان دێتـەوە، وە ئـەو ئارەقەیـەی کە لـە بەدەنیـان دەردەچــێ، بۆنەکــەی وەك میسـکە کــە خۆشــتـرین بۆنــە)، بــە فێـرکـران‌و بــۆ ئاسانکردنـەوە خـوا بەپاك دەگـرن‌و سـتایشـی دەکەن، وەك چـۆن ئێـوە هەنـاســە دەدەن، بەبـێ مـاندوو بوون.

دیـارە ئــەو حاڵەتـانەی بـۆ ئەهلـی دنیــا هـەن لـە ژیـانی دنیـادا، وەك هـەبوونی میــزو پاشـەڕۆك‌و ئــەو کــەم‌و کورپیانــەی دیکـە کـە هــەن، زادەی ئــەو جەســتە ماددییــەن، کــە بۆ دنیــا دروست کراوە، بەڵام لـە بەهەشـت دا خـەڵکی بەهەشت بە پیـاوو ئافرەتەوە ڕووحێکی زۆر چاکیـان دەبـێ‌و جەستەیەکیـان ڕێك‌و پاك‌و خاوێنیــان دەبــێ، وە بەدڵنیــاییەوە پێکهــاتەی جەســتەیی خەڵکی بەهەشـت لـەم پێکهاتەیـەی ئێسـتـای خەڵکی دنیـا، زۆر جیـاواز دەبـێ، بگـرە ئـەو ماددەیـەی کــە لێشــی دروســت دەکرێنــەوە، لـەوەی ئێسـتـا جیــا دەبـێ، فەرمایشـتی خــواش : ﴿...وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾﴾ الواقعة، ئامـاژەیەکی ڕوونە لـەوبـارەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دووەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە دە (١٠) ئایەت پێك دێ، لە ئایەتی (١١ تا ٢٠)، لەو دە ئایەتەدا خوای كارزان باسی چەند بابەتێك دەكات:

١/ پەلە كردنی خوا لە دابینكردنی خێرو چاكەدا بۆ خەڵكو، پەلە نەكردنی لە سزادانو خراپە بەسەر هێنانیاندا.

٢/ هەڵپەو پەلە كردنی مرۆڤی بێبڕوا لە كاتی ناڕەحەتیی داو، دواتر سپڵەییو پێ نەزانیی نواندن.

٣/ ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە كە: خوا گەلانی پێشووی بەهۆی ستەمەوە فەوتاندوونو، پاشان ئێمەومانانی لە دوایان كردۆتە جێنشین.

٤/ داواكردنی كافرەكانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ كە یان قورئانێكی دیكەیان بۆ بێنێ، یان دەستكاریی ئەوە بكات كە هێناویەتیو، وەڵامدانەوەی ددانشكێنیان.

٥/ ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە كە: هاوبەشدانەرەكان شتانێك دەپەرستن كە توانای زیانو سوودیان نیەو، كە بە شەفاعەتكاریشیان دادەنێن، قسەیەكی پووچە.

٦/ خستەڕووی ئەو ڕاستییە كە: مرۆڤایەتیی كاتی خۆی هەمووی ئەهلی خوا بەیەكگرتن بووەو دوایی ڕاجیایی تێدا پەیدا بووە.

٧/ ڕوونكردنەوەی ئەوە كە هێنانی نیشانەو موعجیزەی دیكە، ئەركی پێغەمبەر ﷺ نیە.

﴿وَلَوْ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ ٱسْتِعْجَالَهُم بِٱلْخَيْرِ لَقُضِىَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ ۖ
فَنَذَرُ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١﴾ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ
ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوْ قَاعِدًا أَوْ قَآئِمًا فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمْ
يَدْعُنَآ إِلَىٰ ضُرٍّ مَّسَّهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا
ٱلْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ ۙ وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ ۚ
كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٣﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ مِنۢ بَعْدِهِمْ
لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ ۙ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا
يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ ۚ قُلْ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن
تِلْقَآئِ نَفْسِىٓ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ
عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ ۖ فَقَدْ لَبِثْتُ
فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ
كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٧﴾ وَيَعْبُدُونَ
مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ
ٱللَّهِ ۚ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ
وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٨﴾ وَمَا كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَٱخْتَلَفُوا۟ ۚ وَلَوْلَا
كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ فِيمَا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٩﴾
وَيَقُولُونَ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ فَقُلْ إِنَّمَا ٱلْغَيْبُ لِلَّهِ فَٱنتَظِرُوٓا۟
إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿٢٠﴾﴾

# مانای وشـە بە وشـەی ئایەتەکـان

{وە ئەگـەر خـوا پەلـەی کردبـایە بـۆ وەڵامدانـەوەو هێنـانەدی (نـزای) خراپـەی خـەڵك (لـە خۆیـان) وەك کە ئەوان پەلە دەکەن لە هێنـانەدی چاکـەدا، کـاتی لـەبەیـن چوونیـان تێدەپەڕی، بـەڵام لـە نـائومێدان لـە دیـدارمان (بـە هـۆی بێبـڕوایی یـان گونـاهکـاریی یـەوە) دەگـەڕێین لـە سـەرکێشـیی خۆیـاندا سـەراسـیمە بـن ﴿١١﴾ وە هەرکـات مرۆڤـ (ی بێبـڕوا) خراپـەو زیانێکـی تـووش بـوو، لێمـان دەپاڕێتـەوە، چ لەسـەر کەلـەکەی بـێ، یـان بـە دانیشتنەوە، یـان بـە پێوە، ئنجا هـەر کـات خراپـەو زیانەکەیمـان لـێ لابـرد، دەڕوات (تێهـەڵدەتریزێنـێ) وەك هەرگـیز بـۆ (لابردنـی) زیانێـك کە تووشی بووە، لێمـان نەپاڕابێتـەوە! ئـاوا ئـەوەی زێدەڕۆیی کـاران دەیکەن، بۆیـان ڕازێنـراوەتـەوە ﴿١٢﴾ وە بـە دڵنیـایی (خـەڵکـانی) سـەدەکـانی پـێش ئێوەمـان کـاتێـك سـتەمیان کـرد، فەوتـاندن، وە پێغـەمبـەرانیان بـە بەڵگـە ئـاشـکرایەکـانەوە هاتنـە لایـان، بەڵام نەدەگونجا (پاش ئـەو هـەموو سـتەمو خراپەکـارییەیان) بڕوابێنـن، بەو شـێوەیە سـزای کۆمـەڵی تـاوانبـاران دەدەیـن ﴿١٣﴾ دوایـی ئێوەمـان دوای وان لـەسـەر زەوی کـردە جێگـرەوەیان، تـاکو سـەرنج بدەین: چۆن ڕەفتـار دەکـەن؟! ﴿١٤﴾ وە کـاتێك ئـایەتەکانی ئێمـەیان بـە ڕۆشنیی بەسـەردا خوێندرانـەوە، ئەوانـەی بـە هیـوای دیـداری ئێمـەنین گوتیـان: قورئـانێکی دیکـەی جگـە لـەمە بێنـە، یـان {ئـەوەی ئێمـە حـەزی پێنـاکەین} ، بیگۆڕە، بڵـێ: بۆم نیـە لەلایـەن خۆمـەوە بیگۆڕم، مـن تـەنیا شوێن ئـەوە دەکەوم کە بۆم سروش دەکرێ، بە دڵنیایی ئەگـەر سـەرپێچیی پەروەردگـارم بکـەم لـە سزای ڕۆژێکی مەزن دەترسم ﴿١٥﴾ بڵێ: ئەگەر خوا ویستبای (بەسـەرتاندا نەخوێنمـەوە) نـە بەسـەرتـانـمـدا دەخوێنـدەوە، نەلێشـی ئـاگادار دەکردنـەوە، ئایـا نـافـامن، کـە مـن تەمەنێك لـە نێوتـاندا ماومـەوە (وە بـاسی قورئـانو ئیسلامم نەکـردوە! کەواتـە: ئەمـە قسەی خۆم نیـەو هی خوایـە) ﴿١٦﴾ ئنجا ئـایا کێ لـەو کەسـە ستەمکارترە، کە درۆ بە

ناوی خواوە هەڵدەبەستێ، یان ئایەتەکانی بە درۆ دادەنێ؟ مسۆگەر تاوانباران سەرفراز نابن ﴿١٧﴾ وە لە خوار خواوە، شتانێك دەپەرستن، كە نە زیانیان لێدەدەن و نە سوودیان پێدەگەیەنن، وە دەڵێن: ئا ئەوانە تكاكارمانن لە لای خوا، بڵێ: ئایا لەبارەی پەرستراوانێكەوە هەواڵ بە خوا دەدەن، كە نە لە ئاسمانەكان و نە لە زەوی دا، سۆراغیان نازانێ؟! پاكیی و بەرزیی بۆ وی، لەوەی دەیكەنە هاوبەشی ﴿١٨﴾ وە خەڵك كاتی خۆی تەنیا یەك كۆمەڵ بوون (لەسەر خواپەرستیی، دواتر بە هۆی لادانیانەوە لە بەرنامەی خواو ڕێبازی پێغەمبەران) ناكۆك بوون و ڕاجیایی یان تێكەوت، وە ئەگەر وشە (بڕیار)ێك لە لایەن پەروەردگاتەوە نەدرابایە (كە سزادانی خەڵك هەڵدەگرێ بۆ دواڕۆژ) لەوبارەوە كە تێیدا كەوتوونە ناكۆكییەوە، دادوەریی دەكرا ﴿١٩﴾ وە (بێبڕوایەكان) دەڵێن: دەبووایە (موحەممەدیش ﷺ وەك پێغەمبەرانی پێشووی) نیشانەو موعجیزەیەكی (بەرهەستی) بۆ دابەزێنرابایە! بڵێ: نادیار تەنیا تایبەتە بە خواوە، دەجا ئێوە چاوەڕێ بن، منیش لەگەڵتان لە چاوەڕوانانم (داخۆ خوا ناردنی نیشانەیەكی لەو جۆرە، بە پێویست دەزانێ، یان نا)؟ ﴿٢٠﴾}.

# شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَجَلُهُمْ ): (الأَجَلُ: المُدَّةُ المَضْرُوبَةُ لِلشيءِ)، (أجلْ) بەو ماوەیە دەگوترێ کە دیاریی کراوە بۆ شتێك، بە کۆتاییەکەی دەگوترێ: (أجل).

(فَنَذَرُ ): (وَذَرَ يَذَرُ: أي قَذَفَ يَقْذِفُ الشيءَ لِقِلَّةِ اعْتِدَادِهِ بِهِ)، واتە: شتێك کە فڕێدەدرێ لەبەر ئەوەی بایەخیی پێنادرێ.

(طُغْيَٰنِهِمْ ): (الطُّغْيَانُ: تَجَاوزُ الحَدِّ فِي العِصْيَان)، (طغيان) بریتیە لە بەزاندنی سنوور لە سەرپێچیی دا.

(يَعْمَهُونَ ): (العَمَهُ: التَّرَدُّدُ في الأَمرِ مِنَ التَّحَيُّرِ، قَالَ تعَالى: ﴿زَيَّنَّا لَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُمْ يَعْمَهُونَ ﴾، واتە: (عَمَهُ) ئەوەیە کە ئینسان لە لەرەلەر دابێ، دڵ لە دڵبدا، لە ئەنجامی سەراسیمەیی لە کارێکدا، (عَمِهَ يَعْمَهُ فَهُوَ عَمِهٌ وعَامِهٌ، وَجَمْعُهُ عُمَّه)، (عَمِه) واتە: سەرگەردان بوو، یان کەوتە لەرە لەرە دڵەڕاوکە.

(مَسَّ): (المَسُّ كاللَّمسِ، لَكِن اللَّمْسُ قَدْ يُقالُ لِطلَبِ الشَّيءِ وإنْ لَمْ يُوجد، والمَسُّ يُقَالُ في ما يَكُونُ مَعَهُ إِدرَاكٌ بِحَاسةِ اللَّمْسِ) وشەی: (لَمَسْ) وەك (مَسّ) وایە، بەڵام (لَمْس) بۆ داواکردنی شتێکە با ئەو شتە نەشبێ، بەڵام (مَسّ) بریتیە لە شتێك کە دەستی لێبدرێ.

(ٱلضُّرُّ ): (الضُرُّ سوءُ الحَالِ، سواءً فِي نَفْسِهِ، أَوْ بَدَنِهِ، أَو حَالَة ظَاهِرَة)، (ضُرُّ) واتە: حاڵی ناخۆش، جا چ لەلایەنی دەروونیی، چ لە جەستەیی، [redacted] لە دەوروبەردا.

(كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُۥ): خراپییەکەیمان لێ لابرد، (كَشَفْتُ الثَّوْبَ عَنِ الوَجْهِ وَغَيْرِهِ، وَيُقَالُ كَشَفَ غَمَّه)، واتە: پۆشاکێك لەسەر دەمو چاو بێ، یان لەسەر غەیری وی، لابدرێ پێی دەگوترێ: (كَشْف)، دەگوترێ: (كَشَفَ غَمَّه)، واتە: غەمەکەی نەهێشت، ئەم وشەیە لە ئەسڵدا بۆ لادانی پۆشاکێك، شتێکە لەسەر شتێك، بەڵام دوایی خوازراوەتەوە بۆ لابردنو نەهێشتنی خەمو گرفتو ناخۆشیی.

(مَرَّ): {الـمُرورُ: الـمُضِيُّ وَالإِجْتِيَازُ بِالشيءِ، وَ(مَرَّ) مِثْلُ: ﴿أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ۝٨٣﴾ الإسراء}، (مرور) ئەوەیە کە ئینسان بە لای شتێکدا تێپەڕێو، لێی بگوزەرێ، بەڵام لێرەدا ئەم ئایەتە وەك ئەو ڕستەیە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ۝٨٣﴾ الإسراء، پشتی هەڵکردو تەنیشتی خۆی دوورخستەوە.

(لِلْمُسْرِفِينَ): واتە: زێدەڕۆیی کاران، (السَّرْفُ: تَجَاوُزُ الحَدِّ فِي كُلِّ فِعْلٍ يَفْعَلُهُ الإِنْسَانِ وَإِنْ كَانَ ذَلِكَ فِي الإِنْفَاقِ أَشْهَرُ)، (سرف) بریتیە لە سنوور تێپەڕاندن لە هەر کردەوەیەك دا کە ئینسان دەیکات، هەرچەندە لە بەخشینو ماڵ خەرج کردندا، زیاتر بەکاردێ.

(ٱلْقُرُونَ): (جَمْعُ قَرْنٍ: القَوْمُ الـمُقْتَرِنُونَ فِي زَمَنٍ وَاحِدٍ)، (قَرنْ) کە کۆیەکەی (قرون)ە، بریتیە لە خەڵکێك کە لە ڕۆژگارێکی دیاریی کراودا پێکەوە ژیاون، وە هەندێ لە زانایان بە حەفتا ساڵ، هەندێك بە سەد ساڵ دایاناوە، دیارە هەم بە سەد ساڵەکە دەگوترێ: (قرن)، هەم بە خەڵکێکیش کە لەو سەد ساڵە، یان لەو ماوە زەمەنییەدا ژیاون.

(ٱلْمُجْرِمِينَ): تاوانباران، (أَصْلُ الجُرْمِ: قَطْعُ الثمَرَةِ عَنِ الشَّجَرِ وَاستُعِيرَ لِكُلِّ اكْتِسَابِ مَكْرُوهٍ)، وشەی (جرم) لە بنچینەدا بریتیە لە بڕینی میوە لە درەخت، دوایی خوازراوەتەوە بۆ هەر کردەوەیەکی خراپو ناپەسند، کە ئینسان

وەدەستی دێنێ، (أَجْرَمَ، يُجْرِمُ، إِجْرَاماً، وَهُوَ مُجْرِم) تاوانی کرد، تاوان دەکات، تاوان کردن، ئەو تاوانبارە.

(تِلْقَآيِ): (تِلْقَاءهُ: حِذَاءَهُ، وَالتِّلْقَاءُ أَيْضاً مَصْدَرٌ مِثْلُ اللِّقَاءِ)، (تِلْقَاءهُ) واتە: بەرانبەری، یان لە ڕاست وی، (تِلْقَاء) وەك چۆن بە مانای بەرانبەر دێ، بە هەمان شێوە چاوگەو بە مانای (لِقَاء)یش دێ.

(تَلَوْتُهُۥ): (تَلاَ القُرْآنَ: قَرَأَهُ، وَتَلَوْتُ الرَّجُلَ: تَبِعْتُهُ)، (تلا) واتە: خوێندیەوە، (تَلَوْتُ الرَّجُل) واتە: بە دوای پیاوەکە کەوتم.

(وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ): واتە: خوا ئێوەی لێ ئاگادار نەدەکردەوە، (الدِّرَايَةُ: المَعْرِفَةُ المُدْرَكَةُ بِضَرْبٍ مِنَ الخَتْلِ، دَرَيْتُ: عَلِمْتُ)، وشەی (دِرَايَة) بریتیە لە زانینی شتێك بە پەنهانیی، (دَرَيْتُ) واتە: ئەو شتەم زانی.

(لَبِثْتُ): (لَبِثَ بِالمَكَانِ: أَقَامَ بِهِ مُلاَزِماً لَهُ)، (لَبِثَ بِالمَكَانِ) واتە: لە شوێنەکە نیشتەجێ بووە.

(ٱفْتَرَىٰ): واتە: هەڵیبەست، لە (فَرْي)ەوە هاتوە: (الفَرْيُ: قَطْعُ الجِلْدِ لِلْخَرْزِ وَالإِصْلاَحِ) (فري) بریتیە لەوەی چەرمێك ببڕدرێ، بۆ ئەوەی شتێکی پێ پینە بکرێ، یاخود چاك بکرێ.

(وَاسْتُعْمِلَ فِي القُرْآنِ بِالكَذِبِ وَالشِّرْكِ وَالظُّلْمِ)، واتە: وشەی (افترى) لە قورئاندا بەکارهاتوە بۆ درۆو، شیركو، زوڵم.

(شُفَعَٰٓؤُنَا): (شفعاء) کۆی (شَفِيع)ە، (الشَّفْعُ ضَمّ الشيءِ إلى مِثْلِهِ)، (شَفْع) بریتیە لەوە کە شتێك لەگەڵ شتێکی دیکە جووت بکەیو ببن بە دووان، (وَتْر) واتە: تاك، (شَفْع) واتە: جووت، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ٣ ﴾ الفجر، خوا سوێندی خواردوە بە جووتو بە تاك.

(أَتُنَبِّـُٔونَ ): (النَّبا: خَبَرٌ ذُو فائِدَةٍ عَظِيْمَةٍ يَحْصُلُ بِهِ عِلْمٌ أَو غَلَبَةُ ظَنٍّ) (نَبأ) بریتیە لە هەواڵێك كە سوودێكی مەزنی هەبێ، بە هۆیەوە زانیاریی، یاخود گومانێكی زاڵ وەدەست بێ.

(لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ ): واتە: دادوەرییان لە نێواندا دەكرا، (القَضَاءُ: فَصْلُ الأَمْرِ قَوْلاً كانَ ذَلِكَ أَوْ فِعَلاً)، (قضاء) بریتیە لە لێك جیاكردنەوەی شتێك، یاخود هەڵبڕینی بابەتێك، بە قسە بێ، یان بە كردەوە.

## مانـای گشـتـی ئایەتەکـان

وەك لە پێناسەکەیدا گوتمان: خوای بەرزو مەزن حەوت بابەتی سەرەکیی لەم دە (١٠) ئایەتەدا خستوونە ڕوو، ئێمەش لە مانای گشتییەکەیاندا بە قەدەر حاڵ تیشکیان دەخەینە سەر.

خوا ﷻ هەر لە درێژەی باسی مرۆڤدا بە گشتیو، چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ دوا پەیامی خۆیدا کە بە پێغەمبەردا ناردوویەتی، کە ئەم قورئانەیەو بە موحەممەد ﷺدا ناردوویەتی، بە تایبەت هەڵوێستی کافرو هاوبەش بۆ خوادانەرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺو، لە پشت ئەوانیشەوە هەموو ئەوانەی هەڵوێستی ئەو هاوبەش بۆ خوادانەرانەی ئەوسا، دووبارە دەکەنەوە بە درێژایی هەموو جیلەکانی بەشەر، بەڵێ ئەم قورئانە یەکەمجار ڕووی دواندنی لەو خەڵکانە بووە کە لەو ڕۆژگارەدا ژیاون، کە قورئانی تێدا هاتۆتە خوار، بەڵام ئەم قورئانە هەر بۆ لای ئەوان نەهاتووە بەڵکو ڕووی لە هەموو بەشەرە، بۆیە خوا ﷻ کە فەرمایشت دەفەرمویێ، بە شێوەیەك دایدەڕێژێ، کە ئەگەر تۆ ئێستاش بیخوێنیەوەو تەماشای کافرەکانی ڕۆژگاری خۆشت بکەی، ئەوەی کە خوای کارزان کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەری ﷺ پێ پێناسە کردوە، لەگەڵ کافرەکانی ڕۆژگاری تۆشدا دەگونجێ، بۆچی؟ چونکە ئەم قورئانە کەسێك ناردوویەتی، کە بەشەری دروست کردووەو، دەزانێ کە ئەو بەشەرانە وەختێ کە ڕێی کوفر دەگرن، قسەو هەستو نەستو هەڵوێستو بیرکردنەوەو کاردانەوەیان چۆنە؟ لە بەرانبەر ئایینو بەرنامەی خواداو، لە کاتێکیشدا کە ئیمان دێنن، دیسان خوای پەروەردگار دەزانێ لە ئەنجامی ئیمان هێنانو، لە ئەنجامی ڕاستو دروستی لەگەڵ خوادا، بەندایەتیی بۆ خوا، ئینسان چی لە دەروونیدا پەیدادەبێ؟ چۆن بیر دەکاتەوە؟ چۆن ڕەفتار دەکات؟ وە کارلێکی چۆن دەبێ، لەگەڵ ئایینو بەرنامەی خوادا؟

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ ٱسْتِعْجَالَهُم بِٱلْخَيْرِ لَقُضِىَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ﴾، وە ئەگەر خوا پەلەی کردبایە بۆ خەڵك خراپەیان بێنێتە پێشێ، وەك ئەوان پەلە دەکەن لە هێنانەدی چاکەو بەرژەوەندیی دا، کە بۆ خۆیان دەستەبەری بکەن: کاتی لە بەین چوونیان تێدەپەڕی، کاتەکەیانیانی تەواو دەکرد.

خوێنراویشەتەوە : (لَقَضَى إِلَيْهِمْ أَجَلَهُمْ)، واتە: سەری بە فەتارەت دەدان و کۆتایی پێ دەهێنان (بەڵام خوا وا ناکات) ﴿فَنَذَرُ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾، لەوانە دەگەڕێین کە بە ئومێدی دیداری ئێمە نین : لە سەرکێشیی خۆیاندا سەراسیمەو سەرگەردانبن، (بخولێنەوە) بۆچی لێیان دەگەڕێ؟ بۆ ئەوەی زیاتر شایستەی سزاو جەزرەبە بن، بە بارەکەی دیکەشدا: بەڵکو ڕۆژێك لە ڕۆژان بگەڕێنەوە، خوا ﷻ نەخشەو بەرنامەیەك کە لە ئەزەلەوە دایناوە، بە هۆی ئەوەوە کە خەڵك پەلەو هەڵپە دەکات، نەخشەو بەرنامەی خۆی ناگۆڕێ.

ئنجا دێتە سەر باسی هەڵوێستێکی دیکەی ئینسان، کە دەگونجێ لێرەدا مەبەست پێی ئینسانی بێبڕوابێ، بەڵام دەشگونجێ مەبەست پێی مرۆڤ بێ، بە گشتی، واتە: ئەو مرۆڤەی کە دەستی هیدایەتی خوای نەگەیوەتێ، چونکە مەرج نیە هەرکەسێك کە مسوڵمان نەبوو، کافربێ، کافر کەسێکە کە ئایینی خواو هەقی پێگەیشتوە، بەڵام دەیشارێتەوەو دانی پێداناهێنێ، بەڵام ئەدی کەسێك کە هیچی پێنەگەیشتوە؟ ئەو کەسە، بەڵێ مسوڵمان نیە، بەڵام کافریش نیە، چونکە هەرچەندە ملکەچ نەبووە بۆ خوا، بە پێی شەریعەتی خوا نازی، بەڵام لە هەمان کاتدا: ئایینی خواشی ﷻ ڕەت نەکردۆتەوە، کەواتە: ئەوە حاڵەتێکی دیکەیە، کە دەگونجێ بگوترێ: ئەو کەسە (فَتْري)[1] یە، وەك خوای پەروەردگار لە سووڕەتی مائیدەدا دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُوا۟ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٍ وَلَا نَذِيرٍ فَقَدْ جَآءَكُم بَشِيرٌ وَنَذِيرٌ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٩﴾﴾.

---

١) واتە: وشەی (فَتْري) لە ئایەتی ژمارە (١٩)ی (المائدة) وەرگیراوە.

واتە: ئەی خاوەن کتێبینە! ئەوە پێغەمبەرەکەمان هاتە لاتان، پاش دابڕانێکی (هاتنی) پێغەمبەران (ئەو ڕاستییانەی کە پێویستتانن) بۆتان ڕۆشن دەکاتەوە، نەوەك بڵێن: هیچ موژدەدەرو ترسێنەرێکمان بۆ نەهاتوە، بێگومان ئەوە موژدەدەرو ترسێنەرتان بۆ هاتو، خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

ئنجا درێژترین ماوەی نێوان دوو پێغەمبەران (علیهم الصَّلاة والسلام) ئەو ماوەیە بووە کە لە نێوان عیساو موحەممەد دا بووە، صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر، ئەگەرنا دەربارەی پێغەمبەرانی دیکە، خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا ... ﴿٤٤﴾ ﴾المؤمنون، واتە: پاشان پێغەمبەرانی خۆمان پەیتا پەیتا، یەك لە دوای یەك ناردن.

ماوەی نێوان عیساو موحەممەدیش (٦١٠) شەشسەدو دە، ساڵ بووە.

کەواتە: ئەوانە دەگونجێ، پێیان بگوترێ (أَهْلُ الفَتْرَة، أَوْ أَهْل الإِنْقِطَاع)ن، بە نسبەت ئێستاشەوە کەسێك لە هەر شوێنێکی لاچەپی دنیا بێ، مادام باسی ئیسلامی پێنەگەیشتوە، یان بە شێوازێکی ڕاستو دروست پێی نەگەیشتوە هەروەك ئەوە وایە پێی نەگەیشتبێ، ئەوە حوکمەکەی جیایە.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوْ قَاعِدًا أَوْ قَآئِمًا ﴾، وە مرۆڤ کاتێك ناخۆشیی‌و نارەحەتییەکی دێتە ڕێ، چ لەسەر تەنیشتی بێ، (لەسەر کەلەکەی) چ بە دانیشتنەوە بێ، چ بە پێوە بێ، لێمان دەپاڕێتەوە (داوامان لێ دەکات) (خوایە! لەو ناخۆشیی‌و نارەحەتییە ڕزگارمان بکە).

﴿ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمْ يَدْعُنَآ إِلَىٰ ضُرٍّ مَّسَّهُۥ ﴾، بەڵام کاتێك کە ناخۆشیی‌و نارەحەتییەکەی لەسەر لادەبەین، دەڕواتو تێ هەڵدەتریزێنێ، وەك جارێك لە جاران لێمان نەپاڕابێتەوە، بۆ ئەوەی نارەحەتیی‌و ئازاری لێ دووربخەینەوە.

﴿ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، ئاوا زێدەڕۆیی کاران ئەوەی کە دەیکەن، بۆیان جوان کراوە، لەلایەن کێوە؟ بێگومان لەلایەن شەیتانەوە، وەك خوای

کـارزان لــە شــوێنی دیکــەدا دەفــەرموێ: ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾﴾الأنعـام، واتـە: شـەیتان کردەوەکـانیانی بـۆ جـوان کـردوون، بەچـی دەزانین کە شـەیتـان ئەو کـردەوانەی بۆ جوان کردوون؟ بە هۆی ئەوەوە کە هەم خۆیان، هەم کردەوەکانیان سەروکاریان لـەگەڵ شەیتـاندایە، خۆ ئەگـەر ئیمانـداران بوونـایە، ئەوە دیارە ئیماندار کـردەوەی خراپـی پـێ جـوان نیـە، وە بۆشـی جوان نـاکـرێ، بەڵکـو ئیمانـدار کردەوەی بـاشـی بـۆ جوان دەکـرێ، وەك خـوا دەفـەرموێ: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴿٧﴾﴾الحجرات، واتـە: بەڵکـو خـوا ئیمـانی لـە دڵـی ئێـوەدا خۆشەویست کــردوەو بـۆی جـوان کــردوون‌و، کوفــرو لارێ بـوون‌و ســەرپێچیی کردنــی لــە لای ئێـوە کـردوە بە شتێکی ناخۆشویستـراو.

ئینسان ئەگـەر دڵەکـەی ئیمانی تێدانەبێ، وەك دەگوتــرێ: (تەیــری گــوڵ عاشــقی داری ژەقنــەبووتە)، ئینســان ئەگــەر کوفری لــە دڵدا بــێ، هــەر بــە دوای شتـی خراپـدا دەڕوات، بەڵام ئەگـەر ئیمـانی لــە دڵــدا بــێ، ئیمانەکـەی وای لــێ دەکـات بـە دوای شتـی چاکــدا بـڕوات، وەك چـۆن هــەنگ کــە سروشــتەکەی بـاشــە، هــەر بــە دوای گوڵانــدا دەگـەڕێ، بۆ ئەوەی شیلـەکەیان بمژێ، مێشـە ڕەشەش بە دوای شتـی پیسدا دەگـەڕێ.

دوایـــی خـــوا ﷻ دەفــــەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ ۙ وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾، وە بێگومـان سـەدەکـانمان لـە پێش ئێـوەدا فەوتـاندن، واتە: ئەو کۆمەڵگایانەی کە لـە پێش ئێـوەدا لــە سەدەکــاندا ژیـاون، فەوتــاندمانن، بۆچـی؟ ﴿لَمَّا ظَلَمُوا۟﴾، دوای ئــەوەی ستەمیان کرد، خوا ﷻ کەس لە خـۆوە لـەبەیـن نـابـات، یانی: بەهـۆی بـەڵاوە، ئەگـەرنـا خەڵك بە مردنی ئـاسایی هـەر دەمرێ، بەڵام لـێرەدا مەبەست ئەوەیە کە: بەهـۆی بـەڵاو گرفتـارییەوە لە بەینمان بردن، دوای ئەوەی کە ستەمیان کـرد، ﴿وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم

بِٱلْبَيِّنَـٰتِ وَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ ﴾، وە پێغەمبەرەکانیان بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە بۆیان هاتن، بەڵام نەدەگونجا ئیمان بێنن، بۆچی؟ ڕستەکەی دوایی وەڵامی دەداتەوە، دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾، ئا بەو شێوەیە سزای کۆمەڵی تاوانباران دەدەین، یانی: ستەمکاران کە لەسەر ستەمو تاوان بەردەوام دەبن، وایان لێدێ، کە ڕێی گەڕانەوە بۆ لای خوا لە خۆیان دەبەستن، بە پێی یاسای خوای دادگەر، کەهەر کەسێك لەسەر شتێك بەردەوام بوو، تێیدا دەبێتە شتێکی ڕیشەدارو ڕۆچوو، تەماشا بکەن، نەك هەر کوفرو نیفاقو شیرك، بۆ وێنە: کەسێك عادەت بە جگەرە کێشانەوە دەگرێ، عادەت بە ڕەفتارێکی خراپەوە دەگرێ، دوایی دەبێ بە بەشێك لە سروشتی، بۆیە شەریعەتی ئیسلام دەڵێ: منداڵەکانتان بە بچووکی فێری نوێژو ڕۆژوو چاکەکاریی بکەن، تاکو دینداریی ببێتە بەشێك لە سروشتیان، کرداری باش ببێتە بەشێك لە سروشتو کەسایەتییان.

کەواتە: خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ ﴾، بەڵام نەدەگونجا ئیمان بێنن، واتە: لەبەرئەوەی ئەوانە ئەهلی ستەمو ئەهلی تاوان بوون، بەهۆی ستەمو تاوانەکەی خۆیانەوە، سروشتو کەسایەتییان وای لێهاتبوو، هەر مەیلی خراپەی دەکردو، مەیلی لای خوای نەدەکردو، ڕێی بەرەو خوا دانەدەگرت.

پاشان دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَـٰكُمْ خَلَـٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ مِنۢ بَعْدِهِمْ لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴾، دوایی ئێوەمان لە دوای وان لەسەر زەوی کردە جێنشین، تاکو سەرنج بدەین، چی دەکەن؟ چۆن ڕەفتار دەکەن؟ ئایا بە ڕێی واندا دەڕۆن، هەڵەو تاوانەکانی وان دووبارە دەکەنەوەو، سەرەنجامتان وەك چی وانی لێدێ، یان پەند وەردەگرنو بە شێوەیەکی دیکە ڕەفتار دەکەنو، سەرەنجامێکی دیکەی باشتان دەبێ؟!

ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دی، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَـٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَـٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ ﴾، وە کاتێك ئایەتەکانی ئێمەیان بە ڕۆشنی بەسەردا دەخوێنرێنەوە (یان ئایەتە ڕۆشنەکانی

ئێمەیان بەسەردا خوێنرانەوە) ئەوانەی کە بە ئومێدی دیداری ئێمە نین، دەڵێن: قورئانێکی دیکەی جیا لەمە بێنە، یاخود ئەگەر قورئانێکی دیکەش ناهێنی، ئەم قورئانە بگۆڕە، واتە: هەندێك شوێنی کە ئێمە بە دڵمان نیە، بیگۆڕە یانی: دوو داوایان هەن، بەڵام بابزانین خوا ﷻ فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات، چۆن وەڵامی ئەو دوو داواکارییەیان بداتەوە؟

دەفەرموێ: ﴿قُلۡ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلۡقَآيِٕ نَفۡسِيٓۖ﴾، پێیان بڵێ: من بۆم نیە لەلایەن خۆمەوە قورئان بگۆڕم، واتە: ئەوە کە ئەم قورئانە لابەرمو یەکێکی دیکە بێنم، ئەوە هەر هیچ، هەر تەنانەت قورئانەی کە بەسەریشتاندا دەخوێنمەوە، بۆم نیە دەستکاریی بکەم! بۆیە ئەوی دیکەی هەر باس نەکردوە، چونکە ئەگەر بۆی نەبێ ئەمە دەستکاریی بکات، ئەوە چاکتر بۆی نیە کە قورئانێکی دیکە بێنێ، بۆچی بۆی نیە؟ ﴿إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۖ﴾، من تەنیا شوێن ئەوە دەکەوم، کە بۆم سروش دەکرێو پێم ڕادەگەیەنرێ، واتە: من لەلایەن خۆمەوە نایڵێم، چونکە ئەو قسەیەی کافرەکان زۆر بە شەیتانانە کراوە، یانی: مادام تۆ خۆت قورئانت هێناوە، یان قورئانێکی دیکە بێنە، یان ئەم شوێنانەی کە ئێمە بە دڵمان نین، بیانگۆڕە! پێغەمبەریش ﷺ بە فەرمانی خوا وەڵامیان دەداتەوە، کە: ئەسڵەن ئەم قورئانە هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نیە، بۆیە من لە لایەن خۆمەوە، بۆم نیە بیگۆڕمو، من تەنیا شوێن ئەوە دەکەوم کە بۆم سروش دەکرێ، ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾، من ئەگەر سەرپێچیی لە پەروەرگارم بکەم، لە ئازاری ڕۆژێکی مەزن، دەترسم.

ئنجا هەر لەسەر وەڵامدانەوە بەردەوام دەبێ، دەفەرموێ: ﴿قُل لَّوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوۡتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَدۡرَىٰكُم بِهِۦۖ﴾، بڵێ: ئەگەر خوا ویستبای بەسەرتاندا نەخوێنمەوە، بەسەرتانمدا نەدەخوێندەوەو، خوا بەهۆی منەوە ئێوەی ئاگادار نەدەکردەوە، وە ئێوەی لێ فێر نەدەکرد، ﴿فَقَدۡ لَبِثۡتُ فِيكُمۡ عُمُرٗا مِّن

قَبۡلِهِۦٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾، من تەمەنێکم لە نێو ئێوەدا بردۆتە سەر، پێش ئەوەی ئەم قورئانە دابەزێ، ئایا نافامن؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ چل ساڵی ڕەبەق لە نێو کافرەکان دا، لە مەککە ژیاوە، لەو کۆمەڵگایەی خۆیدا، باس‌و خواسی قورئان‌و ئیمان‌و ئیسلامی لەلا نەبووە، بەڵێ سروشت‌و مەعدەنێکی ساغ‌و سافی هەبووە، دوور بووە لەو شتە خراپانەی لە سەردەمی نەفامیی دا کراون، بەڵێ ڕەوشت‌و ئاکارێکی پەسندی بووە، بەڵام باسی ئیمان‌و ئیسلام‌و قورئان نەبووە، بۆیە: دەفەرموێ: ئایا نافامن؟ ئەگەر کەسێك پرۆژەیەکی هەبێ، پێش تەمەنی چل ساڵیی دەستی پێدەکات، لە کاتێکدا کە تین‌و تاقەتی هەیە، بەڵام کەسێك هیچ بابەتێکی لەوبارەوە نەگوتبێ، لە دوای تەمەنێکی چل ساڵیی، یەکسەر وەرچەرخانێکی سەدو هەشتا پلەیی لە ژیانیدا پەیدا بێ، دیارە کە هی خۆی نیە، دیارە لە دەرەوەی خۆی، ئەو فەرمایشت‌و پەیام‌و بەرنامەیەی بۆ هاتوە.

دوایی لەسەر وەڵامەکەی بەردەوام دەبێ، دەفەرموێ: ﴿ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ ﴾، یانی: ئەگەر گریمان وابێ، من بە ناوی خواوە درۆم هەڵبەستبێ: ئایا کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ، یان ئایەتەکانی خوا بە درۆ دادەنێ؟ واتە: ئەگەر من هەڵمبەستبێ، ستەمکارترین کەسم، ئێوەش ئەگەر ئایەتەکانی خوا بە درۆ بزانن، ئێوەش ستەمکارترین کەسن، ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾، ئنجا مسۆگەر تاوانباران سەرفراز نابن، کە بە تەئکید درۆ بە ناوی خواوە هەڵبەستنیش تاوانە.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی بابەتێکی دی، هەر لەو سیاقەدا، دەفەرموێ: ﴿ وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ ﴾، لە خوار خواوە، لە جیاتی خوا شتانێك دەپەرستن، نە زیانیان پێدەگەیەنن‌و، نە سوودیان پێدەگەیەنن، ﴿ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ ﴾، دەشڵێن: ئا ئەوانە تکاکارمانن بۆ لای

خوا، تکامان بۆ دەکەن، بۆمان دەپاڕێنەوە کە خوا لێمان خۆشبێ، خوای پەروەردگاریش ئاوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَتُنَبِّئُونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾، بڵێ: ئایا هەواڵی شتێك بە خوا دەدەن، کە نایزانێ نە لە ئاسمانەکان، نە لە زەویدا؟ یانی: هەر شتێك هەبێ، زانیاریی خوا پێوەی پەیوەست دەبێ، هەر شتێك هەبێ، خوا دەیزانێ، کەواتە: کەسانێك، یان شتانێك ، هاوبەشی خوابن‌و، تکاکاربن لەلای خوا، نین، بۆیەش خوا نایانزانێ، یانی ئێوە شتێك دەڵێن: کە بوونی نیە، بۆیە زانیاریی خوا پێوەی پەیوەست نابێ، ﴿سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾، پاکیی‌و بەرزیی بۆ خوا، لەوەی کە ئێوە دەیکەنە هاوبەش بۆ خوا، واتە: خوا زۆر بەرزەو، زۆر پاکە لەوەی کە هاوبەشی هەبن، نەك هەر ئەوانەی کە ئێوە دەیانڵێن، بەڵکو هەر هیچ هاوبەشێکی نیە، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (هەر خوا خوایە، ئەوی دی هەمووی گاو بایە).

پاشان خوای دادگەر باسی بابەتێکی دی دەکات، دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَٱخْتَلَفُوا۟﴾، وە خەڵك کاتی خۆی تەنیا یەك کۆمەڵ بوون لەسەر ڕێبازی خواپەرستیی، دواتر بە هۆی لادانیانەوە لە بەرنامەی خواو ڕێبازی پێغەمبەران، ناکۆك بوون‌و ڕاجیایی یان تێکەوت، کەواتە: هەموویان لەسەر یەك سروشت بوون، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە، فەرموویەتی: {مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أو يُنَصِّرَانِهِ أو يُمَجِّسَانِهِ} {رَوَاهُ مُسْلِم برقم: (٦٧٠٠)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه}.

واتە: هەموو ئینسانێك لەسەر سروشتی خواناسیی لە دایك دەبێ، بەڵام دوایی باب‌و دایکی دەیکەنە جوولەکە، یان دەیکەنە نەصرانیی، یان دەیکەنە مەجووسیی.

واتە: دوایی ژینگەو دەوروبەر ئەو کەسە دەگۆڕن.

پاشان دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ فِيمَا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾، وە ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە وشەیەك، بڕیارێك لە لایەن

پەروەردگاتەوە تێپەڕیوە (کە سزادانی خەڵك هەڵدەگریٚ بۆ دوارۆژ) لەوبارەوە کە تێیدا کەوتوونە ناکۆکییەوە، دادوەریی دەکرا لە نێوانیان دا، یان بڕیاری لەبارەوە دەدات، واتە: خوا بڕیاری داوە خەڵك هەرچەندە خراپو ناکۆك بنو هاوبەش بۆ خوا دابنێن، ناڕێك بن لەسەر خواپەرستیی، خوای کاربەجیٚ سزایان نادات، بەڵکو هەڵیدەگریٚ بۆ دوارۆژ، بۆیە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، خوای دادگەر ئەوەندەی پێناخۆشە، هەر لە دنیادا دادوەریی لە نێوان دا دەکردن، یان بڕیاری لەبارەیەوە دەدا.

لە کۆتایی دا دەفەرمویٚ: ﴿ وَيَقُولُونَ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، وە (بێبڕوایەکان) دەڵێن: دەبووایە ئەویش (موحەممەدیش ﷺ وەك پێغەمبەرانی پێشووی) نیشانەو موعجیزەیەکی (بەرهەستی) بۆ دابەزێنرابایە! بۆ وێنە: مووسا گۆچانەکەی هەبووە وەك موعجیزە، صالح حوشترەکەی هەبووە، زیندووکردنەوەو نەخۆش چاککردنەوەی عیسا (عَلَيْهِم الصَّلَاةَ وَالسَّلَام)، خوا لە وەڵامیان دا دەفەرمویٚ : ﴿ فَقُلْ إِنَّمَا ٱلْغَيْبُ لِلَّهِ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴾، بڵێ: نادیار تەنیا تایبەتە بە خواوە، تەنیا خوا پەنهان دەزانیٚ، دەجا ئێوە چاوەڕیٚ بن، منیش لەگەڵتان لە چاوەڕوانانم، داخۆ خوا ناردنی نیشانەیەکی لەو جۆرە بە پێویست دەزانیٚ، بۆ ئەم ڕۆژگارە؟ یاخود نەخێر، حیکمەتی خوا وا دەخوازیٚ کە بۆ مرۆڤایەتیی، لە ڕۆژگاری موحەممەد ﷺ بەملاوە، موعجیزەیەکی زانستیی، فیکریی، باشە، موعجیزەیەك کە بەکەڵکی هەموو چاخو سەردەمەکانی دیکە بیٚ، عەقڵی ئینسان بدوێنیٚ، چونکە نەك هەستەوەرەکانی بدوێنیٚ، بەشەر پێشتر لە قۆناغێکی ساوایی دابووە، لە قۆناغێك دا بووە جاریٚ کرچو کاڵ بووە، موعجیزەکانی ئەوسای پێغەمبەران لە ئاست ئەو قۆناغە ساوایەی خەڵکدا بوون، بەڵام دوای ئەوەی مرۆڤ گەیشتۆتە زیاتر کامڵ بوونی عەقڵ، دەبیٚ خوای کاربەجیٚ عەقڵیان بدوێنیٚ، ئەویش لە ڕێی ئەم قورئانەوە کە موحەممەد ﷺ کردوویەتە بەڵگە لەسەر ڕاستیی خۆی، بەڵێ: موعجیزەی دیکەی بوو ون، بەڵام بۆ بەهێزکردنی ئیمانی ئیمانداران بوون، یان بۆ دەربازکردنیان بوون، لە کێشەو گرفتێك کە ڕووبەڕوویان بۆتەوە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُعَجِّلُ اللَّهُ لِلنَّاسِ الشَّرَّ اسْتِعْجَالَهُم بِالْخَيْرِ لَقُضِيَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ فَنَذَرُ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١﴾﴾، مانایەکەی بە کورتی ئاوایە: وە ئەگەر خوا پەلە بکات بۆ خەڵكو خراپەیان بە پەلە بۆ بێنێ، وەك چۆن ئەوان پەلە دەکەن لە هێنانەدی، چاکەدا (ئەوەی بە چاكو بە سوود بەخشی دەزانن)، کاتیان تەواو دەبوو، (واتە: کاتی کۆتایی هاتنیان تەواو دەبوو) ئنجا لەوانە دەگەڕێین کە بە ئومێدی دیداری ئێمە نین، لە سەرکێشیی‌و گومڕایی خۆیاندا سەراسیمەبن‌و لە گومڕایی دا بسووڕێنەوە.

**لە چوار برگەدا ئەم ئایەتە شی دەکەینەوە:**

یەکەم: کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُعَجِّلُ اللَّهُ لِلنَّاسِ الشَّرَّ اسْتِعْجَالَهُم﴾، وشەی (شرّ) لێرەدا دوو واتایان هەڵدەگرێ:

١/ وەك چۆن مرۆڤەکان بە پەلەن لە وەدەستهێنانی قازانج‌و سوودو بەرژەوەندیی دا بۆ خۆیان، ئەگەر خواش ئاوا پەلە بکات، لە هێنانە پێشی زیان‌و سزای خراپەکانیان بۆیان، ئەوە زوو بنەبڕ دەبن‌و کۆتاییان پێ دێ.

٢/ ئەگەر خوا پەلە بکات لە هێنانە دی، داوای خراپی مرۆڤەکان، کە تووکی خراپ لە خۆیان دەکەن، لە کچ‌و کوڕیان، لە دەوروبەریان، جاری وایە ئینسان توورە دەبێ، نزای خراپ دەکات، ئەگەر خوا وەڵامی ئەو نزا خراپانەیان بداتەوە، کە مایەی زەرەرو زیانیانە، ئەوە کۆتاییان پێ دەهات.

دووەم: ﴿ لَقُضِيَ إِلَيۡهِمۡ أَجَلُهُمۡ ﴾، واتە: کاتی کۆتایی پێهاتنیان دەبڕایەوە، بڕیاری لەسەر دەدراو، تەواو دەبوون، چونکە وشەی (قَضَى)، هەم بە مانای بڕیار لەسەردان دێ، هەم بە مانای تێکپەڕاندنو تەواوکردنی شتێك دێ، کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًا ...﴿٢٣﴾ ﴾ الإسراء، واتە: پەروەردگارت فەرمانی کردوە، بڕیاری داوە کە جگە لەو هیچی دیکە مەپەرستنو، لەگەڵ بابو دایکدا چاکەکاریی بکەن.

بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ ...﴿١٢﴾ ﴾فصلت، واتە: بە دوو قۆناغ، لە دوو ڕۆژاندا حەوت ئاسمانەکانی تەواوکردن، لێرەدا (قَضَاهُنَّ) واتە: (أَتَمهُنَّ).

ئنجا ﴿ لَقُضِيَ إِلَيۡهِمۡ أَجَلُهُمۡ ﴾، خوێنراویشەتەوە (لَقَضَى إِلَيْهِمِ أجَلَهُم)، واتە: کاتەکەی تەواو دەکردن، (أجل) واتە: کاتی کۆتایی هاتنی شتێك.

سێیەم: کە دەفەرموێ: ﴿ فَنَذَرُ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴾، لەوانە دەگەڕێین کە بە ئومێدی دیداری ئێمە نین، لە سەرکێشیی خۆیاندا، سەراسیمە ببن.

(طُغْيَان) بریتیە لە سنوور بەزاندن لە سەرپێچیی کردندا، (يَعْمَهُون)یش لە (عَمَه)وە هاتوە، واتە: سەرگەردانییو سەراسیمە بوون، لەرەلەر کردنی ئینسان لە نێوان کردنو نەکردنی کارێك دا.

واتای ئەم ئایەتە موبارەکە ئەوەیە کە: خوا پەلە ناکات لە سزادانیاندا، لەوەدا کە زیانو خراپەیان بۆ بێنێتە پێش، وەك خۆیان شایستەینی.

ئنجا ئەمە ئەگەر بەو واتایە بێ، ئەوە وەڵامی ئەو قسەیەی کافرەکانە، کە زۆرجار دووبارە کراوەتەوە لە قورئان داو، هەمیشە پەلەیان کردوە لە پێغەمبەرانیان، بۆئەوەی زوو سزایان بۆ بێ، گوتوویانە: ﴿ فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن

كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾ هـود، ئـەوەی تـۆ هەڕەشـەی پـێ لـە ئێمـە دەكـەی، بۆمـانی بێنـە پێش، ئەگەر لە ڕاستانی، بۆ وێنە: لـە سـووڕەتی ئەنفـال دا خـوا لەسـەر زاری وان دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَـٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٢﴾ ﴾، واتە: وە یادبكەوە كاتێك (هاوبەش دانەرەكان) گوتیان: ئـەی خوایە! ئەگـەر ئـەم (قورئـان)ە، هەقە لەلایەن تۆوە هاتوە، بەردبـارانمان بكە لـە ئـاسـمانەوە، یاخـود ئـازارێكی بە ئێشمان بۆ بنێـرە.

تەماشـای ئـەو نەفـامییەیان بكەن! وەك لـە تەفسیـری سـووڕەتی (الأنفـال)دا باسـمان كـردوە، لـە جیـاتی ئـەوەی بڵێن: خوایـە! ئەگـەر ئـەم پێغەمبـەرە، ئـەم قورئـانە، هەقە لە لایەن تـۆوە، دڵمان بـۆ لای وەربچەرخێنـەو، وامـان لێبكـە كـە بـڕوای پـێ بێنیـن، كەچـی گوتوویانـە: ئەگـەر ڕاسـتە لـەلایەن تۆوەیـە، ئـەوە لەسـەرێوە بەردبـارانمان بكـە، یاخـود ئـازارێكـی بە ئێشمان تـووش بكـە.

واتـایەكی دیكـەی ئەوەیـە كـە: ئەگـەر خـوا پەلـە كردبایـە، لـە وەڵامدانـەوەی تـووكو دوعـای خراپـی مرۆڤەكان دا، وەك خێرا كردنـی لـە وەڵامدانـەوەی دوعـای چاكیانـدا، ئەوە كۆتـاییان پێدەهـاتو كـاتی مەرگیـان دەهـات.

چـوارەم: ئـایا بۆچی دەفەرمـوێ: ﴿ فَنَذَرُ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾، لەوانەی كە بە ئومێدی دیـداری ئێمە نیـن، دەگـەڕێین، وازیـان لـێ دێنیـن لە سـەركێشیی خۆیـاندا، سـەراسیمەو سـەرگـەردان ببـن؟!

وەڵام:

أ/ دەگونجـێ ئـەوە ڕوونكردنـەوەی یاسـای خوابـێ، كـە هـەر كەسـێك زۆر ملـی سـەرپێچیو خراپەی گـرتو، هەر بیـری لە تـاوان كـردەوە، تـاوانكردن دەبێتـە بەشـێك لـە كـیانو كەسـایەتییو، خـوو و عـادەتی پێـوە دەگـرێ، بۆیـە خـوای دادگـەریش لـێی دەگەڕێ، چونكـە بۆ خـۆی ئەو ڕێیـەی گرتۆتـە بـەر، خـواش ﷻ

بە تۆبزیی نایهێنێتەوە، هەروەك كەسێك كە ڕێی چاكەو چاكەكاریی دەگرێتەبەر، دەبێتە بەشێك لە گیانو كەسایەتیی، خوای پەروەردگاریش بە لاڕێیدا نابات.

چونكە خوا ﷻ ویستی وا بووە مرۆڤەكان لەم ژیانە دنیایەدا، ئازادبن، سەرپشك بن، بە كەیفی خۆیان ڕێی ڕاست بگرن، یان ڕێی خراپ بگرن.

ب/ دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ خوا ﷻ بۆیە لێیان دەگەڕێو وازیان لێدێنێ، تاكو شایستەی سزای زیاتر بن.

ئنجا ئەمە بۆچیو چۆن؟

وەڵامەكەی ئەوەیە كە: ئەمە هەمووی ڕوونكردنەوەی یاسای خوای پەروەردگارە، واتە: خوا ﷻ ژیانی بەشەری وا ڕێكخستوەو هەڵخستوە ئەگەر ڕوو لە چاكە بكەن، خوای بە بەزەیی زیاتر دەیانخاتە سەر ڕێی ڕاستو، تەقوایان پێدەبەخشێ، ئەگەر ڕوو لە خراپە بكەن، دیسان خوای كارزان وێڵیان دەكاتو لێیان دەگەڕێ، بۆ ئەوەی ئەو تاقیكردنەوەیەی كە خوا لەسەر زەوی بۆی داناون، بە ئازادانە ئەنجامی بدەن، هەر ڕێیەك بگرن، خوا ئازادی كردوون.

**مەسەلەی دووەم**: كە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوۡ قَاعِدًا أَوۡ قَآئِمٗا فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمۡ يَدۡعُنَآ إِلَىٰ ضُرّٖ مَّسَّهُۥۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡمُسۡرِفِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٢ ﴾.

مانایەكەی بە كورتی ئاوایە: مرۆڤ هەر كاتێك تووشی زیانێك، ناخۆشییەك بوو، یەكسەر لێمان دەپاڕێتەوە، ئنجا چ لەسەر تەنیشتی بێ، چ بە دانیشتنەوەبێ، چ بە پێوەبێ، وە كاتێك زیانو ناخۆشییەكەی لێ لادەبەین، دەڕواو تێهەڵدەتریزێنێ، وەك ئەوەی هەر لێمان نەپاڕابێتەوەو ئێمەی هەر نەناسیبێ، ئاوا بەو شێوەیە زێدەڕۆیی كاران، ئەوەی كە دەیكەن (لەو كارە خراپانە) بۆیان ڕازێنراوەتەوەو جوان كراوە.

## چوار هەڵوەستە لەبەردەم ئەم ئایەتەدا :

هەڵوەستەی یەکەم: خوای زاناو شارەزا باسی خۆڕانەگریی‌و بە هەڵپەیی مرۆڤ دەکات، واتە: مرۆڤێك کە دەستی هیدایەتی خوای نەگەیبێتێ، جا چ بێبڕوابێ، چ جارێ ئاشنا نەبووبێ بە ئایین‌و بەرنامەی خواو دەستی هیدایەتی خوای نەگەیبێتێ، کە لەو حاڵەتەدا بە کافر لە قەڵەم نادرێ، چونکە هەقێکی بۆ نەهاتوە بیناسێ‌و ڕەفزی بکات، بەڵام بە تەئکید بە مسوڵمان‌و بڕواداریش لە قەڵەم نادرێ، ئەدی چییە؟

مرۆڤێکە لە حاڵەتی ئاسایی‌و سروشتی خۆیدایە، واتە: وا دادەنرێ جارێ هیدایەتی خوای پێ نەگەیشتوەو، خوای دادگەر لەسەر ئەوە سزای نادات، کە بۆچی شوێن هیدایەتی خوا نەکەوتوە، چونکە ئەسڵەن هەر بە هیدایەت ئاشنا نەبووە، مادام کەمتەرخەمیی نەبێ لە بواری شارەزابوون دا لە ئایینی خوا، واتە: کەمتەرخەمیی نەبێ لە بە دوای هەقدا گەڕان دا، چونکە خوا باسی جۆرێك لە کوفری کافران دەکات، کە بریتیە لە کوفری پشت تێکردن‌و گوێ پێنەدان‌و ئیهمال کردن (كفر الإعْرَاض)، کەواتە: بەڵێ، کەسێك دەگونجێ نەزانبێ بەرانبەر بە ئیسلام، بەڵام نەزانییەکەی لەوەوەیە، کە هەر بایەخی پێ نەداوەو پشتی تێکردوەو ئیهمالی کردوە، کە بێگومان بەو نەزانییەی ناپەرێتەوەو خاوەن پاساو نابێ، چونکە نەزانینەکەی بە ئەنقەستە، بە گوێ پێ نەدانە، بەڵام کەسێك کە کەمتەرخەمیی نەبووە، هەرچەندە هەوڵیشی داوە بەڵام دەستی نەگەیشتۆتێ، یان هیچ هاندەرێکی نەبووە هەوڵبدات، بەڵام لە ڕووی ئیهماڵیی‌و پشت گوێ خستنەوە نەبووە، ئەوە حوکمێکی دیکەی هەیە، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ ﴾الإسراء، واتە: وە ئێمە هیچ کەس سزا نادەین، هەتا پێغەمبەر(ی بۆ) نەنێرین.

ئنجا بە نسبەت پێغەمبەرانیشەوە (عليهم الصلاة والسلام) فەرموویەتی: ﴿ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴿١٢﴾ ﴾التغابن، بێگومان تەنیا ڕاگەیاندنێکی

ڕوونو ئاشکرا لەسەر پێغەمبەرمانە، کەواتە: دەبێ پێغەمبەرێك هەبێو بە ڕوونو ڕاشکاویی پەیامی خوا بەو خەڵکە ڕابگەیەنێ، ئەگەر ڕەفزیان کرد، ئنجا ئەو کاتە شایستەی سزای خوا دەبن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَـٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوْ قَاعِدًا أَوْ قَآئِمًا فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمْ يَدْعُنَآ إِلَىٰ ضُرٍّ مَّسَّهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾، لەبەر ئەوەی ئینسان ئەو سێ حاڵەتەی هەن، بە زۆریی وایە ئینسان لەسەر کەلەکە ڕادەکشێ، یان بە دانیشتنەوەیە، یان بەپێوەیەو ڕاوەستاوە.

واتە: لە هەموو حاڵاندا مرۆڤ خۆڕانەگرەو بە هەڵپەیەو، پەنا دەباتە بەر خواو هاواری تێدەبەستێ، کەچی دواییش نایناسێ، لە زۆر شوێنی قورئان دا ئەم ڕاستییە، باسکراوە، بۆ وێنە: خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَـٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ تَدْعُونَهُۥ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً لَّئِنْ أَنجَىٰنَا مِنْ هَـٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿٦٣﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾الأنعام.

بڵێ: کێ لە تاریکاییەکان (و گرفتارییەکان)ی وشکانیی‌و دەریادا دەربازتان دەکات، بە ملکەچیی‌و پەنهانیی لێی دەپاڕێنەوە: ئەگەر بێت‌و (خوا) لەم (گرفتاریی)ە قوتارمان بکات، بە دڵنیاییەوە لە سوپاسگوزاران دەبین؟ بڵێ: هەر خوا لەو (گرفتاریی)ە قوتارتان دەکات، وە لە هەر خەم‌و تەنگانەیەکی دیکەش، کەچی ئێوەش هاوبەش (بۆ خوا) دادەنێن.

<u>هەڵوەستەی دووەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمْ يَدْعُنَآ إِلَىٰ ضُرٍّ مَّسَّهُۥ ﴾، دوای ئەوەی ناخۆشییەکەمان لێ لابرد، دەڕوات، وەك ئەوەی هەرگیز لە ئێمە نەپاڕابێتەوە، بۆ لابردنی زیان‌و زەرەرێك لێی، واتە: لە بیری دەچێتەوەو سپڵەیی‌و بێ نەمەکیی دەکات بەرانبەر بە خوای بەخشەر.

خوا ﷻ سپڵەیی زۆر پێناخۆشە، هەر بۆیە ئیمان لووتکەی وەفاداریی‌و سوپاسگوزارییە، کوفرو بێبڕواییش پلەی هەرە خواری سپڵەیی‌و بێ‌نمەکییە، بۆیە خوا ﷻ لە سەرەتای سووڕەتی (الإنسان)دا دەفەرموێ: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا ﴿١﴾ إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾﴾، واتە: ... ئێمە ڕێمان پیشانداوە، یان سوپاسگوزار دەبێ، یان ناسوپاسگوزار دەبێ.

هەروەها لە سووڕەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿مَّا يَفْعَلُ اللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَآمَنتُمْ ۚ وَكَانَ اللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾﴾.

واتە: خوا چی داوە لە سزدانی ئێوە، ئەگەر ئێوە سوپاسگوزاربن‌و بڕواداربن !.

خوا سوپاسگوزارییەکەی پێشخستووە، چونکە هەستی سوپاسگوزاریی‌و، هەست کردن بە چاکەی خوا لەسەر مرۆڤ، پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێ، کە ئیمان بێنێ‌و خۆی بە بەندەی خوا بزانێ‌و، بیپەرستێ‌و، لێی بترسێ‌و، لە هەموو شتێك‌و کەسێکی خۆشتر بوێ‌و، شەرمی لێ بکات‌و، بە گەورەی بگرێ‌و... هتد.

هەڵوەستەی سێیەم: کە دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾، ئاوا بەو شێوەیە زێدەڕۆیی کاران ئەوەی کە دەیکەن (لەو کارە خراپانە) بۆیان ڕازێنراوەتەوەو جوان کراوە.

لێرەدا خوای کاربەجێ باسی یاساو سوننەتێکی خۆی دەکات لە ژیانی بەشەر لە دنیادا، واتە: خراپەکاران‌و زێدەڕۆیی کاران، کاتێك لەسەر خراپە بەردەوام دەبن، ئەو کردەوە خراپانە هەرچەندە زۆر نامۆو ناشیرین بن، هەرچەندە پێچەوانەی سروشت‌و عەقڵ‌و مەنتق بن، پێچەوانەی شەرع بن، کە

لەسەریان بەردەوام بوون، لەلایان ئاسایی دەبن، وەك زۆر جار گوتوومە ئەوەی ئارەق دەخواتەوەو سەرخۆش و بێ هۆش دەبێ، یان جگەرە کێشان، کە هەمووی ژەهرو نیکۆتینەو مرۆڤ تووشی نەخۆشیی و دەردەداریی دەکات، هەروەها هەموو ئەو شتانەی کە خوا قەدەغەی کردوون، زیانیان هەیە بۆ ڕووحی ئینسان، بۆ جەستەی ئینسان، بۆ عەقڵی ئینسان، بۆ تاك، بۆ خێزان، بۆ کۆمەڵگە، بۆ دنیا، بۆ دوارۆژ، ئەدی بۆچی ئەو خەڵکە دزیی دەکات، قەتڵ دەکات، حەرام دەخوات، قومار دەکات، شەراب دەخواتەوە؟

لەبەر ئەوەی وەختێك ئینسان لەسەر شتێك بەردەوام دەبێ، ئەوە یاسای خوایە: ئەو شتەی لەلا جوان دەبێ، لەلای شیرین دەبێ، دەبێتە بەشێك لە دەروون و بوونی، بە عەقڵ دەزانێ ئەو شتە خراپە، بەڵام تازە بۆتە بەشێك لە دەروونی، بەشێك لە جەستەی، لەگەڵ وجوودیدا ئاوێتە بووە، بۆیە ئاوا بە ئاسانیی دەستی بۆ لێ هەڵناگیرێ، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە زێدەڕۆیی کاران، ئەوەی کە دەیکەن (لەو کارە خراپانە) بۆیان ڕازێنراوەتەوە، ئەمە باسی یاسایەکی خوای پەروەردگارە وەك لە سووڕەتی (الأنعام)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ﴿١٠٨﴾ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە بۆ هەر کۆمەڵێك کردەوەکانیانمان بۆ جوان کردوون (چ چاکەکاربن، چ خراپەکاربن).

<u>هەڵوەستەی چوارەم</u>: ئایا کێ کردەوەکانی بۆ خراپەکاران جوان کردوون؟

ئەگەر سەرنجی دەقەکانی قورئان بدەین، خوای کاربەجێ کردەوەکانی ئینسان، چ هی چاك، چ هی خراپ پاڵی داونە لای سێ لایەن:

١) پاڵی داونە لای خۆی .

٢) هەندێ جار پاڵی داونە لای شەیتان.

٣) هەندێ جار پاڵی داونە لای لایەنێکی نەناسراو، (مجهول الفاعل).

١/ بە نسبەت خۆیەوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ﴿١٠٨﴾﴾، واتە: ئاوا بەو شێوەیە هەر کۆمەڵێک کردەوەکانیانمان بۆ جوان کردوون.

ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە خوا یاسایەکەی وا داناوە، ئنجا لەو ڕووەوە کە بە ویستی خوا، ئەو یاسایە دانراوەو جێبەجێبوونیشی بە توانای خوایە، بۆیە خوا ﷻ پاڵی داونە لای خۆی.

وە لە سوورەتی (الحجرات)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الرَّاشِدُونَ ﴿٧﴾﴾، واتە: بەڵام خوا ئیمانی لە دڵی ئێوەدا خۆشەویست کردوەو، لەدڵتان دا ڕازاندوویەتەوەو جوانی کردوە، بەڵام کوفرو لاڕێ بوونو یاخی بوونو سەرپێچیی کردنی، لە لای ئێوە کردوە بە شتێکی ناخۆشویستراو ناپەسند.

٢/ بە نسبەت شەیتانەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَكَانُوا مُسْتَبْصِرِينَ ﴿٣٨﴾﴾العنكبوت، واتە: وە شەیتان کردەوەکانی بۆ جوان کردن، لە ڕێی ڕاست لایدان، لە کاتێکدا بەرچاو ڕوون کرابوون، (بەڵام شەیتان خراپەکانیانی بۆ جوان کردن).

٣/ بە نسبەت ئەوەوە کە بە بکەرو سەرچاوە نادیار دەیهێنێو، دیارنیە کە کێ ئەو شتانەی بۆ جوان کردوون، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالْأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ

مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ آل عمـــــران،

واتە: خۆشەویستیی ئارەزووەکان بۆ خەڵکی جوان کراوە، لە ژنانو، کوڕانو، زێڕو زیوی پەزمەندە کراوو، ئەسپانی نیشانەدار کراوو، ئاژەڵو، کشتوکاڵ، ئەوە ڕابواردنی ژیانی دنیایە، خواش سەرەنجامی هەرە چاکی لەلایە.

بێگومان مەبەست پێی خوای پەروەردگارە، چونکە بە پێی ئەو سروشتە کە خوا مرۆڤی لەسەر سروشتاندوە، پیاوان ئافرەتانیان خۆشدەوێ‌و، ئافرەتان پیاوانیان خۆشدەوێ‌و، ئینسان ڕۆڵەی خۆی خۆشدەوێ... هتد.

ئنجا ئایا ئەمە چۆنە؟ دیارە ئەوە بە ئیعتیباری جیاجیایە:

١) لە سۆنگەی ئەوەوە کە هەموو ئەوانە بە ویستی خوان، خوا ﷻ دەیانداتە پاڵ خۆی.

٢) لەو ڕووەوە کە شەیتان هەمیشە بە دوای ئەوەدا دەگەڕێ: شتی خراپ بۆ خەڵك جوان بکاتو هانیان بدات بۆ ئەنجامدانی، پاڵ دەدرێتە لای شەیتان.

٣) جاری واش هەیە خوا دەیەوێ ئەوە بخاتەڕوو کە وەك سروشت ئەو شتە لە مرۆڤ دا هەیە، بۆیە خوای کاربەجێ سەرچاوەکەی بە نادیار دێنێ.

<u>مەسەلەی سێیەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ ۙ وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ وَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٣﴾ ﴾

واتە: وە بە دڵنیایی ئێمە سەدەکان (کۆمەڵگاکان)ی پێش ئێوەمان لە بەین بردن، (کە هەر یەکەیان لە سەدەیەکدا ژیاون) کاتێك کە ستەمیان کردو، پێغەمبەرانیان بە بەڵگە ئاشکرایەکانەوە بۆ هاتنو، نەدەگونجا ئیمان بێنن، ئاوا بەو شێوەیە سزای توندی تاوانباران دەدەین.

**شەش هەڵوەستە لەبەردەم ئەم ئایەتە موبارەکەدا:**

**هەڵوەستەی یەکەم**: ﴿ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ ﴾، وشەی (قرن) کۆیەکەی (قرون)ە، کە پێشتر ئاماژەیەکمان پێدا، (قرن) بە حەفتا (٧٠) تاکو سەد (١٠٠) ساڵ دانراوە، مەبەست پێی ئەو خەڵکەیە، کە لەو ماوەیەدا پێکەوە ژیاون.

**هەڵوەستەی دووەم**: جێی سەرنج ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ ﴾، سەدەکانی پێش ئێوەمان فەوتاند، دوای ئەوەی ستەمیان کرد، کەواتە: ستەم دەبێتە هۆی فەوتاندنی کۆمەڵگا، ئەم حەقیقەتەش لە زۆر شوێنی قورئان دا دووبارە بۆتەوە، بۆ نموونە: خوا دەفەرموێ: ﴿ ...وَمَا كُنَّا مُهۡلِكِي ٱلۡقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهۡلُهَا ظَٰلِمُونَ ٥٩ ﴾ القصص، واتە: وە ئێمە ئاوەدانییەکان نافەوتێنین، مەگەر خەڵکەکەیان ستەمکار بن، کەواتە: خوای دادگەر بەهۆی ستەمەوە ئاوەدانییەکان، وڵاتەکان لە بەین دەبات، کە دیارە ئەمەش یاسایەکی خوای باڵادەستە، چونکە دەگونجێ خەڵك بە کوفرو ئیمانەوە بە یەکەوە بژین، بەڵام بە تەئکید ستەمکار (ظالم)و ستەملێکراو (مظلوم) بە یەکەوە ناژین.

**هەڵوەستەی سێیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾، وە پێغەمبەرەکانیان بە بەڵگە ڕوونو ئاشکرایەکانەوە، (واتە: بە موعجیزەکانەوە) هاتن بۆ لایان.

هیچ پێغەمبەرێك نەهاتوە لەخۆڕا بڵێ: من پێغەمبەرم، ئەگەرنا خەڵکی درۆزنیش هەبووە، ئیددیعای پێغەمبەرایەتیی کردوە، بەڵام چۆن ئەو درۆزنانە لەگەڵ پێغەمبەران، لێك جیاکراونەتەوە؟ بەوە کە پێغەمبەران موعجیزەیان پێبووە، بەڵام ئەوانەی کە بە درۆ ئیددیعای پێغەمبەرایەتییان کردوە، بێ بەڵگە بوون، بۆیە خوا ﷻ چەند جارێك لە قورئان دا ئەوە دووپات دەکاتەوە،

دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٦٤﴾﴾النمل، (البقرة ١١١)و، (الأنبياء ٢٤).

واتە: بڵێ: ئەگەر ڕاست دەكەن بەڵگە بێنن، كەواتە: جیاوازیی نێوان ڕاستو درۆ، هەبوونی بەڵگەیە بۆ یەكەمیانو، نەبوونیەتی بۆ دووەمیان.

فەرمایشتێكی پێغەمبەر ﷺ هەیە، كە چەمكو واتای ئەم ئایەتەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە، ئەمە دەقەكەیەتی: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيٌّ إِلاَّ أُعْطِيَ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ، وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِي أُوتِيتُهُ وَحْيًا أَوْحَاهُ اللهُ إِلَيَّ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٤٧٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٦٩٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٥٢)}، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ پێغەمبەرێك نەبووە لە پێغەمبەران مەگەر شتێكی وای پێدراوە، كە لەسەر بناغەی وی خەڵك بڕوای پێ بێنن، بەڵام ئەوەی كە بە من دراوە، وەحییە بۆم سروش كراوە، بۆیە ئومێدم وایە لە ڕۆژی دواییدا، لە هەموویان شوێنكەوتووم زیاتربن.

چونكە موعجیزەی هەر كام لە پێغەمبەران صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، پەیوەست بووە بەو كاتو ژینگەوە كە تێیدا ژیاوەو، پەیوەست بووە بە ژیانی خۆیەوە، كاتێك ئەو پێغەمبەرە ﷺ وەفاتی كردوەو نەماوە، موعجیزەكەشی نەماوە، ئەویش بەهۆی ئەوەوە كە ئەو پێغەمبەرە تەنیا بۆ ئەو قۆناغە مێژووییە نێردراوە، تەنیا بۆ ئەو كۆمەڵگایەش نێردراوە، بۆیە موعجیزەكەشی هەر لەو چوارچێوە دا بووە، بەڵام پێغەمبەری خاتەم ﷺ چونكە بۆ هەموو بەشەر، بۆ هەموو مرۆڤایەتیی، نێردراوە، بە درێژایی زەمان، بە پانایی زەمین، بۆیە موعجیزەو بەڵگەكەشی هەر بەردەوامە، هەتا ژیان بەردەوام بێ.

هەڵوەستەی چوارەم: كە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا﴾، وە نەدەگونجا ئیمان بێنن، خوا عزّوجلّ نەیفەرمووە: (لن یؤمنوا)، یان (لم یؤمنوا) چونكە

لێرەدا باسی یاسایەکی خۆی دەکات، کە ڕستەی دوای ئەوە هۆکاری: (نەگونجانی ئیمان هێنانیانن) ڕوون دەکاتەوە.

هەڵوەستەی پێنجەم: ﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾، ئاوا بەو شێوەیە سزای کۆمەڵی تاوانباران دەدەین، واتە: بە هۆی خراپەو تاوانەوە، مرۆڤ ڕێی گەڕانەوە بۆ لای خوای نابێ، وەك من زۆر جار گوتوومە: گوناهو تاوان‌و خراپەی زۆر کردن، وەك ئەوە وایە کەسێك لەسەر قەراغ‌و لێواری کەندەڵانێك، سەرەو ژێرێك وەستابێ، کە هەتا دەخلیسکێ، بە دەست خۆیەتی، بچێتە نیزیك، نەچێتە نیزیك، بەڵام کە خلیسکا، تازە لە کۆنتڕۆڵی خۆی دەچێتە دەرێ، لە ڕاستییدا مرۆڤیش: زەلکاوی گوناهو سەرەوژێری گوناح‌و تاوان‌و لە خوا دوورکەوتنەوە بە دەست خۆیەتی بچێتە نێوی‌و بچێتە قەراغی، یان نا، بەڵام زۆرجار کە دەخلیسکێ، لە کۆنتڕۆڵی خۆی دەچێتە دەرێ، هەروەکو تاوێرێك کە لە سەرەوژێرێك دێتە خوار، هەتا دێتە خوار، پەیوەندیی بەو سەرچاوەوەیە کە لێی دێتە خوار، ئنجا مرۆڤێکە پاڵی پێوە دەنێ، ئاژەڵێکە، شوێنەکەی ڕزیوە، بەڵام دوای ئەوەی کە دێ، ئەوە خوا دەزانێ لە کوێ دەوەستێتەوە، کەواتە: خوا ﷻ دەیەوێ پێمان بفەرموێ: بە هۆی تاوانەکانیانەوە، وایان لێهاتبوو، کە ڕێی گەڕانەوەیان لە خۆیان گرتبوو.

فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ ئەم ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: (إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا أَخْطَأَ خَطِيئَةً، نُكِتَتْ فِي قَلْبِهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ، فَإِذَا هُوَ نَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ وَتَابَ، صُقِلَ قَلْبُهُ، وَإِنْ عَادَ، زِيدَ فِيهَا حَتَّى تَعْلُوَ قَلْبَهُ، وَهُوَ الرَّانُ الَّذِي ذَكَرَ اللهُ: ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾﴾ المطففين)} {أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِيُّ برقم: (٣٣٣٤)، وَحَسَّنَهُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٤٦٩)}.

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێك بەندە گوناهێکی کرد، خاڵێکی ڕەش لەسەر دڵی پەیدا دەبێ، ئنجا ئەگەر وازی لێ هێناو داوای لێبووردنی کردو گەڕایەوە (بۆ لای

خوا)و تۆبەی کرد، دڵی سپی دەبێتەوەو، ئەگەر گوناهەکانی بەردەوام بوون، خاڵە ڕەشەکان زیاد دەکەن، هەتا دەبێتە ژەنگ بەسەر دڵیەوەو تەواو کەمرەی لەسەر دەبەستێ، ئەوە ئەوەیە کە خوا باسی فەرمووە: ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾المطففين، واتە: نەخێر ڕاست ناکەن، بەڵکو دڵیان بەهۆی گوناهەکانەوە کەمرەی بەستووەو ژەنگیان هێناوەو داخراوە، بەهۆی ئەو خراپانەوە کە ئەنجامی دەدەن.

واتە: خراپە کردنو تاوان کردن، پەردەیەك، ژەنگێك لەسەر دڵی ئینسان دروست دەکات، دڵی هەموو دادەپۆشێ، کە ئەو کاتە ئینسان ناتوانێ بگەڕێتەوە.

<u>هەڵوەستەی شەشەم</u> : ئەم ئایەتە لێی وەردەگیرێ کە لێکۆڵینەوە لە مێژوو، شتێکی گرنگە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا ۙ وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ وَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ ﴿١٣﴾ ﴾، کە ئەمە سەرنجمان ڕادەکێشێ بۆ مێژوو، تاکو لێکۆڵینەوە لە مێژووی میللەتان بکەین، چ ئەوانەیان کە بۆ خوا ملکەچ بوون، چ ئەوانەی کە لەگەڵ خوادا خراپەکار بوون، سەرنجدانی مێژووی ئەوان، سەرنجدانی سەرەنجامیان، دەرسو پەند بۆ ئێمە دەستەبەر دەکات، وەك خوا لە سووڕەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ ثُمَّ انظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ ﴾، واتە: بڵێ: بە زەویدا بڕۆنو سەرنج بدەن، سەرەنجامی بە درۆ دانەرانی پێغەمبەران چۆن بوو؟! واتە: پەندیان لێ وەربگرن.

**<u>مەسەلەی چوارەم</u>** : کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكُمْ خَلَائِفَ فِي الْأَرْضِ مِن بَعْدِهِمْ لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾، دوایی لە دوای ئەوان ئێوەمان کردە جێنشینی زەوی، تاکو سەرنج بەین، چۆن دەکەن؟ چی دەکەن؟

**سێ هەڵوەستەش لەبەردەم ئەم ئایەتەدا دەکەین:**

هەڵوەستەی یەکەم: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكُمْ خَلَائِفَ فِي الْأَرْضِ مِن بَعْدِهِمْ لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾، واتە: ئێوەمان گێڕا بە جێنشین، (خَلائِف) کۆی (خَلِيفَة)یە، وە (خُلَفَاء) کۆی (خَلِيف)ە، کەواتە: دەگونجێ بگوترێ: (الخلفاء الراشدون) وە (الخلائف الراشدون)، واتە: هەموو جێنشینەکانی پێغەمبەر ﷺ.

ئنجا (خلافة) بریتیە لە جێگرایەتیکردنی کەسێك، کە لە شوێنی ئەو کارەکە بکرێ، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئێوەمان کردە جێنشین لە دوای گەلانی پێشوو، واتە: ئێوەمان لە شوێنی ئەوان دانا، ئێوە لە جیاتی ئەوان هەڵسوکەوت بکەن لەسەر زەوی‌و ئاوەدانی بکەنەوە.

خوا دەفەرموێ ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً ... ﴿٣٠﴾ ﴾ البقرة، کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرمووی: من جێنشینێك دادەنێم لەسەر زەوی، یانی ئەو جێنشینە لە جیاتی من هەڵسوکەوت بکات لەسەر زەوی، لەو بەشەیدا کە تێیدا ئازاد کراوە مرۆڤ دەستی کراوەیە، سەر زەوی ئاوەدان دەکاتەوە، وەك خوا پێی خۆشە، یان کاولی دەکاو تێکی دەدات، کە خوا پێی ناخۆشە، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ ئازادەو دەستی کراوەیە، کەواتە: ئەوەش مانای جێنشینایەتیی مرۆڤە، بۆ خوا لەسەر زەوی، وەك زۆر جاری دی باسمان کردوە، کە مرۆڤ کافر بێ، یان مسوڵمان بێ، بە کردەوە جێنشینی خوایە، چونکە خوا مرۆڤی سەر پشك کردوەو تواناشی پێداوە، ئاوەدانی بکاتەوەو چاکەکاریی تێدا بکات، یاخود وێرانی بکات‌و خراپەکاریی تێدا بکات.

هەڵوەستەی دووەم: کە خوا دەفەرموێ: ئێوەمان لە جێی وان لەسەر زەوی دانا، واتە: پەند وەربگرن لە هەڵەکانیان، ئێوە هەڵەی وەك وان مەکەن، بۆ ئەوەی سەرەنجامتان وەك هی وان نەبێ، بەڵکو پێچەوانەی ئەوان بکەن، تاکو خوا لێتان ڕازی بێ، سەرفرازبن‌و، لە تاقیکردنەوەی ژیانی دنیا ڕزگارتان ببێ.

هەڵوەستەی سێیەم : كە دەفەرموێ: ﴿لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴾، بۆ ئەوەی سەرنج بدەین بزانین چۆن ڕەفتار دەكەن؟ ئەمە دەبێ زۆر كاریگەرییمان لەسەر دروست بكات، چونكە خوا تەماشامان دەكات، دەبێ ئەو هەستەمان لەلا دروست بێ، واتە: خوا تێمانڕاماوە: هەم چاودێریی خۆی، هەم چاودێریی فریشتەكانی، كردەوەكانمان هەر هەموو تۆمار دەكرێن، هەر كەسێك بەڕاستی بڕوای بەوە هەبێ، كە خوا تەماشای دەكاتو چاودێریی دەكات، بە تەئكید ناتوانێ خراپەكاریی‌و تاوان بكات.

ئنجا لە كۆی ئەم ئایەتە موبارەكە وەردەگیرێ، كە وەك چۆن لە بوونەوەردا یاسا هەن، لە ژیانی بەشەریش دا یاسا هەن، یاساكانی ژیانی بەشەر، خوا ناوی لێناون: (سنن) كە كۆی (سنة)ە، لە چەند شوێنێك دا ئاماژەی پێكردوە، بۆ وێنە:

١/ لە سووڕەتی (الأحزاب)دا دەفەرموێ: ﴿ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٦٢﴾ ﴾، واتە: یاسای خوا لەوانەدا كە لە پێش ئێوەدا بوونو ڕابردوون، ئەوە یاسای خوایە تۆ ناتوانی یاسای خوا بگۆڕێ.

٢/ هەروەها لە سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ ﴾، واتە: لە پێش ئێوەدا چەند یاسایەك ڕابردوو ون، ئێوەش بڕۆن سەرنج بدەن، سەرەنجامی بە درۆ دانەران (واتە: بە درۆ دانەرانی پێغەمبەرانی خوا، بە درۆ دانەرانی پەیامەكانی خوا) چۆن بووە !

٣/ لە سووڕەتی (فاطر)یش دا دەفەرموێ: ﴿فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ الْأَوَّلِينَ ۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾ ﴾، چاوەڕێی چی دەكەن جگە لە یاسای پێشووان، {واتە: هاتنەدی‌و چەسپانی یاسای خوا كە

بەسەر پێشوواندا چەسپاوە، غەیری ئەوە چاوەڕێی چی دەکەن}، تۆ ناتوانی یاسای خوا بگۆڕیو، ناتوانی یاسای خوا لابدەی، یانی: ناتوانی بیگۆڕی، یاسایەکی دیکەی بینیە جێی، وە ناشتوانی خۆت لەو یاسایە لابدەی، یان ئەو یاسایە لە خۆت لابدەی، واتە: یاساکانی خوا بەسەر هەموو کەس دا دەچەسپن، وەك چۆن بەسەر پێشوواندا چەسپیون، بەسەر ئێوەشدا دەچەسپن.

**مەسەلەی پێنجەم**: کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآئِ نَفْسِىٓ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾﴾.

**چوار هەڵوەستە لەبەردەم ئەم ئایەتەدا:**

**هەڵوەستەی یەکەم**: کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ﴾،

وە کاتێك ئایەتە ڕۆشنەکانی ئێمەیان بەسەردا خوێنرانەوە، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئەگەر ئایەتەکانی خوا ڕۆشنن، بۆچی تەفسیریان دەکەین؟ دەڵێین: ڕۆشنن بۆ خەڵکی خۆی، بۆ کەسانێك کە توانایان هەیە لێی تێبگەن، عەرەبی دەزانن، شارەزان، ئەوانیش بۆ کەسانێکی ڕوون دەکەنەوە کە توانای تێگەیشتنیان نیە لە قورئان، بەڵام بۆ هەموو کەس ڕۆشنن، دوای ئەوەی کە ڕوون دەکرێنەوە، واتە: وا نین، کە مرۆڤ نەتوانێ لێیان تێبگات.

**هەڵوەستەی دووەم**: کە دەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا﴾،

ئەوانەی بە ئومێدی دیداری ئێمە نین، گوتیان، کەواتە: ئەوەی بە ئومێدی دیداری خوا نەبێ، هەر بە دوای بەهانەدا دەگەڕێ، هەر لە دوای بیانوویە، وەك گوتراوە: (ئەگەر دز دزبێ، تاریکە شەو زۆرە)، واتە: لەبەر ئەوەی کە بە ئومێدی دیداری خوانین، لە بیانوو دەگەڕێن، بۆ ئەوەی بڕوا بە پەیامەکەی نەکەن.

هەڵوەستەی سێیەم : کە دەفەرموێ: ﴿ٱئۡتِ بِقُرۡءَانٍ غَيۡرِ هَٰذَآ أَوۡ بَدِّلۡهُ﴾، قورئانێکی جیا لەمە بێنە، واتە: ئەم قورئانە هەر لابەرە، قورئانێکی دیکە بێنە، یاخود هەندێ شوێنی لێ بگۆڕە، دەستکاریی بکە، ئایا کوێی دەستکاریی بکاتو کوێی بگۆڕێ؟ بە تەئکید مەبەستیان پێی ئەو بەشەی بووە کە لەگەڵ ئارەزووو بەرژەوەندیی ئەواندا ناگونجێ.

هەڵوەستەی چوارەم : خوا ﷻ پێغەمبەر ﷺ فێر دەکات، کە وەڵامی ئەم قسەیان بداتەوە، بە شەش وەڵامی ددان شکێنی بێبڕوایان، لە بەرانبەر ئەم دوو داواکارییە بێ جێیەیان دا:

بەڵێ خوا ﷻ وەڵامێکی شەش برگەیی فێری پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات، بۆ ئەو داوایەیان، کە ئەو داوایەیان دوو لقی هەیە:

١ـ یان ئەم قورئانە لاببەو قورئانێکی دیکە بێنێ.

٢ـ یان هەر ئەو قورئانەی کە هێناوتە، هەندێ شوێنی دەستکاریی بکەو بیگۆڕە.

## وەڵامێکی شەش برگەیی بۆ قسەی کافرەکان

برگەی یەکەم : ﴿مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلۡقَآيِٕ نَفۡسِيٓۖ﴾، بۆم نیە کە لەلایەن خۆمەوە بیگۆڕم، دیارە کافرەکان کە گوتوویانە: ﴿ٱئۡتِ بِقُرۡءَانٍ غَيۡرِ هَٰذَآ أَوۡ بَدِّلۡهُ﴾، قورئانێکی دیکە جگە لەمە بێنە، یاخود ئەمە بگۆڕە، مانای وایە پێغەمبەری خوایان ﷺ راستەوخۆ تۆمەتبار کردوە بەوەی : خۆی قورئانی هێناوە، نەك خوا بۆی ناردبێ، بۆیە برگەی یەکەمی وەڵامەکە ئەوەیە: دەفەرموێ: ﴿مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلۡقَآيِٕ نَفۡسِيٓۖ﴾، ئەسڵەن بۆم نیە، یانی: ئەوە هەر پەیوەندیی بە منەوە نیە، کە من بێم لەلایەنی خۆمەوە بیگۆڕم.

وشەی: (تِلْقَآيِ)، شارەزایان گوتوویانە: سێ وشە هەن: (تِلْقَاء)و (تبیان)و (تمثال)، کە پیتی یەکەمیان بەژێر (کسرة) دەست پێ دەکات (تلقاء) یانی: لەپێش خۆمەوە، لەلای خۆمەوە، (تبیان) واتە: بەیانو ڕۆشنکردنەوە، (تمثال)یش بە مانای (مَثُلَ) دێ، واتە: هاتنە بەردەم، زانایان دەڵێن: ئەم سێ وشەیە چوارەمیان نیە، کە ئەمەش قیاسو بنچینەیەکە کە بۆ ئەو وشانە دانراوە.

(تِلْقَاء): وەك پێشتر لە شیکردنەوەی وشەکاندا باسمانکرد، واتە: (حِذَاء)، یانی: بەرانبەر، یاخود لەلایەن (مِنْ قِبَلِ، مِنْ جِهَةٍ).

ئنجا وەك تێبینیی دەکرێ: خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺی نەفەرمووە، وەڵامی داوای یەکەمیان بداتەوە، چونکە ئەوان گوتوویانە: ﴿ائْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ﴾، خواش بە پێغەمبەر ﷺی فەرمووە: ﴿قُلْ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآيِ نَفْسِيٓ﴾، بڵێ: بۆم نیە ئەم قورئانە بگۆڕم، لێی دەستکاریی بکەم لەلایەن خۆمەوە، ئەدی ئەگەر قورئانێکی دیکە بێنێ؟ هەڵبەتە ئەگەر بۆی نەبێ دەستکاریی هەندێك شوێنی ئەم قورئانە بکات، مانای وایە قورئانێکی دیکەی جیا لەمە، هەر بۆی نیە، بیهێنێ، واتە کە کات ئاسانەکەی بۆ نەبێ، قورسەکەی هەر بۆ نیە، بۆیە بە پێویست نەزانراوە، وەڵام بدرێتەوە، ئەوە بڕگەی یەکەمی وەڵامەکە بوو.

**بڕگەی دووەم**: ﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴾، من تەنیا شوێن ئەوە دەکەوم کە بۆم سروش دەکرێ، واتە: هیچی دیکەم بۆ نیە جگە لە پابەندیی بەوەوە کە خوا بۆم دەنێرێ، من بەندەیەکی ملکەچو فەرمانبەری خوام.

**بڕگەی سێیەم**: ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾، من ئەگەر سەرپێچیی پەروەردگارم بکەم، لە سزاو ئازاری ڕۆژێکی مەزن، دەترسم، کەواتە: نەك هەر بۆم نیە، بەڵکو لەسەریشی سزا دەدرێم، ئەگەر بێتو دەستکاریی ئایەتێك، بەڵکو وشەیەکی قورئان بکەم، بەڵکو چۆنم بۆ دەنێردرێ،

وەك ئەمانەتێك دەبێ بیگەیەنم، ﴿وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾﴾، ڕەوانەكراو تەنیا گەیاندنی ڕوونی لەسەرە.

ئنجا ئەم ڕستەیە وێڕای ئەوە كە وەڵامە بۆ ئەو قسەیە، ئەوەشی لێوەردەگیرێ كە هیچ كەس لە بەرانبەر خوادا ﷻ مافی ئەوەی نیە، شتێك خوا فەرمووبێتی، ئەو بێنێ بە جۆرێكی دیكە تەئویلی بكات، یاخود ملی پێ بابدات و بسووڕێنێ، هەروەها هیچ كەسێك نازو مافی سەرپێچیی كردنی نیە لە بەرانبەر خوای پەروەردگاردا، چونكە (بەندایەتیی) واتە: ملكەچیی بۆ خوا، ژێر دەستەیی بۆ خوا، لە بەرانبەر خوادا بچووكیی نواندن.

**برگەی چوارەم**: ﴿قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ﴾، بڵێ: ئەگەر خوا ویستبای بەسەرتاندای نەخوێنمەوە، بەسەرمدا نەدەخوێندنەوە، ﴿وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ﴾، واتە: (وَلاَ أَعْلَمَكُمْ بِهِ)، وە خوا ئێوەی لێ ئاگادار نەدەكردەوە لەسەر زمانی من، واتە: ئێوەی ئاشنا نەدەكرد بەم قورئانە، ئەو قورئانەی بەئێوە ئاشنا نەدەكرد، كەواتە: هیچ جۆرە پەیوەندییەكی بەمنەوە نیە.

**برگەی پێنجەم**: ﴿فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾، خۆتان دەزانن من تەمەنێك لە نێو ئێوەدا ماومەتەوە، ئایا نافامن؟ تەمەنێك پێش ئەوەی قورئانم بۆ بێتە خوار، من لە نێو ئێوەدا ماومەتەوە، تەمەنێكی چل ساڵیی، ئەوە شتێكی زۆر ڕوون و ئاشكرایە كە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) چل ساڵی ڕەبەق پێش ئەوەی خوای زانا وەحی بۆ بنێرێ و بیكاتە پێغەمبەر ﷺ تەمەنی گوزەراندوە، لەوبارەوە جەعفەری كوڕی ئەبی طالیب، واتە: برای عەلی كوڕی ئەبی طالیب، ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ. ئەم وتەیەی هەیە، كە پێشەوا ئەحمەدی كوڕی حەنبەل لێی گێڕاوەتەوە: {قَالَ جَعْفَر ابْنُ أَبِي طَالب للنجَاشِي ملك الحَبَشَة: بَعَثَ اللهُ فِينا رَسولاً نَعْرِفُ صِدْقَهُ وَنَسَبَهُ وَأَمَانَتَهُ، وَقَدْ كانَتْ مُدَّة مقامِهِ عَلَيْهِ السَّلاَم بَيْنَ أَظْهُرِنا قَبْلَ النبوَّة أَرْبَعِيْنَ سنة} {اخرجه احمد برقم: (١٧٤٠)}.

واتــە: جەعفــەری کوڕی ئەبی طالیب بە پادشای حەبەشەی گـوتوە: (کـاتێك کە چوون بۆ لای، دوای ئـەوەی کافرەکـانی مەککە زۆر ئـازاری مسوڵمانـانیانـدا، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێنمایی کردن، فەرمووی: بچن بۆ حەبەشە، مەلیکێکی لێیە، کەس لەوێ ستەمی لێ ناکرێت لە پەنای ئەودا)، خوا پێغەمبەرێکی لە نێو ئێمەدا ڕەوانکـردوە کە ڕاستگۆییەکەی دەزانین و، ڕەچەڵەکی دەزانین و، ئەمانەت و دەستپاکییەکەی دەزانین و، پێش پێغەمبەرایەتیی، چل ساڵ لە نێو ئێمەدا تەمەنی کردوە.

ئنجا لە ڕاستییدا کە لە دوای چل ساڵییەوە، پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ خوای پەروەردگار هەڵیبژاردوە بە پێغەمبەر، زۆر لە زانایان دەڵێن: ئەوە یاسایەکی خوا بووە، هەموو پێغەمبەران لە دوای تەمەنی چل ساڵییەوە، خوا ﷻ ڕەوانەی کردوون.

زانایانی دەروونناس و کۆمەڵناس دەڵێن: ناگونجێ هیچ کەسێك پێش چل ساڵیی لە بابەتێك لەو بوارەی خۆیدا، کە دوایی قسەی تێدا دەکات، تێگەیشتنێکی نەبووبێ و، دوای چل ساڵیی پەیدابێ، چونکە هەر شتێك بێ، دەبێ ئینسان لەپێش تەمەنی چل ساڵییدا شتێکی لێ دەرکەوتبێ، بەڵام موحەممەد ﷺ هەتا چل ساڵیی، یەك شتی نەگوتوە، وەك ئەوەی کە لە قورئاندا هەیە، لە چل و یەك ساڵییدا، پێغەمبەری خوا ﷺ وەرچەرخانێکی سەدو هەشتا پلەیی لە ژیانیدا ڕوویداوە، دوای ئەوەی کە خوا کردوویەتی بە پێغەمبەر ﷺ.

کەواتە: دیارە کە سەرچاوەی ئەم قورئانە غەیری خۆیەتی، چونکە ئەگەر لە خۆیەوە بووایە، کێ دەزانێ چەند ساڵ دەژی؟ هەر لەو کاتەوە کە شتێکی لێ حاڵی دەبوو، شتێکی لە تواناد دەبوو، دەستی دەکرد بە باسکردنی، بەتایبەت پێش چل ساڵیی، کە مرۆڤ زیاتر لە قۆناغی گەنجێتیی دایەو تین و تاقەتی هەیە، بەڵام کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ تاکو دوای چل ساڵیی، هیچ باسێکی لەوبارەوە نەکردوە، ئەوە بەڵگەیەکی زۆر ڕوونە، کە ئەم قورئانە لە دەرەوەی خۆی بۆی نێردراوە، هەر کەسێکیش سەیری نێوەڕۆکی قورئان بکات، ئەوە زۆر ڕوون و ئاشکرایە، وەك دوایی دەیگەینێ، کە خوای

شارمزا دەفەرموێ: ﴿ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِمَا لَمْ يُحِيطُوا۟ بِعِلْمِهِۦ ﴾، بەڵكو ئەوانە شتێك بە درۆ دەزانن، كە زانیارییان پێی نیە، پێی ئاشنا نین، تێی نەگەیشتوون!

<u>**بڕگەی شەشەم**</u>: خوای پەروەردگار هەر لەسەر وەڵامی ئەو دوو داواكارییەی كافران بەردەوام دەبێ، دەفەرموێ: ﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَـٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾، كێ ستەمكارترە لە كەسێك كە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ؟ یاخود ئایەتەكانی خوا بە درۆ دەزانێ؟ بێگومان تاوانباران سەرفراز نابن، واتە: ئەگەر من هەڵمبەستبێت، وەك ئێوە ئیددیعا دەكەن، ئەوە هیچ كەس لە من ستەمكارتر نیە، هەروەها ئێوەش كە بە درۆی دادەنێن، هیچ كەسیش لە ئێوە ستەمكارتر نیە، سەرەنجامیش: ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾، بە دڵنیایی تاوانباران سەرفراز نابن، ئنجا چ من هەڵمبەستبێت، ئەوە تاوانبارم‌و سەرفراز نابم‌و بە مراد ناگەم، بە ئاكام ناگەم، وە ئێوە بە درۆی دابنێن، سەرفراز نابن‌و بە مراد ناگەن!

دیارە ئێستا دەركەوتوە كێ بە مراد نەگەیشت؟ بانگەوازەكەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئێستا یەك لەسەر چواری دنیا، زۆربەی پانتایی دنیای گرتوە، ئەوانەش كە قورئانیان بە درۆ دەزانی، فڕێدرانە زبڵدانی مێژوو، وە هیچ ناوو ناوبانگێكیان نیە !

كەواتە: ئەگەر هەر وەك سەرەنجامی دنیاییش تەماشای بكەین، پێغەمبەری خاتەم ﷺ سەرفراز بوو، بە مراد گەیشت، ئاواتەكەی هاتەدی، ئامانجەكەی تەحقیق بوو، ئەوانی دیكەش دیارە كە سەرەنجامیان چی لێهات، بوونە بەردی بن گۆمێ.

ئنجا ئەم ئایەتە موبارەكە، شێوەی ئایەتی ژمارە (٢٤)ی سوورەتی (سبأ)ە، كە دەفەرموێ: ﴿ ... وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ ﴾،

واتە: ئێمە یان ئێوە، یەکێکمان لەسەر ڕێنماییین، لەسەر ڕێی ڕاستیین، یاخود لە گومڕاییەکی ئاشکرا داین، واتە: دوو کەس، کە دوو قسە دەکەن، قسەکان تێکدەگیرێن، دیارە دەبێ هەر یەکێکیان ڕاست بێ، ئنجا لێرەدا پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دڵنیایەو لەو سەری هاتۆتەوە، هەموو پێغەمبەرێك خۆی لەسەر بەڵگە بینیوە، وە لەبەر ڕۆشنایی دابوون، هەمیشە گوتوویانە: ﴿أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي ﴿٦٣﴾﴾هود، واتە: هەواڵم پێ بدەن ئەگەر من لەسەر بەڵگەیەکی ڕوون بم لە پەروەردگارمەوە! (ئایا دەستبەرداری بم؟!)

﴿قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ ﴿١٠٨﴾﴾یوسف، واتە: بڵێ: ئەمە ڕێبازمە لەبەر ڕۆشنایی دا بانگەواز بۆ لای پەروەردگارم دەکەم. هیچ پێغەمبەرێك نەبووە لە پەیامی خۆی دڵنیا نەبێ‌و لەبەر ڕۆشنایی نەبێ، ئەدی بۆچی بەو شێوازە قسەیان کردوە؟ بۆ ئەوەی پردێك دروست بکەن، لە نێوان خۆیان‌و بەرانبەرەکەیاندا، چونکە بەرانبەرەکەت، ئەگەر بڵێی: هەرچی من دەیڵێم ڕاستەو، ئەوەی تۆ دەیڵێی، هەمووی درۆیەو هەڵەیە، هەر گوێت بۆ ناگرێ‌و، هیچ پردێك لە بەیندا نابێ بگەنە یەکدی، ئومێدێکی نابێ کە ئەویش قسەیەکی لێ وەربگیرێ، بۆیە ئەوە شێوازێکی زۆر بەرزی قورئانە، کە تۆ بەرانبەرەکەت یەکسەر نائومێد نەکەی‌و، هەستی بپارێزی، بۆ ئەوەی کە وتووێژو دیالۆگەکە بگونجێ بەردەوام بێ.

مەسەلەی شەشەم : دیارە هەر باسی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، چ ئەوانەی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، چ ئەوانەی دوای ئەوو، ئێستاو، دوای ئێستاش، دەفەرموێ:

﴿وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ لَا يَعۡلَمُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا يُشۡرِكُونَ ﴿١٨﴾﴾، جگە لە خوا شتانێك دەپەرستن، کە نە زیانیان پێدەگەیەنن، نە سوودیان پێدەگەیەنن.

وشەی (دُونِ )، دەڵێ: (دون ضِد الفَوْق) یان (الدون: الحَقِير)، دەگوترێ: (هَذَا دُونَ هَذَا أي: أَقْرَبُ مِنْهُ)، (دُونَكَ هُوَ)، واتە: (خُذْهُ) بیگرە کەواتە: وشەی (دُونِ )، واتە: لە خوار، یاخود کەمتر، واتە: ئەوانە لە خوار خواوە، (جگە لە خوا) شتانێك کە زۆر لە خوار خواوەن، خوا (خالق)و ئەوانیش (مخلوق)ن، شتانێك دەپەرستن کە نەزیانیان پێدەگەینن، نە سوودیان پێدەگەینن، بۆیەش وشەی (ضَرّ)ی پێشخستوە : ﴿مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ﴾، چونکە ئەو پەرستراوانە، ئەگەری زیان گەیاندنیان زیاترە لە سوود، جاری واش هەیە وشەی (نفع) پێش دەخرێ، لەبەرئەوەی سیاقەکە وا دەخوازێ، ئەوە هەمووی دەبێ ئینسان سەرنج بدات، بۆچی لەوێ ئەم وشەیە پێش دەخرێ؟ بۆچی لە شوێنێکی دیکە بە پێچەوانە دێ؟ هەمووی پەیوەستە بەو سیاق‌و کەش‌و هەوایەی کە ئایەتەکانی تێدا هاتوونە خوارو، پەیوەستە بەو سیاقەوە کە ئایەتەکانی تێدا دێن‌و، بە زنجیرەی ئایەتەکانەوەو، ئەو مەبەستەی کە ئایەتەکانی بۆ دێن.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ﴾ وە دەڵێن: ئا ئەوانە تکا کارمانن لە لای خوا، واتە: ئەو شتانەی کە ئێمە دەیانپەرستین، دەزانین دروستکراون، بەڵام دەزانین کە لەلای خوا قسەیان گیرایە، داوایان دەگیرێتەوە، ئێمەش دەیانپەرستین بۆ ئەوەی لە خوامان نیزیك بخەنەوە! ئەمە وەك ئایەتی ژمارە (٣)ی سوورەتی (الزمر)ە، کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ ۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِى مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ كَٰذِبٌ كَفَّارٌ ﴿٣﴾ ﴾.

واتە: ئاگاداربن! ملکەچیی ساغ، تەنیا شایستەی خوایە، (ملکەچییەك کە هیچی دیکەی تێکەڵ نەکرابێ‌و بۆ خوا یەکلا بووبێتەوە، ئەوە تەنیا شایستەی

خوایـە)، وە ئەوانـەی کە لـە خـوار خـواوە (جگـە لـە خـوا) کەسـانێکی دیکـە بـە دۆسـتو سـەرپەرشتیاریان دەگـرن، بـە پەرسـتـراویان دەگـرن، دەڵێن: ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ﴾، واتە: ئێمە ئەوانە نـاپەرسـتین، مەگـەر بـۆ ئـەوەی بـە نیزیکیی لـە خوا نیزیکمان بخـەنەوە، خـوا دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِى مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾، دوایـی خـوا دادوەرییـان لـە بەینـدا دەکـات، لـەوەدا کـە تێیـدا کەوتوونـە ڕاجیاییـەوە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ كَٰذِبٌ كَفَّارٌ﴾، بێگومان خـوا کەسێك کـە درۆ دەکـاتو، زۆر سپڵـەیە (یـان زۆر بێبـڕوایە)، نـایخـاتە سـەر ڕێگای ڕاست، (چونکـە شایسـتە نیـە).

کەواتـە: هـەر کەسـێك بڵـێ: مـن شتێکی دیکـەی جگـە لـە خـوا دەپەرسـتم، بۆئەوەی لـە خوا نیزیکم بخـاتەوە، ئـەوە هـەم درۆ دەکـاتو درۆزنـە، هـەم سپڵـەشـە، یـاخـود بـێبڕواشـە، ئـەوەش بەڕاسـتیی هۆشـدارییەکی گرنگـی تێدایـە، بـۆ هـەموو ئەوانەی کە شێوەیەك لە شێوەکانی پەرستن بۆ غەیـری خوا ئەنجـام دەدەن، وەك: لـێپـاڕانەوە، پشت پێ بەستن، ئەوپـەڕی خۆشویسـتن، ئەوپـەڕی لـێترسـان، مـل بـۆ کەچکردن، قوربـانیی بۆ سـەربڕین، نەزر بۆ کردن، سوێند پێخـواردنو، هـەموو ئـەو شـتـانەی دیکە، کە دەچنـە بـازنەی پەرستنەکانەوە، کە بـە داخـەوە مسوڵمـانـانیش زۆر جـار گیـرۆدە دەبـن بـە شیرکـەوە، وەك خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (یوسـف)دا دەفـەرموێ: ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ١٠٦﴾[1]، واتـە: زۆربەیـان ئیمـان بـە خـوا نـاهێنـن، مەگـەر هاوبەشیشـی بـۆ پەیدا دەکەن، کە بـە داخـەوە زۆرجـار لـە نێـو ئۆممـەتی پێغەمبەریشـدا ﷺ ئـەو دەردە هەیـە، بۆیـە مسوڵمـانـان دەبێ وریـابن، بەندایەتیی هەمووی بۆ خوا بـێ، چ وەك پێشکەشـکردنی دروشمەکان (شعائر): نوێژ بە هەموو پێکهاتەکانیـەوە، ئنجا ڕۆژوو، ئنجـا حـەجو

---

١) لە تەفسیری سـوورەتی (یوسف)و لەبـەر ڕۆشنـایی ئـەم ئایەتەدا، باسـێکی خەسـتو خۆڵـمـان لەبـارەی شیـرکەوە کـردوە.

عومـــرە، ئنجـا زەکـات، پاشـان نـەزرو سـوێند پێخواردن. دوایـی ئـەو شتـانەی کـە پەنهـانن، وەك ئەوپـەڕی خۆشویسـتن، ئەوپـەڕی لـێترسـان، ئەوپـەڕی پشـت پـێ بەستن، ئەوپەڕی مـل بۆ کەچکـردن، ئەوپـەڕی بەگەورەگـرتن، ئەوانـە هەموویان تەنیا دەبـێ بۆ خـوا بـن، چ بەرنامەکـان (شرائع)؛ دەبێ حەڵاڵو حـەرام، ئـەمرو نەهـی، تـەنیا لـە خـوای پەروەردگـارو لـە شـەریعەتی خـوای کـارزان وەربگیـرێن، ئەگەرنـا، چ پێشـکەشکردنی دروشـمەکـان، چ وەرگرتنـی یاساکـان، واتـە: (تقديم الشعائر و أخذ الشرائع)، ئەگـەر بۆ غـەیری خوابن، بـە تەئکید مانـای وایە ئـەو غـەیری خوایـە، پەرسـتـراوەو بەندایەتیـی بـۆ کـراوەو، کراوەتـە هاوبەشی خـواو هێنراوەتە ڕیزی خـوا، ئنجـا بیانووەکـەی هـەر چییەك بـێ.

کە بە دڵنیایی ئـەوە پاساوێکی زۆر بێجێیـە: مـن بۆیە ئەوشتە، یان ئەوکەسـە دەپەرستم، یان لێی دەپاڕێمەوە، یـان هـاواری لـێ دەکـەم، داوای لـێ دەکـەم، کە لـە خوام نیزیك بخاتەوە، ئایا کەسێك بپەرستریو ئاوا ببـردرێتـە ڕیزی خوا، بکرێتە هاوبەشـی خوا، ئەگـەر خۆی ڕازی بێ، چۆن ڕووی دێ، دوایی داوا لـە خـوا بکـات، چ ڕوویـەکی هەیـە ئەگـەر خـوا بفـەرموێ: تـۆ چـی، تـاکو شـەریکی مـن بـی؟ تـۆ دروسـتکـراوی منـی، چـۆن دەبـێ بکرێیـە هـاوبەشم؟ چۆن قبووڵت کـرد؟ ئـەوە ئەگـەر ئاگـای لێبـێو ڕازی بـێ، ئەگـەر ئاگاشـی لـێ نەبـێو ڕازی نەبـێ، وەك: عیسـا (علیە السلام) کـە دەپەرستـرێ لـەلایەن مەسیحییەکـانەوەو، عـوزێر کـە پەرستــراوەو، هەنـدێك لـە پیاوچاکـان، کـە پەرسـتــراون، بەبـێ ئـەوەی خۆیـان ئاگایان لـێبـێ، خـەڵك لێیان دەپاڕێتەوە هـاواریان تێدەبەسـتـێ، ئـەوە بـە تەئکـید زیـان لـەوان نـادات، بـەڵام ئـەو کەسـانەی کـە دەیانپەرسـتن و، هەنـدێك لـە پەرستنەکانیان پێشکەش دەکەن، بـەس خۆیـان ئـەو بەرپرسیارێتییە هەڵدەگـرن و ئەو تاوانـە لـە ملی خۆیـان دایـە.

یـاخود ئـەو دارو بـەردو دروسـتکراوانەی کـە ئیـرادەو هەسـتیان نیـە، بـۆ وێنـە: هیندۆسـەکـان مانگا دەپەرسـتن، هەیـە مـار دەپەرستـێ، هەیـە جۆرێك لـە درەخـت دەپەرسـتـێ، هەیــە دارو بـەرد دەپەرستـێ، مـانگ و خـۆرو ئەسـتێرە دەپەرسـتێ. ئەوە دیارە کە ئەو دروستکراوانە، هیچ کامیان ئاگایان لە هیچ نیەو، بوختـانێکـیان پـێ دەکرێ، کە دەکرێن بە هاوبەشـی خـوا ﷻ.

ئنجا کە دەڵێن: ﴿هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ ئا ئەوانە تکاکارمانن لەلای، خوا ﷻ ئاوا پێغەمبەر ﷺ فێر دەکات وەڵامیان بداتەوە: ﴿قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴿١٥﴾﴾، بڵێ: ئایا هەواڵ بە خوا دەدەن بە شتێك کە نایزانێ؟ نە لە ئاسمانەکان نە لە زەویدا، واتە: هیچ شتێك و، هیچ کەسێك نیە، هاوبەشی خوا بێ، یان تکاکار بێ لای خوا، ئەو شتانەی کە ئێوە پێتان وایە هاوبەشی خوان، خوا نایانزانێ، بۆچی؟ چونکە بوونیان نیە، کە ئەو تەعبیرە لە زۆر شوێنی قورئان دا هاتوە، کە خوا ئەو شتە نازانێ، واتە: نیە، چونکە ئەگەر هەبووایە زانیاریی خوا پێیەوە پەیوەست دەبوو، کەواتە: هەر شتێك لە زانیاریی خوادا نەبوو، واتە: بوونی نیە، هەڵبەتە بوونی نیە، بە پێی ئەو قەناعەتەی ئەوان، ئەگەرنا بۆ وێنە: نەصرانییەکان عیسا (عليه السلام) دەپەرستن، عیسا هەیە، بەڵام وەك پێغەمبەرو بەندەی خوا هەیە، نەك وەك هاوبەشی خواو کوڕی خوا، هەروەها فریشتەکان هەن، بەڵام وەك بەندەی خواو فریشتەکانی خواو دروستکراوەکانی خوا، نەك وەك هاوبەشی خواو، وەك کەسانێك کە بەبێ ئەوەی خوا مۆڵەتی لەسەر بێ، شەفاعەت بۆ هەر کەسێك بیانەوێ بکەن!

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ: ﴿سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾، پاکیی و بەرزیی بۆ خوا لەوەی کە دەیکەن بە هاوبەشی، واتە: خوا زۆر لەوە پاکترو بەرزترە، کە ئەو شتانە بهێنرێنە ڕیزیو، بهێنرێنە ئاستی خوا.

<u>**مەسەلەی حەوتەم:**</u> کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَٱخْتَلَفُوا۟ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ فِيمَا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٩﴾﴾، لێرەدا مەبەست لە خەڵك هەموو، مرۆڤایەتییە، واتە: خەڵك هەمووی یەك کۆمەڵ بوون، دوایی کەوتنە ڕاجیایی، وە ئەگەر وشەیەك، (واتە: بڕیارێك) لە پەروەردگارتەوە ڕانەبردبایە (کە لە دنیادا دادوەریی لە بەینی خەڵکدا ناکاتو سزای تاوانباران نادات)، ﴿لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ فِيمَا فِيهِ

يَخۡتَلِفُونَ ﴾، لـەوەدا كـە تێیـدا كەوتوونـە كێشـەو مشـتو مـڕو ڕاجیاییـەوە دادوەرییـان لـە نێوانـدا دەكـراو، بابەتەكـەیان یەكـلایی دەكرایـەوەن یـان بڕیـاریان لەبارەوە دەدرا.

كە دەفەرموێ: ﴿ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾، یەك كۆمەڵ، زۆربەی توێـژەرەوانی قورئـان گوتوویانە، واتە: (أُمَّةً وَاحِدَةً عَلَى التَّوْحِيد) یەك كۆمەڵ لەسەر خوا بە یەكگرتن.

لە سووڕەتی (البقرة)شـدا ئـایەتێكی هاوشێوەی ئەمە هەیە، كە خـوا دەفـەرموێ:

﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِۚ وَمَا ٱخۡتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَا ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ ٱلۡحَقِّ بِإِذۡنِهِۦۗ وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٍ ٢١٣ ﴾،

ئەویش هەر ئاماژەیە بەم مەسەلەیە كە بەشەر لەسـەر یەك ڕێ بوون،و، پێغـەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هاتوون لە سـەرەتاوە بەشەریان خستۆتە سـەر جادەی خـوا بە یەكگـرتن، بەڵام دوایی كە پەیام و بەرنـامەی پێغـەمبەرانیان لـەنێودا كاڵ بۆتەوەو لەبیـرچۆتەوە، ئنجا كەوتوونەتە ڕاجیاییو، هەندێكیان هەر لەسەر خوا بەیـەكگرتن،و، تەنیـا بەندایەتیی بۆ خوا كردن ماونەوە، لەسـەر جادە ماونــەوە، هەندێكیشـیان بـە كوێرە ڕێیـانداو بە ڕێچكاندا بەملاولادا لایانداوەو، لەگـەڵ ئەوانەی كە ئەهلی هـەق بوون، كەوتـوونە مشـتومڕو نـاكۆكییـەوە، كە دەفەرموێ: ﴿ فَٱخۡتَلَفُواْ ﴾، واتـە: (تَفَرَّقُوا عَنِ الجَادَةِ الصَّحِيحَةِ) لـەسـەر ڕاسـتە شـەقام تـرازاون و لایـانداوە.

كە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن ﴾، جارێكی دیكەش باسـمان كـردوە وشـەی (كَلِمَة)، واتـە: (وشـە)، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـت پێـی بڕیـاری خـواو. نەخشەی ئەزەلیی خوایە، خوا نەخشـەی ئەو بوونەی وا داناوە، ئەم قۆنـاغی دنیـایە دەبێ مرۆڤەكـان، هەروەهـا جنـدیـش، بـە كـەیفی خۆیـان ئیمتیحانی خۆیـان بـدەن.

دەستیان کراوە بێو، ئازاد بن، چۆن وەڵامی پرسیارەکان دەدەنەوە بەندایەتیی بۆ خوا دەکەن، یان نایکەن، ئەهلی تەوحید دەبن، یان ئەهلی شیرك دەبن، خوا دەستی واڵا کردوون و ئازادی کردوون، بڕیاری خواش تێپەڕیوە، نەخشەی خوا وا دانراوە کە لەم دنیایەدا کەس لەسەر ئەوە سزا نەدات و لێیان نەپرسێتەوە بۆچی؟

تاکو ئازادانە تاقیکردنەوەی خۆیان بدەن، بەڵام لە قۆناغێکی دیکەدا، کە ڕۆژی دواییە، ئەوجار حیساب و کیتاب دێتە پێش، ئەوە مەبەستی ئەو ڕستە موبارەکەیە، واتە: لە پەروەردگارتەوە ئەو بڕیارە تێپەڕیوە، ئەگەرنا لەسەر ئەوە دادوەرییان، لە بەینیدا دەکرا، واتە: کارەکەیان هێندە ناقۆڵایە هەڵوێستەکەیان هێندە بێجێیە، خوا ﷻ پەلەی دەکرد لەوەدا کە هەر لە دنیادا سزایان بدات و، مشتومڕەکەیان لەگەڵ ئەوانەدا کە خوا بە یەکگرن، یەکلا بکاتەوە، یان مەبەست ئەوەیە کە خوا ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە کە لەوبارەوە بڕیاری پێش وەختی داوە، سزای بێبڕوایانی دەداو کۆتایی پێ دەهێنان.

بەڵام بێگومان خوا نەخشەی خۆی ناگۆڕێ، چۆنی داناوە دەیباتە سەر.

دیارە خوا ﷻ وەك کوردەواریی خۆمان گوتوویانە: (خوا بە سەبرە بەڵام بە زەبرە) ئەگەر خوا ﷻ وەك ئێمەی بەشەر بووایەو، بە شتێك زۆر هەڵچووبایەو، میزاجیی مامەڵەی کردبایە، خوایەتیی بۆ نەدەکرا!

<u>مەسەلەی هەشتەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُونَ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦۖ فَقُلۡ إِنَّمَا ٱلۡغَيۡبُ لِلَّهِ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾، وە دەڵێن: دەبووایە لە پەروەردگاریەوە نیشانەیەکی بۆ دابەزیبایە، {مەبەستیان پێ موعجیزەی وەك هی پێغەمبەران بووە (علیهم الصلاة والسلام)} خوا پێی دەفەرموێ: ﴿ فَقُلۡ إِنَّمَا ٱلۡغَيۡبُ لِلَّهِ ﴾، تۆ بڵێ: پەنهان و نادیار تەنیا عایدی خوایە، خوا دەزانێ لە هەگبەی غەیبدا چی هەیە.

ئنجا ﴿ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ ﴾، کەواتە: ئێوە چاوەڕێبن، منیش لەگەڵ ئێوە لە چاوەڕوانانم، واتە: ئێوە چاوەڕوان بن، بزانین حیکمەتی خوا

وا دەخوازێ، کە موعجیزەیەکی وەك هی پێغەمبەرانی پێشووش بدات بە من، یان هەر بەم قورئانە ئیکتیفا دەکات! منیش چاوەڕێ دەبم، یاخود ئێوە چاوەڕێ بن، چونکە خوا ئەو بەڵگەیەی بە من داوە، بەسە، بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی من، ئنجا ئێوە چاوەڕێ بن، بە دیار ئەوەوە، کە خوا موعجیزەیەکی دیکەی وەك هی پێغەمبەران بۆ من بنێرێ، کە زەمانو ڕۆژگاری ئەو جۆرە موعجیزانە تێپەڕیوە، ئێستا بەشەر کەوتۆتە قۆناغێکی دیکەوە، منیش چاوەڕێ دەبم، داخۆ منیش چیم لێدێو ئێوەش چیتان لێدێ؟ کە مانای دووەمیانم زیاتر دەچێتە دڵەوە، واتە: ئەوە جۆرێکە لە بێباکیی‌و بێ منەتیی‌و، لە خۆ دڵنیا بوون‌و بە خۆ پشت ئەستوور بوون، ئێوە چاوەڕێ بن، مادام ئیکتیفا ناکەن بەم قورئانە، کە تەنیا خوای پەروەردگاریش کە نادیار دەزانێ، بۆ خۆی دەزانێ بەشەر یەکی لەسەر چی کەوتوە، لە هەر ڕۆژگارەدا، بۆ ئەوەی بڕوا بەو پێغەمبەرە بێنێ، کە لەو ڕۆژگارەدا ناردوویەتی، واتە: لەو کاتەوە کە موحەممەد ﷺ هاتوە، تاکو دنیا بە کۆتا دێ، دیارە خوای کاربەجێ ئەم قورئانەی بە بەس (كافي) زانیوە کە ببێتە موعجیزەو بەڵگەی سەلماندنی ڕاستییەتیی پێغەمبەری خاتەم، خوا ئەوەندەی بە بەس (كافي) زانیوە، ئنجا ئەگەر ئێوە پێتان وایە، نەخێر خوا نەیپێکاوە! چاوەڕێ بن، منیش چاوەڕێم.

دیارە پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەوەی کە خوای پەروەردگاری بۆی بە باش زانیوە، ئەویش هەر ئەوەی بە باش زانیوە، پێغەمبەری خاتەم بۆ خۆی زانیویەتی کە ئەم قورئانە بەسە بۆ ئەوەی موعجیزەی ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی وی ﷺ بێ.

وشەی (لَوۡلَآ) کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُونَ لَوۡلَآ ﴾، (لَوۡلَآ) بە دوو واتایان دێ:

<u>یەك</u>: پێی دەگوترێ: (لَولا الإِمْتِناع) کە (يَمْنَعُ الثَّانِي مِنْ أَجْلِ الأَوَّل)، واتە: ڕێ لە دووەم دەگرێ، لەبەر خاتری یەکەمیان، وەك: (لَولا زَيْدٌ لَهَلَكْنا)، واتە: ئەگەر زەید نەبووایە، دەفەوتاین، ئێستا بەهۆی بوونی زەیدەوە فەوتانەکە نەماوە، واتە: (امْتَنَعَ وُقوعِ الهَلاكِ مِنْ أَجْلِ وُجُودِ زَيْدٍ)[1].

---

١) مختار الصحاح، ص ٦١٢.

لە کوردییشدا دەڵێین: ئەگەر فلانە کەس نەبێ، ئاوا دەبوو، یان ئەگەر ئەو هاتبا، ئاوا دەچوو، واتە: دووەمیان نابێ لەبەر بوونی یەکەمیان.

دوو : (لَوۡلَآ ) بە مانای (هَلاَّ) دێ، واتە: بە مانای (تَحْضِيض) هاندان، (هَلاَّ)ش لە ئەسڵدا لە (هَلْ)و (لا) پێکهاتووە، مانای (تَحْضِيض)، هاندان دەگەیەنێ.

ئنجا لێرەدا کە دەفەرموێ : ﴿ وَيَقُولُونَ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، واتە: دەبووایە لە پەروەردگاریەوە نیشانەیەکی بۆ دابەزێ، کەواتە: لێرەدا (لَوۡلَآ ) بۆ (تَحْضِيض) هاندانە.

جێی سەرنج ئەوەیە کە دەڵێن: ﴿لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، وەك خوا ﷻ تەنیا خاوەنو پەروەردگاری موحەممەد ﷺ بێ، کە ئەوە بێئەدەبییەکی گەورەیە، پەروەردگاری ئێوەشە، چونکە موشریکەکانیش هەر گوتوویانە: خوا (الله) ﷻ خاوەنو بەدیهێنەرو پەروەردگاری هەموو کەسێكو هەموو شتێکەو، بتەکانیان بە خوا نەزانیوەو بە پەروەردگاریش نەزانیون، بەڵکو گوتوویانە: ئەوانەش دروستکراوو بەندەی خوان، یان ئەگەر فریشتەیان پەرستوون، ئەگەر پەیکەرو سەنەمیان پەرستوون، هەر شتێکیان پەرستوە، گوتوویانە: ئەوانە دروستکراوو بەندەی خوان، بەڵام تکامان لە لای خوا بۆ دەکەن.

﴿لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، (ءَايَةٌ ) بە مانای (علامة) دێت، واتە: نیشانە، (ءَايَةٌ ) بە سێ جۆر کۆدەکرێتەوە:

١/ (آي) .

٢/ (آيـاي) .

٣/ (آيات)، لە ڕابردووشدا چەندان جار گوتوومانە: کە (آيات) لە قورئاندا، بە سێ واتایان بەکارهاتوە:

١ـ بە مانای ڕستەکانی قورئان، یان ڕستەکانی فەرمایشتەکانی خوا، لە کتێبەکانی دیکەدا.

٢ـ بە مانای موعجیزەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام).

٣ـ بە مانای دیاردەو دیمەنەکانی بوونەوەرو دەوروبەر.

هەڵبەتە لە زۆر شوێندا کافرەکان داوایان لە پێغەمبەری خاتەم کردوە کە موعجیزەو نیشانەی وەك هی پێغەمبەرانی پێشوو بێنێ، وایانزانیوە کە بە دەست خۆیەتی، نەیانزانیوە ئاخر ئەوە نوێنەرو ڕەوانەکراوی خوایە، ئیدی حیکمەتو زانیاریی خوا چ جۆرە بەڵگەیەك بخوازێ، بزانێ چ بەڵگەیەك پێویستە، بۆ خەڵکی ئەو ڕۆژگارەی کە ئەو بۆ لایان ڕەوانە دەکرێ، ئەوەی پێدەدات، نەك بۆ خۆی بە کەیفی خۆی موعجیزەو بەڵگەیەك بێنێ:

١) لە سووڕەتی (الأنبیاء)دا، دەفەرموێ: کافرەکان دەیانگوت: ﴿ فَلْيَأْتِنَا بِـَٔايَةٍ كَمَآ أُرْسِلَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٥﴾ ﴾، واتە: با نیشانەیەکمان بۆ بێنێ، وەك چۆن پێشووەکان ڕەوانە کراون.

یانی: ئەوان بە چ جۆرە بەڵگەو موعجیزەیەکەوە ڕەوانەکراون، با ئەویش بەڵگەیەکی ئاوامان بۆ بێنێ.

٢) هەروەها لە سووڕەتی (العنکبوت)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَـٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْـَٔايَـٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ ﴾، واتە: وە (کافرەکان) گوتیان: دەبووایە لە پەروەردگاریەوە چەند نیشانەیەکی دابەزنە سەرێ، بڵێ: بێگومان نیشانەکان تەنیا لەلایەن خوان، وە من تەنیا ترسێنەرو ورياکەرەوەیەکی ئاشکرام (یان ڕوونکەرەوەم) ئایا بۆ ئەوان بەس نیە، کە ئێمە کتێبێکمان دابەزاندۆتە سەر تۆ، کە بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە؟ لەمەدا بەزەیی هەیەو بیرخستنەوە هەیە بۆ کۆمەڵێك بڕوا بێنن.

کەواتـە: خـوا ﷻ ئەوەنـدەی بـە کـافـی زانیـوە، قورئـانی بـە کـافـی زانیـوە کـە ببێتە بەڵگەو موعجیـزەی پێغـەمبەری خاتەم ﷺ، ﴿ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ﴾، ئایا بەسیان نیـە، کافـی نیـە؟ بـۆ ئـەوان بەشیان نـاکـات، کـە ئێمـە کتێبێکـمان دابـەزاندۆتـە سـەر تـۆ، کـە بەسـەریاندا دەخوێنرێتـــەوە، ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾، بێگومان لـەوەدا (لـە خوێندرانـەوەی ئـایەتەکانی قورئـاندا) بەزەیـی خـوا هـەیەو، بیـرخستنەوەی خـوا هەیە، بۆ کۆمەڵێك بڕوا بێنن، ئەگـەر بیـانەوێ بـڕوا بێنـن، ئـەوە بەسـە، ئەگـەر نەشیانەوێ بـڕوا بێـنن، هەرچی بەڵگـەی کـە داوای دەکـەن، بۆیان بێنـێ، دەڵێن: ئەوە جادوویە، وەك لـە چەند شـوێنێکی دیکـە لـە قورئـاندا هـاتوە، گوتوویـانە: ئـەوە جـادوویە:

أ- لـە سوورەتی (یونس)دا هـاتوە: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَسِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٦﴾ ﴾.

ب- [redacted] لە سوورەتی (الأعراف)دا هاتوە: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٩﴾ ﴾.

٣) هـەروەها لـە سـوورەتی (الأنعام)یشـدا هـەمان شت دووبـارە بۆتـەوە، وەك خـوا دەفـــــەرموێ : ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٧﴾ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ مَّا فَرَّطْنَا فِى ٱلْكِتَٰبِ مِن شَىْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾.

واتـە: وە (کـافرەکـان) گوتیـان: دەبووایـە لـە پەروەردگـاریەوە ئـایەتێکی بـۆ دابـەزێ، بڵـێ: خوا بە توانـایە لەسـەر دابەزانـدنی ئـایەت، بـەڵام زۆربەیان نازانن، [redacted] هیچ زیندەوەرێك (هیچ پێـڕۆیەك) لەسـەر زەوی نیـەو، هیـچ باڵـندەیەك بـە دوو بـاڵەکـانی نـافڕێ، مەگـەر ئـەوانیش کۆمەڵـن وەك ئێوە، لـە کتێبـدا هیـچ شتێکمان زایە نەکـردوە، دوایی بۆ لای پەروەردگاریان کۆدەکرێنەوە.

واتە: ئێوە ئەگەر بتانەوێ بەرزیی‌و مەزنیی پەروەردگارێتیی خوا بزانن، بکۆڵنەوە لە ژیانی ئاژەڵ‌و پەلەوەرو زیندەوەران‌و هەموو ئەوانەی کە خوا دروستی کردوون، لە ژیانی ئەوان وردبنەوە، گەورەیی خواو، پەروەردگارێتیی خواتان، بە درەوشاوەیی دەکەوێتە بەرچاو.

کە دەفەرموێ: ﴿فَقُلْ إِنَّمَا ٱلْغَيْبُ لِلَّهِ﴾، واتە: هێنانی نیشانان‌و هێنانی موعجیزان لەلایەن خواوە، ئەوە کاری خوایە، کاری خواش بۆ من نادیارەو، تەنیا خوا دەیزانێ، کەواتە: ئەوە وەك عەرەب دەڵێن: (طَمَعٌ فِي غَيْرِ مَطْمَعِ) واتە: ئێوە شتێك لە من داوا دەکەن، کە لە ڕاستییدا هی من نیە، هی خوای پەروەردگارە.

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ﴾، یانی :

أ) ئێوە چاوەڕێ بن، منیش لەگەڵ ئێوە لە چاوەڕوانانم، واتە: بزانین خوا دەینێرێ یان نا؟

ب) یاخود: چاوەڕێ بن ئەوەی کە خوا بۆ منی ناردوە بەسە بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتی من، ئنجا بابزانین پێغەمبەرایەتیی من دەچەسپێ لە نێو مرۆڤایەتییدا؟ من پێم وایە دەچەسپێ، ئێوەش چاوەڕێ بن، کە پێتان وایە نەخێر، تاکو بەڵگەو موعجیزەی دیکەم بۆ نەیەت لێم ناسەلمێنرێ کە من پێغەمبەرم، فەرموون ئێوە چاوەڕێ بن، منیش چاوەڕێ دەبم، من دڵنیام‌و پشت ئەستوورم، کە پەیامەکەی من دەچەسپێ‌و، ئەم قورئانە بەسە بۆ بەڵگەو ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی من، ئێوەش کە پێتانووایە بەس نیەو پێویست بە موعجیزەی دیکە دەکات، چاوەڕێ بن، منیش چاوەڕێم.

ئەم ئایەتە موبارەکە، هەروەها ئایەتی (٥١)ی سووڕەتی (العنكبوت)یش، لێیان وەردەگیرێ کە قورئان تاکە موعجیزەو بەڵگەی پێغەمبەری کۆتایی یە، بۆ ئیسپاتی دەعوای پێغەمبەرایەتییەکەی، ئەگەرنا، دیارە موحەممەد پێغەمبەری خاتەم ﷺ موعجیزەی دیکەی بوو ون، بەڵام ئەو موعجیزانەی دیکە، کە ئێمە

لـە کتێبــی حەوتەمــی مەوســووعەی : (الإسـلام کما یتجلـی فـي کتـاب الله)دا، بـاسمان کردوون، لـە بـاسی: (بەڵگەکانی ئیسپاتی پێغەمبــەرایەتی)[1] موحەممەددا، پێغەمبـەری خـوا، موعجیزەی دیکـەی زۆر بوون، بۆ نـموونە:

١/ ئاو لـە نێو پەنجەکانی هاتۆتـە دەرێ، خەڵکێکی زۆر پێـی تێر ئاو بووە.

٢/ خـواردنێکی کەم بە دوعـا کـردنی وی زۆر بــووە.

٣/ دوعــای کــردوە، یـەك هـەور بـە ئاسـمانەوە نـەبووە، یەکسـەر هـەور هاتۆتـە ئاســمانو بــارانێکی زۆر بــاریوەو یــەك هەفتــە بــاران لەســەر یــەك بــاریوە، تــا دوایی خـەڵك بێزار بوون، گـوتوویانە: ئـەی پێغـەمبــەری خـوا ! دوعـا بکـە بــاران بوەســتــێ، ئنجــا دوعــای کــردوەو فەرموویــەتی: {اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَـا وَلاَ عَلَيْنَــا} {أَخْرَجَـهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢١١٦)، وَابْنُ حِبانَ برقم: (٢٨٥٨)، قَالَ شُعَيْب الأرنؤوط: إِسنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم}[2] واتـە: خوایە! بـا بـۆ دەوروبەرمــان بــێو لەســەر ئێمــە نەبــێ، یەکســەر هـەورەکــان وەك ئــەوەی بەدەســت لایانبــەری، ڕۆیشــتوونو بـاران نەمــاوە.

گـەلێك شـتی دیکـەش کە لـە کتێبەکـانی سـوننەتو سیــرەدا هـاتوون، بـەڵام هـیچ کـام لـەو شـتـانەی بـۆ ئـەوە نـەبووە، بـۆ خـەڵـك ئیسپاتی بکـات کـە: مـن پێغەمبـەری خـوام، بەڵکو یان بۆ ئەوە بووە بڕواداران، مسوڵمانان لە تەنگانەیەك دەرباز بکات کە خواردنێکی کەمیـان هــەبووە، بۆیـان زۆر بــێ، یـان کـە ئـاویـان نــەبووە، ئــاویان بـۆ پەیدابــێ، کـە گرفتێکـیان هەبووبــێ، لابچــێ. یـاخود بـۆ دڵخۆشکردنیــان بــووەو بــۆ ئیمــان بەهێزکردنیــان بــووە، ئەگەرنــا، بــە کەســی نەفـەرمووە : وەرە من ئـاوت بۆ لـە پەنجــەم دەردێنم، یـاخود ئـەوەت بـۆ دەکـەم،

---

١) لە چـاپی دووەمی دا. (برهين نُبوَّة محمد).

٢) {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ أَصَابَتِ النَّاسَ سَنَةٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صص فَبَيْنَا رَسُولُ الله ﷺ يَخْطُبُ النَّاسَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِذْ قَامَ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! هَلَكَ الْمَالُ وَجَاعَ الْعِيَالُ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ بِمَعْنَاهُ. وَفِيهِ قَالَ: (اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا)، قَالَ فَمَا يُشِيرُ بِيَدِهِ إِلَى نَاحِيَةٍ إِلاَّ تَفَرَّجَتْ حَتَّى رَأَيْتُ الْمَدِينَةَ فِى مِثْلِ الْجَوْبَةِ وَسَالَ وَادِي قَنَاةَ شَهْرًا، وَلَمْ يَجِئْ أَحَدٌ مِنْ نَاحِيَةٍ إِلاَّ أَخْبَرَ بِجَوْدٍ} وَاللفظ لمسلم.

بزانە کە من پێغەمبەرم، قەت ئەوەی نەکردوە، هەموو ئەوانەی تەنیا بۆ ئیمانداران کردوون، بەڵام بۆ ئەهلی کوفر تەنیا قورئانی پێبووە، بۆچی! ئەمە چ حیکمەتێکی گەورەی خوای کاربەجێی تێدایە: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ئەوە کە ئاو لە پەنجەکانی هاتۆتە دەرێ، خواردنی کەمی زۆر کردوە، باران بە دوعای ئەو باریوە، ئەگەر ئەوەی کردبایە بە بەڵگەی پێغەمبەرایەتیی، ئێستا خەڵکیش بۆیان هەبوو بە ئێمەومانان بڵێن: دەی فەرموون: ئێوەش ئەگەر ڕاست دەکەن، ئیسلام هەقە، ئەوەم بۆ بکەن! بەڵام نا، پێغەمبەر ﷺ تەنیا قورئانی بە بەڵگەی پێغەمبەرایەتیی خۆی هێناوەو، ئەو قورئانە لەبەردەستی ئێمەشدا هەیە.

ئنجا ئایا حیکمەتی ئەوە چییە؟ حیکمەتەکەی ئەوەیە: کە موعجیزەی پێغەمبەرانی پێشوو بۆ کاتێکی دیاریکراوو بۆ گەلو کۆمەڵگایەکی دیاریکراو بوون، وە پێغەمبەرەکان (علیهم الصلاة والسلام) خۆشیانو پەیامەکەشیان بۆ ئەو گەلو ئەو قۆناغە بووە، کەواتە: هەر ئەوەندە بەس بووە، کە بەشی ئەوان بکات، بۆیە لەگەڵ کۆچی دوایی خۆیان، موعجیزەکانیش تەواو بوون: گۆچانەکەی مووسا، مردوو زیندووکردنەوەی عیسا، حوشترەکەی صاڵح،... هتد.

بەڵام موحەممەد ﷺ لەبەر ئەوەی بۆ هەموو مرۆڤایەتیی نێردراوە، بە پانایی زەمینو بە درێژایی زەمان، دەبوو بەڵگەکەیشی بمێنێتەوە، تاکو ژیان لەسەر زەوییە، بۆیە خوای پەروەردگار قورئانی هێشتۆتەوە وەك موعجیزەیەك.

پاشان ئەو کاتە مرۆڤایەتیی لە قۆناغێکی ساوایی دابووە، لە قۆناغێکی کرچو کاڵ دابووە، زیاتر چاوی لەسەر شتی بەرهەست (محسوس) بووە، کە بە هەستەوەرەکانی مامەڵەی لەگەڵدا بکات، بەڵام دوای ئەوەی بەشەر گەیشتۆتە قۆناغی کامڵ (رشید) بوون، خوای پەروەردگار موعجیزەو بەڵگەیەکی بۆ ناردوە، کە مامەڵە لەگەڵ عەقڵو شعوری دا بکات، کە ئەویش قورئانەو، قورئان موعجیزەیەکی فیکریو عیلمیو ئەدەبییە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

٧

# دەرسی سێیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتەکانی: (٢١ تا ٣٠) دەگرێتە خۆی، واتە: دە (١٠) ئایەت، خوای بەرزو مەزن لەو دە ئایەتەدا، هەشت بابەتی سەرەکیی دەخاتە ڕوو:

بابەتی یەکەم: پیلانگێڕیی کافرەکان لە دژی ئایەتەکانی خوا، پاش ئەوەی خوا ڕەحمەتی خۆییان پێ دەچێژێ‌و، چاکەیان لەگەڵدا دەکات، کەچی ئەوان بێوەفایانەو سپڵانە، لە بەرانبەر ئایەتەکانی خوادا، دەست دەکەن بە پیلانگێڕیی.

بابەتی دووەم: لە تەنگانەدا پەنا بردنە بەر خواو، گفتی بەندایەتیی پێدانی لە لایەن مرۆڤەکانەوە بە گشتی‌و، کەسانی هاوبەش بۆ خوا دانەرو، بێبڕواوە بە تایبەت، پاشان دوای دەرباز بوون، هەڵگەڕانەوە لەو گفتو بەڵێنە، هەڵبەتە مرۆڤەکان بە گشتی پەنا دەبەنە بەر خوا لە تەنگانەدا، بەڵام ئەوانەیان کە هەڵدەگەڕێنەوە بە تایبەت، دیارە هاوبەش بۆ خوا دانەرو بێبڕوایەکانن، ئینسانی ئیماندار لە تەنگانەو فەرحانییدا، هەر خۆی بە بەندەی خوا دەزانێ.

بابەتی سێیەم: وێنە هێنانەوە بۆ ژیانی زوو تێپەڕی دنیا، کە خوا ﷻ ژیانی دنیا بە بارانێك، یان بە ئاوێك کە لە سەرێوە دێتە خوارێ، تەشبیه دەکات، کە ڕووەکی پێ دەڕوێ‌و، ئەو سەر زەوییە دەڕازێتەوەو، ئەوانەی ئەو کشتوکاڵەیان کردوە پێی دڵخۆش دەبن‌و، پێیان وایە کە دەتوانن بەرهەم‌و حاصەڵاتەکەی هەڵبگرنەوە، کەچی هەر هێندە دەزانن، بەڵایەکی لێدەدا، دەبێتە پەرێزێکی ڕووت، ژیانی دنیاش ئاوایە.

بابەتی چوارەم: بانگ کردنی خوا بۆ مەنزڵگای ئاشتیی، کە دیارە مەبەست پێی بەهەشتە، کە بەهەشت هەمووی سەلامەتییەو، بێ گرفتارییە بێ دەردو بەڵاییە.

بابەتی پێنجەم: سەرەنجامی چاکەکاران چاکەیەو، زیادەش دەخرێتە سەری، دوورییە لە ڕیسوایی‌و زەبوونیی‌و شەرمەزاریی.

بابەتی شەشەم: سەرەنجامی خراپەکاران، سزای پڕ بە پێست‌و دادگەرانەی خوایەو، ڕووڕەشیی‌و بێبەشییانە لە ڕەحمەت‌و میهرەبانیی خوا، لەبەرئەوەی شایستەی نین.

بابەتی حەوتەم: خستنەڕووی دیمەنێك لە قیامەت‌و، حاشا کردنی پەرستراوانی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، لەوانەی پەرستوویانن (لە پەرستارەکانیان) یەخەیان لەبەر دادەدڕن‌و، حاشایان لێدەکەن‌و، دەڵێن: ئێمە لە بەندایەتی‌و پەرستنی ئێوە بۆ ئێمە، بێئاگا بووین‌و، خواش بە شایەد دەگرن.

بابەتی هەشتەم‌و کۆتایی: دەرکەوتنی دەرەنجامەکان‌و، گەڕانەوە بۆ لای خواو، ونبوونی پەرستراوە ئەفسانەیی‌و هەڵبەستراوەکان، لەوانەی کە پەرستوویانن.

﴿وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ مِّنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُمۡ إِذَا لَهُم مَّكۡرٞ فِيٓ ءَايَاتِنَاۚ قُلِ ٱللَّهُ
أَسۡرَعُ مَكۡرًاۚ إِنَّ رُسُلَنَا يَكۡتُبُونَ مَا تَمۡكُرُونَ (٢١) هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ
حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ
وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ
لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ (٢٢) فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمۡ إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ
فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۗ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ
ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُكُمۡ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ (٢٣) إِنَّمَا مَثَلُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ
أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ مِمَّا يَأۡكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلۡأَنۡعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ
أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ أَتَىٰهَآ
أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارٗا فَجَعَلۡنَٰهَا حَصِيدٗا كَأَن لَّمۡ تَغۡنَ بِٱلۡأَمۡسِۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ
لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ (٢٤) وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ
مُّسۡتَقِيمٖ (٢٥) لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ وَلَا يَرۡهَقُ وُجُوهَهُمۡ قَتَرٞ وَلَا ذِلَّةٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ
أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ (٢٦) وَٱلَّذِينَ كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةِۭ بِمِثۡلِهَا
وَتَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۖ كَأَنَّمَآ أُغۡشِيَتۡ وُجُوهُهُمۡ قِطَعٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مُظۡلِمًاۚ
أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ (٢٧) وَيَوۡمَ نَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ
أَشۡرَكُواْ مَكَانَكُمۡ أَنتُمۡ وَشُرَكَآؤُكُمۡۚ فَزَيَّلۡنَا بَيۡنَهُمۡۖ وَقَالَ شُرَكَآؤُهُم مَّا كُنتُمۡ إِيَّانَا تَعۡبُدُونَ
(٢٨) فَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدَۢا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ إِن كُنَّا عَنۡ عِبَادَتِكُمۡ لَغَٰفِلِينَ (٢٩) هُنَالِكَ
تَبۡلُواْ كُلُّ نَفۡسٖ مَّآ أَسۡلَفَتۡۚ وَرُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۖ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ
يَفۡتَرُونَ (٣٠)﴾

# مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{وە هەر کات دوای ناخۆشییەك کە تووشیان بووە، (نیعمەتو) بەزەییەکی خۆمانمان بە خەڵك (ی بێباوا) چێژت، کتوپڕ پیلانگێڕیی دەکەن دژی ئایەتەکانمان، بڵێ: خوا پلانو نەخشەکەی خێراترە، بێگومان (فریشتە) نێردراوەکانمان، پیلانگێڕییەکەتان تۆمار دەکەن ﴿٢١﴾ (خوا) ئەو کەسەیە کە لە وشکانییو دەریادا هاتووچۆتان پێ دەکات، هەتا کاتێك چوونە نێو کەشتییانەوەو، بە شنە بایەکی خۆش کەشتییەکان بردیانو، پێی دڵخۆش بوون، هەر هێندەیان زانی بایەکی توندی تێکشکێنەر بۆ کەشتییەکانیان هاتو، لە هەموو لاوە شەپۆل دەوری دانو، پێیان وابوو (بە هۆکارەکانی مەرگ) ئابڵووقە دراون، (لەوکاتەدا) بە ملکەچیی بۆ خوا ساغ کردنەوەوە لە خوا پاڕانەوە: بە دڵنیایی ئەگەر لەمە قوتارمان بکەی، مسۆگەر لە سوپاسگوزاران دەبین ﴿٢٢﴾ کەچی کە دەربازی کردن، هەر هێندەت زانی ئەوە بە ناهەق سنوورشکێنیی لە زەوییدا دەکەن، ئەی خەڵکینە! بە دڵنیایی سنوورشکێنییەکەتان بەس لە زیانی خۆتانە، (ژیانەکەتان) ڕابواردنێکی زوو تێپەڕی ژیانی دنیایە، پاشان گێڕانەوەتان بۆ لای ئێمەیە، ئنجا هەواڵی ئەوەتان پێ دەدەین کە دەتانکرد ﴿٢٣﴾ وێنەی ژیانی دنیا، تەنیا وەك ئاوێکە کە لە سەرێوە باراندوومانە، سەرەنجام ڕووەکی زەوی بەهۆیەوە ڕواوەو پێکداچووە، لەوەی خەڵكو ئاژەڵ دەیخۆن، هەتا کاتێك کە زەوی ڕەونەقی تەواوی خۆی وەرگرتو خۆی ڕازاندەوە، (کشتوکاڵەکەی پێگەیشت)، وە خەڵکەکەی پێیانوابوو بەسەریدا باڵادەستن: بە شەو یان بە ڕۆژ، فەرمانی ئێمەی بۆ هاتو، وەك پەرێزێکمان لێکرد، کە دوێنێ هیچی لێ نەبووبێ! بەو جۆرە ئایەتەکانمان بۆ کۆمەڵێك ڕوون دەکەینەوە، بەڵکو بیر بکەنەوە ﴿٢٤﴾ وە خوا (خەڵك) بەرەو مەنزڵگای ئاشتیی بانگ دەکاتو، هەر کەسێکی بوێ، دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێ ﴿٢٥﴾ ئەوانەی چاکەیان کردوە، پاداشتی هەرە باشو زێدەش هەیە بۆیانو، ڕوویان نە

ڕەشاییو نە زەبوونیی لێ نانیشێ، ئا ئەوانە هاوەڵانی بەهەشتن، تێیاندا هەمیشەیی دەبن ﴿٢٦﴾ وە ئەوانەی (کردەوە) خراپەکانیان وەدەستهێناون، سزای هەر خراپەیەك، خراپەیەکی وەك خۆیەتی، وە زەبوونییان بەسەردا دێ، هیچ پارێزەرێکیان نییە لە (سزای) خوا، ڕوویان (وا ڕەش داگەڕاون) وەك بە چەند پارچە شەوێکی تاریك داپۆشرابن، ئا ئەوانە هاوەڵانی ئاگری دۆزەخن، کە تێیدا هەمیشەیی دەبن ﴿٢٧﴾ وە (یاد بکەوە) ڕۆژێك تێکڕایان کۆدەکەینەوە، ئنجا بەوانەی هاوبەشیان (بۆ خوا) داناون دەڵێین: خۆتانو هاوبەشەکانتان بوەستن! ئنجا لەیەکمان ترازاندنو هاوبەشەکانیان گوتیان: ئێوە ئێمەتان نەدەپەرست ﴿٢٨﴾ خوا بەسە شایەد بێ لەنێوان ئێمەو ئێوەدا، کە بە دڵنیایی ئێمە لە پەرستنی ئێوە (بۆمان) بێئاگابووین ﴿٢٩﴾ ئیدی ئا لەوێدا هەر کەسە چی پێشخستوە (پێشتر ئەنجامی داوە) لێی ئاگادار دەبێ (دەزانێ چی لە هەگبەدایە)، وە بۆ لای خوای مشوورخۆری ڕاستەقینەیان گێڕدراونەوەو، ئەوەی کە پێشتر هەڵیان دەبەست (لە هاوبەش بۆ خوا) لێیان بزربوو ﴿٣٠﴾ }.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(أَذَقْنَا ): واتە: پێمان چێژتن، (الذَّوْقُ: وُجُودُ الطَّعْمِ فِي الفَمِ إِذَا كَانَ قَلِيلاً، وَاُختِيرَ لِلعَذَابِ وَالنِّعْمَةِ)، وشەی (ذَوْق) بریتیە لە تامی شتێك كە لە زار دابێ، بەمەرجێك كەم بێ، لێی چێژت، یانی: تۆزێكی لێ خوارد، وشەی (ذَوْق) هەڵبژێردراوە بۆ هەركام لە سزادان‌و ئازارو، بۆ نیعمەت‌و خۆشیی، (واتە: خوازراوەتەوە، ئەگەرنا لە بنچینەدا وشەی (ذَوْق) بە واتای چێژتنی شتێكە بە زار).

(ضَرَّاءَ ): (الضَرَّاءُ: عَكْسُ السَّرَّاءِ والنَّعْمَاءِ، كَمَا أَنَّ الضُرَّ عَكْسُ النَّفْعِ)، وشەی (ضَرَّاء) پێچەوانەی (سَرَّاء)و (نَعْمَاء)ە، (سَرَّاء)، واتە: خۆشیی (نَعْمَاء) واتە: لەززەت‌و چاكە، هەروەك چۆن (ضَرّ) پێچەوانەی (نَفْع)ە، واتە: زیان‌و سوود.

(مَكْرٌ ): (المَكْرُ: صَرْفُ الغَيْرِ عَمَّا يَقْصِدُهُ بِحِيلَةٍ)، (مَكْر) بریتیە لەوەی كە تۆ یەكێكی دیكە لەو مەبەستەی دەیەوێ، لابدەی، بەڵام بە فێڵێك‌و بە پلانێك.

(يُسَيِّرُكُمْ ): واتە: هاتووچۆتان پێ دەكات، (السَّيْرُ: المُضِيُّ فِي الأَرْضِ)، (سَيْر) واتە: ئەوە كە ئینسان بە زەویدا بڕوات، (يُسَيِّرُكُمْ )، واتە دەتانڕوێنێ، هاموشۆتان پێدەكات.

(الْفُلْكِ): (الفُلْكُ: السَّفِينَةُ يُستَعْمَلُ لِلْوَاحِدِ والجَمْعِ)، وشەی (فُلْك) بە واتای كەشتیی دێ، كە بۆ تاك بەكاردێ، وە بۆ كۆش بەكاردێ، واتە: بە كەشتییەك دەگوترێ: (فُلْك)، بە كۆمەڵە كەشتییەكیش هەر دەگوترێ: (فُلْك).

(وَجَرَيْنَ بِهِم ): واتە كەشتییەكان بردیانن، (الجَرْيُ: المَرُّ السَّرِيعُ)، (جَرْي)، واتە: ڕۆیشتنێكی خێرا.

(رِيحٌ عَاصِفٌ): واتە: بایەکی توندی تێکشکێنەر، دەڵێ: (رِيحٌ عاصِف وَعاصِفَةٌ وَمُعْصِفَةٌ: تَكْسِرُ الشيء فَتَجْعَلُهُ كَعَصْفٍ)، دەگوترێ: (رِيحٌ عاصِف وَعاصِفَةٌ وَمُعْصِفَةٌ)، هەرسێکیان، واتە: بایەك کە شت دەشکێنێ، وەك پووش و پەلاش و کاو کۆتی تێکشکاوو شێلدراو، کە گێرە دەکرێ.

(ٱلْمَوْجُ): واتە: شەپۆل، کۆیەکەی (أَمْوَاج)ە، شەپۆلەکان.

(أُحِيطَ بِهِمْ): واتە: دەورە دران، ئابلۆوقە دران، واتە: هیچ ڕێی هەڵاتنیان نییە.

(مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ): واتە: گەردنکەچییتان بۆ خوا ساغ کردۆتەوە، وشەی (مُخْلِص) لەسەر کێشی (مُفْعِل)ە، (اسْم فَاعِل)ە، (أَخْلَصَ، يُخْلِصُ، إِخْلاَصاً، فَهُوَ مُخْلِص)، (مُخْلِص) واتە: دەربازکەر، کەسێك کە گەردن کەچییەکەی خۆی دەرباز کردبێ، لەوەی کە هیچ پشك و بەشی غەیری خوای تێدا بێ، هەمووی بۆ خواو ساغ کردبێتەوە، یان کەسێك کە دینداریی و مسوڵمانەتیی خۆی ساغ دەکاتەوە بۆ خواو بەشی غەیری خوای پێوە ناهێڵێ، ئەوە پێی دەگوترێ : مسوڵمانێکی (مُخْلِص)و، کردەوەکەی پێی دەگوترێ : (إِخْلاَص).

(يَبْغُونَ): واتە سنوورشکێنیی دەکەن، (البَغِيُ: طَلَبُ تَجَاوز الإِقتِصَاد فِيمَا يُتحَرَّى) واتە: ئەسڵی وشەی (البَغي) واتە: خواستنی تێپەڕاندنی میانجێتیی لەوەدا کە خەفتانی تێدادەکرێ (هەندێکیش بە مانای (حَسَد) یان لێکداوەتەوە، چونکە حەسوودییش بریتییە لە سنوور شکاندن و لە خەت دەرچوون).

(مَّتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا): (المَتَاعُ: كُلُّ مَا يُنْتَفَعُ بِهِ عَلَى وَجْهٍ مَا، فَهُوَ مَتَاعٌ وَمُتْعَةٌ) وشەی (مَتاع) هەر شتێکە کە بە شێوەیەك لە شێوەکان سوودو کەڵکی لێوەربگیرێ، (مَتَاع)، شتێکە کە کەم بخایەنێ، واتە : گوزەرانێکی کەم.

( زُخْرُفَهَا ): (الزخرف: الزينة المزوّقة)، (زخرف) بریتیە لە جوانییەك لە ئەنجامی دەستکاریی ئینساندا، وەك چۆن هەندێ شت نەخش و نیگاری لێدەکرێ و دەرازێنرێتەوە، بەڵام (زینة) ئەوەیە شتەکە لە ئەسڵدا بۆخۆی جوان بێ، واتە: جوانیی خوارسك، بەڵام (زخرف) بریتیە لە جوانییەکی بەدەستکاریی، بۆیە عەرەب گوتوویانە: (لَيْسَ الكَحْلُ كَالتَّكَحّل)، واتە: کەسێك کە چاوی ڕەش و جوان بێ، وەك ئەوە نیە کە بەهۆی کلەوە ڕەشی دەکات.

( وَٱزَّيَّنَتۡ ): (أَصْلُهُ تَزَيَّنَتْ فَأُدْغِمَ التاء في الزاي)، وشەی (وَٱزَّيَّنَتۡ ) یانی: (وتزيَّنَتْ) واتە: خۆی ڕازاندەوە، کە دوایی (ت)یەکە لە (ز)یەکەدا دەغم کراوەو بۆتە (وَٱزَّيَّنَتۡ ).

(حَصِيدًا ): (حَصَدَ الزَّرْعَ: قَطَعَهُ، فَهُوَ مَحْصُود)، (حَصِيد، وَحَصِيدَة، وَحَصَدْ)[1]، هەموویان بە یەك واتا دێن، (حصید) واتە: پەرێز، یاخود کشتوکاڵێك کە هەڵگیراوەتەوە، حاصەڵاتێك، دانەوێڵەو دەغڵێك کە دروێنە کراوە، دەگوترێ: (حَصَدَ الزَّرْعَ) واتە: بڕی، درەوی کرد، (مَحْصُود، حَصِيد، وَحَصِيدَة، وَحَصَدْ) هەر چواریان بە مانای دانەوێڵەیەك، یاخود سەوزەیەك دێن، کە دروابێتەوە، یانی: حاصەڵاتەکەی هەڵگیرابێ.

( لَّمۡ تَغۡنَ بِٱلۡأَمۡسِ ): واتە: وەك دوێنێ لەوێ نەبووبێ، لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: (غَنِيَ بالمكان) واتە: لەو شوێنە مایەوە، واتە: وەك پەرێزێکی ڕووتی لێبێ، وەك دوێنێ هیچی لێ نەبووبێ.

( وَلَا يَرۡهَقُ ): (رَهِقَهُ الأمْر: غَشِيَهُ بقَهْرٍ)، (رَهِقَهُ) واتە: بە زۆر چووە سەر سەرو گوێلاکی، دەگوترێ: (رَهِقْتُهُ وَأَرْهَقْتُهُ) هەردووکیان بە یەك مانا دێن، کە لێرەدا

---

١) مختار صحاح، ص١٣٩.

(وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ) واتە: تلْخیی‌و ڕەشیی‌و زەبوونیی دەموچاویان داناپۆشێ‌و داناگرێ.

(قَتَرٌ): (القَتَرُ وَالقُتَارُ: الدُّخَانُ السَاطِعُ مِنَ الشِّوَاءِ وَالعُودِ وَنَحْوِهِمَا)، (قتَر)و (قُتار) بەو دووکەڵە دەگوترێ لە کاتێك دا گۆشت دەبرژێنرێ، یاخود دارێك دەسووتێنرێ‌و دووکەڵی لێ بەرز دەبێتەوە، بە وێنەی ئەوانە دەگوترێ.

(عَاصِمٍ): (العَصْمُ: الإِمْسَاكُ، لا عَاصِمَ: لا شَيءَ يَعْصِمُ مِنْهُ)، (عَاصِم) واتە: پارێزەر، (عَصْم) بریتیە لە گرتنی شتێك کە بیپارێزی، (لا عَاصِمَ)، واتە: هیچ پارێزەرێك ئەو شتە لەو ناپارێزێ.

(فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ)، واتە: لێکمان جیا کردنەوە، (تَزَيَّلوا) واتە: (تَفَرَّقُوا)، (زِلْتُ الشيءَ مِنْ مَكَانِهِ، وَزَيَّلَهُ: فَرَّقَهُ) واتە: ئەو شتەم لە شوێنی خۆی لادا، وە (زَيَّلَهُ) واتە: جیای کردەوە، پەرتەوازەی کرد.

(تَبْلُواْ): (بَلاهُ: جَرَّبَهُ وَاخْتَبَرَهُ، يَبْلُوهُ)، واتە: ئەو شتەی تاقیکردەوە جەڕباندی، ﴿هُنَالِكَ تَبْلُواْ كُلُّ نَفْسٍ مَّآ أَسْلَفَتْ﴾، هەموو کەسێك دەزانێ چی پێشخستوە، بۆی دەردەکەوێ دەیجەڕبێنێ پەرێزی خۆی دەبینێ.

(مَّآ أَسْلَفَتْ): (السَّلَفُ: مَا قُدِّمَ مِنَ الثَّمَنِ عَلَى المَبِيعِ)، (سَلَف) بەوە دەگوترێ کە پێش ئەوەی فرۆشراوەکە وەربگیرێ، پارەکەی درابێ، ئەو پارەیەی کە دەدرێ، پێش ئەوەی فرۆشراوەکە وەربگیرێ.

(وَضَلَّ): واتە (ضاع، فقد) وە بە مانای (عَدَلَ عَنِ الطَّرِيق)یش دێ، (ضَلَّ) دوو واتای هەن :

١) بە مانای بزربوو، ونبوو. ٢) بە مانای لایدا، گومڕابوو، دێ.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ هەر لە درێژەی ئەو ئایەتانەدا کە باسی هەڵوێستی مرۆڤەکان دەکەن بەگشتی، بەتایبەت ئەوانەیان کە سەرەخەرییو، لاساریی دەکەن لە بەرانبەر پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام)و، وەڵامی بانگی خوای پەروەردگار نادەنەوەو، بەدەم بانگەوازی خوای میهرەبانەوە نایەن، بە زۆریی ئەم دە (١٠) ئایەتە باسی هەڵوێستی ئەوانو، پێچەوانەی ئەوانیش، دەکەن، واتە: ئەهلی ئیمان، ئەوانەی کە چاکەکار بوونو وەڵامی بانگەوازی خوای پەروەردگاریان داوەتەوە، بەڵام بەکورتیی.

سەرەتا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ مِّنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُمۡ إِذَا لَهُم مَّكۡرٞ فِيٓ ءَايَاتِنَا﴾، وە کاتێك بەزەییەکی خۆمان بە خەڵك چێژت، دوای ناخۆشییەك کە تووشیان بووە، دەیانبینی کتوپڕ، خەریکی پیلانگێڕیین لە دژی ئایەتەکانی ئێمە، واتە: لە جیاتی شوکرانە بژێریی‌و سوپاسگوزاریی‌و بە ئەمەگیی، بە پێچەوانەوە: خەریکی پیلانگێڕیی‌و فرت‌و فێڵن لە دژی ئایەتەکانی ئێمە، ئایەتەکان واتە: ئەو پەیامەی کە خوا بە پێغەمبەران دا، صەڵات‌و سەلامی خوایان لەسەر بێ، دەینێرێ، کە عەقڵ‌و مەنتیق وا دەخوازێ، مادام ئەو خوایە ﷻ ڕەحمەتی خۆی بە ئێوە چەشتوەو چاکەی لەگەڵ ئێوەدا کردوەو، ئەو هەموو نازو نیعمەتەی بە ئێوە داوە، پێویستە ئێوەش وەڵامگۆی ئایەتەکانی ئەو بن‌و، بەدەم بانگەوازەکەیەوە بچن، بەڵام ئەوان پێچەوانەکەی دەکەن، بۆیە دەفەرموێ : ﴿قُلِ ٱللَّهُ أَسۡرَعُ مَكۡرًا﴾، بڵێ: نەخشەو پلانی خوا خێراترە، واتە: بۆ سزادانی ئێوە، بۆ پەلکێشکردنی ئێوە بەرەو گوناهو تاوانی زیاتر، تاکو شایستەی سزای توندتر بن، ﴿إِنَّ رُسُلَنَا يَكۡتُبُونَ مَا تَمۡكُرُونَ﴾، بێگومان ڕەوانەکراوەکانی ئێمە، ئەوەی کە ئێوە وەك پیلان‌و فێڵ دەیکەن، ئەو فێڵ‌و تەڵەکەیەی کە سازی دەکەن، لە دژی ئایەتەکانی خواو پەیامی خوا، هەمووی تۆمار دەکەن.

ئەوە هەڕەشەیە، چونکە: مادام تۆماری دەکەن، کەواتە: ئەو کردەوە خراپانەو پیلانگێڕییە، دێتەوە ڕێتانو، سزای لەسەر وەردەگرن.

پاشان خوا ﷻ باسی هەڵوێستی کەسانی بێبڕوا دەکات، کەسانێك کە بێ سفەتن بەرانبەر بە خوا، سپڵەو بێ نمەکن، لە بەرانبەر خوادا: خوا چییان بۆ دەکات، کەچی ئەوان لە بەرانبەردا، چۆن سپڵەو بێ وەفایانە ڕەفتار دەکەن ؟!

دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ ﴾، ڕووی دواندن دەگونجێ لە هەموو مرۆڤایەتیی بێ، چونکە خوای بەخشەر هۆکارەکانی هاتووچۆی وشکانییو دەریایی بۆ هەموو مرۆڤەکان ڕەخساندوون، بەڵام بەپێی سیاقو بە سەرنج دانی کۆی ئایەتەکان، بۆمان دەردەکەوێ کە لێرەدا ڕووی دواندن، لە مرۆڤە بێبڕواو کافرو هاوبەش بۆ خوا دانەرو بێ ئەمەگەکانە، ئەگەرنا، ئەگەر تەماشای کۆی ئایەتەکان نەکەین، دەڵێین: ڕووی دواندن لە هەموو مرۆڤایەتییە، چونکە خوای پەروەردگار هۆیەکانی هاتووچۆی وشکانییو دەریایی بۆ هەموو مرۆڤەکان ڕەخساندوون، دەفەرموێ: خوا ئەو کەسەیە کە ئێوە دەڕوێنێ، واتە: ڕۆیشتنتان پێ دەکات، یاخود هاتوچۆو هاموشۆتان پێ دەکات، لە وشکانییو لە دەریادا بە چی هاموشۆیان پێدەکات؟ دیارە بە ڕەخساندنی هۆکارەکانی هاتووچۆ، کاتی خۆی وڵاخو کەرو هێسترو حوشترو ئەوانە بوون، لە وشکانیی دا، کەڵەكو بەلەمو کەشتی چارۆکەدارو ئەوانە بوون لە دەریادا، بەڵام ئێستا جگە لە جۆرەکانی هامووشۆی وشکانییو دەریا، هەواشی هاتۆتە سەرێو زۆر زیاد بوون.

هەڵبەتە لێرەدا کە دەفەرموێ: هۆیەکانی هامووشۆی بۆ ڕەخساندوون، یانی: توانای داونێ کە هۆیەکانی هامووشۆ دروست بکەن، بۆیە ئەگەر یەکێك بڵێ: سەیارە مرۆڤ دروستی کردوە هەروەها فڕۆکەو کەشتییو شەمەندەفەرو چیو چی؟ دەڵێین: ڕاستە، بەڵام چۆنو بە چی دروستی کردوون؟

یەکەم : بەو عەقڵو هۆشە کە خوا پێی داوە.

دووەم : لەو کەرەستەو ماددانە کە خوای باڵادەست خستوونیە بەردەستی.

ئنجا بۆیەش خوای پەروەردگار هەموو نیعمەتەکان دەگێڕێتەوە بۆ خۆی، چونکە حەقیقەت وایە.

ئنجا ئەوە هەمووی ڕوویەکی مەسەلەکەیە، ڕوویەکی دیکە ئەوەیە کە ئەسڵەن ڕۆیشتن بە نێو ئاودا، دابنێ ئاو وەك گڵ بووایە، چۆن کەشتیی لەسەری دەڕۆیشت؟ یان دابنێ وشکانیی وەك ئاو بووایە، چۆن وڵاخو سەیارە بەسەریدا دەڕۆیی؟ یان دابنێ هەوا وەك ئاو بووایە، یان هەوا وەك خاك بووایە، چۆن تەیارە تێیدا دەفڕی؟ کەواتە: خوا ﷻ سروشتی هەر کام لە هەواو ئاوو خاکی بە شێوەیەك هەڵخستوە، کە هەر کامێکیان بە کەڵکی جۆرێك لە بەنێودا ڕۆیشتن‌و لەسەر ڕۆیشتن بێ، هەرچەندە زۆر کەس بیر لەوە ناکاتەوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ ﴿٢٢﴾﴾، هەتا کاتێك کە ئێوە چوونە نێو کەشتییەکانەوەو، کەشتیەکان پێیان ڕۆیشتن، (لێرەدا لە شێوەی دواندنەوە، دەیگۆڕێ بۆ نادیار (غائب)، چونکە پێشێ نیزیکن لە وشکانییەوەو، خوای پەروەردگار ئاوا دەیاندوێنێ، دوایی کە دەچنە نێو کەشتییەکە، دوور دەکەونەوە، بۆیە ڕاناوی نادیار (غائب)یان بۆ بەکاردێنێ) ﴿وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ﴾، کەشتییەکان ڕواندیانن، پێیان ڕۆیشتن سەفەریان پێکردن، بە چی؟ (بريح طيبة) بە بایەکی گونجاو، کاتی خۆی دیارە هەر کەشتیی چارۆکەدار هەبووە، کە بە با ڕۆیشتوەو، جار جار ئەگەر سەوڵەشیان لێدابێ زۆر بە کەمیی، بەڵام ئێستا هەرچەندە کەشتییەکان بە ماددەی دیکە کار دەکەن، بەڵام دیسان (با)ی گونجاو بۆ کەشتییەکان هەر پێویستە، کەسێك حاڵی دەبێ لە (با)ی نەگونجاو کە سواری کەشتیی بووبێ، لە دەریادا شەپۆڵی گەورە گەورە ڕووی تێکردبن، بەقەدەر کێو، ئەوجار لێی حاڵی دەبێ کە (با)ی نەگونجاو چەند بەڵایە کاتێ بە ملت دادێ، با ڕۆیشتنی کەشتییەکە بە گازوایل بێ، یان خەڵووزی بەردبێ، یان کارەبا بێ، ... هتد، بەڵام دیسان هەبوونی بای گونجاوو تەبا، لەگەڵ ڕێڕەوی کەشتییەکەدا، زۆر

نیعمەتێکی گەورەیە، هەروەك بە پێچەوانەشەوە : بای پێچەوانەو بای دژ، بە ئاراستەی کەشتییەکە، زۆر بەڵایەکی گەورەیە، زۆرجار کەشتییەکان بەهۆی ئەوەوە غەرق دەبن.

دەفەرموێ: کە بە شنە بایەکی موناسبو گونجاو دەڕۆن، کەشتییەکان دەیانبەن، ئەوانیش زۆر دڵخۆش دەبن، بەڵام هەر ئەوەندە دەزانن، ﴿ جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ ﴾، بایەکی توندی تێکشکێنەریان بۆ دێ، ﴿ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ ﴾، (وە بایە بەهێزەکە کە هەڵدەکات، دەریا هەمووی دەبێتە شەپۆلو) لە هەموو لاوە شەپۆل ڕوویان تێ دەکات.

ئێمە جارێك ـ لە ساڵی ١٩٩٨ ز دا ـ لە دوورگەی (مالطا)وە دەچووین بۆ (بەنغازیی) لە (لیبیا) کە نیزیکەی نۆزدە (١٩) سەعات ڕێیە، کەشتییەکەمان کە حەوت قات بوو، دەوری (دوو) (سێ) هەزار کەسی تێدا بوو، کاتێك ئەو شەپۆلە گەورانە دەهاتنو کەشتییەکە لووتەکەی ڕۆ دەچوو، دەمانگوت: تازە نغرۆ دەبێو تاکو بنی دەریا گیر نابێ، دوایی هەڵدەستایەوە، کە دەکەوتە سەر لای ڕاست، دەمانگوت: تازە بەولادا نغرۆ دەبێ، کە دەکەوتە سەر لای چەپ، کە شەپۆل لە پێشەوەڕا دەهات، بە پشتەوەدا دەشکا، دەمانگوت: تازە بە پشتەوەدا دەشکێ، مەترسییەکی گەورە بوو، بەڵام خوای میهرەبان دەربازی کردین.

بەڵێ کەسێك دەزانێ کە شەپۆل چۆن لە هەموو لاوە دێ، کە سەفەری دەریای کردبێ.

ئنجا دوای ئەوەی شەپۆل لە هەموو لاوە ئابڵووقەیان دەدات، ﴿ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ ﴾، گومانیان وا بۆ دروست دەبێ، قەناعەتی ئەوەیان بۆ دروست دەبێ کە دەوریان دراوە، واتە: تازە تەواو کۆتاییان دێ، لەو کاتەدا ﴿ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾، لە خوا دەپاڕێنەوەو، ملکەچیو گەردنکەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ

دەکەنەوە، واتە: بەشی غەیری خوایان پێوە نامێنی، بتو صەنەمو پەرستراوی دیکە هیچی نامێنێ، بۆچی؟ چونکە دەزانن بێجگە لە خوا ﷻ کەسی دیکە لەو تەنگانەیەدا، لە فریایان نایەت.

کەواتە: وشەی (دین) لێرەدا بە مانای (ئیسلام) نیە، بەڵکو بە مانای ملکەچیی‌و طاعەتە، بە مانای لێپاڕانەوەو تەسلیم بوونە.

ئنجا کە گەردنکەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ دەکەنەوەو چی دەڵێن؟ ﴿لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾، ئەگەر لە ئا ئەمە واتە: لەم بەڵاو فەرتەنەو دژواریی‌و سەغڵەتییە، دەربازمان بکەی، بە (ل)ی قەسەم، بە (ن)ی تەئکید، دەڵێن: هیچ گومانی تێدا نیە، بە جەخت کردنەوە، ئێمە لە شوکرانە بژێران‌و لە سوپاسگوزاران دەبین بۆ تۆ، ﴿فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمْ إِذَا هُمْ يَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ﴾، کەچی دوای ئەوەی دەربازی کردن، دەیانبینی بە ناهەق لە زەوییدا سنوورشکێنیی دەکەن، دەچنەوە سەر بەزمی پێشێیان.

ئنجا خوا بانگیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُم﴾، ئەی خەڵکینە! ئەو سنوورشکێنیی‌و سنوور بەزێنییە، زیانەکەی بۆ خۆتانە، زیان لە خۆتان دەدەن، ﴿مَّتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾، ئەوە ڕابواردنێکی کەمی ژیانی دنیایە، واتە: ژیانەکەی ئێوە، ڕابواردنیکی کەم‌و گوزەرانێکی کەمە، ئەوە ناهێنێ کە لەسەر ئەو کەمە زیانە، خوا لە خۆتان بڕەنجێنن‌و، تووڕەی بکەن، ﴿ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُكُمْ﴾، دوایی گێڕانەوەتان هەر بۆ لای ئێمەیە، بۆ لای کەسی دیکە ناچنەوە.

هەرکات (الجار والمجرور) پێشخرا، کورت هەڵێنان دەگەیەنێ، ﴿فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، هەواڵتان پێ دەدەین بەوەی کە دەتانکرد، ئەوەت کردو ئەوەت نەکردو، ئەوەت وابوو، ئەوەت واچوو، کەواتە: خۆتان هەڵگرن بۆ ئەو ڕۆژە، مادام ئەو دیدارە هەیە، بزانن بە چ چاوو ڕوویەکەوە دەچنە خزمەت خوا!

دوای خوای پەروەردگار وێنەیەك دێنێتەوە، بۆ ژیانی دنیا، ﴿إِنَّمَا مَثَلُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلْأَنْعَٰمُ﴾ وێنەی ژیانی دنیا هەروەك ئاوێکە کە لە سەرێوە ناردوومانەتە خوار، بە هۆی ئەو ئاوەوە ڕووەکی سەر ڕووی زەوی تێکەڵ بە یەك بووە، واتە: ئەو کشتوکاڵە دەڕوێ، وە پێکدا دەچێ‌و تێکەڵ دەبێ، ﴿مِمَّا يَأْكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلْأَنْعَٰمُ﴾، لەوەی کە خەڵکیش‌و ئاژەڵیش دەیخۆن، واتە: هەم لەوەڕگاکان پێکدا دەچن‌و چڕو پڕ دەبن، هەم ئەوەی خەڵك دەیخوات، کە دانەوێڵەیە: گەنم‌و جۆو هەرزن‌و نیسك‌و نۆك‌و برنج‌و باقی دانەوێڵەکانی دیکەو، سەوزەیەو، میوەجات، هەموو ئەوانە بەو ئاوە دەڕوێن‌و، چڕو پڕ دەبن‌و تێکەڵ دەبن، ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلْأَرْضُ زُخْرُفَهَا﴾، هەتا کاتێك کە زەوی جوانییەکەی خۆی وەردەگرێ، چۆن ئافرەتێك، بووکێك، ئەگەر زێڕیشی نەبێ جلی جوانیشی نەبێ، ئافرەتەکە بیەوێ خۆی بڕازێنێتەوە، لە یەکێکی دیکەی وەردەگرێ، زەوییش جوانیی خۆی وەردەگرێ‌و خۆی دەڕازێنێتەوە، ﴿وَٱزَّيَّنَتْ﴾، یانی : تەواو دەڕازێتەوە، کە مەبەست پێی کشتوکاڵ‌و ڕووی زەوییە، کە دەڕازێتەوە بە کشتوکاڵ‌و بە سەوزەو میوەجات‌و بەوانەی کە بە ئاو دەڕوێن، ﴿وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَٰدِرُونَ عَلَيْهَآ﴾، وە خەڵکەکەی، (واتە: خاوەنی ئەو پارچە زەوییە)، پێیان وایەو قەناعەتیان وا دەبێ، کە توانایان بەسەریدا هەیە، دەڵێن: ئەوە کشتوکاڵەکەمان پێگەیی، بەرهەم‌و حاصەڵاتەکە هەڵدەگرینەوە.

ئا لەو کاتەدا، ﴿أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا﴾، فەرمانی ئێمەی بۆ هات، بە شەو یان بە ڕۆژ، واتە: فەرمانی لە بەینچوونی، فەرمانی سەر بە فەتارەت چوونی، ئەو کشتوکاڵ‌و بەروبوومە، ﴿فَجَعَلْنَٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِٱلْأَمْسِ﴾، کردمان بە پەرێزێ، وەك دوێنێ نەبووبێ، وەك دوێنێ هیچی لێ نەڕوا بێ، بوو بە پەرێزێکی

سوورو سەقەتاڵ، ﴿ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأَيَٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾، ئاوا ئایەتەکان ڕۆشن دەکەینەوە، بۆ کۆمەڵێك کە بیر بکەنەوە، ئەمما ئەوەی بیر نەکاتەوە بێگومان هیچ سوود، لە ئایەتە ڕۆشنەکانی خوای پەروەردگار، وەرناگرێ.

هەڵبەتە دەشگونجێ مەبەست لەم ئایەتە موبارەکە، گۆی ژیانی دنیا بێ، نەك تەنیا پارچە زەوییەك کە کەسانێك دەیکەن بە دانەوێڵەو سەوزایی و میوەجات.

واتە: دوای ئەوەی خەڵکی بێ بڕوا تەماعیان پەیدا دەبێ، کە دنیا لە ژێر تواناو ڕکێفی خۆیان دایەو، بەسەری دا باڵادەستن، بەڵایەکی خوا لێی بداتو، ببێتە پەرێزێکی ڕووت، کە هیچی لێ نەمێنێ.

دوایی خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢٥﴾ ﴾ وە بێگومان خوا خەڵك بانگ دەکات بەرەو مەنزڵگای ئاشتیی، هەر کەسێکیشی بیەوێ، دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێ.

لێرەدا وشەی (هدایة) دەبێ بڵێی: (خستنە سەر ڕاستە ڕێ)، نەك ڕێ پێشاندان، چونکە خوا ﷻ لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴾، وە هەر کەسێکی بوێ، هیدایەتی دەدات، بەڵام ئاشکرایە کە ڕێ پێشاندانەکەی خوا، خوا ویستوویەتیو تێپەڕیوە وەك فەرموویەتی: ﴿ وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ ﴾آل عمران، ﴿ ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ ﴾یوسف، قورئان کە خوا ناردوویەتی، هیدایەتی خوایەو، ویستوویەتیو وەك ڕێنمایی ناردوویەتی بۆ هەموو خەڵك، بەڵام: ئەم هیدایەتەی ئێرە جۆری دووەمی هیدایەتەو هیدایەتێکی تایبەتە، واتە: خستنە سەر ڕێ، خستنە سەر ڕاستە ڕێ، ئەوەش لوتفێکە خوای پەروەردگار لەگەڵ ئەو بەندانەدا دەیکات کە شایستەن، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ زَادَهُمْ هُدًى ﴿١٧﴾ ﴾محمد، وە ئەوانەی کە هیدایەت دراونو ڕێی خوایان گرتوە، خوا ڕێنماییان بۆ زیاد دەکات، سەر ڕاستییان بۆ زیاد دەکات.

پاشان خوا باسی پاداشتی ئەوانە دەکات، کە دەیانخاتە سەر ڕاستە ڕێی خۆی‌و، شایستەی ئەومن، دەفەرمویٚ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ﴾، بۆ ئەوانەی کە چاکەیان کردوە، پاداشتی هەرە چاکتر هەیەو زێدەش لەوە، ﴿وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ﴾، وە دەمو چاویان نە تلٚخیی‌و ڕەشیی خەمو خەفەت‌و پەژارە دایدەپۆشیٚ، نە زەبوونیی‌و مەینەتیی، ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ﴾، ئەوانە هاوەڵی بەهەشتن‌و، بە هەمیشەیی لە بەهەشتی خوادا دەمێننەوە.

دوایی دەفەرمویٚ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَسَبُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾، بەڵام ئەوانەی کە خراپەکانیان وەدەست هێناوە، (کە بە تەئکید خراپە وەدەست هێنان‌و، گوناحکردن، کاسبییەکی زۆر خراپە) ﴿جَزَآءُ سَيِّئَةٍۭ بِمِثْلِهَا﴾، هەر خراپەیەك سزایەکەی بە قەدەر خۆیەتی، ﴿وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ﴾، وە زەبوونیی دایاندەپۆشیٚ، زەبوونیی، ماتەمینیی لە دەمو چاویان دەنیشیٚ، ﴿مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ﴾، هیچ پارێزەرێك نیە لە سزای خوا بیانپارێزیٚ ﴿كَأَنَّمَآ أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مُظْلِمًا﴾، وەك ئەوە وایە دەموچاویان، بە چەند پارچەیەك لە شەوی تاریك داپۆشرابن، وەك ئەوە وایە: شەوی تاریك، پارچە قوماشێکی ڕەش بیٚ، چەند پارچەیەکی لیٚ ببڕیٚ‌و بیانخەیە سەر یەك، ئنجا بە دەمو چاویانەوە بنێی، دەموو چاویان ئاوا تلٚخ‌و تاریك بووە، لە هەژمەتان‌و لە خەمو خەفەتان‌و لە پەشێمانییان، ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ﴾، ئا ئەوانە هاوەڵی ئاگرن، (ئاگری دۆزەخ) تێیدا دەمێننەوە.

چەند جارێکی دیکەش گوتوومانە: وشەی (صاحب) کە کۆیەکەی (أصحاب)ە، دەگونجیٚ بە مانای خاوەن بیٚ، دەشگونجیٚ بە مانای هاوەڵ بیٚ، ئنجا ئینسان چ خاوەنی ئاگر بیٚ، چ هاوەڵی بیٚ، هەر خراپە، هەر وەك چ خاوەنی بەهەشت بیٚ، چ هاوەڵی بەهەشت بیٚ، هەر چاکە.

ئنجا خوا ﷻ دیمەنێكی قیامەتیان دەخاتە بەرچاو، دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا مَكَانَكُمْ أَنتُمْ وَشُرَكَاؤُكُمْ ﴾، وە ئەو ڕۆژە كە هەموویان كۆدەكەینەوە، (مەبەست پێی ڕۆژی لێپرسینەوەو سزاو پاداشتە، ڕۆژی حەشرو حیسابە) دوایی بەوانەی كە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، دەڵێین: بوەستن خۆتانو هاوبەشەكانتان، واتە: ئەوانەی كە لە وەهمو خەیاڵی ئێوەدا هاوبەشی خوا بوون، ئەگەرنا خوا هاوبەشی نین، ﴿ فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ ﴾، لێكمان ترازاندن، لێكمان دوور خستنەوە، ئەوانەی پەرستار بوونو بەندایەتییان كردوەو، ئەوانەش كە پەرستراو بوون، ﴿ وَقَالَ شُرَكَاؤُهُم مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا تَعْبُدُونَ ﴾، (شركاء)، واتە: ئەوەی كە لە خەیاڵو وەهمی ئەواندا هاوبەشی خوا بوون، ئەگەرنا خوا هاوبەشی نین، واتە: ئەوانەی كە بە هاوبەش دانرا بوون، بەوانەیان گوت: كە پەرستبوویانن: ئێوە ئێمەتان نەدەپەرست، ئنجا ئەو بە هاوبەش بۆ خوا دانراوانە، ئەو پەرستراوانە، چ بتو صەنەم بن، چ مارو مشك بن، چ گاو مانگا بن، وەك لە هیندستانو لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا هەیە، چ خۆرو مانگو ئەستێرە بن، چ پیاوچاكان بن، چ فریشتەكان بن، هەر كامێكیان بن، حاشایان لێ دەكەن، دوایی دەڵێن: ﴿ فَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ إِن كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَافِلِينَ ﴾، خوا بەسە شایەد بێو چاودێر بێ لە نێوان ئێمەو ئێوەدا، كە ئێمە لە پەرستنتان بۆ ئێمە، بێئاگا بووین، ڕازی نەبووین.

دیارە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و پیاوچاكانو ئەوانەی كە نەزانەكان لێیان دەپاڕێنەوەو، وەك پەرستراو (معبود) مامەڵەیان لەگەڵدا دەكەن، بە تەئكید ئەوان ڕازیی نەبوونو، وە بێئاگا بوون، عیسا (علیه السلام) دوای خۆی كە دەپەرسترێو، پێغەمبەرانی دیكەشو، پیاوچاكانی دیكەو، فریشەكان.

بەڵام ئەوانەی دیكە، كە دارو بەردو مانگو خۆرو ئەستێرەو ئەوانەن، بێگومان كە ئاگایان لە هیچ شتێك نیە.

جا دەفەرموێ: ﴿هُنَالِكَ تَبْلُواْ كُلُّ نَفْسٍ مَّآ أَسْلَفَتْ﴾، لەو ڕۆژەدا هەموو کەسێك دەزانێ چی پێشخستوە، بۆی دەردەکەوێ، (تَبْلُواْ) واتە: (تَخْتَبِرُ)، دەیجەرِبێنێو بۆی ئاشکرا دەبێ، هەروەك خوێنراویشەتەوە : (تَتْلوا كل نفس)، هەر نەفسێك چی پێش خستوە، لە کردەوە، دوای ئەوە دەکەوێ، واتە: مەحکوومی کردەوەکەی خۆیەتی، وەك لە سوورەتی (المدثر)دا دەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ٣٨﴾، هەر کەسە بارمتە (رهن)ی کرەوەکانی خۆیەتی، چی کردبێ، بە پێی کردەوەکەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکـــــــرێ، ﴿وَرُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾، وە گێڕرانەوە بۆ لای خوا، سەرپەرشتیاری هەقیانو، ئەوەی کە هەڵیاندەبەست بە ناوی خواوە، یاخود وەك هاوبەشی خوا، یان وەك پەرستراو مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد، ئەوانە هەموویان ون بوون، زایە بوونو، بێسەرو سۆراغ بوون.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ مِّنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُمۡ إِذَا لَهُم مَّكۡرٞ فِيٓ ءَايَاتِنَاۚ قُلِ ٱللَّهُ أَسۡرَعُ مَكۡرًاۚ إِنَّ رُسُلَنَا يَكۡتُبُونَ مَا تَمۡكُرُونَ ٢١ ﴾

### چوار هەڵوەستەیەك لەبەردەم ئەم ئایەتەدا :

**هەڵوەستەی یەکەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ ﴾، زانایانی شارەزای زمانی عەرەبی دەڵێن: ئەم (إِذَا )یە، (إِذَا )ی (شرطية)یە، واتە: وە هەر کات بەزەییەکی خۆمانمان بە خەڵك چێژت، واتە: نیعمەتێکی خۆمانمان پێدان، وە بەهرەمەندمان کردن، بەڵام لێرەدا وشەی (ذوق)ی بەکارهێناوە کە پێشتر گوتوومانە : وشەی (ذوق) چێژتنو تامکردنی شتێکە بە زمان، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ بەهرەمەندبوونی ئینسان لە نیعمەتەکانی خوای بەخشەر.

کە دەفەرموێ: ﴿ رَحۡمَةٗ ﴾، ڕەحمەتیش دیارە سیفەتی خوای بەخشندەیەو حاڵەتێکی مەعنەوییە، دیسان ئەمیش خوازراوەتەوە بۆ نیعمەتەکان، چ نیعمەتی ماددیی بن، چ نیعمەتی مەعنەویی بن، چونکە نازو نیعمەتو چاکەکان، بەرجەستەکەری بەزەییو میهرەبانییو بەخشندەیی خوای پەروەردگارن.

**هەڵوەستەی دووەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ مِّنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُمۡ ﴾، لە دوای ناخۆشییەك کە تووشیان بووە (ضَرَّآءَ )، پێچەوانەی (نَعۡمَاء)ە.

(مَسَّتۡهُمۡ)، واتە: تووشیان بووە، هەڵبەتە (مَسّ)، ئەوەیە کە شتێك بە شتێك بکەوێ، لێرەدا دیسان، ئەم وشەیەش خوازراوەتەوە بۆ ئەوە کە ئینسان تووشی گرفتێك، بەڵایەك، ناخۆشییەك، دەردەسەرییەك، دەبێ.

<u>هەڵوەستەی سێیەم</u>: ﴿إِذَا لَهُم مَّكۡرٌ فِيٓ ءَايَاتِنَا﴾ ئەم (إِذَا)یە، (إِذَا)ی (فجائیة)یە، واتە: یەکسەر، کتوپڕ، وەڵامی (إِذَا)ی (شرطیة)ی پێشێیە، یانی: دەبینی ئەوانەی بێبڕوانو دوور لە خوان، یەکسەر، کتوپڕ دەست دەکەن بە پیلانگێڕیی لە دژی ئایەتەکانی ئێمە.

لێرەدا مەبەست لە: (مَّكۡرٌ)، کە دەفەرموێ: ﴿إِذَا لَهُم مَّكۡرٌ فِيٓ ءَايَاتِنَا﴾ زۆر شت دەگرێتەوە چونکە وشەی (مَّكۡرٌ)، لە کوردیی دا ئەگەر بمانەوێ بۆ باری خراپە لێکی بدەینەوە دەڵێین: (پیلان)، بەڵام ئەگەر بمانەوێ بە باری چاکەدا لێکی بدەینەوە، دەڵێین: (پلان)، کە لە ڕاستیشدا هەردووك وشەکە (ئینگلیزیین)، لە ئەسڵدا وشەی (پلان)ە، بەڵام کورد ئەگەر بۆ خراپە بێ (یـ)ەکیان خستۆتە سەری، بە هەرحاڵ وشەی (مَّكۡرٌ)، بریتیە لەوەی ئینسان بیەوێ کەسێك لە مەبەستێك کە هەیەتی، لابدات، بەڵام بە شێوەیەکی پەنهانکارو بە شێوەیەکی لێزانانە، بە شێوەیەك کە ئەو نەفەرە بەخۆی نەزانێو ئاگادار نەبێ.

لێرەدا دەگونجێ مەبەست لە: (مَّكۡرٌ)، گێڕانەوەی نیعمەتەکانی خوابێ، بۆ جگە لە خوا، دەگونجێ مەبەست نکووڵیی کردن بێ لەوەی کە خوا خاوەن نیعمەتو خاوەن چاکەیەو، دەگونجێ هەر شتێکی دیکە بێ، گرنگ ئەوەیە کە پێچەوانەی وەفاو سوپاسگوزاریی‌و بە ئەمەگییە، بەرانبەر بە خوای بەخشەر.

<u>هەڵوەستەی چوارەم</u>: دەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱللَّهُ أَسۡرَعُ مَكۡرًا﴾ پێیان بڵێ: (مکر)ی خوا خێراترە.

(الطَّبَرَانِي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا (التفسير الكبير)[1]، ئاوا ئەم ڕستەیە شی دەکاتەوە، دەڵێ: (أَي أَسْرَعُ جَزَاءً عَلَى المَكْرِ، وَأَقْدَرُ عَلَى ذَلِكَ، يُسَمَّى الجَزَاءُ بِاسْمِ المجْزِي عَلَيْهِ)، واتە: خوا خێراترە لە سزادانەوەتان لەسەر ئەو فێڵەو، بە تواناترە، لێرەدا ئەو سزایە بە ناوی سزا لەسەردراوەکە، کە بریتییە لە (پیلانەکە) ناونراوە.

دەشگونجێ بڵێین: مەبەست ئاوایە: (أَسْرَعُ تَدْبِيراً وَتَخْطِيطاً)، خوای توانادار پلان‌و نەخشەی خێراترە بۆ سزادانی ئێوە.

ئنجا لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رُسُلَنَا يَكْتُبُونَ مَا تَمْكُرُونَ﴾، بێگومان نوێنەرەکانی ئێمە، ڕەوانەکراوەکانی ئێمە، (کە بێگومان فریشتەکانن) چونکە فریشتەکان کردەوەی مرۆڤەکان تۆمار دەکەن، چاك‌و خراپیان، بۆیەش کردەوەکان دیکۆمێنت (توثيق) دەکەن‌و تۆمار (تسجيل)، دەکەن، تاکو لە ڕۆژی دواییدا هیچ کەس نەتوانێ نکوڵیی بکات، وەك لە شوێنی دیکەدا باسمان کردوەو، لە داهاتووشدا باس دەکەین، کە تەعبیرەکانی قورئان کە خوای پەنهانزان بەکاریهێناون، چەمك‌و واتاکەیان هەموو شێوەکانی تۆمارکردن دەگرنەوە، بە وێنەو دەنگ (الصوت والصورة)ەوە، بۆ وێنە:

١/ خوای زانا دەفەرموێ: ﴿... وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا ...﴿٤٩﴾﴾الكهف.
واتە: ئەوەی کە ئەنجامیان دابوو، بە ئامادەیی بینییان لەبەردەمی خۆیان. کەواتە: دەبێ فیلم بەرداریی کرابێ.

٢/ هەروەها دەفەرموێ : ﴿... إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾﴾ الجاثية، واتە: ئێمە ئەوەی دەتانکرد، نوسخەمان لەبەر دەگرتەوە.

٣/ هەروەها دەفەرموێ : ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ﴿٨﴾﴾الزلزلة، واتە: هەر کەسێك بە

---

١) ج٣، ص ٣٨١.

قەدەر کێشی گەردیلەیەك چاکە بکات، دەیبینێتەوەو، هەرکەسێك هێندەی کێشی گەردیلەیەك خراپە بکات دەیبینێتەوە، واتە: خودی کردەوەکە دەبینێتەوە.

لێرەشدا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رُسُلَنَا يَكْتُبُونَ مَا تَمْكُرُونَ﴾، نوێنەرەکانی ئێمە، رەوانە کراوەکانی ئێمە، ئەوەی کە ئێوە لە پیلانگێڕیی دەیکەن، تۆماری دەکەن، ئەمە هەڕەشەیە، واتە: هەمووی تۆمار دەکرێ لەسەرتان، دواییش خوا ﷻ سزاتان دەداتەوە.

(الطَّبَرَانِي) دیسان لەوبارەوە دەڵێ : (وَالمَعْنَى: إِذَا مَسَّتهُمْ رَاحَةٌ وَرَخَاءٌ بَعْدَ شِدَّةٍ وَبَلاَءٍ، وَقِيْلَ: مَطَرٍ بَعْدَ قَحْطٍ، إِذَا لَهُمْ كُفْرٌ وَتَكْذِيبٌ)، دەڵێ: مەبەست ئەوەیە: هەر کاتێك ئەوانە ئاسوودەیی‌و خێرو خۆشییەکیان تووش بوو، لە دوای ناڕەحەتیی‌و گرفتاریی، وە گوتراوە: بارانیان بۆ بارێنرا، لە دوای وشکە ساڵیی، یەکسەر دەست دەکەن بە ناسوپاسیی‌و بە درۆ دانان، واتە: (طبراني) لێرەدا ماناکەی دیاریی (تحدید) کردوە، بەڵام لە ڕاستییدا وەك هەمیشە (الطبري) رەحمەتی خوای لێ بێ، دەیەوێت چەمکی ئایەتەکان ماناو واتاکەیان فراوان بکات، کە بێگومان هەر فراوانیشە، لێرەش دا خۆ خوای بەرز دەیتوانی بفەرموێ: (إِذَا لَهُمْ تَكْذِيبٌ أَو كُفْرٌ فِي آياتنا)، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿إِذَا لَهُم مَّكْرٌ﴾، وشەی (مَكْرٌ)، هەم بە درۆ دانان، هەم کوفر، هەم گێڕانەوەی نیعمەتەکان بۆ غەیری خوا، هەم چەواشەکردنی خەڵك، لە بەرانبەر چاکەو نیعمەتەکانی خواداو، زۆر شتی دیکەش دەگرێتەوە.

هەڵبەتە ئەمە باسی ئەوە بوو کە ئینسانی بێبڕوا، ئینسانی دوور لە خوا، لەجیاتی ئەوەی چاکەو نیعمەتەکان بگێڕێتەوە بۆ خاوەنیان، دووریان دەخاتەوە، وەك خوا ﷻ، لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ۝٥٣﴾، واتە: هەر چاکەیەکتان تووش بێ، لە خواوەیە، دەبێ تۆ فەزڵ بۆ خاوەن فەزڵ بگێڕیەوە، مادام خوای پەروەردگار سەرچاوەی هەموو نیعمەتو

چاکەکانە، دەبێ بیانگێڕینەوە بۆ خاوەنەکەی خۆیان، ئەوە ئەمەگ و وەفادارییە، بەرانبەر بە خوای بەخشەر.

**مەسەلەی دووەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمۡ إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۗ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُكُمۡ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە دەکەینە یازدە بڕگە، چونکە خوا ﷻ، لەم ئایەتەدا باسی نیعمەتێکی دیکەی زۆر گەورەی خۆی دەکات، ئەویش ئەوەیە کە هۆیەکانی هاموشۆی لە وشکانیی و دەریادا بۆ مرۆڤەکان ڕەخساندوون، بەلام مرۆڤەکان لە کاتێکدا کە بە سەلامەتیی و بە خۆشیی دەڕۆن، بە تایبەتی لە دەریادا، ئەوە دڵخۆشن، بەلام دوایی کە تووشی تەنگانەو سەغڵەتیی دێن و، دەوریان بە شەپۆلان دەگیرێ و، بایەکی تێکشکێنەر هەڵدەکات و، کەشتییەکەیان دەکەوێتە هەلاکەت، لەو حاڵەتەدا پەنا بۆ خوا دەبەن و، خۆیان بۆ خوا ساغ دەکەنەوە، لە داوا لێکردن و لە ملکەچییدا، کەچی دوایی کە دەرباز دەبن، ئەوەیان لە بیر دەچێ :

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە یازدە بڕگەدا

**بڕگەی یەکەم:** دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ ﴾ خوا ئەو کەسەیە، کە ئێوە دەڕوێنێ، سەفەرتان پێ دەکات، هاموشۆتان پێ دەکات، لە وشکانیی و لە دەریادا، (يُسَيِّرُكُمۡ)، خوێنراویشەتەوە : (يَنۡشُرُكُمۡ)، واتە: بلاوتان

دەكـاتەوە بـە وشـكانییو دەریـادا، بـە هـۆی هۆیـەكانی هاتووچۆوە، لێـرە كـە خـوا دەفـەرموێ: خـوا ئێوە هـامووشـۆ پـێ دەكـات لە وشكانییو دەریادا، باسـی نەكـردوە كە هۆیەكانی هـامووشـۆی وشكانیی چین؟ وە هی دەریا چین؟ هەمووی دەگرێتـەوە، چ ئەوەی كە كاتی خۆی هەبوون، كـە هۆیـە سروشـتییەكان بـوون، ئـەوەی كـە خـوا دروسـتی كردوون ڕاستەوخۆ، چ ئەوانەی ئێستـا كە دوایی مرۆڤ دروسـتی كردوون، بـەڵام هەر بەو عەقڵو هۆشـەی كە خـوا پێیداوەو، هەر لـەو كەرەستـەو ماددەیـەی كـە خـوا خسـتوویەتە بەردەسـتیو، بـەو شـێوەیە كـە خـوای پەروەردگـار ئـەو مـادانەی بۆ وا لێكردوە، كە بشـێن، بۆ ئەوەی شتیان لـێ دروست بكـرێ.

كەواتـە: ﴿ يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ ﴾، سـەفەرتـان پـێ دەكـات، هامووشـۆتـان پێدەكـات، لـە وشـكانییو دەریـادا، واتـە: هۆكـارەكانی هاتووچـۆی نێـو وشـكانییو دەریـای بۆ ڕەخساندوون، وە ئەگەر بە (يَنْشُرُكُم)یش بخـوێنرێتەوە، واتـە: خـوا بڵاوتـان دەكـاتەوە لـە وشـكانییو دەریـادا، بەهـۆی چـییەوە؟ بەهـۆی ئـەو هۆكارانـەوە كە بۆی ڕەخساندوون.

ئنجا دوایی باسی سەفەری نێو دەریا دەكات، لەبەرئـەوەی لـە دەریـادا ئینسـان زیـاتر دەكەوێتـە مەترسـیی مـەرگو لەبـەین چوونەوە، بۆیـە خـوای كـارزانیش مەبەسـتی ئەوەیـە ئـەوەمان بـۆ بخـاتە ڕوو، كـە ئینسـان لـە كـاتی لێقـەومانو تەنگانەدا، پەنا دەباتە بەر خواو، لە دەریاشدا ئینسان دەستی بە هیچ شوێنێك ڕانـاگـات، دەفـەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا ﴾، هەتا كاتێك كە لە نێو كەشتییدا بوون، چونكە وشـەی (ٱلۡفُلۡكِ)، پێشـتریش باسمان كـردوە، هەم بۆ تـاكو هـەم بـۆ كـۆ بەكـاردێ، بەڵام بـە پێـی سیاقەكەی دیـاریی دەكـرێ، ئایـا یەك كەشـتییە، یاخـود چـەند كەشـتییەكـن، كە لێرەدا بە پێی سـیاقەكە دیارە، مەبەست پێی چەند كەشتییەكـن، چونكە دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ ﴾، كەشـتییەكان بردیـانن بـەهۆی بایـەكی باشەوە، بایەكی گونجاوو تەباوە لەگـەڵ ئاڕاستەی كـەشتییەكـاندا، (وَفَرِحُواْ بِهَا)،

وە زۆر پێی دڵخۆش بوونو شادمان بوون، لێرەدا سێ شتی باس کردوون، کە هەموویان ئەرێنیین.

**<u>برگەی دووەم</u> :** ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ ﴾، هەتا کاتێک ئێوە سواری کەشتییەکان بوون.

**<u>برگەی سێیەم</u> :** ﴿ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ ﴾، وە کەشتییەکان ئەوانیان برد بۆ نێو دەریا، بەهۆی بایەکی گونجاوەوە.

{کاتی خۆی کەشتیی چارۆکەدار هەبووە، هەڵبەتە ئێستاش (با)ی گونجاو بۆ کەشتییەکانی نێو دەریا، نیعمەتە، وەك چۆن بای نەگونجاویش بەلاو گرفتارییە} .

بەهۆی بایەکی گونجاوو چاكو خۆشەوە، کەشتییەکان بردیانن، جا پێشێ بە شێوەی دوێنراو (مخاطب) دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ ﴾، هەتا کاتێك کە ئێوە لەنێو کەشتییەکان دابوون، بەڵام دوایی بە شێوەی نادیار (غائب) ﴿ وَجَرَيۡنَ بِهِم ﴾، وە کەشتییەکان بردیانن، زانایانی ڕەوانبێژیی دەڵێن: لەبەرئەوەی پێشێ لە وشکانیی بوون، نیزیك بوون بدوێنرێن، بەڵام دوایی کە چوونە نێو دەریاو دوور کەوتوونەتەوە، ئنجا بە شێوەی دواندنی دیار نەدوێندراون، بەڵکو بە شێوەی نادیار دوێنراون.

**<u>برگەی چوارەم</u>:** ﴿ وَفَرِحُواْ بِهَا ﴾، وە زۆر پێی دڵخۆش بوون، چونکە: وشەی (فَرَحْ) بریتیە لە (السُّرُورُ الشَّدِيد)، زۆر دڵخۆش بوون.

کەواتە: ئەمە سێ حاڵەت: سواربوونی کەشتیی، ڕۆیشتنی کەشتییەکان، زۆر دڵخۆش بوونی سواربووانی کەشتییەکان، ئنجا دوایی سێ شتی دیکە باس دەکات، کە هەموویان نەرێنیین :

**برگەی پێنجەم:** ﴿جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٌ﴾، بایەکی تیکشکێنەری توند هات، یانی: بۆ کەشتییەکان هات، چونکە: (عَاصِفٌ) واتە: بایەکی تێکشکێنەر، گیایەك، ڕووەکێك کە وشك دەبیٚو تێکدەشکێنریٚ، پێی دەگوتریٚ: (عَصْف)، وەك لە سووڕەتی (الفیل)دا خوای بالآدەست دەفەرمویٚ: ﴿فَجَعَلَهُمۡ كَعَصۡفٖ مَّأۡكُولِۭ ٥﴾، وەك کای خوراو، وەك پووشی خوراوی لێکردن، پووشێك کە دەخوریٚ، یاخود ئەگەر بویستریٚ دەرخواردی ئاژەڵ بدریٚو بکرێتە ئالف، دەبیٚ تێکبشکێنریٚو ببێتە کاوکوتەڵ، (عَاصِفٌ)یش، واتە: بایەك کە شت تێکدەشکێنیٚ.

**برگەی شەشەم :** ﴿وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ﴾، ئنجا ئەگەر بایەکی وا توندو تیژو تێکشکێنەر بیٚ، دیارە لەسەر ڕووی دەریا شەپۆلی جۆراو جۆر پەیدا دەکات، بۆیە دەفەرمویٚ: لە هەموو لاوە شەپۆل دەوری دان، (ٱلۡمَوۡجُ )، دەگوتریٚ: (مَاجَ البَحْرُ: أي اضْطَرَبَ) دەریایەکە لەرزییەوە، جموجوڵی پێکەوت.

لە سووڕەتی (الکهف)دا هاتوە، خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ: ﴿وَتَرَكۡنَا بَعۡضَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ يَمُوجُ فِي بَعۡضٖ ٩٩﴾، (يَمُوجُ)، (مَاجَ، يَمُوجُ، يَعْنِي: إخْتَلَط، يَخْتَلِطُ)، واتە: تێکەڵ بوو تێکەڵ دەبیٚ، ئاشکراشە شەپۆل (موج)ی دەریا لە ئەنجامی جموجۆڵو لەرزینی دەریاوە پەیدا دەبیٚ.

**برگەی حەوتەم :** ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ﴾، دیارە لە حاڵێکی وادا بایەکی تێکشکێنەر بیٚو، لە هەموو لاوە ئابڵووقەیان بداتو دەوریان بدات، ج قەناعەتێکیان بۆ دروست دەبیٚ؟

پێیـان وابـوو کـە دەورە دراونو ئابڵـووقە دراون، واتـە: ڕێـی هـەڵاتنیـان نیـەو تـازە مـەرگ لەگـەڵیـان دەستەو یەخـەیە.

لێرەدا سـێ شـت خراونـە بەرانبـەری سـێ شـتـان :

١/ سـواربوونی کەشـتییەکـان.

٢/ بەهـۆی بایەکـی گونجـاوو لەبـارەوە.

٣/ زۆر دڵخـۆش بوونیـان.

١) هـاتنـی بایەیـەکـی تونـدی تێکشـکێنـەر.

٢) هـاتنـی شـەپـۆل لە هـەموو لایەکـەوە.

٣) پەیـدابوونی ئـەو قەنـاعەتە، کـە تـازە دووچـاری مـەرگ دەبـنو ئابڵـووقە دراونو ڕێـی هـەڵاتنیان نیـە.

لەو حاڵەتەدا، ﴿دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ لە خـوا پاڕانـەوە، ملکەچیی خۆیـان بـۆ خـوا سـاغ کـردەوە، پێشتر باسمـان کـرد (أَخْلَصَ، يُخْلِصُ، إِخْلَاصًا)، (أَخْلَصَ) واتە: دەربـازی کـرد، سـاغی کـردەوە، (يُخْلِصُ)، واتـە: دەربـازی دەکـاتو سـاغی دەکاتەوە، (إِخْلَاصًا)، واتـە: سـاغ کردنـەوە، (مُخْلِص)، واتـە: سـاغکەرەوە، یانی: ملکەچیی خۆیان بۆ خـوا سـاغ کـردەوە، بەشـی بـتو صـەنەمو هـیـچ کەسـیان پێوە نەهێشـت.

لێـرەدا وشـەی (ٱلدِّينَ)، واتـە: ملکەچیـیو تەنیـا لـە خـوا پـاڕانەوە، ئەگەرنـا ئەوانە دینیان نەبووە، تـاکو بە واتـا عورفییەکەی دینـداریی خۆیـان بـۆ خـوا سـاغ بکـەنەوە، بەڵـکو یـانی: ملکـەچییو داواکـردنـی خۆیـانو، زەبـوونیی خۆیـان بـۆ خـوا سـاغ کـردەوە.

**<u>بڕگـەی هەشتـەم</u>** : دەڵێـن: ﴿لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ واتـە (ئـەی خـوایـە!) ئەگـەر تـۆ لـەم حاڵـە، لەم گرفتـارییە دەربـازمـان بکـەی، سوێند بە خـوا (وە بە جەختـکـردنـەوە) ئێمە لـە سـوپاسـگـوزاران دەبـین، زۆر بـە

جەختکردنەوە قسەیان کردوە، نەیانگوتوە: (لَنَشْكُرَنَّكَ) سوپاست دەکەین، هەروەها نەیانگوتوە: (لَنَكونَنّ شَاكِرِين)، شوکرانە بژێر دەبین، بەڵکو گوتوویانە: ﴿ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾، بەدڵنیاییی لە شوکرانەبژێران دەبین، واتە: هێندە سوپاسی تۆ دەکەین هەتا سیفەتی سوپاسگوزاریی وامان لێدەکات، بچینە ڕیزی ئەوانەوە کە هەمیشە سوپاسگوزاریی بۆ تۆ دەکەن، دیارە بە (اسْم فَاعِل)یش هێناویەتی (الشاكر) واتە: ئەو سیفەتەمان تێدا دەبێ بە شتێکی ڕۆشنو بنەڕەتیی.

ئنجا بابزانین داخۆ ڕاست دەکەن لە بەڵێنەکەیان دا ؟

**برگەی نۆیەم** : دەفەرموێ : ﴿ فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمْ إِذَا هُمْ يَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾، واتە: کاتێك دەربازی کردن، فوتاری کردن، (إِذَا هُمْ ) واتە، کتوپڕ بینیت، دەستیان کردەوە بە دەستدرێژیی و سنوورشکێنیی لە زەوییدا بە ناهەق، هەڵبەتە دەستدرێژیی و سنوورشکێنیی هەر بە ناهەقە، بەڵام خوای زانا دەیەوێ ئەو سنوورشکێنیی و دەستدرێژییەیان زیاتر ناقۆڵایی و ناشیرینییەکەی دەربخات، وەك زۆرجار وشەی: (بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ )، هاتوە ئەگەرنا دەستدرێژیی و سنوورشکێنیی هەر بە ناهەقە، وشەی (بَغِي)، واتە: دەستدرێژیی، خاوەنی (مختار الصحاح)[1] دەڵێ: (كُلُّ مُجَاوَزَةٍ وَإِفْرَاط عَلَى المِقْدَار الّذِي هُوَ حَدّ الشيء، فَهُوَ بَغْيٌ)، هەر تێپەڕاندنێك و هەر سنوورشکێنییەك لەو ئەندازەیەی کە سنووری شتەکەیە لە سنوورەکە تێپەڕێ، پێی دەگوترێ: (بَغِي)، واتە: سنوورشکێنیی و تێپەڕاندن.

**برگەی دەیەم** : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُم ﴾، واتە: ئەی خەڵکینە! {تەماشا بکەن! ئەو خوایە چەند میهرەبانە، چەند بە سۆزو پەرۆشە، چەند بە ڕەحمە، چەند لێبوردەیە، چەند هێدیی و مەندە، پەلە ناکات لە

١) ص ٧٣.

سزادانی بەندەکانی دا، لەو نارەحەتییەو لەگەڵ مەرگدا دەستەو یەخەبوونە دەربازی کردوون، پاڕانەوەکەی قبووڵ کردوون، داواکەی گرتوونەوە، کەچی ئەوان پەیمانیان شکاندوەو، دەستیشیان کردوە، بە دەستدرێژیی لە زەوییدا، کەچی خوا بانگیان دەکات: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾.

ئەی خەڵکینە ! ﴿إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُم ﴾، بێگومان سنوورشکێنیی‌و سنووربەزێنیی‌و، دەستدرێژییەکەتان زیانەکەی بۆ خۆتانە، خۆتان لێی زیانبارن، واتە: هیچ زیان بە ئێمە ناگات، بەڵام پێم ناخۆشە ئێوە تووشی زیان ببن، ﴿مَّتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، ئەم زیانەی ئێوە، ڕابواردنێکی کەمی ژیانی دنیایە، واتە: ئەم گوزەرانەی ئێوە، کە لەسەر ئەو ژیان‌و گوزەرانە، خوا لە خۆتان تووڕە دەکەن‌و، وا دەکەن کە خوای پەروەردگار بە دادگەریی خۆی مامەڵەتان لەگەڵ بکات‌و، سزاتان بدات، ئەو ژیانە ڕابواردنێکی کەمە.

وشەی: (مَّتَٰعَ )، خوێنراویشەتەوە: (مَتَاعُ الحَيَاةِ الدُّنيا)، واتە: ئەو ژیانەی ئێوە ڕابواردنێکی کەمی ژیانی دنیایە، شتێکی زوو تێپەڕە، واتە: بۆ ئەو ژیانە زوو تێپەڕە، خوا لە خۆتان تووڕە مەکەن‌و، خۆتان گوناهباری لای خواو عەیبداری لای خەڵك مەکەن.

<u>**بڕگەی یازدەیەم‌و کۆتایی:**</u> ﴿ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُكُمْ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ دوایی گێڕانەوەتان بۆ لای ئێمەیە، واتە: بۆ لای کەسی دیکە نیە، بۆ لای کەس ناچنەوە، چونکە (الجار والمجرور) کە پێش دەخرێ، دەلالەت لەسەر کورت هەڵهێنان دەکات، (مَرْجِع)یش بە مانای (رُجُوع)ە، واتە: گێڕانەوەو گەڕانەوەی ئێوە تەنیا بۆ لای ئێمەیە، بۆ لای کەسی دیکە نیە، ﴿فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، چەند بە لوتفەوە خوای بە بەزەیی فەرموویەتی : هەواڵتان پێدەدەین بەوەی کە دەتانکرد، ئنجا کە هەواڵت پێدرا: ئەوەت کردوەو ئەوەت

کردوە، ئەوە زوڵمو ستەمو دەستدرێژییەو، ئەوە خراپەکارییە، ئنجا بۆ خۆت فەرموو، هەر بۆ خۆت دادگایی خۆت بکە، داخۆ شایستەی سزا نیت؟

لێرە ئەم ئایەتە موبارەکە ئەوەی لێوەردەگیرێ، وەك زۆر جاری دیکەش باسمان کردوە، خوای پەروەردگار، تەنیا وەڵامی پاڕانەوەی ئیمانداران ناداتەوە، بەڵکو خوا ﷻ ئەگەر کافرانیش لێی بپاڕێنەوە، جاری وا هەیە وەڵامیان دەداتەوە، بت پەرستانیش لێی بپاڕێنەوە، وەڵامیان دەداتەوە ئەوانیش دەرباز دەکات بۆچی؟ چونکە خوای دادگەر لە دنیادا وەك فەرموویەتی: ﴿ وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤۡمِنُونَ ١٥٦ ﴾الأعراف، واتە: بەزەیی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە، (واتە: لە دنیادا هەموو شتێك بە ڕەحمەتی خوا بەڕێوە دەچێو، هەموو کەس بە ڕەحمەتی خوا دەژی، باران کە خوا ناوی ناوە ڕەحمەت، بۆ هەموو کەسێکە کافرو مسوڵمان، هەوا کە نیعمەتی خوایەو بەرجەستەکەری ڕەحمەتی خوایە، تیشکی خۆر، ئەو نیعمەتانەی کە لە زەوییدان، کافرو مسوڵمان لێیان بەهرەمەندن، بۆیە وەك چۆن ئەو نیعمەتانە هەموو لایەك لێیان بەهرەمەندن، دیسان نیعمەتی دەربازکرانی خەڵك لە تەنگانەو ناڕەحەتییانیش، دیسان ئەویش خوای پەروەردگار هەموو کەسی تێدا بەشدار کردوە، پێویستە بزانرێ کە خوا ﷻ خوای هەموو لایەکەو، ڕەحمەتەکەی هەموو کەسێکی گرتۆتەوەو، هەموو شتێکی گرتۆتەوە، بەڵام لە دوارۆژدا خوا بەزەیی خۆی تایبەت دەکات بە ئیمانداران‌و چاکەکارانەوە.

لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتە هەیە، کە زۆر جێی سەرنجە: {عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أن النبيَّ صلى الله عليه وسلم لما أهدر يوم الفتح دَمَ جماعةٍ منهم: عِكْرِمَةُ بن أبي جهل، هَرَب من مكة وركِبَ الْبَحْرَ، فَأَصَابَتْهُمْ عَاصِفٌ، فَقَالَ: أَصْحَابُ السَّفِينَةِ لأَهْلِ السَّفِينَةِ: أَخْلِصُوا، فَإِنَّ آلِهَتَكُمْ لاَ تُغْنِي عَنْكُمْ شَيْئًا هَا هُنَا، فَقَالَ: عِكْرِمَةُ: وَاللهِ لَئِنْ لَمْ يُنْجِنِي فِي الْبَحْرِ إلاَّ الإِخْلاَصُ، مَا يُنْجِينِي فِي الْبَرِّ غَيْرُهُ، اللَّهُمَّ إِنَّ لَكَ عَهْدًا إِنْ أَنْتَ عَافَيْتَنِي مِمَّا

أَنـا فِيهِ، أَنِّـي آتِـي مُحَمَّدًا حَتَّـى أَضَـعَ يَـدَيْ فِـي يَـدِهِ فَلأَجِدَنَّـهُ عَفُـوًّا كَـرِيمًا، قَـالَ: فَجَـاءَ فَأَسْـلَمَ} {أَخْرَجَـهُ أَبُـو دَاوُد بـرقم: (٢٦٨٣)، والنَّسـائِي بـرقم: (٤٠٦٧)، قـال الشيخ الألباني: صحيح}.

واتـە: سـەعدی کـوڕی ئـەبی وەققـاص خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: کاتێـك پێغـەمبـەری خوا ﷺ بڕیاری دەرکرد لە کاتی ئازادکردنی مەککەدا کە کۆمەڵـێك دەبـێ بـە سـزای مـەرگ بگـەیەنرێن، یەکـێك لەوانـە عیکریمـەی کـوڕی ئـەبو جـەهل بـوو، عیکریمـە لـە مەکـکە، ڕایکـردو سـواری کەشـتیی بـوو لـە دەریـادا، (واپێدەچـێ دەریـای سـوور بـوو بـێ، ئـەوێیان لـێ نیزیکە) ئنجا لەنێو دەریـادا بایـەکی تێکشکێنەری تونـد هـات، ئەوانـەی خـاوەنی کەشـتییەکە بـوون (لێیـان دەخوڕیو سەرپەرشتییان دەکرد) بە سواربووانی کەشتییەکەیان گوت: پاڕانەوەی خۆتـان (بۆخوا) یەکـلایی بکەنەوە، چونکە پەرسـتراوەکانی دیکە هیـچ سوودتـان پێ ناگـەیەنن لێرەدا (هەر خوا دەفریاتـان دێ، ئەوانی دیکە هیچ نین) عیکـریمـە دەڵێ: لە دڵی خۆمدا گوتـم: ئنجا ئەگـەر لەنێـو دەریادا تەنیا خۆ سـاغ کردنـەوەم بۆ خـوا دەربـازم بکـات، لـە وشکانییشـدا هـەر ئـەو لـە فریـام دێ، ئـەی خـوایە! پەیمان بێ، ئەگەر تـۆ لەم وەزعـە کە تێیدام دەربازتکـردم، بچمە لای موحەممـەدو دەسـتم بخەمە نێو دەستی، ئەوکاتە بە دڵنیایی مـن لێبوردەو بەخشـندە دەبینـم، ئیدی عیکریمـە هات بۆ لای پێغـەمبـەر ﷺ و مسوڵمان بوو.

پێغـەمبـەری خـوا زۆر ڕێزی لـێ گرت، بەڵـکو ڕۆژێـك، قسـەیان بە ئـەبو جەهـل گـوت، عیکـریمـەش لـەوێ بـوو، پێـی نـاخۆش بـوو، پێغـەمبـەر ﷺ فـەرمووی: کـەس قسـە بـە مردووانێـك نەڵـێ، کـە زینـدووەکان پێیـان نـاخۆش بـێ، وەك عاتیفەی بابو کـوڕایەتیی، ئەگەرنـا عیکریمـە کە مسـوڵمان بـووە، دەیزانـێ بـابی تـازە دۆزەخییـە، چونکە لەسـەر کـوفـر مـردوە.

**مەسـەلـەی سێیـەم:** خـوای کـاربەجی لـەم ئایـەتەدا وێنـە دێنێتـەوە بـۆ ژیـانی دنیـا دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّمَا مَثَلُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلْأَنْعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلْأَرْضُ زُخْرُفَهَا

وَٱزَّيَّنَتۡ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارٗا فَجَعَلۡنَٰهَا حَصِيدٗا كَأَن لَّمۡ تَغۡنَ بِٱلۡأَمۡسِۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە نۆ برگەدا

خوا ﷻ وێنەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش کە ئێمە هەمیشە لە واقیعدا لەگەڵیدا ڕووبەڕوو دەبینەوە، بۆ ئەم ژیانە دنیایەی ئێمە دێنێتەوە:

**برگەی یەکەم** : دەفەرموێ : ﴿ إِنَّمَا مَثَلُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، بێگومان وێنەی ژیانی دنیا.

وشەی (مِثل)، دەڵێ: (مِثْلٌ: كَلِمَةُ تَسوِيَة، يُقَالُ: هَذَا مِثْلُهُ وَمَثَلُهُ، كَمَا يُقَالُ: شِبْهُهُ وَشَبَهُهُ، وَالمَثَلُ مَا يُضْرَبُ بِهِ مِنَ الأَمْثَالِ، وَمَثَلُ الشيءِ صِفَتُهُ)(١) وشەی (مِثْل) بێژەی یەکسان کردنە، دەگوترێ: ئەمە وەك ئەوە وایە، (هَذَا مِثْلُهُ)، هەروەها (مَثَل)یش بە هەمان شێوە، دەگوترێ: (هَذَا مَثَلُهُ)، وەك چۆن دەڵێی: (شِبْهُهُ) و(شَبَهُهُ)، لە زمانی عەرەبیدا، وە (ضَرْبُ المَثَل)، وەك پەند، وێنە پێ هێنرانەوە، ئەمە واتایەکی، واتایەکی دیکەی (مَثَل)، یانی (صِفَة)، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ ﴿٢٧﴾ ﴾ الروم، واتە: سیفەتی هەرە بەرز وەسفی هەرە بەرز، تەنیا شایستەی خوایە، کەواتە: (مَثَل)، بە مانای یەکسان کردنی شتێك لەگەڵ شتێك دێ و، بەمانای سیفەت و وەسفی شتێکیش دێ.

---

١) مختار الصحاح، ص ٦٤٢.

کە دەفەرموێ : ﴿ إِنَّمَا مَثَلُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، لێرەدا خوای قسە لەجێ بە هەردووك واتاکەی دەیهێنێ، دەگونجێ بڵێی: ژیانی دنیا وەك ئەوە وایە، یاخود سیفەتی دنیا وەك ئەوە وایە.

**بڕگەی دووەم :** ﴿ كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾، وەك ئاوێکە کە لە سەرووەوە دامانبەزاندوە.

پێویستە بزانین خوای زاناو شارەزا بۆچی بە زۆریی باسی ئاو (ماء) دەکات؟

چونکە ئەگەر بفەرموێ: (مَطَر) تەنیا باران دەگرێتەوەو، ئەگەر بفەرموێ: (ثَلْج) تەنیا بەفر دەگرێتەوەو، ئەگەر بفەرموێ (بَرَد) تەنیا تەرزە دەگرێتەوە، بەڵام کە دەفەرموێ (ماء) هەرسێکیان دەگرێتەوە، بەڵکو شتی دیکەش دەگرێتەوە، وەك: هەڵمو ئاونگو شێ.

ئنجا کە دەفەرموێ: (السَّمَاء) (السَّمَاءُ: كُلُّ مَا فَوْقَكَ، أَو كُلُّ مَا عَلاكَ فَأَظَلَّكَ، وَمِنْهُ قِيلَ لِسَقْفِ البَيْتِ: سَمَاء)[1]، واتە: هەر شتێك لە سەرووتەوەیە، هەر شتێك سێبەرت لێ بکات، پێی دەگوترێ: (سَمَاء)، بۆیە بە سەربانی خانووش دەگوترێ: (سَمَاء)، واتە: لە سەرووتانەوە ئاومان دابەزاندوە.

**بڕگەی سێیەم:** ﴿ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ ﴾، ڕووەکی زەوی بەهۆیەوە تێکەڵ بووە، کە ئەمە دوو واتای هەن:

١) واتە: ڕووەکی زەوی تێکەڵ بە ئاوەکە بووە، یان ئاوەکە تێکەڵ بە زەوی بووە.

٢) ڕووەكو شیناوردی زەوی، {کە دیارە ڕووەك هەم دانەوێڵە دەگرێتەوە، هەم سەوزە دەگرێتەوە، تەڕەکار دەگرێتەوە، دارو درەختو میوەجات دەگرێتەوە، هەمووی دەگرێتەوە}، بەهۆی ئەو ئاوەوە ئەو سەوزاییو ڕووەکە تێکەڵ بەیەك دی دەبێ، واتە: پێکدا دەچێتو چڕوپڕ دەبێ.

---

١) مختار الصحاح، ص٣٢٦.

**برگـەی چـوارەم :** ﴿مِمَّا يَأۡكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلۡأَنۡعَٰمُ﴾، لەوەی كە خەڵكیش‌و ئاژەڵیش دەیخۆن، واتـە: هـەموو ئـەو شتـانەی كـە خەڵـك دەیخـوات، خـەڵك چـی دەخـوات؟ گەنـم‌و جۆ، نیسك‌و نـۆك، هـەرزن‌و زوڕات‌و گەنمـە شامیی‌و، تەرەكـارو، سـەوزەو میوەو، هەموو ئەوانە، خەڵك دەیانخوات، ئەدی ئاژەڵ چی دەخوات؟ ئاژەڵیش گیا دەخـوات، ئالـف دەخـوات، هـەموو ئـەو شتـانەی كـە ئـاژەڵ دەیانخـوات، ئەمـە ئاماژەیە بۆ ئەوە كە لایەنە ماددییەكەی ژیانی دنیا، خاڵی هاوبەشی نێوان مرۆڤـو ئـاژەڵـە، كەواتـە: مەیكـەن بـە ئامـانج، تـەنیا ئـەوێ مـەبینن، چونكە ئـەو لایەنـە ماددییە خـاڵی هـاوبەشی نێوان ئێوەو ئاژەڵە، ئێوەش خۆتـان پـێ لـە سـەرووی ئاژەڵەوەیە، كەواتە: چاو لەســەر ئـەوە چـڕدا مەگرن‌و، جێـی گرنگـیی پێدانتـان تەنیا ئـەو لایەنـە ماددییـە نەبـێ، كە لەگـەڵ ئاژەڵدا كۆتـان دەكاتـەوە، بەڵكـو با جێـی گرنگیی پێدان‌و جێی بایەخ پێدانتـان، خـاڵی جیاكەرەوەتـان بـێ لەگــەڵ ئـاژەڵدا، كە لایـەنە مەعنـەوییـەكەیە.

هەڵبەتــە لێـرەدا مانــای وا نیـە كـە لایـەنـە ماددییەكـەش پشتـگوێ بخـرێ، چونكـە خـوای بەخشـەر وەك نیعمـەت باسی دەكات.

**برگـەی پێنجـەم :** ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا﴾، ئەو ڕووەك‌و شینـاوردو میوەجـات‌و دانەوێڵـەیە كـە لـەو زەوییـەدا كـراوە، هەتـا كـاتێك كـە زەوی جوانییەكـەی خـۆی وەرگـرت‌و خـۆی ڕازانـدەوە، مەبەسـت ئـەو كشتوكـاڵەیە بـە هـەموو جۆرەكانیەوە، واتە: هەم سـەوزە، هەم دانەوێڵە، هـەم میوەجـات هـەمووی، كە دەبێتـە مایەی ڕازاندنەوەی ڕووی زەوی، ڕووی زەوی بـە چـی دەڕازێتـەوە؟ بـەو شینــاووردو كشـتوكــاڵ‌و دانەوێڵــەو ئەوانــە دەڕازێتـەوە، ســەر زەوی ســەوز دەكاتەوە، زۆر جوان دەبـێ، كاتێـك كە ئـاوای لـێهـات، سـەر زەوی جـوانیی خـۆی وەرگـرت‌و، خـۆی ڕازاندەوە، وەك چۆن ئافرەتێك خۆی دەڕازێنێتــەوە.

**برگـەی شـەشــەم :** ﴿وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ﴾، خەڵكەكـەی، واتە: خـاوەنی ئەو پارچە زەوییە پێیـانوابوو، ئەو قەناعەتـەیان بـۆ دروسـت بـوو، كــە توانــادارن بەســەر زەوییەكــەی خۆیانــداو، بەســەر كشتوكــاڵەكەی خۆیانــدا،

بەروبوومەکە لەبەردەستیان دایەو دەتوانن حاصەلاتەکەی هەڵبگرنەوە، ئا لەو حاڵەتەدا.

**برگەی حەوتەم** : ﴿أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارٗا﴾، فەرمانی ئێمەی بۆ هات بە شەوێ، یان بە ڕۆژێ، واتە: چ بە شەوێ، چ بە ڕۆژێ، ئەگەر بە شەوێ بێ دیارە کتوپڕ هاتوە، بەڵام ئەگەر بە ڕۆژێ بێ، واتە: لەبەرچاوی ئەوان هاتوە، کە هەر کامێکیان جۆرە ئێشێکی هەیە، ﴿فَجَعَلۡنَٰهَا حَصِيدٗا﴾، کردمان بە پەرێز، واتە: کردمان بە پەرێزێک کە کشتوکاڵەکەی لادەبرێو دەدروێتەوەو هیچی لێ نامێنێ، ئاوامان لێکرد.

**برگەی هەشتەم** : ﴿كَأَن لَّمۡ تَغۡنَ بِٱلۡأَمۡسِ﴾، وەك دوێنێ هیچی لێ نەبووبێ، وەك دوێنێ ئەو پارچە زەوییە هیچ کشتوکاڵو بەرهەمێکی لێ نەبووبێ، چونکە دەڵێ: (غَنِيَ بالمَكَانِ) یانی (أَقَامَ)، واتە: لەو شوێنەدا مایەوە.

(الطبراني) دەڵێ: (المُغْنَى: هُوَ المَوْضِعُ الَّذِي يُقَامُ فِيهِ وَيُعَمَّر) واتە: (مُغْنَى) ئەو شوێنەیە کە ئینسان یان، کەسێك، یان شتێك لێی دەبێو ئاوەدان دەکرێتەوە.

**برگەی نۆیەمو کۆتایی** : ﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾، ئاوا ئایەتەکانی خۆمان بۆ کەسانێك، بۆ کۆمەڵێك، کە بیر بکەنەوە، ڕوون دەکەینەوەو شیدەکەینەوە، کەواتە: کەسێك بیر نەکاتەوە بەهرەمەند نابێ لە ڕوونکردنەوەی ئایەتەکانی خوای پەروەردگار، جا ئەمە مانایەکی بوو، کە زۆربەی تەفسیرەکان هەر ئەو مانایەیان لێکداوەتەوە، بۆ ئەم ئایەتە موبارەکە.

بەڵام من پێم وایە ئەم ئایەتە بەپێزە، مانایەکی دیکەشی هەیە، ئەویش ئەوەیە: کە خوا ﷻ نەك پارچە زەوییەك کە کشتوکاڵێکی لێ دەکرێ، ژیانی دنیا بەراورد بکات لەگەڵ ئەوەداو، بیچوێنێ بەو زەوییە کە کشتوکاڵی لێکراوەو، خەڵکەکەی پێی دڵخۆش دەبن، ئنجا دوای ئەوەی سەرزەوی دەڕازێتەوەو خەڵکەکە پێیان وادەبێ، کە کشتوکاڵەکەو بەرهەمەکە،

لەبەردەستی خۆیاندایەو، دەتوانن درەوی بکەنو هەڵی بگرنەوەو، لێی بەهرەمەند بن.

بەڵکو پێم وایە: وێڕای ئەو واتایە، ئەوەش دەگەیەنێ کە خوا لێرەدا باسی کۆی سەر زەوی دەکات، کە ژیانی دنیا لەسەر هەموو زەوی، وەك ئەو بارانە وایە، کە دێتە خوارەوەو کشتوکاڵێکی پێ دەڕوێ، ئنجا دوایی کە دەفەرموێ : ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ ﴾، ئەوە دەگرێتەوە، کە کاتێك خوا ئەم ژیانی دنیایە هەمووی، نەك تەنیا ئەو پارچە زەوییە کە کشتوکاڵەکەی لێکراوە، هەموو ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی کاتێك دەپێچێتەوەو کۆتایی پێدێنێ، کە تەواو سەر زەوی ڕازاوەتەوە پڕکراوە لە باڵەخانەو خانوو ڕێگاو بانو کارگەو ئاوەدانیی زۆر، وە پڕ کراوە لەو نازو نیعمەتانەی کە مرۆڤ لەبن زەوی دەریاندێنێ، وە پڕ کراوە لە هۆکارەکانی هاتووچۆی هەوایی‌و دەریایی‌و وشکانیی، واتە: لە کاتێکدا کە بەشەر دەگاتە لووتکەی بەرەوپێشچوون لە ڕووی تەکنۆلۆژیا، لە ڕووی ماددیی و شارستانیەتیی ماددییەوەو، قەناعەتێك بۆ خەڵکی سەر زەوی دروست دەبێ، کە ئەوە هەر خۆیانن‌و، پێویستییان بە خوا نیە، خۆیان باڵادەستن‌و، بەتوانان بەسەر چارەنووسی زەوی‌و ژیانی خۆیاندا، ئا لەو حاڵەتەدایە، کە فەرمانی خوا دێ، بە پێچرانەوەی لاپەڕەی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی، بۆیەش خوا دەفەرموێ: ﴿ أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارًا ﴾، بە شەوێ یان بە ڕۆژێ، خوای پەنهانزان دەزانێ بە شەوێ ئەو پارچە زەوییەی کە کشتوکاڵەکەی لێکراوە، کاول دەبێ، یاخود بە ڕۆژێ کاول دەبێ، بەڵام بە نسبەت کۆی ژیانی سەر زەوییەوە، ئەگەر فەرمووبای: بە شەوێ دێ بۆ نیوەی ڕاست بووو، ئەگەر بیفەرمووبایە : بە ڕۆژێ دێ، بە نسبەت نیوەکەی دیکەیەوە ڕاست بوو، چونکە هەمیشە شەوو ڕۆژ (شەوگارو ڕۆژگار)، لەسەر زەوی دابەش دەبن، هەمیشە نیوەی زەوی شەوەو نیوەکەی دیکەی ڕۆژە، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: بە شەوێ، یان بە ڕۆژێ دێ، چونکە بە نسبەت نیوەیانەوە شەوەو، بە نسبەت نیوەیانەوە ڕۆژە، کە ئەوە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە ئەم زەوییەی ئێمە خڕو هێلکەیی هەڵکەوتوەو، هەمیشەش داپۆشراوە، هەم بە شەوو هەم بە ڕۆژ.

**مەسەلەی چوارەم:** خوا دەفەرموێ : ﴿ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢٥﴾ ﴾، واتە: وە خوا (خەڵك) بانگ دەكات، بۆ مەنزڵگای ئاشتیی‌و، هەر كەسێكی بیەوێ، دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێ.

كە دەفەرموێ : ﴿ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ ﴾، ئایا مەبەست لە (دار السلام)، چییە؟

زانایان سێ واتایان بۆ لێكداونەوە، كە هەر سێكیان گونجاون :

**یەك** : واتە: (دار السلامة)ە، مەنزڵگایەك كە سەلامەتیی تێدایە، واتە: بێ زیانیی تێدایەو، ئاشتیی تێدایە.

**دوو** : ﴿ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ ﴾، واتە: (دارِ اللهِ السَّلام)، وشەی (السلام)، سیفەتی خوایە، ناوی خوایە، واتە: بۆ مەنزڵگای خوایەك، كە یەكێك لە سیفەتەكانی بریتییە لە: (السلام)، واتە: ئاشتیی‌و خێرو خۆشیی‌و سەلامەتیی لەوەوەیە.

**سێ** : (دار السلام)، واتە: (إسمٌ للجنّة)، واتە: (دارُ السلام)، یانی: بەهەشت، چونكە ئەوە یەكێكە لە ناوەكانی بەهەشت.

كە دەفەرموێ : ﴿ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، وە هەر كەسێك بیەوێ، هیدایەتی دەكات بەرەو ڕاستە ڕێ، لێرەدا مەبەست لە (هدایة) هەرچەند زۆر لە تەفسیرەكان هەر وایان لێكداوەتەوە، واتە: ڕێنمایی دەكات، بەڵام لێرەدا ئەو واتایە ڕاست نییە، بەڵكو مەبەست لە (هدایة)، لێرەدا خستنە سەر ڕێی ڕاستە، نەك ڕێ پیشاندان، بۆچی؟ چونكە ڕێ پیشاندانی خوا ﷻ بۆ هەموو مرۆڤەكان، شتێكی گشتییەو براوەتەوەو، خوا ویستوویەتی، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴾، هەر كەسێك كە خوا بیەوێ، هیدایەتی دەكات بۆ ڕاستە ڕێ.

هەڵبەتە خوا ویستوویەتی هەموو مرۆڤەکان بە خواستی یاسادانەرانەی خۆی، ئەوەی خواستوە کە بەرنامەیەك بنێری، کە ڕێ پێشاندانە بۆ هەموو خەڵك، ئەوەی ویستوەو بڕاوەتەوە، ئەدی ئەوەی کە ئێستا دەیەوێ؟ ﴿ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ ﴾، واتە: خوا هەر کەسێك کە بیەوێ، دەیخاتە سەر ڕاستەڕێ، چونکە وشەی (هدایة) سێ واتای گشتی هەن:

١/ هیدایەتی خوا ﷻ بۆ هەموو دروستکراوەکانی، وەك لە سوورەتی (طه)دا مووسا ﷺ لە وەڵامی فیرعەوندا دەڵێ : ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ٥٠ ﴾، واتە: پەروەردگارمان ئەو کەسەیە، کە بوونی بە هەموو شتێك داوەو ڕێنمایشی کردوە، ئەوە هیدایەتی گشتی خوایە.

٢/ هیدایەتێکی تایبەت هەیە، کە تایبەتە بە مرۆڤو جندەوە، کە بریتیە لە ناردنی کتێبەکانی خوا، ناردنی پێغەمبەران، (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، کە ڕێ پێشانی خەڵك دەدەن، بە گشتی.

٣/ هیدایەتێکی تایبەتتری خوا هەیە، تایبەتی تایبەت، کە بریتیە لەوەی دوای ئەوەی کەسانێك هیدایەتی خواو، ڕێنمایی خوا، بەرنامەی خوا قبووڵ دەکەن، خوا لوتفیان لەگەڵ دەکاتو، زیاتر دڵیان ڕۆشن دەکات، بەرچاویان ڕۆشن دەکاتو دەیانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ هُدٗىۗ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٞ مَّرَدًّا ٧٦ ﴾ مریم، واتە: وە ئەوانەی هیدایەت دراون، هیدایەتی خوایان وەرگرتوە، خوا هیدایەتیان بۆ زیاد دەکات، کەواتە: ئەو هیدایەتە کە زیاد دەکرێ، جیایە لە ئەسڵی هیدایەت، کە بریتیە لە ڕێی خۆ دیتنو ڕێ ڕاستگرتن، هیدایەتە زیادکراوەکە، بریتیە لەوە کە زیاتر دەچەسپێن، بەرچاویان ڕۆشنتر دەبێ، دڵیان ڕۆشنتر دەبێو، لە هەموو وردەکارییەکاندا بە پێی شەریعەت هەنگاو دەنێن.

هەروەها لە سوورەتی (محمد)دا، دەفەرموێ : ﴿ وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: وە ئەوانەی کە ڕێی ڕاستیان گرتووە، خوا هیدایەتیان بۆ زیاد دەکات، واتە: زیاتر دەیانخاتە سەر ڕاستە ڕێو، تەقواشیان پێ دەبەخشێ.

لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە هەیە {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ خَرَجَ عَلَيْنَا رَسولُ اللهِ ﷺ يَوْمَاً، فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنَّ جِبْرِيلَ عِنْدَ رَأْسِي وَمِيكَائِيلَ عِنْدَ رِجْلَيَّ، يَقُولُ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: اضْرِبْ لَهُ مَثَلاً، فَقَالَ: اسْمَعْ سَمِعَتْ أُذُنُكَ، وَاعْقِلْ عَقَلَ قَلْبُكَ، إِنَّمَا مَثَلُكَ وَمَثَلُ أُمَّتِكَ، كَمَثَلِ مَلِكٍ اتَّخَذَ دَاراً، ثُمَّ بَنَى فِيهَا بَيْتاً، ثُمَّ جَعَلَ فِيهَا مَائِدَةً، ثُمَّ بَعَثَ رَسولاً يَدْعُو النَاسَ إِلَى طَعَامِهِ، فَمِنْهُمْ مَنْ أَجَابَ الرَّسولَ، وَمِنْهُمْ مَنْ تَرَكَهُ، فَاللَّهُ هُوَ الْمَلِكُ، وَالدَّارُ: الإِسْلاَمُ، وَالْبَيْتُ: الْجَنَّةُ، وَأَنْتَ يَا مُحَمَّدُ! رَسولٌ، فَمَنْ أَجَابَكَ دَخَلَ الإِسْلاَمَ، وَمَنْ دَخَلَ الإِسْلاَمَ، دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ دَخَلَ الْجَنَّةَ، أَكَلَ مَا فِيهَا} {أَخْرَجَهُ ابْنُ سَعْد ج١، ص١٧٢، وَالحَاكِمُ برقم: (٣٢٩٩)، وَقَالَ: صَحِيح الإِسْنَاد، وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً: التِّرمِذِيُّ برقم: (٢٨٦٠)، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ مُرْسَلٌ، وَقَدْ رُوِي هَذَا الحَدِيث مِنْ غَيْرِ وَجْه عَنِ النَّبي ﷺ بِإِسْنَاد أَصَحَّ مِنْ هَذَا، وَالبَيْهَقِي فِي "الدلائل" ج١، ص٣٧٠}.

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەدەر بۆ لامان، فەرمووی: لە خەوندا بینیم کە جبریل لە لای سەرم وەستا بوو، میکائیل لە لای هەردوو پێیەکانم وەستا بوو، یەکێکیان بە ئەوی دیکەی دەگوت: وێنەیەکی بۆ بێنەوە، ئەویش گوتی: ببیستە، گوێت ببیستێ، وە بە هۆشبە، دڵت بە هۆش بێو تێبگات، وێنەی تۆو وێنەی ئۆممەتەکەت، (کۆمەڵەکەت)، وەك وێنەی پادشایەك وایە، کە خانوویێکی دروست کردوە، ئنجا لەو خانوودا، ژوورێکی چاكو ئامادە کردوە، دوایی لەو ژوورەدا سفرەیەکی ڕازاندۆتەوە، خوانێکی داناوە، دوایی نوێنەرێکی ناردوە کە خەڵك بانگێشت بکات بۆ ئەو خواردنە، کە لەسەر ئەو خوانو سفرەیە داناوە،

ئنجا هەیانە وەڵامی نوێنەرەكەی داوەتەوەو، هەشیانە وازی لێهێناوەو نەهاتوە، خوا ﷻ پادشایەكەیە، خانووەكە ئیسلامە، ژوورەكە (ماڵەكە) كە سفرەكەی تێدا دانراوە، بەهەشتە، سفرەو خواردنەكەش نازو نیعمەتی بەهەشتە، تۆش ئەی موحەممەد! نوێنەرەكەی، كە خاوەن خانوو سفرەو خوانەكە ناردوویی، هەر كەسێك وەڵامت بداتەوە، دەچێتە نێو، (ئیسلام)و، هەر كەسێك بێتە نێو ئیسلام، دەچێتە بەهەشت، هەر كەسێكیش بچێتە بەهەشت، لێی دەخوات، واتە: لەو سفرەو خوانەی كە خوا ڕازاندوویەتەوە، لە بەهەشتدا بۆ ئیمانداران، خوا لەو كەسانەمان بگێڕێ بە لوتفو كەرەمی خۆی.

<u>**مەسەلەی پێنجەم**</u>: كە دەفەرموێ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۖ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢٦﴾﴾، بۆ ئەوانەی چاكەیان كردوە، پاداشتی هەرە چاك هەیە (چونكە (ٱلْحُسْنَىٰ)، (مُؤَنَّث)ی (الأَحْسَن)ە، واتە: پاداشتی هەرە چاك هەیە، بۆ كەسانی چاكەكار) (وَزِيَادَةٌ)، وە زێدەشیان بۆ دەخرێتە سەر، ﴿وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ﴾، وە دەمو چاویان ڕەشییو تلْخییو، زەبوونیی دایناپۆشێ.

كە دەفەرموێ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟﴾، واتە: بۆ ئەوانەی كە چاكەیان كردوە، یانی: هەموو ئەو كردەوە باشانەی ئەنجامیان داون، وەك بوونناسییو جیهان بینیی ڕاستو دروست، ئنجا ئیمانو عەقیدەی تەواو، ئنجا خوا پەرستیی، پاشان ڕەوشتی جوان، ئنجا كردەوە باشەكان، هەمووی دەگرێتەوە، ئەوانە چییان بۆ هەیە؟ (ٱلْحُسْنَىٰ)، كە وەك گوتم (مؤنث)ی، (الأَحْسن)ە، واتە: (المثوبة الحُسنى)، پاداشتی هەرە چاك، (وزیادة)، هەندێكیان بە بینینی خوای بێ وێنەو تەماشاكردنی ڕووی لێكیان داوەتەوە، بەڵام وەك (طبري) دەڵێ: (یَحْتَمِلُ كُلَّ شَيءٍ حَسن)، (زِیَادَة)، لەو پاداشتە چاكە، واتە: هەموو شتێكی باش دەگرێتەوە، وەك دوایی باسی دەكەین.

لەوبارەوە ئەو فەرموودەیە گێڕدراوەتەوە: کە وشەی (زیادة)ی بە بینینی خوای پەروەردگارو، ڕوانین بۆ خوا ﷻ تەفسیر کردوە: {عَنْ صُهَيْبٍ قَالَ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ، الْجَنَّةَ، نُودُوا: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ! إِنَّ لَكُمْ عِنْدَ اللهِ مَوْعِداً لَمْ تَرَوْهُ، فَقَالُوا: وَمَا هُوَ؟ أَلَمْ يُبَيِّضْ وُجُوهَنَا، وَيُزَحْزِحْنَا عَنِ النَّارِ، وَيُدْخِلْنَا الْجَنَّةَ، قَالَ: فَيُكْشَفُ الْحِجَابُ، وَيَنْظُرُونَ إِلَى اللهِ عَزَّوَجَلَّ، فَوَاللّٰهِ مَا أَعْطَاهُمْ اللهُ شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنْهُ، ثُمَّ قَرَأَ ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۖ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢٦﴾﴾} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٣٩٧٠)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْط مُسْلِم، أَخْرَجَهُ أَيْضَاً التِّرمِذِيُّ برقم: (٢٥٥٢)، وَالبَزَّار برقم: (٢٠٨٧)، وَالنَّسائِيُّ فِي (الكُبْرَى) برقم: (١١٢٣٤)، والطبراني في (الأوسط) برقم: (٧٥٦)}.

واتە: صوهەیب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێك خەڵکی بەهەشت چوونە بەهەشتەوە، بانگ دەکرێن: ئەی خەڵکی بەهەشت! بەڵێنێکتان لەلای خوا هەیە، جارێ نەتانبینیوە، دەڵێن: چییە؟ ئەدی خوا ڕووی گەش نەکردووین‌و، لە ئاگری دۆزەخ دووری نەخستینەوەو، نەیخستینە بەهەشتەوە.

(ج بەڵێنێك ماوە بۆمان جێبەجێی بکات؟) دەفەرموێ: پەردە لادەدرێ‌و، تەماشای خوا دەکەن، سوێند بە خوا، هیچ شتێکیان پێ نەدراوە، خۆشەویستتر بێ لە لایان لەوە، (واتە: لە تەماشاکردنی خوا ﷻ).

کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ﴾، وە دەم‌و چاویان داناپۆشێ، نە (قَتَر)و، نە (ذِلَّة).

ئەمە لێرەدا مەبەست توانج گرتنە لە کافرەکان، واتە: ئیمانداران دەم‌و چاویان گەش‌و جوانە، ڕوو خۆش‌و دڵخۆشن، وەك کافرەکان باری خەمیان لێ نەنیشتوە‌و. دەم‌و چاویان تاڵ‌و ڕەش نەبووە‌و، زەبوون‌و شەرمەزار نەبوون.

وشەی (رَهَق)، دەڵێ: (رَهِقَهُ : غَشِيَهُ، وَعَلاهُ)، (رَهِقَهُ)، واتە: دایپۆشی‌و چووە سەری‌و لێی نیشت، (القَتَر)و، (القُتار)، کە کۆی (قَتَرة)یە، (وَهِيَ الغُبَارُ)، بریتیە لە تۆزو خۆڵ، راغیبی ئەصفەهانیی بەوە لێکی دەداتەوە، هەروەها (مختار الصحاح)یش، بە دووکەڵێك، یان بە تۆزو خۆڵێکی ڕەش، یان بە دووکەڵێکی ڕەش، کە لە ئەنجامی سووتاندنی شتێکدا پەیدا دەبێ، دەڵێ: (القَتَرُ: غَبْرَةٌ فِيهَا سوادٌ)، (قَتَر)، بریتیە لە بۆرایییەك کە ڕەشیی تێدا بێ.

بە (قَتْر)یش، خوێندراوەتەوە.

ئنجا دەفەرموێ : ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ﴾، ئا ئەوانە هاوەڵی بەهەشتن، یاخود خاوەنی بەهەشتن، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، (أَصْحَـٰبُ)، کۆی (صاحب)ە، (صاحب)یش بە مانای هاوەڵ دێ‌و، بە مانای خاوەنیش دێ.

<u>مەسەلەی شەشەم</u> : دێتە سەر باسی خراپەکاران، دەفەرموێ : ﴿وَٱلَّذِينَ كَسَبُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةٍۭ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ۖ كَأَنَّمَآ أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مُظْلِمًا ۚ أُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ


﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە شەش بڕگەدا :**

<u>بڕگەی یەکەم</u> : ﴿وَٱلَّذِينَ كَسَبُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾، وە ئەوانەی کە خراپەکانیان بە دەست هێناوە، خراپەکان کامانەن؟ هەموو ئەو کردەوانەن کە شەریعەتی خوا بە خراپیان دادەنێ، وە عەقڵ‌و فیطرەتی ساغیش بە خراپیان دادەنێ، چونکە خوا ﷻ شەریعەتی خۆی بە پێی فیطرەت‌و سروشتی ساغی ئینسان، ناردوە،

وەك لە ئایەتی ژمارە (٣٠)، سووڕەتی (الروم)دا، ئاماژەی پێكراوە، ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ الروم

ئەم ئایەتە موبارەكە ئەوە دەگەیەنێ كە فیطرەتو شەریعەت، دوو ڕووی دراوێكن، دوو ڕووی یەك حەقیقەتن، ئەوەی شەریعەت دەیڵێ، فیطرەتیش دەیخوازێ، ئەوەی فیطرەت دەیخوازێ، شەریعەتیش فەرموویەتیو وەڵامی داوەتەوە.

ئنجا ئەوانەی كە خراپەكانیان وەدەست هێناوە، هەموو ئەو شتانەی كە لە شەریعەت دا خراپنو، پێچەوانەی فیطرەتی ساغی مرۆڤیشن، كە بەدڵنیاییی كەسابەتی زۆر خراپیان كردوە، كەسێك هەموو كەسابەتو هەموو بەرهەمەكەی ئەوەبێ، كە خراپە وەدەست بێنێو هەگبەی خۆی پڕ بكات لە خراپە، بەڕاستیی كەسابەتێكی خراپی كردوە.

<u>**برگەی دووەم**</u> : ئەو جۆرە كەسانە چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەكرێ؟ ﴿ جَزَآءُ سَيِّئَةٍۭ بِمِثْلِهَا ﴾، سزای هەر خراپەیەك وەك خۆیەتی، بە ئەندازەی خۆیو سزای پڕ بە پێست دەدرێ، نە كەمتر، نە زیاتر، لە سووڕەتی (الأنعام)دا، خوا دەفەرمووێ: ﴿ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾ ﴾، واتە: هەر كەسێك چاكەیەك بكات، بە دە بەرانبەر پاداشتی دەدرێتەوەو، هەر كەس خراپەیەك بێنێ، بە ئەندازەی خۆی، وەك خۆی سزا دەدرێو، ئەوان ستەمیان لێ ناكرێ.

<u>**برگەی سێیەم**</u> : كە دەفەرمووێ : ﴿ وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ﴾، زەبوونیی لە دەمو چاویان دەنیشێ، زەبوونییان دێتە سەرێ، واتە: خەمباریو زەبوونییو ڕوو تاڵیی،

دەمو چاو تاڵو ترش بوون، لێیان دەنیشێ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە لە دواڕۆژدا، سزای مەعنەویی لە پێش سزای جەستەییەوەیە، چونکە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ مَّا لَهُم مِّنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ كَأَنَّمَا أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ اللَّيْلِ مُظْلِمًا﴾ ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ لە قۆناغی دوایی دان باسی سزای ئاگر دەکات.

**بڕگەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿مَّا لَهُم مِّنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ﴾ لە لایەن خواوە هیچ پارێزەرێکیان نیە، واتە: هیچ پارێزەرێك نیە لە سزای خوا بیانپارێزێ، هیچ کەسێكو هیچ پارێزەرێك نیە، سزای خوایان لێ دووربخاتەوە.

**بڕگەی پێنجەم:** دەفەرموێ: ﴿كَأَنَّمَا أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ اللَّيْلِ مُظْلِمًا﴾ هەروەك دەمو چاویان، ڕووەکانیان، بە چەند پارچەیەك لە شەوی تاریك داپۆشرابن.

وشەی (قِطَعًا) خوێنراویشەتەوە: (قِطْعًا)، واتە: (بَعْضًا) هەندێك لە شەوی تاریك، بەڵام (قِطَعًا) کۆی (قِطْعَة)یە، واتە: چەند پارچەیەك، شتێکی ڕەش بەسەر شتێکدا بدەیت، ئەوە دیارە ڕەش هەڵگەڕێ، ئەدی ئەگەر چەند پارچەیەك لە شتی ڕەش بخەینە سەر یەك؟ کەڵەکەی بکەی؟ دیارە زۆر زۆر ڕەش هەڵدەگەڕێ.

لێرەدا خوا ﷻ شەوی تاریکی چواندوە، بە پارچە قوماشێکی ڕەشەوە، کە چەند پارچەیەك لەو پارچە قوماشە ڕەشە دەبڕدرێو لەسەر یەك دادەنرێن، ئنجا دەخرێتە سەر دەموچاوی ئەوانە، واتە: دەموچاویان ئاوا ڕەشو تاریك دادێ.

**برگـەی شـەشـەم :** لـە کۆتـایی دا دەفـەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، ئـا ئەوانـە هـاوەڵ، یاخـود خـاوەنی ئاگـرن، (ئـاگری دۆزەخ)، بـە هەمیشـەیی تێیدا دەمێننـەوە.

**مەسـەلـەی حەوتـەم :** کـە دەفـەرموێ : ﴿ وَيَوۡمَ نَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ مَكَانَكُمۡ أَنتُمۡ وَشُرَكَآؤُكُمۡۚ فَزَيَّلۡنَا بَيۡنَهُمۡۖ وَقَالَ شُرَكَآؤُهُم مَّا كُنتُمۡ إِيَّانَا تَعۡبُدُونَ ٢٨ فَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدَۢا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ إِن كُنَّا عَنۡ عِبَادَتِكُمۡ لَغَٰفِلِينَ ٢٩ ﴾

**ئەم ئایەتـەش لە پێنج برگـەدا شیدەکـەینـەوە:**

**برگـەی یـەکـەم :** کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَيَوۡمَ نَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ٢٨ ﴾، وە ئـەو ڕۆژەی هەمووان کۆدەکەینـەوە.

(حشـر) بریتیە لەوەی لە چەند شوێنێکی جیا جیـاوە، خەڵکی کۆبکرێتـەوە، بۆ یەك شـوێنی تـایبـەت، کە لێرەدا مەبەست ئەوەیە: خـوا هـەموو مرۆڤـەکانو، جندەکان، هەرچی کە لەسـەر زەوی ژیـاوە، خـوا هـەموویان کۆدەکـاتەوە بـۆ ئـەو گۆڕەپانەی کە لێپرسینەوەو سزاو پاداشتی تێدا ئەنجـام دەدرێ.

**برگـەی دووەم :** ﴿ ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ مَكَانَكُمۡ أَنتُمۡ وَشُرَكَآؤُكُمۡ ﴾، دوایی بەوانەی کە هاوبەشیان بۆ خـوا دانـاون، دەڵێین: بوەسـتن، خۆتـانو هاوبەشـەکانتـان، واتـە: ئەوانـەی کـە ئێـوە پێتـان وابـوو هاوبەشـی خـوانو، کـردبووتـانن بـە هاوبـەش بـۆ خـوا، لە بەندایەتیـی بۆکـرانـدا، لـە پەرسـتندا، ئەگـەرنـا بێگومـان خـوا هاوبەشـی نیـە، بەڵام لە خەیـاڵو وەهمـی ئەوانـدا، هـاوبەش بـوون.

**برگەی سێیەم** : ﴿ فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ ﴾، لێکمان جیا کردنەوە، لێکمان ترازاندن، دەڵێ: (فَرَّقْنا، وَمَيَّزْنا، زَيَّلَ يُزَيِّلُ مزَايلَةَ)، واتە: لێکی جیا کردەوە، مەبەست ئەوانەن کە پەرستوویانن‌و، ئەوانەش کە پەیڕەویی لێکراوو پەرستراوەکانن.

**برگەی چوارەم** : ﴿ وَقَالَ شُرَكَآؤُهُم مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا تَعْبُدُونَ ﴾، وە هاوبەشەکانیان، {واتە: نەك هاوبەشەکانی خوا، بەڵکو ئەوانەی کە لە وەهم‌و خەیاڵی ئەو نەزانانەدا، هاوبەشی خوا بوون}، هاوبەشەکانیان گوتیان: ئێوە ئێمەتان نەدەپەرست، واتە: هەموو ئەوانەی کە بە هاوبەشی خوا دانراون، حاشا دەکەن، دووریی دەکەن لەوانەی کە پەرستوویانن.

**برگەی پێنجەم** : ﴿ فَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ إِن كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَٰفِلِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: خوا بەسە شایەد بێ‌و چاودێر بێ‌و، بەڵگەبێ لەنێوان ئێمەو ئێوەدا.

ئەم (إنْ)ە بۆ تەئکیدە، بە بەڵگەی ئەوە کە دوایی (ل) خراوەتە سەر (غافلین)، واتە: بێگومان لە پەرستنی ئێوە لە بێئاگایان بووین، هیچ ئاگامان لێنەبووەو ڕازی نەبووین، هەڵبەتە ئەوە بۆ فریشتەکان‌و، پێغەمبەران‌و، مرۆڤانێکی بەچاك دانراون، کە پەرستراون، ئاوا دەڵێن، ئنجا بت‌و صەنەمەکانیش، مانگ‌و خۆرو دارو بەردو، ئەوانەش کە دەپەرسترێن لە ماددەی بێ ژیان، یان بێ هەست‌و هۆش، ئەوانەش هەر بێئاگا بوون، ئەگەرنا کەسانێك کە پەرستراون بە ئاگاداری خۆیان، ناتوانن ئەو حاشایە بکەن، ئەو کاتە هەمان حوکمی ئەو کەسانەیان هەیە کە پەرستوویانن.

لە سووڕەتی (سبأ)دا، خوا ﷻ ئێرەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ۖ بَلْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ۖ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژە کە (خوا) هەموویان کۆدەکاتەوە، دوایی بە فریشتەکان

دەفەرموێ: ئایا ئا ئەوانە ئێوەیان دەپەرست؟ گوتیان: پاکیی بۆ تۆ، تۆ سەرپەرشتیارو خاوەنو مشوورخۆری ئێمەی، جیا لەوان، بەڵکو ئەوانە جندیان دەپەرست، زۆربەیان پێیان بڕوادار بوون.

کەواتە: ئەگەر فریشتەشیان پەرستبن، ئەوە بەدنەدانو وەسوەسەی شەیتانەکان بووەو، ئەگەر بتو صەنەمیشیان پەرستبن، شەیتان بۆی جوان کردوون.

ئنجا دەربارەی وشەی (زیل)، خاوەنی (التحریر والتنویر) دەڵێ: (زَیَّل: مُضَاعَفُ زَالَ المُتَعَدِّي، یُقَالُ: زَالَهُ عَنْ مَوْضِعِهِ یَزِیلُهُ، بِمَعْنَى أَزَالَهُ، فَجَعَلُوهُ یَائِي العَیْنِ للتَفْرِقَةِ بَیْنَهُ وَبَیْنَ زَالَ القَاصِرِ الَّذِي هُوَ وَاوِي العَیْنِ، (فزیَّل) فعل للمبالغة في الزَّیْل، مثل فَرَّق مُبَالَغَةَ فِي فَرَقَ، وَالمَعْنَى: وَقَعَ بَیْنَهُمْ تَفْرِیقٌ قَوِيٌّ، بِحَیْثُ انْقَطَعَتْ جَمِیعُ الوُصُلُ الَّتِي کَانَتْ بَیْنَهُمْ)، واتە: (زیَّل) لە (زال)ی (متعدّي)یەوە هاتوە، دەگوترێ: (زَالَهُ عن موضعه یَزِیلُهُ) لەشوێنی خۆی لایدا، لایدەدا، بەمانای (أزالَهُ): لایدا، دێ، بۆیە (عین الفعل)ەکەیان کردوە بە (ی) تاکو لە (زالَ)ی (قاصر) کە (عین الفعل)ەکەی (و)ە، جیابێتەوە. (زال: یانی: لاچوو)، ئنجا (زیَّل) لە (زَیْل)ەوەیەو بۆ زێدەڕۆییە، وەك (فَرَّق) کە لە (فَرَق)ەوە دێ، ماناکەی: لێك ترازانێکی بەهێز لەنێوانیان دا ڕوویدا، بەجۆرێك کە هەرچی پەیوەندیی نێوانیان بوو، پچڕا.

**مەسەلەی هەشتەمو کۆتایی** : کە دەفەرموێ : ﴿هُنَالِكَ تَبْلُوا۟ كُلُّ نَفْسٍ مَّآ أَسْلَفَتْ وَرُدُّوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ٣٠﴾.

لە سێ بڕگەدا ئەم ئایەتە موبارەکە، شیدەکەینەوە.

**بڕگەی یەکەم** : ﴿هُنَالِكَ تَبْلُوا۟ كُلُّ نَفْسٍ مَّآ أَسْلَفَتْ﴾ ، واتە: لەو شوێنەدا، لەو کاتەدا، کە ڕۆژی دواییە، لە گۆڕەپانی لێپرسینەوەو سزاو پاداشتدا، هەموو نەفسێك ئەوەی کە پێشی خستوە، لێی حاڵی دەبێ، بۆی دەردەکەوێ.

زانـایان گوتوویـانە: (تَخْتَبِـرُ كُـلُّ نَفْـسٍ مَـا قَـدَّمَتْ)، هـەر نەفسێك چـی پێشخستوە لە ژیـانی دنیایـدا، ئێستـا دێتـە بەرچـاوی، دەیجەربێنـێو دەزانـێ چی کـردوە.

وشـەی (تبلوا)، خوێنراویشـەتەوە: (تَـتْلُوا)، کـە بە دوو مانـایان دێ:

أ/ (تَتْلُـوا كُـلّ نَفْـسٍ)، هـەر نەفسـێك دەیخوێنێتـەوە، وەك لـە سـوورەتی (الإِسْرَاء)دا دەفەرموێ : ﴿ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ ﴾ واتە: نووسـراوەکەی خۆت بخوێنـەوە، ئـەمڕۆ خۆت بەسـی کـە لێپرسـینەوە لەگەڵ خۆتـدا بکـەی.

ب/ (تَتْلُوا) بە مانـای (تَتَّبِـعُ)دێ، یانـی : هەر نەفسێك بـە دوای ئـەو کـردەوەیە دەکـەوێ، کە ئەنجامی داوە، واتە: هەر کەسێك دەبێتـە بارمتـەی کـردەوەکـانی خۆیو، هەر کەسـە لە گرەوی کـردەوەی خۆیـدا دەبـێ.

<u>**بڕگـەی دووەم :**</u> ﴿ وَرُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ ﴾، وە گێـڕدرانـەوە بـۆ لای خـوا، سـەرپەرشتیارو مشوورخۆری چەسپاوو حەقو ڕاسـتیان.

(الرَدُّ: الإِرْجَاعُ)، واتە: گـێڕانەوە، (والمولـى: السيِّد ومتولِّي الأمور)، (مولـى) بە مانـای سـەیدو گـەورەو سـەروەر دێ، وە بە مانـای سـەرپەرشتیاری کاروبار دێ.

(والحق: الـموافق للواقعِ والصِّدْق)، (حق) واتـە: شـتێك کە لـەگـەڵ واقیـع داو، لەگەڵ ڕاستی ڕێك بێ، واتە: دەگێڕدرێنەوە بۆ لای خـوای سەرپەرشتیاری هەقیان، وە هیچ پەیوەندییان نـامێنێ بەو شتـانەوە کە پەرسـتوویانن، چونکـە شـایسـتەی پەرسـتـران نـەبوون، پەرسـتـراوەکان بۆخۆشـیان هـی چیـان لەدەسـت نایـەت، چ جـای بۆ ئـەوانەی پەرسـتوویانن!

<u>**بڕگـەی سـێیـەم :**</u> ﴿ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴾، ئەوەی کە هەڵیاندەبەست، بە درۆ هەڵیان دەبەسـت، کە دەیانگوت: ئەوانـە هاوبەشی خـوان، ئەوانەیان لـێ ون بوون.

وشەی (ضَلَّ: بَطَلَ، ضَاع، فُقِدَ)، واتە: پووچ بوو، زایە بوو، ون بوو.

﴿مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ﴾، (أي إفتراؤهم)، واتە: هەڵبەستنەکەیان، ئەوەی کە بە درۆ هەڵیاندەبەست، کە بریتی بوو لەو پەرستراوانەی کە لە خەیاڵو وەهمی خۆیان دا پێیان وابوو، ئەوانە بەشیان هەیە لە پەرستراندا، شایستەی پەرسترانن‌و، تکایان لە لای خوا بۆ دەکەن، ئەوانەیان هەموو لێ ون بوون، بە کوردیی : (بوون بە سەپانی پووشێ)و، (دەستیان لە بنی هەمبانەی بەتاڵەوە دەرچوو).

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چوارەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئەم دەرسـەمان لە ئایەتەکانی: (٣١ تـاکـو ٤٠) پێـك دێ، واتـە: دە (١٠) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، دیـارە لـەم دە ئایەتـەدا، خـوای زانـاو توانـا لـە دوو تـەوەردا، هەنـدێك ڕاسـتیی گەورەو گرنگ دەخـاتە ڕوو:

تـەوەری یەکـەم : خـوا بـە یەکگـرتن، (توحیـد اللە)و، تـەنیا شایسـتەیی خـوا، بـۆ بەندایـەتیی بـۆ کـرانو پەرسـتران، ئنجـا بـۆ سەلـماندنی ئـەو بابەتـە، خـوا بـە پێغـەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ دەفـەرموێ: کـە چـەند پرسـیارێك ئاڕاسـتەی هـاوبەش بۆ خـوا دانەرەکان بکات:

یـەك: کـێ لە ئاسمانو زەوییـەوە ڕۆزیـیو بژیوتـان دەدات ؟

دوو: کـێ خـاوەنی بیسـتنو چاوەکانە ؟

سـێ: کـێ زینـدوو لە مردوو، وە مردووو، لە زینـدوو، دەردێنـێ؟

چـوار: کـێ کـاروباری بوون هەڵدەسووڕێنـێ؟

کە دیارە وەڵامەکەیان ڕوونەو تەنیـا خـوایە، کە هـەموو ئەو کـارانەی لەدەسـتبـێن، ئنجا خـوا دەفـەرموێ: ئایـا پارێـزی لـێ ناکـەن ؟

پاشان ڕایدەگەیەنێ، کە خـوا بە تـەنیا پـەروەردگاری ڕاستەقینەیانەو، لاڕێ بـووان بڕیـاری خـوایان لەسـەر چەسپاوە، کە بـڕوا نـاهێنـن.

دوایی خـوا ﷻ دووبـارە بە پێغـەمبـەری خاتـەم موحەممەد ﷺ دەفـەرموێ : کە لێیـان بپرسـێ: کـە ئایـا هـیچ کـام لـە هاوبەشـەکانیان شت دروسـت دەکـەن؟ پاشان

دوای ئەوەی لەبەین دەچێ، دەیگێڕنەوە؟ وە ئایا هیچ کام لە پەرستراوەکانیان، خەڵك بەرەو هەق ڕێنمایی دەکەن؟ هەر خۆشی پێی دەفەرموێ: کە پێیان ڕابگەیەنێ: بەس خوا ئەوەی لەدەستدێ، کە شت دروست بکاتو، دوای فەوتانیشی بیگێڕێتەوە، وە خەڵك ڕێنمایی بکات، بەرەو هەق، بۆیە هەر بۆخۆشی ﷻ شایستەی پەیڕەویی لێکراونو، ملکەچیی بۆکرانو بەندایەتیی بۆکرانە، دوایی خوا دەیخاتە ڕوو، کە ئەوانە تەنیا شوێن گومانو وەهم کەوتوون.

تەوەری دووەم : کە لەم دە (١٠) ئایەتەدا خراوەتە ڕوو، باسی قورئانە، کە پەیامو سروشی خوایەو، ناگونجێ هەڵبەسترا بێو، خوا تەحەددایان دەکات، واتە: داوایان لێدەکات، بێنە مەیدان، کە ئەگەر ڕاست دەکەن، ئەم قورئانە هی خوا نیە، با وێنەی سووڕەتێکی بێنن، هەرچی بە دەنگیشیانەوە دێ، لە دۆستو پشتیوانیان کە هاوکاریانن، لە خەڵکی سەر زەوی، لە جندو مرۆڤ بانگیان بکەن، وەك لە سووڕەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ : ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ﴿٨٨﴾ ﴾ واتە: بڵێ: ئەگەر مرۆڤو جند هەموویان کۆببنەوەو پشتی یەکدی بگرن، کە وێنەی ئەم قورئانە بێنن، (بەڵکو وێنەی دە (١٠) سووڕەت بێنن، وەك لە سووڕەتی هووددا دەفەرموێ، بگرە وێنەی سووڕەتێکی بێنن، وەك لێرەدا دەفەرموێ، وە لە سووڕەتی بەقەڕەدا دەفەرموێ) ناتوانن.

ئنجا ئایا هۆی بێبڕوایی ئەوانە چییە؟ ڕوونی دەکاتەوە، کە بەهۆی نەزانییانەوە، بڕوا بە قورئان ناهێنن، جارێ دەرکی ڕاستییەکانی قورئانیان نەکردوە، ئەو هەواڵانەی کە قورئان داونی، جارێ سەرەنجامەکەیان، نەهاتۆتە دی، پاشان خوا پۆلێنیان دەکات، بۆ بڕوادارو بێبڕوا، کە دوایی ڕوونی دەکەینەوە، مەبەست لە بڕوادارو بێبڕوا چییە؟

﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ
ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا
تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ
﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ فَسَقُوٓا۟ أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ قُلْ هَلْ مِن
شُرَكَآئِكُم مَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣٤﴾
قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَهْدِى لِلْحَقِّ ۗ أَفَمَن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ
أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّىٓ إِلَّآ أَن يُهْدَىٰ ۖ فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٥﴾ وَمَا يَتَّبِعُ
أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ۚ إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَا
كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ
ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ
وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِمَا لَمْ يُحِيطُوا۟ بِعِلْمِهِۦ
وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ
﴿٣٩﴾ وَمِنْهُم مَّن يُؤْمِنُ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن لَّا يُؤْمِنُ بِهِۦ ۚ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾.

## مانای وشــە بە وشەی ئایەتەکـان

{بڵێ: کێ لە ئاسمان‌و زەوییەوە بژێوتان دەدات؟ یان کێ بیستن‌و چاوەکانی بەدەستن؟ وە کێ زیندوو لە مردوو، وە مردوو لە زیندوو دەردێنێ؟ وە کێ سەرپەرشتیاریی بوون دەکات؟ بێگومان دەڵێن: خوا، بڵێ: ئەدی پارێز لە (سزای) خوا ناکەن؟ ﴿٣١﴾ ئا ئەو خوایەتان پەروەردگاری هەق‌و ڕاستەقینەتانە، ئنجا ئایا لە دوای هەق، جگە لە گومڕایی چی دیکە هەیە؟ بەرەو کوێ‌و چۆن لا دەدرێن؟ ﴿٣٢﴾ ئاوا بەو شێوەیە (وشە) بڕیاری پەروەردگارت لەسەر ئەوانە چەسپیوە، کە لاڕێ بوون، کە بڕوا ناهێنن ﴿٣٣﴾ بڵێ: ئایا هیچ کام لە هاوبەشەکانتان دروستکراو لە نەبوونەوە دێنێتە دی؟ ئنجا پاش لەبەین چوون دەیگێڕێتەوەو دروستی دەکاتەوە؟ بڵێ: بەس خوا دروستکراو پەیدا دەکات‌و، دواییش دەیگێڕێتەوە، چۆن هەڵدەگێڕدرێنەوە؟ ﴿٣٤﴾ بڵێ: ئایا لە هاوبەشەکانتان کەس هەیە (خەڵك) بەرەو هەق ڕێنمایی بکات؟ بڵێ: بەس خوا (خەڵك) بەرەو هەق ڕێنمایی دەکات، ئنجا ئایا کەسێك (خەڵك) بەرەو هەق ڕێنمایی دەکات، شایستەترە پەیڕەویی لێ بکرێ، یان کەسێك کە مەگەر ڕێنمایی بکرێ، ئەگەرنا خۆشی ڕێی هەق نازانێ، چیتانە چۆن دادوەریی دەکەن؟ ﴿٣٥﴾ وە زۆربەیان جگە لە وەهم‌و گومان شوێن هیچ ناکەون. وەهم‌و گومانیش هیچ کەلێنی هەق پڕ ناکاتەوە ﴿٣٦﴾ وە ئەم قورئانە ناگونجێ لە خوار خواوە هەڵبەسترابێ، بەڵکو بە ڕاستدانەری کتێبەکانی پێش خۆیەتی‌و، ڕوونکردنەوەی مەبەستەکانی کتێب (کتێبە پێشووەکان)، بەبێ هیچ دوودڵییەك، لەلایەن پەروەردگاری جیهانییانەوەیە ﴿٣٧﴾ یان ئایا دەڵێن: (موحەممەد ﷺ) هەڵیبەستوە، بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن، هەر کەسێك دەتوانن جگە لە خوا بانگیان بکەن بۆ هاوکارییتان، سوورەتێکی وەك وی بێنن، ﴿٣٨﴾ بەڵکو ئەوەی بە درۆیان دانا زانیارییان لەبارەیەوە نیەو، جارێ سەرەنجامەکەیان بۆ نەهاتوە، (ئەو شتانەی هەواڵی پێداون نەهاتوونە دی) هەر ئاواش ئەوانەی پێش وان، بێبڕوا بوون، دەجا سەرنج بدە! سەرەنجامی ستەمکاران چۆن بوو! ﴿٣٩﴾ وە هەیانە بڕوای پێدێنێ‌و، هەشیانە بڕوای پێ ناهێنێ‌و، پەروەردگارت زاناترە بە تێکدەران ﴿٤٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(فَأَنَّىٰ ): واتە: چۆن؟ كەی؟ بۆ كوێ؟ (أَنَّى: تَكُونُ شَرْطِيَة بمَعْنَى أَيْنَ : أَنَّى تَبْحَثُ تَجِدْ فَائِدَةً، وَاستفْهَامِيَّةً بمَعْنَى مِنْ أَيْنَ : أَنَّى لَكِ هَذَا؟ وبِمَعْنَى مَتَى، وبِمَعْنَى كَيْفَ؟)[1]، (أَنَّى)، جاری وایە پێی دەگوترێ: (شَرْطِيَة)، بە واتای (أَيْنَ) دێ، واتە: لە كوێ، وەك (أَنَّى تَبْحَثُ تَجِدْ فَائِدَةً)، لە هەر شوێنێك تۆ لێكۆڵینەوە بكەی، سوودێك دەبینی، وە جاری وایە بە مانای پرسیاركردن دێ، واتە: (مِنْ أَيْنَ) دێ، واتە: (أَنَّى لَكِ هَذَا) ئەمەت لە كوێ بوو؟ وە جاری وایە بە مانای (مَتى)، واتە: كەی دێ، وە جاری وایە بە مانای (كَيْفَ) دێ، واتە: چۆن.

(تُصۡرَفُونَ ): (الصَّرْفُ: رَدُّ الشيءِ مِنْ حَالَةٍ إِلى حَالَةٍ)[2]، (صرف) بریتییە لە شتێك كە لە حاڵێكەوە بگۆڕێ بۆ حاڵێكی دیكە.

(حَقَّتۡ )، (حَقَّ يَحِقُّ: أي وَجَبَ، ثَبَت، وَأحَقَّهُ غَيْرهُ أوْجَبَهُ)[3]، (حَقَّ يَحِقُّ) واتە: پێویست بووە، یان چەسپاوە، (أَحَقَّهُ غَيْرهُ: أَوْجَبَهُ) غەیری خۆی هێنایەدی، یان چەسپاندی، یان پێویستی كرد.

( كَلِمَتُ )، (الكلمة: الأَمْرُ، الوَعْدُ، الثَّوَابُ، وَالعِقَاب)[4]، وشەی (كَلِمَة) بە مانای فەرمان دێو، بە مانای بەڵێنی خوا دێ، كە ئەویش یان پاداشتە، یان سزایە.

---

١) المعجم الوسيط، ص ٣١.

٢) مختار الصحاح، ص ٣٧٥.

٣) مختار الصحاح، ص ١٤٧.

٤) المعجم الوسيط، ص٣١ .

(يَبۡدَؤُاْ )، (بَدَأَ الشَّيءَ: أَنْشَأَهُ وَأَوْجَدَهُ، أَبْدَأَ وَأَعَادَ: بَدءَ وَعَادَ)[1]، (بَدَأَ الشَّيءَ) واتە: لە سەرەتاوە دروستی کرد، یانی: پێشینەی نەبوو، لە نەبوو هێنایە دی، پەیدای کرد، (أَبْدَأَ وَأَعَادَ)، واتە: دەستی پێکردو گێڕایەوە.

(يُعِيدُهُۥ)، (أَعَادَ الشيءَ إِلَى مَكَانِهِ: أَرْجَعَهُ)[2] ئەو شتەی ئیعادە کرد، واتە: گێڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی، دووبارەی کردەوە، هێنایەوە.

(تُؤۡفَكُونَ)، (أَفِكَ فُلَانَاً عَنِ الشيءِ أَفْكاً: صَرَفَهُ) کەواتە: (أَفِكَ فُلَانَاً عَنِ الشيء)، واتە: فلان کەسی لادا لەو شتە، (وَالأَمْرَ عَنْ وَجْهِهِ: قَلَبَهُ وَصَرَفَهُ)، واتە: کارەکەی لاداو، ڕووی پێ وەرگێڕا.

(لَّا يَهِدِّيٓ )، واتە: (لاَ يَهْتَدِي) بە ڕێگا نازانێ، یان ناتوانێ ڕێی ڕاست بگرێ.

(لَا يُغۡنِي )، واتە: سوودی پێ ناگەیەنێ، (غَنِيَ بِالمَكَانِ: أَقَامَ)، واتە: نیشتەجێ بوو، مایەوە لەوێ، (أَغْنَى الشيءُ)، واتە: ئەو شتە کافی بوو، بەس بوو، واتە: ئەو شتە مرۆڤی بێ نیاز کرد.

(تَأۡوِيلُهُۥ)، (التأوِيلُ: الرُّجُوعُ إِلَى الأَصْلِ) (تأویل) گەڕانەوەیە بۆ ئەسڵ، بنەڕەت، (المَوْئِل: المَوْضِعُ الَّذِي يُرْجَعُ إِلَيْهِ)، (مَوْئِل) واتە: ئەو شوێنەی کە خەڵکی بۆ لا دەگەڕێتەوە.

ئنجا (وَذَلِكَ هُوَ رَدُّ الشيءِ إِلَى الغَايَةِ المُرَادَةِ مِنْهُ، عِلْمَاً كَانَ أَوْ فِعْلاً)، دەڵێ: (تأویل)، بریتییە لە گەڕانەوەی شتێك بۆ مەبەستەی کە بۆی ویستراوە، چ لە ڕووی زانیارییەوە بێ، چ لە ڕووی کردەوەوە بێ، لە ڕووی زانیارییەوە قسەیەك دەکرێ، واتاکەی ڕوون نییە، دوایی دەگێڕدرێتەوە بۆ ئەو مەبەستەی کە لەو قسەیەدا لەبەرچاو گیراوە.

---

١) المعجم الوسيط، ص ٤١.

٢) المعجم الوسيط، ص٦٣٥.

(طبري)، تەفسیرەکەی خۆی بەو ناوە ناوناوە : (جَامع البَيَان فِي تأوِيلِ القُرآن)، واتە: گێڕانەوەی وشەکانی قورئان، بۆ ئەو مەبەستانەی (کە بە بۆچوونی ئەو)، خوای پەروەردگار ویستوونی، کە ئەوە ڕەددی عیلمیی پێ دەڵێن.

ئەوی دیکەش کردەوەیە، بۆ وێنە: یوسف (علیه السلام) کە دەفەرموێ : ﴿وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ ١٠٠﴾یوسف، واتە: وە گوتی: ئەی بابە گیان! ئەوە سەرەنجامی خەونەکەمە، کە پێشتر بینیبووم، ئێستا بە کردەوە هاتە دی.

## مانــای گشــتــی ئایەتەکـــان

وەك لە پێنـاسـەی ئەم دەرسەدا گوتمان: خـوای بەرزو مەزن لەم دە (١٠) ئایەتـەدا دوو بابەتی گەورەو بنـەڕەتی ئیسلام، دەخاتـەڕوو کە بریتیـن لە:

١/ خـوا بە یەکگرتن، تەنیا بەندایەتیی بۆ خـوا کرانو، تەنیا پەرسـترانی خـوا ﷻ (توحید الله).

٢/ پاشـان مەسـەلەی قورئـان کە کتێبـی خـوای پەروەردگـارە، وە وەحـیو سروشـی خـوایـە، بۆ پێغـەمبـەری خاتـەمی نـاردوە.

ئەم دوو بابەتـە لـەم دە ئایـەتـە بەپێـزەدا خـراونە ڕوو.

سـەرەتـا خـوا ﷻ دێتـە سـەر بابـەتی یەکـەمیان، واتـە: (خـوا بەیەکگـرتن)، وە بـە پێغـەمبەری خاتەم ﷺ دەفـەرموێ ؛ چەند پرسیارێك لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان، لە کافرەکان بکات، کە وەڵامەکەیان زۆر ڕوونە، بەڵام بۆیە ئەو پرسیارانەیان لێدەکـات، بۆ ئەوەی بە خەبەریان بێنـێ، کە مادام وەڵامی ئەو پرسیارانە بەوشـێوەیەیە، پێویسـتە ئەو ئەنجامگیـرییەش بنیات بنرێ، لەسەر ئەو وەڵامانە، دەفەرموێ : ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾، دیارە ئەمـە هـەر لـە سیاقی ئـەو قسـەو باسـانەدایە کـە کافرەکـانو هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان، دەدوێنـرێنو، وتووێژیان لەگەڵدا دەکرێو، بەرچـاویان ڕۆشـن دەکرێتـەوە، کـە: ئێـوە بـە هەڵەداچوون، کە جگە لە خـوا دەپەرسـتن، لە خـوار خـواوە شتـانێکی دیکـە دەپەرسـتنو دەیانهێننە ڕیزی خـواو، دەیانهێننـە ئاستی خوا، وەك لە سـووڕەتی (الشـعراء)دا هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان لـە ڕۆژی دوایـی دا دەڵـێن: ﴿ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ

نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾، واتە: دەڵێن: سوێند بە خوا ئێمە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بووین، کە ئێوەمان یەکسان دەکرد لەگەڵ پەروەردگاری جیهانییاندا.

ئنجا لێرەدا دەفەرموێ : ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، بڵێ: کێ بژێوتان دەدات، (لە سەرێ و لە خوارێ) لە ئاسمان و زەوییدا؟ ﴿ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ ﴾، یاخود کێ خاوەنی بیستن و بینینەکانە؟ کێ خاوەنی گوێ و گوێەندامی بیستن و، گوێەندامی دیتن، چاوو هەموو ئەو پێکهاتە سەرسوڕهێنەرانەیە؟ ﴿ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ ﴾، وە کێیە زیندوو لە مردوو دەردێنێ و، مردوو لە زیندوو دەردێنێ؟ ﴿ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ﴾، وە کێ سەرپەرشتیی هەموو کاروبارەکان دەکات؟ یانی: هەموو کاروباری بوون، ﴿ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ ﴾، بێگومان لە وەڵامی ئەو پرسیارە ڕاستەوخۆیانەدا، کە وەڵامەکەیان زۆر ڕۆشنە، هەر دەڵێن: بێگومان خوا، واتە: هەر خوا بژیومان دەدات لە ئاسمان و زەوییەوە، (لە سەرێ و خوارێوە) وە هەر خوا خاوەنی گوێ و چاوەکانە، وە هەر خوا زیندوو لە مردووو، مردوو لە زیندوو دەردێنێ و، هەر خوا سەرپەرشتیی کاروباری بوونەوەر دەکات، ﴿ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾، تۆش پێیان بڵێ: ئەدی بۆچی پارێز ناکەن؟ خۆتان ناپارێزن لە سزای خوایەك کە ئەو هەموو چاکەو نیعمەتانەی لەسەر ئێوە هەن، کەچی ئێوە بچن هەندێك لە دروستکراوەکانی بێننە ئاستو ڕیزی خواو، لە بەندایەتی بۆکران و پەرستراندا، بەشدارییان پێ بکەن ؟ ﴿ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلْحَقُّ ﴾، ئا ئەم خوایەتان، خاوەن و پەروەردگارو مشوورخۆری هەق و ڕاستەقینەتانە، ﴿ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ ﴾، لە دوای هەقیش تەنیا گومڕایی هەیە، (حق) واتە: شتێك کە چەسپاو بێ، شتێك کە بوونێکی ڕاستەقینەی هەبێ، پێچەوانەکەی بریتیە لە (باطل)، واتە: شتێك تەنیا لە

وەهەو زەمیندا هەبێ‌و، بوونێکی ڕاستەقینەی نەبێ، لێرەدا دەفەرموێ : ﴿ فَمَاذَا بَعۡدَ ٱلۡحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُۖ ﴾، لە دوای ڕاستیی، تەنیا گومڕایی هەیە، یان لە دوای شتی چەسپاو، تەنیا شتی ون بوو هەیە، چونکە (ضلال)، یانی: ونبوون، (ضل) واتە: (ضاع)، ون بوو، لە دوای ڕێگای ڕاستگرتن، تەنیا سەرگەردانیی‌و سەرلێشێواویی هەیە، ﴿ فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ ﴾، (أنَّى): لێرەدا واتە: بەرەو کوێ لادەدرێن، یاخود چۆن لادەدرێن؟ واتە: مادام خوا هەمەکارەی ئێوەیە، خوا سەرپەرشتیاری ئێوەیە، پەروەردگاری ئێوەیە، ژیێنەری ئێوەیە، دەبێ هەر ئەویش بەندایەتیی بۆ بکرێ.

﴿ كَذَٰلِكَ حَقَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ فَسَقُوٓاْ أَنَّهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە وشەی پەروەردگارت، (واتە: یاسای پەروەردگارت، بڕیاری پەروەردگارت) لەسەر ئەوانە چەسپیوە کە لادەر بوون‌و لایانداوە، ئەو بڕیارو یاسایەی خوا چییە؟ ﴿ أَنَّهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾، کە بڕوا ناهێنن، واتە: کەسانێك کە لادەدەن لە حوکمی عەقڵ‌و فیطرەت، لە حوکمی شەریعەت، لادەدەن، دووردەکەونەوە، دیارە بڕیاری خوایان بەسەردا دەچەسپێ، کە هەرکەسێك لە ڕێی ڕاست لابدات، ئیمان ناهێنێ، ئینسان لە ڕێی ڕاستەوە خوا دەناسێ، لە ڕێی ڕاستەوە، ئیمان دێنێ، کاتێك کە لە ڕێی ڕاست لادەدات، ناتوانێ بڕوابێنێ.

وشەی (فِسْق) بە مانای (خرُوج)ە، (فَسَقُوا) واتە: (خَرَجُوا) دەرچوون، لە کوێ‌و لەچی دەرچوون؟ لە حوکمی عەقڵ، لە حوکمی فیطرەت‌و سروشتی ساغی خۆیان دەرچوون، لە حوکمی وەحی‌و شەریعەتی خوای پەروەردگار دەرچوون، جا کەسانێك ئاوا لەو ڕاستە ڕێیانە دەربچن، بێگومان سەرەنجامەکەیان ئەوە دەبێ کە ئیمان ناهێنن، ئینسان لە ڕێی ڕاستەوە، دەتوانێ ئیمان بێنێ، بەڵام لە ڕێگای چەوتەوە، بەرەو کوفرو گومڕایی‌و سەرگەردانیی دەچێ.

دوایی خوا ﷻ هەندێ پرسیاری دیکە بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: کە ناڕاستەی بێبڕوایەکانیان بکات، دەفەرموێ : ﴿ قُلۡ هَلۡ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَبۡدَؤُاْ

ٱلۡخَلۡقَ ﴾، پێیان بفەرموو: ئایا لە هاوبەشەکانتان {واتە: ئەوانەی کە لە وەهم و زەینی پووچی ئێوەدا هاوبەشی خوان، ئەگەرنا لە دنیای واقیعدا، خوا هاوبەشی نین} ئایا لە نێو هاوبەشەکانتاندا کەسی وا هەیە کە شت لە نەبوونەوە بێنێتە دی؟ ﴿ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ﴾، ئنجا دوای ئەوەش کە لە بەین دەچێ، دووبارە بیگێڕێتەوەو بیهێنێتەوە؟ ﴿ قُلِ ٱللَّهُ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ﴾، دیارە پێویست ناکات چاوەڕێی وەڵامەکە بێ، بۆیە پێی دەفەرموێ : بڵێ : هەر خوا سەرەتا شت دەست پێ دەکات، لە نەبوونەوەو پەیدای دەکات، ﴿ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ﴾، دوای ئەوەش، بە نسبەت ژیانەوەرانەوە، دوای ئەوەی کە مردنیان بەسەردا دێ و، بە نسبەت شتەکانی دیکەوە، دوای ئەوەی کە ئەو حاڵەتەی هەیانە دەگۆڕێ و، دەچنە حاڵەتێکی دیکە، دووبارە دەیانگێڕێتەوەو دەیانهێنێتەوە بۆ دۆخی پێشێیان، ﴿ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴾، واتە: چۆن؟ چونکە (أَنَّى) دەگونجێ بە مانای (مِنْ أيْنَ) بێ، واتە: لە کوێوە؟ یاخود (إلى أيْنَ) بێ، واتە: بەرەو کوێ لادەدرێن؟ یاخود بە مانای (كَيْفَ) بێ، واتە: چۆن لادەدرێن؟ هەڵبەتە (أنَّى) بە مانای کەی (مَتَى)ش دێ.

بەڵام لێرەدا ئەو مانایە (کەی) ناگونجێ.

وشەی (تُؤۡفَكُونَ ) لەگەڵ (تُصۡرَفُونَ ) جیاوازییەکەی ئەوەیە: (صَرْف) بریتیە: لە (لادان)، (صُرِفَ)، واتە: (لادرا)، بەڵام (أُفِكَ)، واتە: (هەڵگێڕرایەوە) واتە: لادانی تێدایە، بەڵام بە هەڵگێڕرانەوەوە ﴿ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴾، بەرەو کوێ هەڵدەگێڕدرێنەوە؟

پرسیارێکی دیکە: ﴿ قُلۡ هَلۡ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّۚ قُلِ ٱللَّهُ يَهۡدِي لِلۡحَقِّ ﴾، بڵێ: ئایا لە نێو هاوبەشەکانتاندا کەسی وا هەیە کە ڕێنمایی بکات بۆ هەق؟ ڕێی هەق پێشان بدات، هەق لە بواری بووناسیی دا، لە بواری ئیمان و عەقیدەدا، لە بواری پەرستن دا، لە بواری ڕەوشت دا، لە بواری حەڵاڵ و حەرام دا، لە بواری حوکم و

سیاسەت دا، لە هەموو ڕووەکانەوە، ﴿ قُلِ ٱللَّهُ يَهْدِى لِلْحَقِّ ﴾، بەڵێ: هەر خـوا ڕێنمـایی دەکـات بەرەو هـەق، هەر خـوا هەق بە خەڵك دەنـاسێنیّو، دەیانخاتـە سـەر ڕێی هـەق، ﴿ أَفَمَن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّىٓ إِلَّآ أَن يُهْدَىٰ ﴾، ئـەوە پرسـیاری نکووڵیی لێکەرانەیە: ئایا کەسێك کە خەڵك بەرەو هەق ڕێنمایی دەکات، شایستەترە کە شوێنـی بکەونو، پەیڕەویی لـێبکرێ، یاخود کەسێك کە خۆشی بە ڕێیە نازانـێ، مەگـەر ڕێنمایی بکرێو ڕێگای پێشان بـدرێ؟ ﴿ فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴾، ئـەوە چیتـانە، چـۆن حوکـم دەکـەن؟ چۆن بڕیـار دەدەن؟ بڕیارەکـەی ئێـوە زۆر پێچـەوانەی عەقـڵو مەنتیقە، کە تەنیا خـوا ﷻ ڕێگای ڕاست پێشانی خـەڵك دەدات، تـەنیا ئـەو بەدیهـێنانو گێڕانەوە ئەنجام دەدات، تەنیا ئەو هـەموو نیعمەتـەکانی بەدەسـتن، کەچی غـەیری ئـەو بپەرستن، ئەوە زۆر پێچەوانەی عەقڵو مەنتیقە!

دوایی دەفـەرموێ: ﴿ وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ﴾، زۆربـەیان تـەنیا بـە دوای گومـان دەکـەون.

(ظـنّ) لێـرەدا بریتیـە: لەوە کە ئینسـان زانیاریی بە شـتێك هەبێ، بەڵام دڵـنیا نەبـێ تێیدا، کە ئەو شتە وایە، ئەوانە هەر بەدوای گومان دەکەون، ﴿ إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ﴾، بێگومان گومانیش هیچ شـوێنـی هـەق نـاگرێ، لـە شـتێکـدا کـە پەکـت لەسـەر دڵنیـایی کـەوتبێ، گومـان هـیچ دادێکـت نـادات، بـە کەڵکـت نایـەت، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴾، بێگومان خـوا زانـایە بەوەی کە ئەنجامی دەدەن، کە ئەمە هەڕەشـەیە، واتـە: مادام تەنیا بە دوای گومان دەکەون، لە شتێکدا کە دەبێ لەسـەر دڵـنیـاییو یەقین بنیـاتی بنێن، ئەوە ئـارە کردەوەیـەکی خراپ دەکەن، خـوای دادگەریش زانـایە بـەو کردەوانـەیان. واتە: سـزایان دەدات.

لـێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ﴾، وە زۆربەیـان، بـەس دەکەونـە دوای گومان، لەبەرئەوەیە کە کەمێکیان یەقینان هەبوو کە موحەممەد ﷺ پێغەمبـەری

خوایە، یەقینیان هەبوو بە قورئان، کە فەرمایشتی خوایە، بەڵام سەرۆکایەتییو بەرژەوەندییە ناشەرعییەکان، دەستو پێیان گرتبوون، بەڵێ ئەبو جەهلو نەضری کوڕی حاریثو ئەبو سوفیانو ئەو زلە زلانە، دەیانزانی کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، بەڵام زۆربەیان، واتە، ڕەشو ڕووتو خەڵکەکە کە چەواشەیان کردبوونو هەڵیان خەڵەتاند بوون، ئەوانە لە گومان دابوون.

ئەوە باسی خوا بەیەکگرتن، کە بابەتی یەکەم بوو.

دوایی دێتە سەر بابەتی دووەم، کە باسی قورئانە، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، وە نە دەگونجاو، نەدەشیا ئەم قورئانە لە خوار خوای پەروەردگارەوە، یاخود لەلایەن جگە لە خواوە، هەڵببەسترێ، ﴿ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾، بەڵام ئەم قورئانە بە ڕاست دانەری هەموو کتێبەکانی پێش خۆیەتی، واتە: وەك ئەسڵەکەیان کە لە خواوە هاتوون، پەیامو بەرنامەکانی خوا کە بە پێغەمبەرانی دیکەدا ناردوونی، قورئان هەموویان بە ڕاست دەزانێ، ﴿ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، وە ڕوونکردنەوەی کتێب، واتە: ڕوونکردنەوەی هەموو کتێبەکانی خوا، ئەوەی کە پێویست بێ لە قورئاندا، دیارە ڕوونکراوەتەوە، وەك لە سووڕەتی (المائدة)دا دەفەرموێ : ﴿ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتە: بە ڕاست دانەری کتێبەکانی پێش خۆیەتیو، بەسەریشیانەوە چاودێرەو، خستوونیە ژێر ڕکێفو کۆنترۆڵی خۆیەوە، لە هەر شوێنێك دەستکاریی کرابن، ئەگەر بە پێویستی بزانێ، خەڵکی لێ ئاگادار دەکاتەوە.

دەفەرموێ: ڕوونکردنەوەی کتێبە پێشووەکان، لە قورئاندا هیچ گومانی تێدانیە، هیچ دوو دڵییەکی تێدا نیە، کە لەلایەن پەروەردگاری جیهانییانەوەیە، هەر ئەو ﷻ ئەو نادیارو پەنهانە دەزانێ، ئەو ڕابردووە دەزانێ، کە تەورات، ئینجیل، زەبوور،

کتێبەکانی دیکە کوێیان دەستکاریی کراوە، کوێیان گۆڕدراوە، وە ئەگەر بە پێویستی بزانێ، ڕاستی بکاتەوە بۆ بەشەر.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ ﴾، یان ئایا دەڵێن: (موحەممەد ﷺ) قورئانی هەڵبەستوە، (واتە: بە درۆ بە ناوی خواوە گوتوویەتی، ئایا شتی وا دەڵێن؟) ﴿ قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّثْلِهِ ﴾، بڵێ: فەرموون: ئێوەش سوورەتێکی وەك وێنەی قورئان، وێنەی یەکێك لە سوورەتەکانی قورئان بێنن، ﴿ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾، وە هەرچی لە تواناتاندا هەیە بانگیان بکەن، جگە لە خوا، لە خوار خواوە کێ هەیە، بانگیان بکەن، با هاوکارتان بن، پشتیوانتان بن، بۆ ئەوەی وێنەی نەك هەموو قورئان، بەڵکو وێنەی یەکێك لە سوورەتەکانی قورئان بێنن، ئەگەر ڕاست دەکەن، بەڵام ئەگەر نەتانتوانی، وەك لە چەندان شوێنی قورئاندا هاتوە، لە سوورەتی (البقرة)دا هاتوە، لە سوورەتی (القمر)دا هاتوە، لە سوورەتی (هود)دا هاتوە، ئەگەر نەتانتوانی، ئەوە دیارە ڕاست ناکەن، لەو تۆمەتەتاندا کە پاڵی دەدەنە لای پێغەمبەر ﷺ و لای قورئان.

دوایی خوا ﷻ حەقیقەتی هەڵوێستەکەیان دەخاتە ڕوو، دەفەرموێ: ﴿ بَلْ كَذَّبُوا بِمَا لَمْ يُحِيطُوا بِعِلْمِهِ ﴾، بەڵکو ئەوانە شتێکیان بە درۆ داناوە، کە دەورەی زانیارییەکەی ویان نەداوە، واتە: نازانن چی تێدایە، پێی شارەزا نین، پێی ئاشنا نین، تفەنگ بە تاریکییەوە دەنێن، وەك عەرەب دەڵێن: (النـاسُ أعْداءُ مَا جَهِلُوا)، خەڵك دوژمنی شتێکن کە پێی نائاشنان، لە ڕاستییدا ئەوانەش قەدری قورئان نازانن، قەدری زێڕ لای زێڕنگەرە، پێی ئاشنا نینو، نازانن چی تێدایەو، نێوەڕۆکەکەی چییە؟ ﴿ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ ﴾، وە سەرەنجامی هەواڵەکانی ئەم قورئانەشیان بۆ نەهاتوە، ئەم قورئانە دەفەرموێ: زیندوو دەکرێنەوە، سزا دەدرێن، سەرەنجام پەیامی پێغەمبەر (علیهم الصلاة والسلام) دەچەسپێو، ئێوە هیچتان لەدەست نایەت، کە ئەوانە

هەندێکیان لە قیامەت دا دێنە دیو، هەندێکیان لە دنیادا هاتوونە دی، وەك لە کۆتایی سوورەتی (ص)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينٍۭ ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: ... بێگومان هەواڵەکەی دەزانن دوای ماوەیەکی دیکە، کە ئەمە بۆ هەموو بەشەر نێردراوە، ئنجا ئێستا لە هەموو نێو بەشەردا ئەم کتێبە هەیە، وە یەك لەسەر چواری بەشەر کەمو زۆر ئیمانیان بەم قورئانە هەیەو، خۆیان بە شوێنکەوتووی ئەم قورئانە دەزانن، چونکە یەك لەسەر چواری بەشەر مسوڵمانن، کەواتە: ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينٍۭ ﴾، وە بە تەئکید لەمەودوا، دوای ماوەیەکی دیکە، هەواڵەکەی دەزانن، هی ئەم قورئانە، دیارە خەڵکی مەککە وایاندەزانی ئەوە شتێکی ناوچەییەو، بەس پەیوەندیی بە ئەوێوە هەیە، بەڵام خوا ﷻ فەرموویەتی: بۆ هەموو بەشەرە بۆ هەموو جیهانییانە، کە دواییش بە نێو هەموو جیهانییاندا بڵاوبۆوەو، یەك لەسەر چواری جیهانییان وەك گوتم: کەمو زۆر بوونە شوێنکەوتووی، بوونە پەیڕەوی.

وشەی (تأویل)یش، لە (أوْل)ەوە هاتوە (أوْل)، واتە: (رَجْع)، گەڕانەوە، (تأویل)، واتە: گێڕانەوەی شتێك بۆ ئەسڵەکەی، جارێ ئەنجامی ئەومیان بۆ نەهاتوە کە قورئان هەواڵی پێ دەدات، ﴿ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، هەر بەو شێوەیەش ئەوانی پێش ئەوانیش پێغەمبەرانی خۆیانیان بە خاوەن درۆ دانا، وە کتێبەکانی خوایان بە درۆ دانا، ﴿ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، بەڵام سەرنجیان بدە ! سەرەنجامی ستەمکاران چۆن بوو؟!

واتە: ئەوانەی کە ستەمیان لە خۆیانو پێغەمبەرانو پەیامەکانی خوا کردو، لە بەندەکانی خوا کرد، کە نەیانهێشت پەیامەکانی خوایان پێ ڕابگات، درۆو دەلەسەیان بۆ کرد، خەڵکیان چەواشە کرد، سەرنج بدە! ئەو ستەمکارانە سەرەنجامیان چۆن بوو؟

بە تەئکید ستەمکارەکانی ڕۆژگاری تۆش، ئەی پێغەمبەر ﷺ! وە ڕۆژگارەکانی دیکەش، هەر هەمان سەرەنجامیان دەبێ.

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُم مَّن يُؤْمِنُ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن لَّا يُؤْمِنُ بِهِۦ﴾، وە هەیانە لەو کافرانە بڕوای پێ دێنێ‌و، هەشیانە بڕوای پێ ناهێنێ، ﴿وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِٱلْمُفْسِدِينَ﴾، پەروەردگاریشت بە تێکدەران زاناترە، هەیانە بڕوای پێ دێنێ، واتە: هەیانە لە نەفسی خۆیداو لە ناخی خۆیدا، دەزانێ کە قورئان هەقە، بەڵام دەرینابڕێ، کە بەدڵنیاییەوە ئەو قەناعەتەی دەربڕینی لەگەڵ نیە، سوودی نیە، چونکە ئەوە پێی دەگوترێ: (جحود)، وەك خوای شارەزا دەربارەی ئالی فیرعەون دەفەرموێ:

﴿وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ...﴿١٤﴾﴾النمل، واتە: نکووڵییان لێکرد، (دانیان پێدا نەهێنا) هەرچەندە لە دەروونیشیاندا یەقینیان هەبوو.

لە نێو کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺیشدا، دوای ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺیش کەسانێکی وا هەن، هەشیانە هەر بڕوای پێناهێنێ.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە: کە هەیانە لە داهاتوودا، بڕوای پێ دێنن، هەشیانە بڕوای پێناهێنن‌و، پەروەردگاری تۆ بە تێکدەران زاناترەو، سزای پڕ بە پێستیان دەداتەوە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَـٰلُ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾، لێرەدا خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: حەوت پرسیار ئاراستەی هاوبەش بۆ خوا دانەرو بێبڕوایەکان بکات:

**پرسیاری یەکەم و دووەم** : ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، بڵێ: کێ بژیوتان دەدات؟ لە سەرێوەو لە خوارێوە، (ٱلسَّمَآءِ)، واتە: سەرێ، (وَٱلْأَرْضِ)، واتە: خوارێ، یاخود ئاسمان و زەوی، کێ بژیوتان دەدات؟ جارێ مەبەست لەم حەوت پرسیارە ئەوەیە، کە خوای پەروەردگار دەیەوێ عەقڵ و ویژدانیان بجووڵێنێ، کە هەرچی نازو نیعمەت و خێرو چاکەیە لە ژیانی ئێوەدا، لەلایەن خواوەیە، ئەدی مادام وایە، بۆچی بەندایەتییشتان خوا ساغ و یەکلاناکەنەوە؟ تەنیا خواش ناپەرستن؟ بۆچی هاوبەشی بۆ پەیدا دەکەن؟ بۆچی ڕوو لە غەیری خوا دەکەن؟

لە ڕاستییدا ئێمە هەر ئەم ڕستەیە : ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، ئەگەر بمانەوێ هەقی خۆی بدەینێ، زۆری دەوێ، بەڵام هەر ئاماژەیەکی کورت دەکەین :

**ئاماژەیەکی کورت بە چەند چاکەو نیعمەتێکی خوا لە ژیانی بەشەردا:**

١) ئەو بژیوەی لە ئاسمانەوە دێ، پێش هەمووی تیشکی خۆرە، کە تیشکی خۆر هەم گەرمییمان دەداتێ، هەم ڕووناکییمان دەداتێ، ئنجا ئەو خۆرە کە پێنج ملیار (٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵە، خوا دایگرساندوە، تا ئێستا، نە کەس خەمی لێ خواردوە، نە جارێك پڵتە پڵتی کردوە، وەك چرای بەشەر، نە جارێك شۆرتی کردوە، نە جارێك لە کاتی خۆی دواکەوتوە، نە جارێك شەوقەکەی کەمتر بووە، لە هی پێشێ، ئەوە بە نسبەت تیشکی خۆرەوە.

٢) ئنجا ئاو کە سەدا حەفتا (٧٠٪)ی پانتایی زەوی داپۆشیوە، تیشکی خۆر لێیدەداو دەیکاتە هەڵم‌و، ئاوی دەریاکان‌و ئۆقیانووسەکان، هەمووی سوێرە، سوێرو تاڵ‌و تفتە، نەك ئینسان هەر پێی ناخورێتەوە، ئەگەر بیخواتەوە، هەر پێشی دەمرێ، بەڵام خوای پەروەردگار لە ڕێی تیشکی خۆرەوە، هەڵم لەسەر ڕووی ئەم دەریایانە پەیدا دەکات، دوایی دەیکاتە هەورو، سەرەنجام ئاوێکی شیرینمان لەو ئاوە سوێرو تاڵ‌و تفتە بۆ دەپاڵێوێ، وەك لە سوورەتی (الواقعة)دا دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيۡتُمُ ٱلۡمَآءَ ٱلَّذِي تَشۡرَبُونَ ٦٨ ءَأَنتُمۡ أَنزَلۡتُمُوهُ مِنَ ٱلۡمُزۡنِ أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡمُنزِلُونَ ٦٩ لَوۡ نَشَآءُ جَعَلۡنَٰهُ أُجَاجٗا فَلَوۡلَا تَشۡكُرُونَ ٧٠ ﴾، واتە: بڵێ: ئایا ئەو ئاوە کە دەیخۆنەوە، سەرنجتان داوە؟ ئایا ئێوە لە هەور دەینێرنە خوار، یاخود ئێمە دەینێرینە خوارەوە؟ ئەگەر ویستبامان تاڵ‌و تفتمان دەکرد، هەر {وەك چۆن لە ئەسڵدا تاڵ‌و تفتە، سوێرو تاڵە، ئاوا لێی دەگەڕاین‌و نەماندەپاڵاوت تاڵایی‌و تفتی‌و سوێرییەکەمان لێ لانەدەبرد، ئاوێکی شیرین‌و زوڵاڵ بنۆشن} ﴿ فَلَوۡلَا تَشۡكُرُونَ ﴾، دەبووایە سوپاسگوزاریی بۆ خوا بکەن.

٣) ئنجا پلەی گەرمیی، جیاوازیی نێوان بەستەڵەکی سەروو و خواروو، لەگەڵ هێڵی یەکسانیی (خط الإستواء)، پلەی گەرمیی، کە لە دوو جەمسەرەکە، زۆر نزمەو لە ژێر سفرەوەیەو، لە هێڵی یەکسانیی دا زۆر بەرزە، کەواتە: پلەی

گەرمیی جیاواز، هۆکاری جووڵاندنی هەوایەو، لە ئەنجامی ئەوەدا هەوا دەجووڵێ، لە ئەنجامی ئەوەشدا با هەڵدەکاتو، دەگونجێ ئەو هەڵمەی سەر دەریا کە بە تیشکی خۆر پەیدا دەبێ، بجووڵێنرێ، سەرەنجام بێتە ناوچە ساردەکانو، ببێتە هەورو، بەفرو بارانو تەزرەی لێ پەیدا بێ.

٤) هەروەها (هەوا)، کە پێشتریش باسمان کردوە، ئەو بەرگە هەوایەی کە دەوری زەوی داوە، کە سەدا حەفتاو هەشت (٧٨٪)ی نایترۆجینەو، سەدا بیستو یەك (٢١٪)ی ئۆکسجینە، سەدا سفرو لە دەدا سێی (٠,٣٪)، دووەم ئۆکسیدی کاربۆنو هەندێك لە توخمەکانی دیکەش بە ڕێژەیەکی کەمتر هەن، ئنجا ڕێژەی ئەو پێکهاتانەی هەوا، هەمووی بەو شێوەیە، دەبوو هەر ئاوابن، بۆ ئەوەی ژیان لەسەر زەوی دروست بێو بەردەوام بێ.

٥) بە نسبەت بژێوی زەوییەوە: جارێ توخمەکانی زەوی، کالیسیۆمو فۆسفۆرو مەگنیسیۆمو ئاسنو کاربۆن، ئەوجار جۆرەکانی بەکتریا، کە هەمووی ڕۆڵی هەیە لەوەدا کە ژیان لەسەر زەوی هەبێ، پاشان جۆری تۆوەکانو، جۆری نێوکەکان، جۆرەکانی دانەوێڵەو سەوزەو میوە، بۆ وێنە، گەنم، زانایان دەڵێن: (٣,٦٠٠) جۆر گەنم هەیە، دار خورما، هەندێك لە شارەزایان دەڵێن: (٧٠٠) جۆرە دارخورما هەیە، سەدان جۆرە درەختی مێو (ترێ) هەیە، هەروەها میوەکانی دیکە.

<u>پرسیاری سێیەمو چوارەم</u>: ﴿أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ﴾، یان ئایا کێ خاوەنی بیستنو بینینەکانە؟ دیارە هەر خوا ﷻ خاوەنە، بەڵام لێرەدا بۆ جووڵاندنی هەستو ویژدانیانە، شایانی باسە کە هەمیشە لە قورئاندا وشەی (ٱلسَّمْعَ) پێش (البصر) خراوە، واتە: بیستن پێش دیتن خراوە، بۆچی؟

١- یەکێك لە هۆکارەکانی ئەو پێشخستنە، ئەوەیە کە: کۆرپەلە، پێش ئەوەی لە دایك بێ، لە سکی دایکیشی دا، لە منداڵدانی دایکیشیدا، دەنگ دەبیستێ، بەڵام بە تەئکید هیچ نابینێ، وە کە لە دایکیش دەبێ، سەرەتا هیچ نابینێ، بەڵام

دەنگەكان دەبیستێ، واتە: پێشێ هێزی بیستنی دەكەوێتە كار، ئنجا هێزی دیتن، بۆیە خوای زاناو شارەزا هەمیشە هێزی بیستن پێش دەخات.

٢- پاشان هەر كەسێك كەڕ بێ، لاڵیش دەبێ، بەڵام مەرج نیە كە كوێر بوو، لاڵ بێ، چونكە بابای كەڕ هیچ وشەیەك، هیچ دەنگێك، هیچ پیتێكی ناچێتە زەینەوە، بۆیە ناتوانێ فێری قسە ببێ، وە لە قورئاندا تەنیا لە یەك ئایەتدا وشەی (البصر)، پێش (السمع) خراوە، واتە: دیتن پێش بیستن خراوە، ئەویش ئایەتی ژمارە (١٢)ی سووڕەتی (السجدة)یە، كە دەفەرموێ: ﴿ ... رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴾، واتە: (لە ڕۆژی قیامەتێ كە خەڵك زیندوو دەبێتەوە، ئەوانەی بێبڕوان تاوانبارو خراپەكارن، دەڵێن:) پەروەردگارمان ! بینیمان‌و بیستمان، بمانگێڕەوە (واتە: بۆ ژیانی دنیا)، با كردەوەی باش بكەین، ئێستا دڵنیاین (كە ژیان تەنیا ژیانی دنیا نەبوو، بەڵكو لێپرسینەوەو سزاو پاداشت هەبوو، ئێستا گەیشتووینە دڵنیایی) ئەگەر بمانگێڕیەوە، چاكە دەكەین.

لێرەدا لەو هەڵوێستەدا دەڵێن: ﴿ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا ﴾، ئەگەرنا لە شوێنەكانی دیكەدا هەر بیستن پێش دیتن خراوە، بۆچی؟ چونكە بینینی ئەو دیمەنە سەرنج ڕاكێشانەی قیامەت، زیاتر كاریگەریی هەیە لە بیستنی دەنگەكان، پاشان تیشك لە چركەیەكدا (٣٠٠,٠٠٠) كیلۆمەتر دەبڕێ، بەڵام دەنگ لە چركەیەكدا (٣٣٠) مەتر دەبڕێ، واتە: ئەو دیمەنانەی كە دەیانبینن، زووتر دەكەونە بەرچاویان، لەو دەنگانەی دەیانبیستن، جاری وایە تۆ هەورە تریشقەیەك دەێ، یەكسەر دەیبینی، بەڵام دوای ماوەیەك ئەوجار دەنگەكەی دەبیستی، ئنجا لەبەر ئەوەی ئەوانیش پێشێ شتەكان دەبینن، چونكە تیشك خێراترە، دوایی دەنگەكە دەبیستن، بۆیە لەوێ دیتن پێش بیستن خراوە، دیارە ئەگەر باسی ئەوەش بكەین كە كۆئەندامی گوێ (بیستن)، هەم سەیوانی گوێ، هەم كۆئەندامی گوێ، پەردەی گوێ، چەكوش‌و سندان‌و ئەو هەموو وردەكارییەی كە لە گوێدا هەیە، چۆن دوایی ئەو دەنگانە لە ڕێی گوێوە نەقڵ دەبن بۆ نێو مێشك، ئنجا

مێشك ئەو دەنگانە، كە ڕەنگە لە (١٠٠٠/١)ی چرکەیەکدا، بگەنە مێشك، ئێستا من قسە دەکەم و دەگاتە گوێی ئێوە، یەکسەر تێی دەگەن، هەر کە دەنگەکە دەچێ، ئەو دەنگە بەر پەردەی گوێ دەکەوێ، پەردەی گوێ دەلەرێتەوە، ئەویش چەکوشەکە دەلەرێنێتەوە، لە سندانەکە دەدات، ئنجا لە ڕێگای ئەوەوە دەگاتە مێشك، وردەکارییەکە، هەر خوا ﷻ دەزانێ چۆنە.

هەروەها چاو کە بە ملیۆنان خانە، لە پێکهاتنی چاودا دەوریان هەیە، کە چۆن چاو وێنەکان دەگرێ، بە هەڵگێڕاوەیی دەیانگرێ، دوایی کە دەیداتە مێشك بە ڕێکییە، ئەوە هەمووی وردەکاریی زۆری تێدایە، کە لە کتێبەکانی (فیسیۆلۆژیی دا) کە باسی جەستەی مرۆڤ دەکەن، باسکراون.

<u>پرسیاری پێنجەم و شەشەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ ﴾، وە بڵێ: کێ زیندوو لە مردوو دەردێنێ، وە مردوو لە زیندوو دەردێنێ؟ جا کاتی خۆی گوتوویانە: زیندوو لە مردوو دەردێنێ، وەك بێچووی باڵندان، بێچووی ژیانەوەران، کە لە هێلکەکەیان دێتە دەرێ، کە هێلکەکە مردوویە، بەڵام ئەو بێچووەی لێی دێتە دەرێ، زیندووە،

مردوو لە زیندوو دەردێنێ، گوتوویانە: وەك چۆن هێلکە مردوویە، لە مریشکی زیندووی دەردێنێ.

بەڵام ئێستا چەمکی دەرهێنرانی زیندوو لە مردوو، وە مردوو لە زیندوو، زۆر فراوان بووە، لە جەستەی هەر کامێك لە ئێمەدا لە خولەکێك دا بە ملیۆنان خانە دەمرن و، بە ملیۆنان خانە پەیدادەبن، خانەی زیندوو، کە ژیانیان تێدا پەیدا دەبێ، ئنجا لە هەموو دەوروبەرماندا بەردەوام ژیان لە ماددەی بێ ژیان پەیدا دەبێ، ئەوەی کە ژیانداریشە دەگۆڕێ و ژیانەکەی لێ وەردەگیرێتەوە، هەڵبەتە من لە شوێنێکی دیکەشدا باسم کردوە، کە ڕووح تایبەتە بە مرۆڤەوە، بەڵام ژیان، واتە: (الحيَاة)، لە ڕووەکیشدا هەیە، لە زیندەوەرانیشدا هەیە، لە پەلەوەرانیشدا هەیە، لە ئاژەڵ و دڕندانیش دا هەیە، بەڵام ڕووح تایبەتە بە مرۆڤەوە، نوتفەی مرۆڤیش ژیانی تێدایە، پێش ئەوەی ڕووحیشی بەبەردا

بکرێ، چونکە ئەو خانەیەی، یاخود ئەو هێلکۆڵە (بویضة)ی ئافرەت، لەگەڵ تۆویلکەی (حَیمَنَ) پیاودا کە یەکدەگرن، وە نوتفەی لێ پێکدێ‌و، نوتفەش زیندەوەرێکە، هەردووکیشیان (بویضة و حَیمَنَ) هەر زیندوون، واتە: خاوەنی ژیانن، بەڵام دوایی پاش چوار مانگو ده شەو، ڕووحی بەبەردا دەکرێ، کە دیارە ئەوە قۆناغێکی دیکەی ژیانەو، ڕووح تایبەتە بە مرۆڤەوە.

ئنجا ئایا کێ زیندوو لە مردووو، وە مردوو لە زیندوو دەردێنێ؟ هەر خوا ﷻ، نهێنی ژیان (حیاة)یش تا ئێستا هەر نهێنییەو بێجگە لە خوا کەس نایزانێ، هەرچەندە زانست زۆر بەرەو پێشەوە چووە، بەڵام لە بەرانبەر نهێنی ژیاندا دەستەوسانە!

<u>پرسیاری حەوتەم</u>: لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ﴾، وە کێ سەرپەرشتی کاروبارەکان دەکات؟ کێیە کاروبار بەڕێوە دەبات؟ جا کاروبار بەڕێوەبردن، کاروباری کەهکەشانەکان، بەڵکو کاروباری گەلە کەهکەشانەکان (الحشود المجريَّة)، پاشان کاروباری کەهکەشانی ئێمە، کۆمەڵەی خۆر، کاروباری سەر زەوی هەمووی، کاروباری دنیا، کاروباری دواڕۆژ، کاروباری فریشتەکان، کاروباری جندو مرۆڤ، کاروباری ئەو دروستکراوانەی دیکە، کە خوا هەر بۆخۆی دەیانزانێ، کێ کاروبار هەمووی بەڕێوە دەبات؟ کێ ئەو کارانە هەموویان دەکات؟ ﴿فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ﴾، بە تەئکید دەڵێن: خوا، دیارە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان‌و کافرەکان بە درێژایی مێژوو ئیشکالیان نەبووە، لەوەدا کە خوا تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنە، بەڵکو گرفت‌و ئیشکالیان لەوەدا بووە، کە چۆن مامەڵە لەگەڵ خوادا بکەن؟ بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾.

پێیان بڵێ: ئەدی پارێز ناکەن؟ ئەدی ئەگەر مادام بەس خوا ﷻ بژێوتان دەدات لە سەرێ‌و لە خوارێوە، لە ئاسمان‌و زەوییەوەو، هەر ئەو بیستن‌و دیتنەکانی بە دەستن، هەر ئەو ژیاندار لە مردووو، مردوو لە ژیاندار دەردێنێ‌و، هەر ئەو هەموو کاروبارەکان بەڕێوە دەبات‌و سەرپەرشتییان دەکات، ئەدی بۆچی پارێزی لێناکەن؟

بۆچی هاوبەشی بۆ پەیدا دەکەن؟ بۆچی پشتی تێ دەکەن؟ بۆچی پابەند نابن بە بەرنامەکەیەوە؟

دوایی دەفەرموێ : ﴿ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلۡحَقُّۖ فَمَاذَا بَعۡدَ ٱلۡحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُۖ فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ ﴾، ئا ئەو خوایەتان، پەروەردگارو خاوەنی ڕاستەقینەتانە، لەدوای هەق جگە لە گومڕایی‌و سەرگەردانیی، چی دیکە هەیە؟ هیچی دیکە نیە، ﴿ فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ ﴾، بەرەو کوێ لادەدرێن؟ یانی: بۆچی جڵەوی خۆتان داوەتە دەست کەسانێکی دیکەی غەیری خۆتان؟ داوتانەتە دەست شەیتان، داوتانەتە دەست طاغووتەکان، دەست فیرعەونەکان، کە تووشی کۆیلایەتییتان دەکەن، لە خواپەرستیی لاتان دەدەن، بۆ ئەوەی ئازادیی خۆتان لەدەست بدەن، تاکو ئەوەی پێی بوون بە مرۆڤ، کە ئیرادەو ویستی ئازادانەیە، لەدەستی بدەن، بەرەو کوێ لادەدرێن؟ بۆچی وا کۆنتڕۆڵی خۆتان‌و جڵەوی کاروباری خۆتان لەدەست داوە؟ یانی: ئێوە وا دێنە بەرچاو، کە ئەسڵەن خاوەنی ئیرادەی خۆتان نەبن‌و، خۆتانتان لە دەست دابێ.

لە ڕاستییدا شیرك‌و کوفر، وا لە ئینسان دەکات کە ئازادیی خۆی، کەسایەتیی خۆی لەدەست بداتو، لە ڕاستییدا ئینسان بەهۆی ئیمان‌و خواناسین‌و خوا بە یەکگرتنەوە، ڕێزو حورمەت‌و کەسایەتیی خۆی دەپارێزێ.

<u>**مەسەلەی دووەم**</u> : کە دەفەرموێ : ﴿ كَذَٰلِكَ حَقَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ فَسَقُوٓاْ أَنَّهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٣٣ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە: وشەی پەروەردگارت، بڕیاری پەروەردگارت چەسپاوە بەسەر ئەوانەدا کە لایانداوەو لاڕێ بوون، کە بریتیە لەوەی: ﴿ أَنَّهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾، کە بڕوا ناهێنن، واتە: لە ئەنجامی لادانیاندا، وایان لێهاتوە کە نەتوانن بڕوا بێنن، بۆچی؟ وەك لە مانا گشتییەکەشدا گوتمان، چونکە ئینسان لەسەر ڕێی ڕاست، دەتوانێ ئیمان بە خوا بێنێ، بەڵام کە دەکەوێتە سەر ڕێی چەوت، ناتوانێ ئیمان بێنێ، واتە: ئیمان بە خوا، بەو شێوەیە کە لەلای خوا قبووڵە،

نەك خواناسیی، چونکە ئیبلیسیش خوا دەناسێ، فیرعەونو ئەبو جەهلیش خوایان دەناسی، ئیمان واتە: خوا بناسی بە هەقو، بە عەقڵ هەرچی خوا فەرموویەتی دەرکی بکەیو، وە بە ڕاستی بزانی، دانی پێدا بێنیو، بە دڵ قبووڵی بکەیو پەسندی بکەی، خۆشت بوێو، بە زمان دانی پێدا بێنی، ئیقراری پێ بکەیو، بە ئەندامەکانیشت جێبەجێی بکەی، خوا دەفەرموێ : بڕیاری پەروەردگارت بەسەر ئەوانەدا چەسپاوە، کە لایانداوەو دەرچوون، لەچی دەرچوون؟ لە حوکمی عەقڵ، لە حوکمی فیطرەت، لە حوکمی شەریعەت چەسپانی ئەو بڕیارەش بریتیە لەوەی کە: ﴿أَنَّهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾، کە بڕوا ناهێنن، مەبەست لە وشەی پەروەردگارت، یان بڕیاری پەروەردگارت، یانی: خوا ﷻ لە ژیانی بەشەردا، بەرنامەیەکی داناوە، وەك چۆن هەر فەرمانگەیەك، هەر دامەزراوەیەك سیستەمێك دادەنێ، پەیڕەوێکی نێوخۆ دادەنێ، بۆ بەڕێوەبردنی، ئەو دامەزراوەیە، ئەو فەرمانگەیە، هەر کاتێك هەر فەرمانبەرێك پێچەوانەی ئەو پەیڕەوی نێوخۆ (نظام الداخلي)یە بجووڵێتەوە، تووشی سزا دەبێ، خوای کارزانیش ئەم کەونو کائیناتەی لەسەر سیستەمێك داناوەو، بە پێی بەرنامەیەك کاروبارەکانی خۆی بەڕێوە دەباتو، هەڕەمەکیی نیە!

ئیدی کەسێك لە بەرنامەی خوا لابدات، تووشی سزای خوا دەبێ، ئنجا خوای پەروەردگار ئەو سیستەمەو ئەو یاسایانەی خۆی، کە ئێمە لە ژیانی دنیاماندا پێی دەڵێین: پەیڕەوی نێوخۆ، ئەوە بەچی تەعبیری لێکردوە؟ بە وشەی (كَلِمَة)، بڕیاری خوا، کەواتە: جاری وایە بڕیارو یاسای خوا، بە هۆی لادانی خەڵکەوە بەسەریاندا دەچەسپێ، کە شایستەی سزادان دەبن.

لێرەدا دەفەرموێ : بڕیاری خواو یاسای خوا لەسەر ئەوانەی کە لایانداوە، لا ڕێ بوون، دەرچوون، چەسپاوە، کە بڕوا ناهێنن، دیارە ئینسان بە هۆی لادانەوە، ڕێی ئیمان هێنانی لێ دەگیرێ، کە ئەوەش یاسای خوای دادگەرە.

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ: ﴿قُلۡ هَلۡ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥۚ قُلِ ٱللَّهُ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ٣٤﴾، بڵێ: ئایا لە

هاوبەشەکانتان، (واتە: ئەوانەی لە خەیاڵو وەهمی ئێوەدا، هاوبەشی خوان، ئەگەرنا لەسەر ئەرزی واقیع، خوا هاوبەشی نین، هەر خوا خوایە، ئەویدی هەموو گاو بایە) بڵێ: ئایا لە نێو هاوبەشەکانتاندا کەسی وا هەیە کە شت لە نەبوون بێنێتە دیو دروستی بکات؟ دوای ئەوەش کە لەبەین دەچێو دەفەوتێ، دووبارە بیهێنێتەوە، بیگێڕێتەوە؟ ﴿ ٱللَّهُ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥۖ ﴾، بڵێ: هەر خوا دروستکراوەکان دروست دەکاتو، دوایی دەشیانگێڕێتەوە، ﴿ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴾، واتە: بەرەو کوێ لادەدرێن؟ یاخود بەرەو کوێ هەڵدەگێڕدرێنەوە؟

(طَبَري)، لە (جامع البيان)[1] دا، ئاوا ئەم ئایەتە شی دەکاتەوە، دەڵێ: (مَنْ يُنْشِيءَ خَلْقَ شَيءٍ مِنْ غَيْرِ أَصْلٍ، فَيُحْدِثُ خَلْقَهُ ابْتِدَاءً، ثُمَّ يُعِيدُهُ، ثُمَّ يُفْنِيهِ بَعْدَ إِنْشَائِهِ، ثُمَّ يُعِيدُهُ كَهَيْئَتِهِ قَبْلَ أَنْ يُفْنِيَهُ).

واتە: ﴿ مَّن يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ﴾، کەسێك کە دروستکردنی شتێك دەست پێدەکات، بێئەوەی کە بنەمایەکی بووبێ، (واتە: نەبووە) پەیدای کردوە لە سەرەتاوە، ئنجا دوایش کە لە بەینی دەباتو دەیفەوتێنێ، دوای ئەوەی کە دروستی کردوە دەیفەوتێنێ، دووبارە جارێکی دیکە دەیهێنێتەوە دوای ئەوەی کە فەوتاندوویەتی.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴾، هەر (طَبَري)، دەڵێ، (فَأَيُّ وَجْهٍ عَنْ قَصْدِ السَّبِيلِ وَطَرِيقِ الرُّشْدِ تُصْرَفُونَ وَتُقْلَبُونَ).

واتە: بەرەو چ ڕوویەك، دوای ئەوەی کە خوا نیشانی داوە، خستۆتە سەر ڕاستە ڕێ، ڕاستە ڕێی عەقڵو فیطرەت، ڕاستە ڕێی شەریعەت، بەرەو کوێ لادەدرێن؟ بۆ کوێ هەڵدەگێڕدرێنەوە؟

<u>مەسەلەی چوارەم</u> : خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ هَلۡ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّۚ قُلِ ٱللَّهُ يَهۡدِي لِلۡحَقِّۗ أَفَمَن يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّيٓ

---

١) ج ١، ص ١٢٨.

إِلَّآ أَن يُهۡدَىٰۖ فَمَا لَكُمۡ كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ ٣٥ ﴾، خـوا ﷻ دەربـارەی بابـەتی گـەورەو گرنگی خوا بە یەکگرتن، تەنیا خوا پەرستن، چەند پرسیارێك فێری پێغەمبـەری خاتەم ﷺ دەکات، کە ئاراستەی هاوبەش بۆ خوا دانـەران‌و بێبـڕوایەکانیان بکـات، یەکێك لە پرسیارەکان ئەوەیە: پێیان بڵێ: ئایا هیچ کام لە هاوبەشەکانتـان (خەڵك) ڕێنمایی دەکات بۆ هـەق؟ خەڵك دەخاتە سـەر ڕێی هـەق، هەق، بە مانای بوونناسیی، کە ئینسان بزانێ ئەم بوونە چییە؟ هـەق، بە مانـای ئیمان‌و عەقیـدە، هـەق، بە مانای بەندایـەتیی بۆ خـوا، بـە مانـای ڕەوشـت‌و ئاکاری بـەرزو پەسـند، بـە مانـای حـەڵاڵ‌و حەرام، بە مانای چۆنیەتی ڕێکخستنی خێزان‌و کۆمەڵگاو، بەڕێوەبردنی دەوڵەت، هەق هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، ئایا هیچ لە هاوبەشـەکانتـان توانـای ئەوەیـان هەیـە، خـەڵك ڕێنمایی بکات بەرەو هەق؟! ﴿ قُلِ ٱللَّهُ يَهۡدِي لِلۡحَقِّ ﴾، واتە: پێویست ناکات چـاوەڕێی وەڵامیان لـێ بکەی، هەر خۆت یەکسەر ئەم ڕاستییە بڵێ: تـەنیا خـوا ڕێنمـایی دەکات بەرەو هەق، بڵێ: هەر خـوا زانیاریی تەواوی هەیە بە هەق‌و نـاهەق، هـەق لـە هـەموو بوارەکاندا، لە بـواری بوونناسیی، ئیمـان‌و عەقیـدە، خـواپەرسـتیی، ڕەوشـت‌و ئاکـار، حـوکم‌و دەوڵـەت، حـەڵاڵ‌و حـەڕام، ... هتـددا، بۆیـە هـەر ئـەویش دەتوانـێ خـەڵك ڕێنمایی بکـات‌و بەرچاویـان ڕۆشـن بکـاتەوە بەرەو هـەق.

دوایی دەفـەرموێ: ﴿ أَفَمَن يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّيٓ إِلَّآ أَن يُهۡدَىٰۖ ﴾، ئایا کەسێك کە خەڵك بەرەو هـەق ڕێنمایی دەکات، شایستەترە، پـەیڕەویی لـێ بکرێ‌و ملی بۆ کەچ بکرێ‌و، بپەرسترێ‌و، شوێنی بکەون، یاخود کەسێك کە نـەك هەر نـاتوانـێ خەڵك ڕێنمـایی بکـات، بەڵکو نـاتوانـێ خۆشی بەڕێیـە بزانـێ، چونکـە (يَهِدِّي) لە ئەسڵدا (يهتدي)یە، (ت)یەکە لە (د)ەکەدا دەغـم کراوە بۆ ئەوەی ببێتـە (يَهِدِّي) کە چەند خـوێندنەوەیەکیشی هەن، وەك دوایی ئامـاژەیـان پـێ دەدەین، واتـە: کەسـێك کە بۆ خۆشی بە ڕێگـا نـازانـێ، بۆ خۆشی نـاتوانـێ ڕێی ڕاست بگرێ، مەگـەر ڕێنمـایی بکـرێ، ﴿ فَمَا لَكُمۡ كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ ﴾، ئـەوە چـیتانە! بـەو شـێوە بڕیـار دەدەن‌و حوکـم دەکەن، کە خـوا، خـوای هـەقی شـارەزای تـەواو بـە هـەق، نـاپەرسـتن.

دەچن هاوبەشی بۆ پەیدا دەکەن، لە کەسانێك چاوەڕوانی شتێك دەکەن، کە تەنیا هی خوایە، ئەگەر خێرو خۆشیی‌و نازو نیعمەتی دنیایە، ئەگەر سەرخستن‌و شیفایە، هەرچی هەیە لەم دنیایەدا، ئەگەر لێبوردن‌و لێ خۆشبوونە بۆ دواڕۆژ، ئەوانە هەموویان هی خوای بالادەستن، کەواتە: با لە خوایان داوا بکەن، لە خوایان چاوەڕوان بکەن‌و، ئەو شتانە ئاڕاستەی غەیری خوا مەکەن، ئەو هاوبەشانەش بۆ خۆتان داتاشیناون‌و، بێگومان ئەوەش ستەمێکی گەورەیە لە خۆتانی دەکەن.

کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم ﴾، واتە: ئەوانەی لە خەیاڵی ئێوەدا هاوبەشی خوان، نەك لە دنیای واقیعدا، ئنجا ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە دەبێ هەق بناسرێ، لە هەموو بوارەکانی ژیانی دنیادا، ئنجا ئایا لەڕێی کێ وە دەناسرێ؟ بێگومان تەنیا لە ڕێی خواوە، هەقی ڕەها دەناسرێ، چ لە بواری بوونناسیی دا، چ لە بواری ئیمان‌و عەقیدەدا، چ لە بواری پەرستن دا، چ لە بواری ڕەوشت‌و ئاکاردا، چ لە بواری بەڕێوەبردنی خێزان‌و کۆمەڵگادا، چ لە بواری بەڕێوەبردنی وڵات دا، چ لە بواری جەنگ‌و ئاشتیی‌و پەیوەندییەکان‌و ... هتد دا، هەقی ڕەها دەبێ تەنیا لەلای خواو، لە بەرنامەی خواداو، لە کتێبی خوادا بۆی بگەڕێی‌و لەوێوە چاوەڕێی بکەی.

وشەی ﴿ يَهِدِّيٓ ﴾، بە چوار جۆر خوێنراوەتەوە:

١) (يَهِدِّي) لە ئەسڵدا (يَهْتَدِي)یە، (ت)یەکە لە (د)ەکەدا دەغم کراوە بۆئەوەی ببێتە (يَهِدِّي).

٢) (يَهْدِّي) واتە: بە زەنە (سکون)ی (هـ)و (د)یش گیرە (شدّة)ی هەیە.

٣) (يَهَدِّي) ئەویش هەر (يَهْتَدِي)یە.

٤) (يَهْدِي) کەسێك کە خەڵك ڕێنمایی ناکات، مەگەر خۆی ڕێنمایی بکرێ.

**مەسەلەی پێنجەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّاۚ إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾، خوای زاڵی بەرز ڕایدەگەیەنێ،

بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺو بۆ دوای ئەویش‌و بۆ ئێمەش‌و بۆ دوای ئێمەش، کە هەموو ئەوانەی جگە لە خوا دەپەرستن، وە هەموو ئەوانەی بە ڕێی جگە لە خوادا دەڕۆن، تەنیا شوێن گومان دەکەون، گومانیش هیچ کەلێنی هەق ناگرێ، هیچ سوودێکت پێناگەیەنێ، لە جیاتی هەق، واتە: کە تۆ هەقت دەستگیر نەبووبێ، بە گومان کەلێنی هەقت بۆ پڕ نابێتەوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا يَفۡعَلُونَ﴾، بێگومان خوا زانایە بەوەی کە دەیکەن، کە ئەوە هەڕەشەیە.

(الطبري) ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە مانا دەکات، دەڵێ: (إِنَّ الشك لاَ يُغْنِي مِنَ اليَقِينِ شَيْئاً وَلاَ يَقُومُ مَقَامُهُ فِي شَيء، وَلاَ يُنتَفَعُ بِهِ حَيْثُ يُحْتَاجُ إِلى يَقِين)[1].

واتە: دوو دڵیی هیچ کەلێنی دڵنیایی ناگرێ‌و، ناتوانێ بچێتە شوێنی، وە سوودی لێ نابینرێ لە حاڵێکدا کە تۆ پێویستیت بە دڵنیایی هەیە لە شتێکدا.

کەواتە: لە شتێکدا کە گومانی زاڵیش بەس بێ، قەیناکات شوێن گومانیش بکەوین. بەڵام لەو شتانەدا کە دەبێ دڵنیاییت تێیاندا هەبێ‌و، ئەگەر دڵنیاییت نەبێ، بە کەڵک نایەت، دروست نیە بە دوای گومان بکەوین، کە ئێستا حیکمەتی ئەم قسەیە ڕوون دەکەینەوە.

لە بواری بوونناسیی دا، کە ئەم بوونە چییە؟ کێ خاوەنیەتی؟ کێ هێناویەتی دی؟ بەرەو کوێی دەبات؟ بۆچی هێناویەتی؟ کە ئەوانە کۆی ئەو پرسیارانەن کە جیهانبینیی‌و دنیا بینییەکان، دەیانەوێ وەڵامیان بدەنەوە، کە من لە جیاتی جیهانبینیی‌و دنیا بینیی، وشەی : (بوونناسیی) بەکاردێنم، بە عەرەبی پێی دەگوترێ : (مَعْرِفَةُ الوجود) یان (عِلْم الوجُود)، کە بەرگی یەکەمی مەوسووعەی: (الإِسْلاَمُ كَمَا يَتَجَلَّى فِي كِتَابِ الله)م هەموو بۆ تەرخان کردوە، کە چوار سەدو پەنجا (٤٥٠) لاپەڕەیە، بوونناسیی دەبێ لەسەر بناغەی یەقین‌و دڵنیایی بنیات بنرێ، ئیمان‌و عەقیدە کە لەسەر بوونناسیی دادەمەزرێ، واتە: هەڵوێستت بەرانبەر

---

١) جامع البيان ج ٧، ص ١٣٠.

بە خاوەنو بەدیهێنەرو پەروەردگاری ئەم بوونە، دەبێ چۆن بێ، چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەن؟ وە ئەوانەی کە ئەو ڕەوانی کردوون، وەك نوێنەرو ڕەوانکراوانی خۆی، دەبێ هەڵوێستتان بەرانبەریان چۆن بێ؟ وە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ فریشتەکانو لەگەڵ کتێبەکانی خواو، ڕۆژی دوایی، کە ئەوانە کۆی پایەکانی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیین، دەبێ لەسەر بناغەی دڵنیایی (یقین) بنیات بنرێن، هەروەها خواپەرستییو، ڕەوشتو ئاکارە بەرزو پەسندەکانو، هێڵە گشتییەکانی بواری حوکمو سیاسەتو ئابووریو جەنگو ئاشتیی، وەك هێڵە گشتییەکانیان، دەبێ لەسەر دڵنیایی (یقین) بنیات بنرێن، بۆیە لەو بوارانەدا بەو شێوەیەی کە باسمان کرد، دروست نیە بە دوای گومان بکەوی.

پێویستە بشزانرێ کە وشەی (ظن) کە لە قورئاندا بەکارهاتوە، بەلای کەمەوە بە سێ واتایان بەکارهاتوە:

یەکەم : گومانو دوودڵیی، کە بەزۆریی لە قورئان دا، بەم واتایەیە ئەم ئایەتەش کە خەریکی توێژینەوەینی، وشەی (ظن)ی بەم واتایە تێدا بەکارهاتوە.

دووەم : زانیاریی تەواوو دڵنیایی، کە ئەم واتایە لە بەکارهێنانی قورئان دا کەمو دەگمەنە، بۆ نموونە : ﴿ ... قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةًۢ بِإِذْنِ ٱللَّهِۗ ... ﴿٢٤٩﴾ ﴾ البقرة.

سێیەم : گومانی زاڵ (راجح)، ئەمیش هەر کەمو دەگمەنە لە قورئان دا، بۆ نموونە : ﴿ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم مَّا نَدْرِى مَا ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾ الجاثية.

(محمد الطاهر بن العاشور) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، ئاوا پێناسەی (ظن) دەکات، واتە: بە مانای سێیەمی : دەڵێ : (الظن: هو العلم المُستند إلى دليل

١) التحرير والتنوير، ج ١١، ص ١٦٦.

راجِح مع احتمال الخطأ احتمالاً ضعيفاً، وَهَذَا الظنّ هُوَ مَناطُ التَّكْلِيف بفُرُوعِ الشَّرِيعَةِ).

واتە : (ظن)[1] بریتیە لە زانیارییەك كە پشت دەبەستێ بە بەڵگەیەكی زاڵكەر، لەگەڵ هەبوونی ئەگەری بە هەڵەدا چووندا، بە ئەگەرێكی لاواز، وە ئەو گومانە بناغەی داوا لێكرانی مرۆڤە، بۆ پابەندیی بە لقەكانی شەریعەتەوە (بۆ هەمووی یەكمان لەسەر یەقین نەكەوتوە).

بۆ وێنە: ئەم ئایەتە ئەم مانایە دەدات، مانایەكی دیكەش دەدات، واتە: تۆ یەقینت نیە بڵێی هەر ئەو مانایە دەدات، یان فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺ بە ئێمە دەگات، كە سوننەت دابەش كراوە بۆ چەند بەشێك‌و، مەگەر ئەوەی موتەواتیرە، ئەگەرنا دڵنیاییت بۆ پەیدا نابێ، كە پێغەمبەر ﷺ وای كردوە، وای گوتوە، بەڵام بۆ پابەندیی بە شەریعەتەوە، بۆ ئەوەی كە پێی دەگوترێ: یاسا كردەوەییەكان (الأحكام العملية)، گومانی زاڵ بەسە.

شایانی باسیشە، كە ئەو جۆرە واتایە بۆ وشەی (ظن)، وەك پێشتریش گوتمان، یان لە قورئان دا هەرنیە یان زۆر دەگمەنە، بەڵكو ئەو جۆرە بۆ وشەی (ظن) مانایەكی زاراوەیی (إصطلاحي)یەو زانایان بەتایبەت شەرعزانان (فقهاء) دایاننـاوە، بۆیە لێكدانەوەكەی (محمد الطاهر بن عاشور) بۆ وشەی (ظن) لە قورئاندا دروست نیە!

**مەسەلەی شەشەم** : كە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾، خوا نەیفەرمووە: (وَمَا هَذَا القُرآن مُفْتَرَى) ئەم قورئانە هەڵبەستراونیە،

---

١) لە زمانی كوردیی دا هەركام لە وشەكانی (ظن، شك، ريب، مِرْيَة) تەنها گومان بەكاردێ، ئەوەش نیشانەی هەژاری زمانی كوردییە لە بەرانبەر عەرەبیی دا، لە حاڵی حازردا، بەڵام ئەگەر زمانێكی یەكگرتووی كوردیی لە هەموو زار (لهجة)ەكان پێك بێ، دەگونجێ موفرەداتی زۆر لە هەر وشەیەك بۆ حاڵەتە جۆراوجۆرەكان دابنرێن .

یان تەعبیرێکی دیکە، کە دەگونجا بە زۆر شێوازی دی، ئەم واتایە بگەیەنرێ، بەڵام ئەم تەعبیرەی ئێستا بە جۆرێك ئەو واتایە دەگەیەنێ، هیچ تەعبیرێکی دیکە بەو شێوەیە نایگەیەنێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ ﴾، زانایانی زمان ئاوا لێکیان داوەتەوە: (أَي مَا وُجِدَ أَنْ يُفْتَرَى، أَوْ وجُودهُ مُنافٍ لافتِرَائِهِ، فَدَلالَةُ ذَاتِهِ كَافِيَةٌ فِي أَنَّهُ غَيْرُ مُفْتَرَىً)، واتە: ئەسڵەن نەدەگونجا ئەم قورئانە هەڵبەسترێ، یانی: ناگونجێ و هیچ ئەگەری تێدانییە کە ئەم قورئانە هەڵبەستراوبێ، لە خوار خوای پەروەردگارەوە، یان لەلایەن جگە لە خواوە، ناگونجێ و سروشتەکەی ئەوە هەڵناگرێ، بۆ هەر کەسێك کە شارەزای قورئان بێ، دەزانێ کە ئەسڵەن بە قەد نووکی دەرزی ئەگەری ئەوەنیە، کە ئەم قورئانە لەلایەن غەیری خوای پەروەردگارەوە، هاتبێ.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾، بەڵکو ئەم قورئانە بەڕاستدانەری ئەوەی پێش خۆیەتی، یانی: کتێبە پێشووەکان و پێغەمبەرانی پێشوو، کە قورئان هەموو کتێبەکانی ڕابردوو بە ڕاست دەزانێ، وەك نێوەرۆکیان، وەك حاڵەتی واقیعییان کە لەسەری بوو ون، نەك حاڵەتی ئێستایان کە دەستکاریی کراون، هەروەها هەموو پێغەمبەرانیش بە ڕاست دەزانێ.

لە سوورەتی (المائدة)دا دوای ئەوەی باسی تەوراتی جوولەکەکان و ئینجیلی نەصرانییەکان دەکات، پاشان باسی قورئان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ... ﴿٤٨﴾ ﴾ واتە: وە (وەك چۆن تەوراتماندا بە مووساو ئینجیلماندا بە عیسا) کتێبیشمان بۆ تۆ دابەزاند بە هەق، (هەقی تێدایەو بە هەق هاتوەو بۆ چەسپاندنی هەق دابەزیوە) هەموو کتێبەکانی پێش خۆی بەڕاست دەزانێ و، بەسەریشیانەوە چاودێرە.

واتە: بەسەریانەوە چاودێرە، لە کوێ گۆڕدرابن، دەستکاریی کرابن، ئەگەر بە پێویستی بزانێ، ڕاستی دەکاتەوە.

دوایـــی دەفــەرموێ: ﴿ وَتَفۡصِيلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، ئـەم ئایەتـە دوو مانـای هــەن:

١/ دەگونجێ مەبەست لە (كتـاب) هەر قورئـان بـێ، واتـە: ئـەو ئایەتـە ڕۆشنـانەی كە ئەم كتێبەیـان ڕوونكـردۆتەوەو واتـاو مەبەستەكانیان زۆر جـوان شیكـردۆتەوە، هیچ گومانی تێدانیـە، كە لەلایـەن پەروەردگـاری جیهـانییـانەوەیـە.

٢/ واتـایەكی دی: ﴿ وَتَفۡصِيلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، واتـە: ئـەم قورئــانە هەڵـساوە بـە شیكردنـەوەی كتێبـی خـوا، لێرەدا مەبەسـت پێی جینسی (كتـاب)ە، واتـە: هـەموو كـتێبەكانی خـوا، هەرچـی ڕاسـتییەكانن كـە لـە هـەموو كتێبەكانی خـوادا هـاتوون، ئەم قورئـانە ئەو ڕاستییانەی هـەمووی شـیكردۆتەوەو ڕوونكردۆتــەوە، بۆیـە هەرچـی ڕاسـتییەكانن كـە لـە كتێبــە پێشووەكـاندا هـەن، قورئـان هـەموویانی گرتوونـە خـۆی، ئنجا ئـەو ڕوونكردنـەوەی ڕاسـتییەكانی نێـو كتێبەكـانی خـوا، هـیچ دوو دڵـیی‌و گومـانی تێدانیـە، كـە لەلایـەن پـەروەردگاری جیهـانەكانەوەیە.

وشەی (ریب) دەڵێ: (أدنى الشك) واتە: كەمتـرین گومان، (شـك)یش بە كـوردی هەر دەڵێین: گومان، بەڵام لە ڕاستییدا هەڵەیە، گومـان ئەوەیـە شتێك تـۆ پێت وابێ وایە، بـەڵام تـەواو دڵنیـا نـەبی، بـەڵام (شـك) بریتیـە لـە دوو دڵیی، وە (ریـب) واتـە : تۆزقاڵێـك‌و لای كـەمی دوودڵیـی، واتــە: ئــەم قورئانــە وەك لــە ســەرەتای سـوورەتی بەقەرەدا دەفەرموێ : ﴿ الٓمٓ ١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢ ﴾. ئەم كـتێبـە تۆزقـاڵێك دوودڵیی گومانی تێـدانیە، ڕێنمـاییكـارە بۆ پارێزكـاران.

**مەسـەلەی حەوتەم** : كـە دەفـەرموێ : ﴿ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٣٨ ﴾، واتە: یان ئایا دەڵێن: هەڵیبەستوە (وشـەی (أم) دەڵێ: (أم للإضراب الإنتقـالي مـن النفـي إلـى الإسـتفهام

الإنكاري التَّعجيبي)[1]، (أم) بۆ گواستنەوەیە، لە لابردن (نفي)ەوە بۆ پرسیاری لێکردنی نکوولّیی لێکەرانەی سەرسووڕهێنەرانە، واتە: نەك ئەوان ئەوەی کە دەیڵێن وانیە، بەڵکو شتێکی دی دەڵێن، ئەویش ئەوەیە کە دەڵێن: بۆ خۆی هەڵیبەستوە واتە: موحەممەد، یانی: پێشێ سەرچاوەی هەڵبەستنەکە نەزانراوە، دوایی سەرچاوەکەی دیاریی دەکات، کە ئەوان پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ تۆمەتبار دەکەن، کە قورئانی هەڵبەستوە. خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ﴾، بڵێ: سوورەتێکی وەك ئەم قورئانە بێنن (ئنجا هەر خۆشتان نا) بەڵکو هەرچی لە تواناشتاندایە بۆ بانگکردنی هاوکاران، بانگیان بکەن، جگە لە خوا، لە خوار خواوە، وەك لە سووڕەتی بەقەرەدا دەفەرموێ: ﴿... وَٱدْعُوا۟ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٢٣﴾﴾، واتە: چاودێرەکانتان شایەدەکانتان، ئەوانەی لەگەڵ ئێوەدا هاوڕانو شایەدییتان بۆ دەدەن، هەموویان بانگ بکەن، لێرەشدا دەفەرموێ: هەرکەس دەتوانن بانگی بکەن، بانگیان بکەن، جگە لە خوا، ئەگەر ڕاست دەکەن، کە قورئان هەڵبەستراوەو لەلایەن خواوە دانەبەزێنراوە، واتە: هەرچی هاوکارەو بە دەنگو بە دەمتانەوە دێ، هەمووان کۆبکەنەوە، فەرموون ئێوەش سووڕەتێکی وەك قورئان بێنن، ئەگەر ڕاست دەکەن، ئەگەر واتان نەکرد، دیارە کە درۆ دەکەن، قورئان هەڵنەبەستراوەو، پێغەمبەر ﷺ لەلایەن خۆیەوە نەیفەرمووە، بەڵکو لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بۆی هاتوە.

<u>**مەسەلەی هەشتەم**</u>: کە دەفەرموێ: ﴿بَلْ كَذَّبُوا۟ بِمَا لَمْ يُحِيطُوا۟ بِعِلْمِهِۦ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٣٩﴾﴾

نا: ئەوە ڕاستیی هەڵوێستەکەیانە، دەفەرموێ: بەڵکو ئەوان بێبڕوا بوون بە شتێك کە دەوری زانیارییەکەییان نەداوە، شتێکیان بە درۆ داناوە، کە دەوری زانیارییەکەیان نەداوە، ﴿وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ﴾، وە جارێ سەرەنجامەکەیشیان بۆ نەهاتوە.

---

١) التحرير والتنوير، ج١١، ص١٧٠.

دەڵێ: (الإِحَاطَةُ بالشيء: الكَوْنُ حَوْلَهُ كَالحَائِطِ)، (إحاطة) وەك دیوارێكە بە دەوری شتێكی دا دروست بكەی، دەورەدانی شتێك.

﴿كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، واتە: ئەوانەی پێش ئەوانیش ئاوا بەدرۆدانانیان كردە پیشە، دەجا سەرنج بدە ! سەرەنجامی ستەمكاران چۆنبوو!

خاوەنی (التحرير والتنوير)[1] ئاوا ئەمە مانا دەكات، دەڵێ: (وَالمَعْنَى: أَنَّهُمْ سَارَعُوا إِلَى التَّكْذِيبِ بالقُرآنِ فِي بَدِيهَةِ السَّمَاعِ، قَبْلَ أَنْ يَفْقَهُوهُ وَيَعْلَمُوا كُنْهَ أَمْرِهِ وَيتدبَّروه، وَإِنَّمَا يَكُونُ مِثْلُ هَذَا التَّكْذِيبِ عَنْ مُكَابَرَةٍ وَعَدَاوة، لاَ عَنِ اعْتِقَاد كونه مَكْذُوباً).

واتە: ئەوانە خێراییان كردوە لە بە درۆ دانانی قورئاندا، هەر كە بیستوویانە، یەكسەر گوتوویانە: ئەوە درۆیە، پێش ئەوەی كە لێی تێبگەن‌و، بۆ ئەوەی كە بیری لێ بكەنەوەو، لێی وردببنەوەو، پەی بە نێوەڕۆكەكەی ببەن، وە ئەو جۆرە بە درۆ دانانە، لە خۆ بە گەورە زانینی‌و لە ڕووی دوژمنایەتییەوە دەبێ، نەك لە ڕووی ئەوەوە كە قەناعەتیان وابێ، درۆیە.

واتە: هەر لە ڕێوە بە درۆیان دانا، بێ ئەوەی لێی تێبگەن، جاری وایە كەسێك قەناعەت دێنێ، پێش ئەوەی بیر بكاتەوە، نیەتیان هێناوە كە بە درۆی دابنێن، پێش قسەكردن، ئنجا ئەو ڕستە قورئانییە، ئەوە دەگەیەنێ كە دەبێ خەڵك باش لە قورئان وردبنەوەو ئەوەی لە قورئاندایە باش تێبگەن، تاكو قەدری قورئان باش بزانن، پێشینانیشمان گوتوویانە: (قەدری زێڕ لەلای زێڕینگرە)، لە ڕاستییدا ئەوانەی كە زانان، شارەزان، باش لە قورئان تێدەگەن، وەك خوا لە سەرەتا سوورەتی (سبأ)دا دەفەرموێ : ﴿وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلۡحَقَّ وَيَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ٦﴾، واتە: وە ئەوانەی زانیارییان پێدراوە :

---

١) ج ١١، ص ١٧٢.

دەزانن کە ئەوەی بۆ لای تۆ ( ئەی موحەممەد!) دابەزێنراوە، هەر ئەوە هەقەو (خەڵکی) بەرەو ڕاستە شەقامی (خوای) زاڵی ستایشکراو ڕێنمایی دەکات.

دوایی دەفەرموێ : ﴿ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ ﴾، وە جارێ سەرەنجامەکەییان بۆ نەهاتوە، (آل إلى الشيء: رجع)، (آل) واتە: گەڕایەوە بۆ لای.

وشەی (تأويل) دوو واتای هەن :

١) (التاوِيلُ : تَفْسِيرُ اللَّفْظِ الَّذِي خَفِيَ مَعْنَاهُ تَفْسِيراً يُظْهِرُ الـمَعْنَى، فَيُؤول واضحاً بَعْدَ أَنْ كَانَ خَفِياً)، ڕوونکرنەوەی وشەیەك کە ماناکەی پەنهانە، وا ڕوون بکرێتەوە کە ماناکەی ڕوون بکات، سەرەنجام ماناکەی ڕوون بێتەوە، دوای ئەوەی پەنهان شێرراوە بووە.

٢) (التاوِيل : ظُهُورُ عَاقِبَةُ الشيء) دەرکەوتنی سەرەنجامی شتێك.

کە لە قورئاندا (تأويل) بەم دوو واتایە بەکارهاتوە.

بەڵام دواتر زانایان وشەی (تأويل)یان بە مانایەکی دیکەی سێیەمیش بەکارهێناوە کە ئێستا ئەو مانا سێیەمە زیاتر دێتە زەینەوە، لە کاتی بەکارهێنانی وشەی (تأويل)دا، ئەویش بریتییە لە:

(صرف لَفْظٍ أو كلمة أو جملةٍ عن معناه الظاهر الـمتبادِر الى الذهن، الى معنى آخر، لمانعٍ يمنع منه أو لقرينةٍ تُوجِبُ ذلك).

واتە: لادانی بێژەیەك یان وشەیەك یان ڕستەیەك لە مانا دیارو ئاشکرایەکەی بەرەو مانایەکی دیکە، بەهۆی ڕێگرێکەوە کە ڕێ لە مانا ئاشکرایەکە دەگرێ، یان نیشانەیەك کە ئەوە پێویست دەکات.

بۆ نموونە: ﴿ ... وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ... ﴿٤﴾ ﴾ الحديد، واتە: (وە خوا) لەگەڵتانە لە هەر کوێیەك بن. کە ئەم ڕستەیە تێکڕای زانایان بە ئیمام ئەحمەدیشەوە تەئویلیان کردوەو گوتوویانە: ﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ﴾ (اي مع كم بعلمه وقدرته) واتە: وە خوا بە زانیاریی و توانای لەگەڵتانە لە هەر جێیەك بن.

لە کۆتایی دا خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، ئەوانەی پێش وانیش هەر ئاوا پێغەمبەرانیان، کتێبەکانیان بە درۆ دانان، سەرنج بدە! سەرەنجامی ستەمکاران چۆن بوو، یانی: بە تەئکید ئەگەر سەرەنجامی ئەو ستەمکارانە وابووبێ، ئەوە سەرەنجامی ئێوەش هەر وا دەبێ، ئەگەر ستەمکاربن.

ئنجا لە ڕاستییدا ئێستاش وایە، کەسانێك هەر لە ڕێوە دژایەتیی ئیسلام دەکەن‌و، دژایەتیی تەوژمی ئیسلامیی دەکەن‌و، دژایەتیی ئەو ڕاستییانە دەکەن، کە قورئان‌و، سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هێناویانن، من زۆر لەگەڵ خەڵکی سیکۆلارو لیبراڵ‌و مارکسیی‌و ئەوانەدا وتووێژو گفتوگۆم بووە، بۆ تەنیا جارێکیش تا ئێستا، یەکێکیانم لێ هەڵنەکەوت کە لە ڕووی شارەزایی لە قورئان‌و سوننەت‌و لە ڕووی تێگەیشتنیانەوە، ڕەخنەیان لێ بگرێ، هەمووی لە ڕووی تێنەگەیشتن‌و بێئاگایی‌و. لە ڕووی لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشا کردنەوە بووە، ئەوەش شتێکی زۆر نەگونجاوە لەگەڵ عەقڵی سەلیمدا، منی ئیسلامیی کاتێك ڕەخنە دەگرم، بە بەرچاو ڕوونیی‌و شارەزاییەوەیە، کاتی خۆی کە کتێبی: (ئیسلام‌و ڕێچکان)و (خواناسیی ، ئایین ، ئیمان)م نووسیوە، وە لە کتێبەکانی دیکەدا: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)و (تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی) کە ڕەخنەم گرتوە. لە ڕێچکەو بیروبۆچوونە ڕۆژهەڵاتیی‌و ڕۆژئاواییەکان، سەرەتا باش لێم کۆڵیونەوە. لە بنج‌و بنەوایان وردبوومەوەو باش لێیان تێگەیشتووم، لە سەرچاوەکانی خۆیانەوە نەك لەو کتێبانەی کە ڕەخنەیان لێ گرتوون، تۆ دەبێ فیکری هەر کەسێك لە سەرچاوەکەی خۆیەوە وەربگری، بەڵام زۆر کەسم لەو کۆلکە عەلمانییانەی خۆمان بینیوە، کە لە دژی ئیسلام قسان دەکەن، تەنیا ئەو کتێبانەیان خوێندوونەوە، کە لە دژی ئیسلام نووسراون، لەبەر ڕۆشنایی ئەواندا، ڕەخنە لە ئیسلام‌و قورئان دەگرێ، کە لەڕاستییدا ئەوە میتۆدێکی زۆر نازانستییانەو نازیرانەیە.

<u>**مەسەلەی نۆیەم**</u> : کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يُؤْمِنُ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن لَّا يُؤْمِنُ بِهِۦ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾، ئەم ئایەتە موبارەکە دوو واتای هەن :

واتا ڕواڵەتییەکەی ئەوەیە: هەیانە بڕوای پێ دێنێ‌و، هەیانە بڕوای پێ ناهێنێ‌و، پەروەردگارت زاناترە بە تێکدەران.

١/ واتە: کافرەکانی سەردەمی تۆ (ئەی موحەممەد) ﷺ هەیانە لە داهاتوودا بڕوای پێ دێنێ، هەشیانە بە بێبڕوایی دەڕوات.

٢/ واتە: هەیانە لە دڵی خۆیدا دەزانێ کە قورئان ڕاستە، بەڵام دەرینابڕێ‌و دانی پێداناهێنێ، هەشیانە هەر لە دەروونی خۆشیدا بە ڕاستی نازانێ.

بە پێی (وَمِنْهُم ) ئەو مانایەی دووەم زاڵ دەبێ، واتە: هەیانە لە دڵی خۆیدا دەزانێ کە قورئان ڕاستە، بەڵام دەرینابڕێ‌و دانی پێداناهێنێ، هەشیانە هەر لە دەروونی خۆشیدا بە ڕاستی نازانێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

٥٧

# دەرسی پێنجەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان حەوت (٧) ئایەت دەگرێتە خۆی، لە ئایەتەكانی: (٤١ تا ٤٧) لەو حەوت ئایەتەدا، سەرەتا خوای كارزان ئامۆژگاریی پێغەمبەرەكەی دەكات، كە بە كافرەكان ڕابگەیەنێ: هەر كەسە بەرپرسیاری كردەوەی خۆیەتی.

پاشان هەڵوێستی نەرێنییانەی كافرەكان لە بەرانبەر خوای و پەیامەكەیدا دەخاتەڕوو، كە وەك كەڕو كوێرو بێ هۆشان، مامەڵەی لەگەڵ دەكەن، وە ڕاشیدەگەیەنێ كە ئەوانە خۆیان ستەمیان لە خۆیان كردوە، كە عەقڵو بیستنیو دیتنی خۆیان، لە بەرانبەر ناسینی هەقدا، پەك خستوون.

دوایی باسی هەڵوێستیان لە كاتی كۆكردنەوەی قیامەتیاندا دەكات، كەوا دەزانن ماوەیەكی كەم نەبێ، لە ژیانی دنیادا نەماونەوە.

دوایی خوا عزّ وجلّ پێغەمبەر ﷺ دڵنیا دەكاتەوە، كە خوا چ هەندێك لەوەی هەڕەشەی پێ لە كافرەكان كردوە، پێشانی بدات، چ پێش ئەوە بیمرێنێ، سەرەنجام هەر بۆ لای خوا دەچنەوەو، ئاگاداریش بووە چییان كردوە!

لە كۆتاییدا دەیخاتەڕوو كە، لە ڕۆژی دواییدا، خوا دادوەریی لە نێوان پێغەمبەران و كۆمەڵگاكانیاندا دەكات، بە شێوەیەكی دادگەرانەی بێ ستەم.

﴿وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٌ
مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٤١﴾ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَعْقِلُونَ
﴿٤٢﴾ وَمِنْهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ أَفَأَنتَ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٤٣﴾
إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ ٱلنَّاسَ شَيْـًٔا وَلَٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٤﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ
كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا سَاعَةً مِّنَ ٱلنَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ وَمَا
كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿٤٥﴾ وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ ٱللَّهُ
شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ ﴿٤٦﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَآءَ رَسُولُهُمْ قُضِىَ بَيْنَهُم
بِٱلْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٤٧﴾﴾.

## مانای وشــە بە وشەی ئایەتەکـان

{وە ئەگــەر بــە خـاوەن درۆیـان دانــای، بڵــێ: کــردەوەی خـۆم بـۆ خـۆمو، کــردەوەی خۆشتــان بـۆ خۆتــان، ئێـوە لــەوەی مـن دەیکـەم دوورن‌و، منـیش لـەوەی ئێـوە دەیکـەن دوورم ﴿٤١﴾ وە لەوان کەسانێك هەن، کە گوێت بۆ هەڵدەخەن، ئنجا ئایا تۆ بە کـەڕانێك کـە نـافـامن، دەبیسـتێنی؟! ﴿٤٢﴾ وە کەســی وایـان هەیــە، تەماشــات دەکـات، ئنجـا ئایـا ڕێنمایی کوێرانێکت پـێ دەکـرێ، هەرچەنده (بـە چاوی عەقــڵ‌و دڵ) نەشبینن؟! ﴿٤٣﴾ بە دڵنیایی، خـوا هیچ ستەمێك لە خەڵك (ی بێبـڕوا) نـاکات، بەڵکو ئەوان ســتەم لـە خۆیان دەکەن (کە بە هۆی ستەم‌و خراپەوە هەستەوەرەکـانی خۆیانیـان پەککخسـتوون) ﴿٤٤﴾ وە (یاد بکەوە) ڕۆژێك کە (خـوا لە قیامەت) کۆیان دەکاتەوە، (ژیـانی دنیـا لەچاو دواڕۆژ هێنده کـورت‌و کەم دێتـە بەرچـاو) وەك تـەنیا ماوەیــەکی کــەم لـە ڕۆژێکــدا بـۆ یـەکــدی نـاســین مابنــەوە! مسۆگــەر ئەوانـەی دیـداری خـوایان بـە درۆ دانــا، زیانبـار بوون‌و لە ڕێی ڕاسـتگرتووان نـەبوون ﴿٤٥﴾ وە ئەگـەر هــەندێك لـەو (سزای)ـەی گفتیـان پێدەدەین، پێشانت بدەیـن، یان (بەرلــەوە) بتمرێنیــن (و نەیبیـنی) ئـەوە گــەڕانەوەیان هــەر بـۆ لای ئێمەیــە، ئنجـا خــوا ئاگـاداری ئەوەیــە کـە دیکــەن ﴿٤٦﴾ وە بـۆ هــەموو کۆمەڵگایــەکی فـراوان، پێغـەمبــەرێك هـەبووە، ئنجـا هــەر کـات (لـە ڕۆژی دوایــی دا) پێغەمبـەرەکەیان هاتە بەرانبەریان، دادگەرانە دادوەرییان لە نێواندا دەکرێ‌و، سـتەمیان لـێ ناکرێ ﴿٤٧﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(كَذَّبُوكَ ): واتە: (نسبوك إلى الكذب) یانی: گوتیان: درۆ دەکەی، یان (قالوا لك: كذبت) واتە: گوتیان: تۆ درۆ دەکەی‌و ڕاست ناکەی.

(بَرِيٓءٌ): (بعيدٌ وخَليٌّ وخالصٌ) واتە: دوورو ساغ‌و پاك لەو شتە.

(يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ ): (يَتَسمَّعون ويُصغون) واتە: گوێ هەڵدەخەن‌و خۆیان بێ دەنگ دەکەن لەو کاتەدا کە قسان دەکەی، بە کوردیی دەڵێن: گوێ هەڵخستن، واتە: ئەوە نیە هەر بێدەنگ بێ، بەڵکو بە دڵیش سەرنج دەدات.

(ٱلصُّمَّ ): کۆی (أصم)ە، واتە: کەڕ.

(ٱلْعُمْىَ ) کۆی (أعمى)یە، واتە: کوێر.

(لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ ): (لم يمكثوا، لم يقيموا) واتە: نەمانەوە، بەردەوام نەبوون.

(مَرْجِعُهُمْ ): (أي رُجوعُهم، أو مَحَلُّ رجُوعِهِم) دەگونجێ چاوگ بێ، گەڕانەوەیان، دەشگونجێ ناوی شوێنیش بێ، واتە: شوێنی گەڕانەوەیان.

(قُضِىَ ): (أي حُكِم وَفُصِل) واتە: بڕیار دراو دادوەریی کرا.

## مانـای گشـتی ئایەتەکـان

لەم حەوت ئایەتە موبارەکەدا، خوا ﷻ چەند ڕێنماییەك باس دەکات بۆ چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ بێبڕوایانی نەیاردا، سەرەتا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ ﴾، وە ئەگەر پەیامەکەی تۆ، (قسەکەی تۆ)یان بە درۆ دانا، تۆیان بە خاوەن درۆ دانا، تۆ بڵێ: کردەوەی خۆم بۆخۆم، کردەوەی خۆتان بۆخۆتان، ﴿ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴾، ئێوە دوورن لەوەی کە من ئەنجامی دەدەم، منیش دوورم لەوەی ئێوە ئەنجامی دەدەن، واتە: مادام من بە ناڕاست دەزانن‌و متمانەتان بە من نیە، باشە چاوەڕێ بن، بۆ خۆتان لەسەر ڕێی خۆتان بەردەوام بن. منیش لەسەر ڕێی خۆم بەردەوام دەبم، پێغەمبەری خاتەم ﷺ تەواو دڵنیاو پشت ئەستوور بووە، وە متمانەی بە خۆی‌و بە بەرنامەکەی هەبووە، کە لەسەر ڕێی هەق بووە، وە دڵنیاش بووە کە ئەوانیش لەسەر ڕێیەکەی پووچن‌و، پشت ئەستوور نین بە هیچ شتێك کە سوودیان پێ بگەیەنێ، یان زیانیان لێ دوور بخاتەوەو. سەرەنجامیشیان زۆر خراپە.

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَعْقِلُونَ ﴾، لەوان کەسانێك هەن، کە گوێت بۆ هەڵدەخەن (بە ڕواڵەت باش گوێت بۆ دەگرن) بەڵام ئایا تۆ کەڕانێك کە نافامن، دەتوانی پێیان ببیستێنی؟ واتە: ڕاستە ئەوانە گوێیان هەن، بەڵام عەقڵیان بێدارنیە، عەقڵیان هۆشیار نیە، ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ ﴾، هەشیانە تەماشات دەکات، واتە: بە تیلەچاو، بە ڕواڵەتی. ﴿ أَفَأَنتَ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يُبْصِرُونَ ﴾، ئنجا ئایا دەتوانی ڕێنمایی کوێرانێك بکەی، بەبێ ئەوەی ببینن؟ بە چاوی سەر دەبینن، بەڵام بە چاوی

دڵ نابینن، بە گوێی سەر دەبیستن، بەڵام بە گوێی عەقڵو دڵ نابیستن، وەك خوا لە سوورەتی (الحج)دا دەفەرموێ: ﴿ ...فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾ ﴾، واتە: چاوەكانی سەریان كوێر نین، بەڵكو ئەو دڵانەی كە لە سینەكانیاندان، كوێرن، كە مەبەست لێرەدا عەقڵو هۆشیانە، واتە: دەبووایە بە دوای ئەم هەقەدا بگەڕێن، نەك كە بۆیان ڕوون بۆتەوە، بێن دژایەتیی بكەنو ڕەخنەی لێبگرن.

ڕەنگە یەكێك بپرسێ: ئەوانە بۆچی ئاوا هەستەوەرەكانیان لە كار كەوتوون؟ ئایا خوا ستەمی لێ نەكردوون؟

خـوای دادگـەر دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ ٱلنَّاسَ شَيْـًٔا وَلَٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾، بێگومان خوا هیچ ستەمێك لە خەڵك ناكات، (نەك زۆر، هەر ستەمی كەمیشیان لێ ناكات) بەڵكو ئەوە خەڵكن ستەم لە خۆیان دەكەن.

كە لە ئەنجامی ناحەزییان بەرانبەر بە ئایینو بەرنامەی خواو، لە ئەنجامی ئەوەدا كە عەودالی هەق نینو، لە ئەنجامی ئەوەدا كە بەرژەوەندییە ناشەرعییەكان، دڵو عەقڵو چاوو گوێیانیان داپۆشیون، هەموو هەستەوەرەكانیان لە كارخستوونو، خۆیان ستەمیان لە خۆیان كردوە.

ئنجا خوای پەروەردگار باسی كۆكرانەوەو خڕ كرانەوەی ڕۆژی قیامەتیان دەكات، دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا سَاعَةً مِّنَ ٱلنَّهَارِ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی كە كۆیان دەكەینەوە، وەك نەمابنەوە جگە لە سەعاتێك، واتە: ماوەیەكی كەم لە ڕۆژێدا، ﴿ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ ﴾، كە هەر ئەوەندەی یەكدییان ناسیبێو پێك ئاشنا بووبن، ئەوە فلانە، ئەوە دراوسێی ئەو بووە، ئەوە برادەری ئەوە بووە، هەر ئەوەندە، بۆچی وایان دێتە بەرچاو؟ كە تەماشای ڕۆژە درێژەكانی قیامەت دەكەن، هەر نابڕێنەوە، كە ڕەنگە كات لەوێ واتایەكی دیكەی هەبێ، وەك چۆن خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ

﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾إبراهيم، واتە: ئەو ڕۆژە کە زەوی دەبێتە زەوییەکی دیکە، وە ئاسمانەکان دەبنە ئاسمانانێکی دیکە، بازاڕو هەڵو مەرجێکی دیکە دێتە گۆڕێ، دیارە چەمکی کاتو شوێنو هتدیش هەموویان دەگۆڕێن، بۆیە کە بەراوردی ژیانی دنیایان دەکەن، کە حەفتا، هەشتا ساڵە، هەرچەندێکە، لەگەڵ ئەو ڕۆژەی قیامەت دا، وا دەزانن هەر ماوەیەکی زۆر کەم لە دنیادا ماونەوە. ﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴾، بێگومان ئەوانەی کە بڕوایان بە دیداری خوا نەکردو بە درۆیان دانا، زیانبار بوونو، لە ڕێی ڕاست گرتووان نەبوون.

دنیا شاری بێ خاوەن نیە، خوا تۆ دروست بکاتو ئەو هەموو نازو نیعمەتەت بەسەردا بڕژێنێو، ئەو هەموو بەزمو بازاڕەت بۆ ساز بکات، دوایی لێت نەپرسێ: ئەرێ چیت کردو چۆنت کرد؟

ئنجا لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ ﴾، وە ئەگەر بەشێك لەوەی کە گفتی پێ دەدەمینەوان، هەڕەشەی لەوان پێ دەکەین، پێشانی تۆی بدەین، یان تۆ بمرێنین، پێش ئەوەی بەشێك لەو سزایە ببینی، ﴿ فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ ﴾، (لە هەردوو حاڵاندا) گەڕانەومیان بەس بۆ لای ئێمەیەو، دوایی خوا چاودێرەو ئاگادارە بەوەی کە دەیانکرد.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَآءَ رَسُولُهُمْ ﴾، وە هەموو کۆمەڵگایەك، ڕەوانەکراوێکی بووە، ئنجا لە ڕۆژی دوایی دا کاتێك کە ئەو ڕەوانە کراوە، ئەو پێغەمبەرە، دێتە بەرانبەریان، تاکو دادوەرییان لە نێواندا بکرێ، ﴿ قُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾، بە دادگەرانە دادوەرییان لە نێواندا کراو، ستەمیان لێ ناکرێ.

دەگوترێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ تۆ ئەم پەیامەت پێگەیاندوون؟ دەفەرموێ: بەڵێ، دەگوترێ: بەڵگەت چییە؟ بەڵگەکانی دەخاتەڕوو، ئەگەر نکووڵییان کرد، ئەوە دادگایی دەکرێن، بەڵام دادگاییەك کە ئەوپەڕی دادگەریی تێدایە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾، دیارە ئەگەر دادوەریی دادگەرانە بێ، ستەمی هەر تێدانییە، بەڵام ئەوە بۆ زێدە تەئکید کردنەوەیە، واتە: هیچ ستەمیان لێ ناکرێ، هەر کەسە پڕ بە پێستی خۆی، سزا دەدرێ، لەو ستەمکارو خراپەکارانە، ئەگەر چاکەکاریش بێ، بە ئەندازەی خۆی پاداشتی دەدرێتەوە، بەڵکو خوای بەخشەر زیادەشی بۆ دەخاتە سەر.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** که خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٤١﴾ ﴾، واتە: ئەگەر تۆیان بە درۆدانا، تۆیان بە خاوەن درۆ دانا، تۆ بڵێ: کردەوەی خۆم بۆخۆم، کردەوەی خۆشتان بۆخۆتان، ئێوە دوورن لەوەی کە من دەیکەم، هیچ پەیوەندییتان بە کردەوەی منەوە نیە، منیش دوورمو هیچ پەیوەندییم بە کردەوە (خراپە)کانی ئێوەوە نیە کە دەیانکەن، واتە: با هەر کەسە بۆخۆی بە ڕێی خۆی دا بڕوات.

وشەی: (كَذَّبُوكَ ) واتە: (نسبوك إلى الكَذِب) تۆیان پاڵدایە لای درۆ، تۆیان بە خاوەن درۆ زانی، کە بە داخەوە هەندێك لە تەفسیرە کوردییەکان ئەمەیان بە هەڵە لێکداوەتەوە، دەڵێن: تۆیان بە درۆ خستەوە، کە لە ڕاستییدا بە درۆ خستنەوە، جیایە لە بە درۆ دانان، بە درۆ خستنەوە ئەوەیە، کە ئەو کەسە لە ئەسڵدا درۆی کردبێ، بەڵام دوایی درۆیەکەی سپی بکرێتەوە، درۆیەکەی لەسەر ساغ بکرێتەوە، کە ئەوە بە دڵنیایی مانایەکی هەڵەیە، بەڵکو واتە: بە تەئکید تۆیان بە درۆ دانا.

ئنجا دەربارەی وشەی: (بَرِيٓءٌ) (البَرِيء: الخَلِيُّ عَنِ التَّلَبُّسِ بشَيءٍ وَعَنْ مُخَالَطَتِهِ)، (بريء) ئەوەیە کەسێك یان شتێك پاك بێ، لەوەی کە تێکەڵ بووبێ بە شتێكو لەگەڵی ئاوێتە بووبێ، مەبەست لەم ئایەتە موبارەکە، ئەوەیە کە دوای ئەوەی ئەو ڕاستییانەت بۆیان خستنە ڕوو، دەربارەی خوا بە یەکگرتن، دەربارەی خۆت، دەربارەی قورئان، ئەگەر لە داهاتوودا هەر لەسەر بێبڕوایی خۆیان، لەسەر بە درۆ دانانی تۆ، سوور بوون، مانای وایە یەکیان لەسەر بەڵگە نەکەوتوە، تۆش دوورییان لێ بکەو حاشایان لێ بکە، ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سوورەتی (النجم) وایە، کە لە ئایەتی (٢٩)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ

يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٢٩﴾﴾، واتە: تۆ پشت بکە کەسێك کە ڕوو لە یادی ئێمە، (یان ڕوو لە کتێبی ئێمە) وەردەگێڕێ‌و، تەنیا ژیانی دنیای دەوێ، پشت لەو جۆرە کەسانە بکەو وازیان لێ بێنە.

هەروەها وەك ئەو دوو ئایەتەی سووڕەتی (سبأ) وایە، کە دەفەرموێ: ﴿قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٦﴾﴾، واتە: بڵێ: ئەو تاوانانەی ئێمە دەیانکەین، ئێوە لێتان ناپرسرێتەوە لەسەریان، وە ئێمەش لەسەر کردەوەکانی ئێوە، لێمان ناپرسرێتەوە، هەر کەسە کردەوەکانی خۆی بۆخۆی، بڵێ: پەروەردگارمان پێکەوە کۆمان دەکاتەوە، بۆ دادگایی کردن، دوایی بە دادگەریی دادوەرییمان لە نێواندا دەکات‌و، خوا زۆر دادوەرێکی زانایە.

دوو ئامانجی گەورە کە ئەم ئایەتە دەیانپێکێ:

١) ئەم ئایەتە شێوازێکی زۆر بەرزی تێدایە بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن، لەگەڵ نەیاران دا، کاتێك کە دەگەیە بنبەست، بوەستی‌و بڵێی: باشە، هەر کەسە لەسەر ڕێی خۆی، نەك وەك گوتراوە: لەگەڵی بگەیەنیە مریشکە ڕەشە، بەڵکو کە زانیت ئەو کەسە لە هەق ناگەڕێ، وە نایەوێ دانی پێدابێنێ، لێیگەڕێ.

٢) ئەوەش لێوەردەگیرێ کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ زۆر دڵنیاو پشت ئەستوور بووە لە ڕێبازی خۆی، کە سەرەنجامی خێرو چاکەیە، ڕێچکەو کوێرە ڕێیەکانی ئەوانیش سەرەنجامیان شوومە، واتە: ئەوە من بۆم ڕوونکردنەوە، ئێوە بە ڕێیی خۆتاندا بڕۆن، مادام هەر ئامادە نین، ئەم هەقە لە من وەربگرن، فەرموون: بە ڕێی خۆتاندا بڕۆن، منیش بە ڕێی خۆم دادەڕۆم.

هەڵبەتە ئەم تەعبیرە لە چەندان شوێنی قورئاندا هاتوە وەك دەفەرموێ: ﴿فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿٧١﴾﴾الأعراف، یان دەفەرموێ:

﴿ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ ۖ وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِۦٓ أَوْ بِأَيْدِينَا ۖ فَتَرَبَّصُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾ التوبة، واتە: چاوەڕێ بکەن، ئێمەش لەگەڵ ئێوە چاوەڕێین.

کە وەك گوتم: پشت ئەستووریی ئینسان، و متمانەبوون بە خواو بەرنامەکەی، و باوەڕ (ثقة) بەخۆبوون، دەگەیەنێ.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٢﴾ وَمِنْهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾، وە لەوان کەسانێك هەن، کە گوێت بۆ هەڵدەخەن، بەڵام ئایا تۆ دەتوانی بە کەسانێك کە نافامن، ببیستێنی؟ وە لەوان کەسانێك هەن، تەماشات دەکەن، بەڵام ئایا تۆ دەتوانی ڕێنمایی کوێرانێك بکەی کە نابینن؟

لێرەدا دوو مەبەستی گەورە لە باسکردنی ئەمەدا هەن:

١ـ ناساندنی ئەو جۆرە کەسانە بە پێغەمبەرﷺو، بە هەر کەسێکی دیکە، کە بە ڕێی پێغەمبەری خاتەم دا ﷺ دەڕوات، کە تۆ جاری وایە لەگەڵ کەسانێکدا ڕووبەڕوو دەبیەوە، هەموو شتێکیان بۆ ڕوون دەکەیەوە، هەقیان وەك گۆشتی سەر چەپەرێ بۆ دەخەیە گۆڕێ، هیچ تەمو مژی بە دەورەوە نامێنێ، بەڵام تەماشا دەکەی، هەر نایانەوێ بیسەلمێنن، وەك کابرا گوتی: (بشفرێ هەر بزنە)! نایەوێ بیسەلمێنێ.

٢ـ دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەرﷺو، بۆ هەر کەسێك کە لە ڕێی پێغەمبەرەوە ﷺ دەڕوات، کە کەمو کورتیی لە کردەوەکانی تۆوە نیە، لە بەرنامەکەی تۆوە نیە، بەڵکو کەمو کورتییو ناتەواوییو لە بەرانبەرەکانت دا هەیە، کە هەستەوەرەکانی خۆیان لە کارخستوون.

دیاره کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾، دوایی دەیکات بە ڕاناوی تاك كە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ أَفَأَنتَ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾، هەیانە تەماشات دەكات!

وشەی (مَنْ) بۆ تاكو بۆ كۆ بەكاردێ‌و، ئەوە جۆرێكیشە لە جۆراو جۆری لە دەربڕیندا.

بۆیە بۆ گوێگرتن، بە كۆ هاتوه، چونكە دەنگ لە زۆر لایانەوە بۆ گوێ دێ، بەڵام تەماشا كردن بە تاك هاتوه، چونكە ئینسان تەنیا دەتوانێ تەماشا یەك شوێن بكات، بۆیە خوا بیستنەكەی بە كۆ هێناوەو، بینینەكەی بە تاك هێناوە.

دیاره مانای وشەكانی كتێبی خوا ﷻ هەر تەنیا خۆی بە تەواویی دەیانزانێ.

<u>مەسەلەی سێیەم</u>: كە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ ٱلنَّاسَ شَيْـًٔا وَلَـٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾، بێگومان خوا هیچ ئەندازەیەك ستەم لە خەڵك ناكات، بەڵام ئەوە خەڵكن، ستەم لە خۆیان دەكەن.

وا دێتە بەرچاو: خوای كاربەجێ لێرەدا وەڵامی پرسیارێك، ئیشكالێك بداتەوە، كە بە هۆی دوو ئایەتی پێشیّوە لە هەندێك بیرو زەیناندا پەیدا دەبن، پرسیارەكەش ئەوەیە:

ئەوانە كە نابیستن‌و، نابینن، خوا بە كەڕو كوێر ناویان دێنێ، كەواتە: چ گلەییەكیان دێتە سەر، دیاره خوا كەڕو كوێری كردوون لە بەرانبەر هەقدا، بۆیە هەق نابیستن‌و هەق نابینن، مادام وایە خوا بۆچی گلەییان لێدەكات‌و سزایان دەدات؟

ئایەتەكانی قورئان وەك زۆر جاری دیكەش باسمان كردوە، وەك ئاڵقەكانی زنجیرن‌و هەموویان یەكدی دەبەستنەوە، بەڵام دەبێ ئینسان باش ڕامێنێ: ئەم

ئایەتە بۆچی بە دوای ئەم ئایەتەدا هاتوە، ئەم ئایەتە بۆچی لە پێش ئەم ئایەتەوە هاتوە؟!

بێگومان خوا هیچ ئەندازەیەك ستەم لە خەڵك ناكات، كە ئاوا هەستەوەرەكانیان لە كاردەخەن، بیستنیان لە كاردەخەن: بینینیان لە كاردەخەن، گوێیان قسە هەقەكان دەبیستێ، بەڵام دوایی عەقڵ و هۆشیان ئەو دەنگانە شی ناكاتەوە، تا وەریانبگرێ، چاویان دیمەنەكان دەبینێ، بەڵام دوایی عەقڵیان ئەوەی كە لە پشت دیمەنەكانەوە وەردەگیرێ، وەریناگرێ، ئەوە خۆیانن لە ئەنجامی كەللە ڕەقیی و عینادیی و گوناهو تاوان دا، ستەمیان لە خۆیان كردوە، چونكە خوای كارزان باسی لەڕێ دەرچوون (فسق) دەكات، باسی تاوانكردن (إجرام) دەكات، باسی گوناه (معصیة) دەكات، یانی: لە ئەنجامی ئەو گوناهو تاوان و لادان و خراپەكارییەی خۆیاندا، هەستەوەرەكانی خۆیانیان لە كارخستوون و، خۆیان بەو دەردە بردوە، لە ئەنجامی ئەوەشدا یاسای خوا بەسەریاندا چەسپیوە، بەپێی یاسای خوا: هەر كەسێك لەسەر خراپەیەك بەردەوام بوو، ئەو خراپەیە دەبێتە بەشێك لە سروشت و كەسایەتیی، جاری دیكەش باسمان كردوە، كەسێك خوو دەگرێ بە خواردنێكی خراپەوە، بە شتێكی پیسەوە، دوایی ئەوە دەبێتە بەشێك لە سروشتی، ڕەنگە ئەو شتە پێشتر زۆر لەسەری قورس بووبێ، ئەگەر شەڕاب خۆرییە، جگەرە كێشانە، سەرەتا لەسەر جەستەی قورسە، بەڵام دوایی كە پێیەوە ڕاهات، دەبێتە بەشێك لە سروشتی، هەروەها بۆ چاكەش هەر وایە، ئەو چاكەیە ئەگەر كردەوەیەكی وەك هەڵسان بێ بۆ نوێژی بەیانیی، ڕۆژوو گرتنی فەرز یان سوننەت، ماڵ بەخشین، جەنگ و جیهاد كردن، كۆچ كردن لە پێناوی خوادا، ڕقی خۆ قووتدانەوە یەكەمجار ڕەنگە بۆت قورس بێ، بەڵام دوایی پێیەوە ڕادێی.

هەڵبەتە ئەمە هەم بۆ حاڵەتی جەستەیی و هەم بۆ حاڵەتی دەروونیی، هەر وایە، ئنجا بۆ كردەوەی چاكیش وایە، بۆ كردەوەی خراپیش وایە، واتە: بە پێی یاسای خوا كە لە ژیانی بەشەردا دایناوە، ئەگەر ئینسان لەسەر شتێك بەردەوام بوو، لەسەری چوو، ئەوە دوایی دەبێتە بەشێك لە كەسایەتیی و كەینوونەی و. سەرەنجام ئەوە دەرهاویشتەی دەبێ، لەسەر جۆری بیركردنەوەی، لەسەر جۆری بیستنی، لەسەر جۆری بینینی.

**مەسەلەی چوارەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةً مِّنَ ٱلنَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾،

وە یاد بکەوە ئەو ڕۆژەی کە خوا کۆیان دەکاتەوە، {(حشر) کۆکردنەوە، ئەوەیە کە لە چەند شوێنێکی جیاوە بۆ یەك شوێنی دیاریکراو کەسانێك یان شتانێك ببردرێن} لەو ڕۆژەدا بێبڕوایەکان وایان دێتە بەرچاو کە تەنیا کاتێکی کەم لە ڕۆژێدا ماونەوە، یەکدییان ناسیوەو بە یەکدی ئاشنا بوونە.

وشەی (الساعة) لە بەکارهێنانی قورئاندا بریتیە لە: (مقْدَارٌ مِنَ الزَّمَانِ وَالأَكْثَرُ أَنْ تُطْلَقَ عَلَى الزَّمَانِ القَصير إلاّ بقَرِينةٍ)، واتە: ماوەیەك لە کات، بەڵام بە زۆریی بۆ ماوەیەکی کەم بەکاردێ، مەگەر بەڵگەیەك هەبێ لەسەر ئەوەی کە کاتەکەی زۆرە، ئەگەرنا زیاتر بۆ ماوەی کەم بەکاردەهێنرێ.

دەبێ بزانین (الساعة) بە مانای (کاژێر)، کە شەست خولەکە، نیە، کە ڕۆژیش بیستو چوار سەعاتە، بەڵکو لە زمانی عەرەبییدا واتە: کاتێکی کەم، نەك یەك لەسەر بیستو چوار (٢٤/١)ی شەوو ڕۆژێك، ئەوە چەمکێکی باوی ئەم سەردەمەی ئێستایە، دوای ئەوەی کە کاتژمێر دروست کراوە.

ئنجا ئەمە بە درۆ خستنەوەی کافرەکانە کە دەیانگوت: زۆر دەمێنینەوە لە گۆڕدا، دوای ئەوەی کە مردین داخۆ کەی قیامەت دێ، ئەو هەموو کاتە زۆرەی کە پێدەچێ، چۆن دەگونجێ ئێمە زیندوو بکرێینەوە؟ خوا پێیان دەفەرموێ: ئێوە لە قیامەتدا کاتێك کە کۆدەکرێنەوە، وا دێتە بەرچاوتان تەنیا یەك سەعات ماونەتەوە، کاتێکی کەم ماونەتەوە، هەر بایی ئەوەندەی یەکدی بناسن، واتە: ئەوەندە مانەوەی دوای مردنتان بە بەراورد لەگەڵ قیامەتو، لەگەڵ ئەو کاتە دوورو درێژەدا، کە هەر خوا دەزانێ، چەندە؟ هەر بایی ئەوەندەیە کە ئاشنایەتییتان لەگەڵ یەکدی پەیدا کردبێ.

وشەی (تَعَارف) (تَفَاعُل) لە: (عَرَفَ)ەوە یانی: ناسی، هاتوە.

هەڵبەتە وشەی (الساعة) وەك دواییش باسی دەكەین، خوای قسە لەجێ كردوویەتی بە ناوونیشانو زاراوەیەك بۆ ئەوكاتەی كە دنیای تێدا كۆتا دێ، كە بە كوردیی دەڵێین: ئاخر زەمان، پەسڵان، (الساعة) واتە: كاتی تێدا كۆتایی هاتنی دنیا، جیایە لە (قیامة)، واتە: كاتی هەڵسانەوەو زیندووبوونەوە دوای تێكچوونو نەمانی دنیا، بەڵام (الساعة) واتە: ئەو كاتە كەمەی كە دنیای تێدا كۆتا دێ.

لە كۆتایی دا خوا دەفەرموێ: ﴿ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾، بێگومان ئەوانەی كە دیداری خوایان بە درۆ زانی، زیانبار بوون، زیانیان لێكەوتو، لە تێگەیشتووانو ڕێنمایی وەرگران نەبوون، بۆیە زیانبار بوون، ڕێی ڕاست گرتن ئەوەیە كە مرۆڤ بزانێ ئەم بوونەوەرە، ئەم كەونەو كائیناتە، شاری بێ خاوەن نیە، خوایەك ئێمەی هێناوەو ئەم دروستكراوانەی دروست كردوونو، دوای ئەوەی كە لە بەینمان دەبات، دووبارە دروستمان دەكاتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقًّاۚ إِنَّهُۥ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلۡقِسۡطِۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ شَرَابٞ مِّنۡ حَمِيمٖ وَعَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ﴿٤﴾ ﴾یونس، خوا دروستكراوەكان لە بەین دەبات، پاشان دووبارە دەیانهێنێتەوە، ئەوان لەبەرئەوەی ڕێی ڕاستگرتوو نەبوونو، ئەو تێگەیشتنەیان نەبوو، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ ﴾الروم، واتە: ڕواڵەتێك لە ژیانی دنیا دەزانن، بەڵام لە دواڕۆژ بێئاگان، بۆیە تووشی ئەو زیانبارییو دۆڕانە بوون.

<u>**مەسەلەی پێنجەم**</u>: كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعۡضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمۡ أَوۡ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾، وشەی (وَعد) لە قورئاندا

هەم بۆ گفتو بەڵێنی باش (الوعدُ بالخَیْر) دێو، هەم بۆ گفتو بەڵێنی خراپ (وَعِید)یش.

ئنجا لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوەی کە ئێمە بەڵێنو گفتیان پێدەدەین، کە بریتیە لە سزاو ئازاری دنیا، ئەگەر هەندێك لەوەت پێشان بدەین، یاخود بتمرێنین، پێش ئەوەی ئەو سزایەی خوا هەڕەشەی پێ لەوان دەکات، پێشانی تۆی بدەینو، دڵت ئۆخژنی بۆ بێ، کە هەموو جارێ تۆیان هەڵدەپێچا: دەی ئەگەر ڕاست دەکەی، سزای خوا بێنە، بەردمان بەسەردا ببارێنە، سزای بەئێشمان بۆ بێنە! لە هەردوو حاڵاندا گێڕانەومیان، یان شوێنی گەڕانەومیان{چونکە (مَرْجِع) هەم بە مانای چاوگە (رجُوع)، هەم بە مانای ناوی شوێن (اسم مکان)ە} ، لە هەردوو حاڵاندا گەڕانەومیانو گێڕانەومیان بۆ لای ئێمەیە، دوایش خوا شایەد بووە بەسەر ئەوەوە کە دەیکەن، هەمووی بینیوەو ئاگادارە پێیان.

لە ئایەتی ژمارە (١٠) تا (١٦)ی سووڕەتی (الدخان)دا، زیاتر تیشك خراوەتە سەر ئەو سزا دنیاییەی کە خوا هەڕەشەی پێ لە کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ دەکات، بەتایبەت کافرەکانی مەککە، کە دیارە بۆ کافرەکانی ڕۆژگارەکانی دیکەش، ئەو یاسایەی خوا هەر لە ئارا دایە، خوا لە سووڕەتی (الدخان)دا دەفەرموێ: ﴿ فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ١٠ يَغۡشَى ٱلنَّاسَۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ١١ رَّبَّنَا ٱكۡشِفۡ عَنَّا ٱلۡعَذَابَ إِنَّا مُؤۡمِنُونَ ١٢ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكۡرَىٰ وَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مُّبِينٞ ١٣ ثُمَّ تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَقَالُواْ مُعَلَّمٞ مَّجۡنُونٌ ١٤ إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلۡعَذَابِ قَلِيلًاۚ إِنَّكُمۡ عَآئِدُونَ ١٥ يَوۡمَ نَبۡطِشُ ٱلۡبَطۡشَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ١٦ ﴾.

واتە: چاوەڕێ بکە ڕۆژێك کە ئاسمان دووکەڵێکی ئاشکرا دێنێ ، خەڵك دادەپۆشێ، (خەڵك، یان فریشتەکان دەڵێن:) ئەوە سزایەکی بەئێشە، (ئنجا دەپاڕێنەوە) پەروەردگارمان! ئەم سزایەمان لەسەر لابدە، ئێمە دەبینە بڕوادار، {(خوا ﷻ) دەفەرموێ:} چۆن پەند وەردەگرن، کە پێشتر پێغەمبەرێکی ڕوونو ئاشکرایان بۆ هاتبوو، بەڵام بانگەوازەکەیان قبووڵ نەکرد، ئنجا پشتیان تێکردو

گوتیان: فێرکراوەو شێتیشە، ئێمە بۆ ماوەیەکی کەم ئەو سزاو ئازارەتان لەسەر لادەبەین، بەڵام ئێوە دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ سەر بەزمی پێشێتان (دوای ئەوەی کە سزایەکەمان لەسەر لابردن) ئەو ڕۆژەی کە تۆڵەی گەورە دەستێنینەوە، ئەو ڕۆژە ئێمە تۆڵە سێنەرەوەین (جا چ مەبەست جەنگی بەدر بێ، چ مەبەست کاتی مەرگیان بێ، چ مەبەست پێی ڕۆژی دوایی بێ).

کە ئەگەر تەمەن باقی بێ، لە تەفسیر سوورەتی (الدخان)دا پێی دەگەین، زانایان دەڵێن: کاتی خۆی گرانییەك بەسەر خەڵکی مەککەدا هات، دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ تووکی لێکردن‌و فەرمووی: {اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ[1] اللَّهُمَّ اجْعَلْهَا سِنِينَ كَسِنِينَ يُوسُفَ} {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٩٦١)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ}.

واتە: ... خوایە! ساڵی گرانیی‌و قات‌و قڕیی بەسەر (موزەڕ) دابێنە، وەك ئەو ساڵانەی کە بەسەر خەڵکی میسرڕدا هاتن.

کە یوسوف سەلامی خوای لێ بێ، نەخشەیەکی ئابووریی بۆ دانان بۆ ئەوەی ڕزگاریان بێ لەو قەیرانە ئابوورییە، کەسی وایان هەبوو ئەوەندە تووشی هەژاریی‌و گرانیی‌و قات‌و قڕیی بوو بوو، وای دەزانی کە لە نێوان ئەوو ئاسماندا چینێکی ئەستووری تۆزو خۆڵ‌و دووکەڵ هەیە.

کە دەفەرمویێ: ﴿ثُمَّ اللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ﴾، واتە: دوای ئەوەش ئنجا خوا ﷻ ئاگادارەو چاودێرە بەسەر ئەوەوە کە دەیکەن.

وشەی (شهید) واتە: شایەد، دەڵێ: (وَهُوَ مُخْبِرٌ عَنْ أمرٍ فِيهِ تَصْدِيق مُخْبِرِ. وَاستَعْمِلَ هُنَا في العَالِمِ عِلْمَ تَحْقِيقٍ)، (شهید) بریتییە لە هەواڵدەرێك کە لە هەواڵ دانەکەیدا بەڕاست دانانی ئەو هەواڵدەرە هەیە، شایەدیی دەدات دەڵێ: ئەو هەواڵدەرەی کە هەواڵتان پێدەدات ڕاست دەکات، وە لێرەدا بە مانای زانایەك بەکارهاتوە کە چاك لە زانیارییەکەی خۆیدا گەیشتۆتە دڵنیایی.

---

١) (أي القريش).

**مەسەلەی شەشەمو کۆتایی**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَآءَ رَسُولُهُمْ قُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾، وە بۆ هەر کۆمەڵگایەك رەوانەکراوێك نێردراوە، ئنجا لە رۆژی دوایی دا کە پێغەمبەرەکەیان بۆ لایان هات (بۆ دادگایی کردنو پاداشتو سزا وەرگرتنیان) لە نێوانیاندا دادوەریی دەکرێ بە دادگەرانە، وە ئەوان ستەمیشیان لێ ناکرێ.

لێرەدا دوو پرسیار دروست دەبن:

## وەڵامدانەوەی دوو پرسیار

١ـ ئایا بۆ هەر کۆمەڵگایەك پێغەمبەرێكو رەوانەکراوێك هەبووە؟

وەڵام/ دەڵێین: بەڵێ، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (فاطر)دا زۆر بە روونو راشکاویی دەفەرموێ: ﴿ ... وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: وە هیچ کۆمەڵگایەك نەبووە، مەگەر وریاکەرەوە، ترسێنەرێکی تێدا رابردوە، کە لێرەش دەفەرموێ: ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ ﴾، بۆ هەر کۆمەڵگایەکی گەورە، پێغەمبەرێك هەبووە، بەڵام لە سوورەتی (فاطر)دا خوای پەنهانزان زۆر بە شێوازێکی دڵنیاکەرەوە فەرموویەتی: هیچ کۆمەڵگایەك نەبووە، مەگەر وریاکەرەوە، ترسێنەرێکی تێدا رابردوە.

کە زانایان دەڵێن: بەهێزترین شێوازی ئیسپات کردنی بابەتێکە، کە لە پێشیەوە لابردن (نفي) هەبێو لە دوایەوە هەڵاواردن (إستثناء) بێ.

ئەگەر تەماشای مێژووی گەلانو ئوممەتانی پێشووش بکەین، هەر وامان دێتە بەرچاو، بەڵام پێویستە ئەو راستییەش بزانین کە مێژووی گەلانو وڵاتانو کۆمەڵگاکان کێ نووسیویەتیەوە؟ کاتی خۆی نووسینو خوێندن، وەك ئێستا نەبووە، هەموو کەس خوێندنو نووسینی نەدەزانی، خوێندنو نووسین زیاتر لە دەستی دەستەڵاتداراندا قۆرخکرابوو و کورت هەڵهاتبوو، ئەوان

مێژووەکەیان بە کەیفی خۆیان نووسیوەتەوە، بۆیەش لەو شوێنەوارانەی میسرو شامو عێراقو ... هتددا، باسی ئیبراهیم ناکرێ، ئەگەرنا ئەوە شتێکی دیارە کە ئیبراهیم علیه السلام جوولەکەو نەصرانییو مسوڵمانو خەڵکی دنیا هەموویان دەزانن، کە ئیبراهیم علیه السلام پیاوێك بووەو، ئەو بەسەرهاتانەی هەبوون، بەڵام بۆچی باسو خواسی نەنووسراوە؟ چونکە دەستەڵاتداران مێژوویان بە شێوەیەك نووسیوەتەوە، کە لەگەڵ بیروبڕوا کلتوورو فەرهەنگی خۆیاندا بگونجێ، ئێستاش کە دنیا هێندە پێشکەوتوە، لە ڕووی زانستو خوێندنو نووسینەوە، بۆ وێنە: تەماشای مێژووی عێراق بکە، ئەگەر صەددام لە بەین نەچووبایە، بێگومان مێژووی عێراقی بەو شێوەیە دەنووسیەوە کە بۆ خۆی پێی خۆش بووە، ئەو جەنگە هەشت ساڵییەی ئێرانی هەر بە قادسیەی دووەم ناونابوو، وە جەنگی کوێتی بە (غزو) ناونابوو، بەڵێ مێژوو دەستەڵاتداران بەو شێوەیە دەینووسنەوە کە لە بەرژەوەندیی خۆیان بێ، بۆیە پێویستە وریابین، من زۆر لەو کتێبە مێژووییانەم خوێندوونەوە، تەماشام دەکرد باسی پێغەمبەرانیان تێدانیە، بەڵام نهێنییەکەی ئەوەیە، وەك گوتم: خوێندنو نووسین ئەوکاتە زۆر کەمبووە، ئەوەی کە هەشبووە، شتێکی سەلمێنراوە کە لەدەستی دەستەڵاتداراندا بووە، ئەوانیش ئەوەی کە بۆخۆیان پێیان خۆشبووەو لەگەڵ بیرو بڕواو کلتوورو فەرهەنگو بەرنامەو فیکری خۆیاندا گونجاوە، نووسیوویانەتەوە، وە هەر هەواڵێك پێچەوانەی بیروبڕواو کلتوورو فەرهەنگو بەرنامەو فیکری ئەوان بووبێ، نەیانووسیوەتەوە.

ئنجا ئەو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) کە هەر دژایەتیی کراونو دەرکراون، هەیانبووە بەند کراوە، هەیانبووە شەهید کراوە، وەك زەکەریاو یەحیا، ئنجا وەك چۆن خۆیان نارەحەت کراونو کوژراون، ناحەزەکانیان شوێنەوارەکانیشیان ئاوا سڕیونەوە.

٢ـ بۆچی ئەو پێغەمبەرانە صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، وەك نووحو ئیبراهیمو مووساو عیساو موحەممەد، هەروەها هوودو صاڵحو لووطو شوعەیب، زیاتر لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستن؟

وەڵام/ وەڵامەکەی ئەوەیە کە بەشەر بەگشتی زیاتر لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون، وەك جارێکی دیکەش باسم کردوە: لە ساڵی ٢٠١٤ز دا، لە سەفەرێکمدا بۆ سوید، چووینە شاری (یوتۆبۆریی) کە یەکێکە لە شارە گەورەکانی سوید، چووینە شوێنێکی زۆر بەرز، ڕەنگە زیاتر لە کیلۆمەترێك لە ئاستی دەریا بەرز بێ، چیایەك بوو، میلێکی لێ بوو لەسەری نووسرابوو: دە هەزار (١٠,٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش، ئێرە سەد مەتر ئاوی لەسەر بووە، واتە: شوێنە بەرزەکە لە ژێر قووڵایی سەد مەتر ئاو دابووە، ئەدی دەبێ شارەکە چەندەی ئاو لەسەر بووبێ؟ کەواتە: ڕەنگە زۆر لە وڵاتانی ئەورووپا ساڵانێکی زۆر لە ژێر دەریادا بووبن، پاشان باسی ئەوە دەکرێ کە کاتی خۆی هەردوو قارەی ئاسیاو ئەفریقیا لەگەڵ قارەی ئەمریکا، پێکەوە بوو ون، دوایی گۆی زەوی گۆڕانێکی گەورەی بەسەردا هاتوە، ئەگەرنا چ شتێك هێندە سوورەکانی گەیاندۆتە ئەمریکا؟ چونکە ئەو کاتە هۆکاری هاموشۆ هێندە پێشکەوتوو نەبووە، وادیارە کاتی خۆی بە یەکەوە لکاو بوون، دوایی پچڕاون، کە دیارە گۆڕانکاریی زۆر بەسەر ئەم زەوییەی ئێمەدا هاتوون.

ئنجا لە ڕاستییدا لە نێو هەموو کۆمەڵگاکان دا، لە نێو دواکەوتووترین کۆمەڵگاشدا شوێنەواری ئایینو خواپەرستییو دروشمەکانی خواپەرستیی هەن، ئەوە نەك هەر من وا بڵێم، بەڵکو (توینبی) کە باسی مێژووی شارستانی بەشەر (قصة الحضارة) دەکات، هەروەها هەموو ئەوانەی لە مێژووی بەشەر دەکۆڵنەوە، دەڵێن: هیچ کۆمەڵگایەك نیە کە جۆرێك لە دینداریی‌و دروشمەکانی خواپەرستییو بەندایەتیی بۆ خوا کردنی، تێدانەبێ، چ بە ڕاست، چ بە هەڵە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شەشەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە نۆ (٩) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی ؛ (٤٨ تا ٥٦)، تەوەری سەرەکیی ئەم دەرسە، بریتیە لە باسی هاتنی (ساعَة) و (قِیامَة)، کە بەداخەوە زۆر کەس ئەم دوو وشەیە تێکەڵ دەکەن، بەڵام وەك دوایی باسی دەکەین، دوو مانای جیایان هەن، دیارە بێبڕوایەکان پەلەیان کردوە لە هاتنی کاتی تێکچوونی بوونەوەر، خوای زاناو کارزانیش بە پێغەمبەری خۆی ﷺ دەفەرموێ: پێیان ڕابگەیەنە ؛ کە ئەم مەسەلەیە کەمو زۆر پەیوەندیی بە ئێوەوە نیەو، عائیدی خوایە، پاشان هەر کام لە (ساعَة)و (قِیامَة)، وەك واقعێك دەخاتە بەرچاوو، دڵنیایان دەکاتەوەو، ڕوونیشی دەکاتەوە کە بابای کافری ستەمکار، لەو ڕۆژەدا بە ئاوات دەخوازێ کە هەموو دنیا بکاتە بەلاگێڕی خۆی‌و، دەربازی ببێ، بەڵام بێ سوودە.

لە کۆتایی دا خوا ﷻ خاوەندارێتیی خۆی بۆ ئاسمانەکان‌و زەوی‌و هەرچی تێیاندا هەیە، دەخاتەڕووو، ئەوە کە بەڵێنی خوا ڕاستەو دێتە دی، پاشان زیندووکردنەوەو مراندنی ڕەها، وەك سیفەتێکی خۆی باس دەکات‌و، گەڕانەوەی مرۆڤەکان بۆ لای خۆی بۆ سزاو پاداشت، ڕادەگەیەنێ.

﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى ضَرًّا وَلَا
نَفْعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۗ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ ۚ إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً ۖ وَلَا
يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُهُۥ بَيَٰتًا أَوْ نَهَارًا مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ
ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٥٠﴾ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ ءَامَنتُم بِهِۦٓ ۚ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ
قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٥٢﴾
وَيَسْتَنۢبِـُٔونَكَ أَحَقٌّ هُوَ ۖ قُلْ إِى وَرَبِّىٓ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ ۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥٣﴾ وَلَوْ
أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِى ٱلْأَرْضِ لَٱفْتَدَتْ بِهِۦ ۗ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ۖ
وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٥٤﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٥﴾ هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ
وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾.

## مانای وشــە بە وشەی ئایەتەکـان

{وە بێبڕوایەکان دەڵێن: ئەگەر ڕاسـت دەکەن : ئەم بەڵێنە کەی دێتە دی (واتە: بەڵێنی کۆتـایی هـاتنی دنیـا، یـان زیندووکـرانەوەو هەڵسـێنرانەوە) ﴿٤٨﴾ بڵێ: هیچ زیان‌و سوودێکی خۆشمم بەدەست نیە، مەگەر ئەوەی خـوا بیەوێ، بۆ هەر کۆمەڵگایەك کـاتێکی کۆتـایی هـاتن هەیە، هەر کـات کـاتی کۆتـایی هاتنیـان هـات، نـە سـەعاتێك دوا دەکەون‌و نە پێشدەکەون ﴿٤٩﴾ بڵێ: پێم بڵێن: ئایـا هەر کات سزای خـوا بـە شـەوێ یـان بە ڕۆژێ هات، تـاوانـباران پەلـەی چ بەشـێکی دەکـەن، ﴿٥٠﴾ ئایـا دوای ئـەوەی قـەوما، بڕواتان هێنـا، ئایا ئێستا، کە پێشـتر پەلەتان لێ دەکرد؟ ﴿٥١﴾ دوایی بەوانەی سـتەمیان کـردوە گوترا: ئازاری هەمیشەیی بچێژن، ئـایـا هـەر بـە پێی ئـەوە کـە دەتـانکـرد، سزا نـادرێن ! ﴿٥٢﴾ هەواڵت لـێ دەپرسـن: ئایـا ئـەو هەواڵـی هەڵسانەوەو زینـدووبوونەوەی دوای مـردن، ڕاستە؟ بڵێ: بەڵـێ، سـوێند بـە پـەروەردگارم، ئـەوە ڕاسـت‌و چەسـپاوەو. ئێوەش دەستەوسـانکەری خـوا نین (کە زیندووتـان بکاتەوەو سزاشـتان بـدات) ﴿٥٣﴾ لـەو ڕۆژەدا هـەر کەسـێك کـە سـتەمی کـردوە، ئەگـەر هەرچـی لـە زەویدایـە، هەیبـووایە. دەیکـردە قـەرەبووی‌و، کاتێك سزاو ئازاریـان بینـی، پەشـێمانییان پەنهـان کـردو، بـە دادگەرانە دادوەرییان لە نێواندا کرا، بێئەوەی ستەمیان لێ بکرێ ﴿٥٤﴾ بزانن! هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەویدایە، هی خوایـە، ئاگـاداربن! کە بەڵێنی خـوا بە هـاتنی قیـامەت چەسـپاوە، بەڵام زۆربەیان نازانن ﴿٥٥﴾ هەر خـوا دەژیەنێ‌و دەمرێنێ‌و، هەر بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە ﴿٥٦﴾ }.

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(أَجَلٌ ) : (الأَجَلُ: المُدَّة المَضروبة لشيء)، (أجل) بريتيه له كاتى دياريكراو بۆ شتێك، واته: كۆتایی هاتنی ئەو شته.

(وَيَسْتَنْبِئُونَكَ) : واته: هەواڵت لێ دەپرسن، (النَّبأُ: خَبَرٌ ذُو فَائِدَة عَظيمة يَحصلُ بِهِ علمٌ أو الظن الراجح) (نبأ) بریتیە لە هەواڵێك كە سوودێكی مەزنی هەبێ، بەهۆیەوە زانیاریی، یاخود گومانێكی زاڵ، وەدەست بێ.

(إِي ) : بە واتای (نَعَم)، دێ بەڵام (لاَ يَكُونُ إِلاَّ مَعَ القَسَمِ) وشەی (إِي) واتە: بەڵێ، بەڵام حەتمەن لە دوایەوە، سوێند دێ.

(وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ) : واتە: ئێوە دەستەوسانكەر نین، (العَجْزُ : أَصْلُهُ التاخُّرُ عَنِ الشيءِ، وَحُصُولُهُ عِنْدَ عَجْزِ الشيءِ وَمُؤَخَّرِهِ)، (عجز) بریتیە لە دواكەوتن لە شتێكو، كەوتنە پاش شتێك، (وَصَارَ فِي التَّعَارُفِ اسْمَاً لِلْقُصُورِ)، دوایی بە شێوەی عورفو باو، بۆتە ناو بۆ كەمتەرخەمیی.

(لَٱفْتَدَتْ بِهِۦ ) : (الفِدَى وَالفِدَاءُ: حِفْظُ الإِنسانِ عَنِ النائبَةِ بِمَا يبْذُلُهُ عَنْهُ) واتە : (فِدَى وَفِدَاء): بریتیە لەوە كە ئینسان خۆی بپارێزێ لە بەڵایەك، بەهۆی پارەیەكەوە كە سەرفی دەكاو دەیكاتە بەڵاگێڕی خۆیو، دەیكاتە قەرەبووی خۆی، (افتَدى: إِذَا بَذَلَ ذَلِكَ عَنْ نَفْسِهِ)، (افتَدى) واتە: پارەیەكی سەرف كرد خۆی بكڕێتەوە.

(وَأَسَرُّواْ ) : (الإِسْـرَارُ : خِلاَفُ الإِعْلاَنِ)، (إسـرار) واتـە : پەنهـان کـردن، پێچـەوانەی (إعـلان)ە، ئاشکرا کـردن.

(ٱلنَّدَامَةَ ) : واتـە : پەشـێمانیی، (النَّـدَمُ وَالنَّـدَامَةُ : التَحَسُّـرُ مِـنْ تَغيُّـرِ رَأَيٍ فِـي أَمْـرٍ فَائِـت)، واتـە: (نَـدَم)و (نَـدَامَة)، واتـە: خەفـەت خـواردن بەهـۆی ئـەوەوە، کـە ڕای گۆڕاوە دەربـارەی شـتێك کە تێپەڕیوە (ڕای بگۆڕێ، نەگـۆڕێ بـێ سوودە).

# مانـای گشـتی ئایەتەکـان

خوا ﷻ لە درێژەی باسکردن‌و خستنەڕووی هەڵوێستی بێبڕوایەکان لە بەرانبەر پێغەمبەری خاتەم ﷺ و لە بەرانبەر قورئانداو، ئەو بابەتانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوو توێی قورئاندا دەیخستنەڕوو، بە تایبەت ئەوە کە ڕۆژێك دێ، دنیا کۆتایی پێ دێ، ئەم بازاڕە دەپێچرێتەوە، دوایی بازاڕێکی دیکەو قۆناغێکی دیکە دێتە پێش، کە قۆناغی هەڵسانەوەو زیندووبوونەوەو لێپرسینەوەو سزاو پاداشتە، لەوبارەوە بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، وە هی ئەم ڕۆژگارەی ئێمەش‌و هی دوای ئێستاش، هەمیشە دەربارەی ئەو ڕاستییانە مشتومڕیان کردووەو جێی ئیشکالیان بوون، مەگەر کەسانێك کە لە وەحی خوا بەهرەمەند بووبن‌و لەو ڕاستییانەی بەهرەمەند بووبن کە وەحی خوا دەیانگەیەنێ، ئەگەرنا ئەوە شتێکی نادیارەو، بۆ بەشەر دوورە دوای ئەوەی ئینسان دەمرێ، دووبارە زیندوو بێتەوە ! هەڵبەتە بۆ خوای پەروەردگار زۆر زۆر ئاساییە، ئەدی چۆن لە سەرەتا دروستی کردوە؟ ئەگەر بە قیاسی عەقڵیی‌و مەنتیقییش بێ، کەسێك کە شتێك دروست بکات، دوای ئەوەی کە لێی تێکدەچێ، ئاسانتر دەتوانێ دروستی بکاتەوە، دروستکراوێك کە دووبارە دەکرێتەوە لەوەی لە نەبوو دروست دەکرێ، ئاسانتر چاك دەکرێتەوە، دروست دەکرێتەوە.

ئنجا لەو سیاقەدا خوای باڵادەست باسی قسەی کافرەکان دەکات، سەرەتا دەفەرموێ :

﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾، وە دەڵێن: ئەو بەڵێنە کەی دێ، ئەگەر ڕاست دەکەن؟

ئایا مەبەستیان پێی چی بووە؟ دەگونجێ مەبەستیان پێی (قیامة) بووبێ، دەشگونجێ مەبەستیان پێی (ساعة) بووبێ، ئەگەر مەبەستیان پێی (ساعة) بووبێ، کە لە کوردییدا (ساعة) پێی دەگوترێ: پەسڵان، ئاخیر زەمان، واتە: کۆتایی هاتنی ئەم ژیانە، پێچرانەوەی تۆماری ئەم ژیانە.

ئەگەر مەبەستیشیان پێی (قیامة) بێ، واتە: هەڵسانەوەی خەڵك بۆ وەرگرتنەوەی پاداشتو سزا، هەر چۆن بێ، ئەوان دەپرسن، دەڵێن: ئەم بەڵێنە کەی دێتە دی؟

خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ : ﴿ قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِي ضَرًّا وَلَا نَفْعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ﴾، پێیان بڵێ: من بۆ خۆشم هیچ زیانو سوودێکم بەدەست نیە، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ (بەسەرم بێ لە زیانو ناخۆشیی، یان ئەوەی بێتە ڕێم لە خێرو چاکەو خۆشیی) واتە: سزادانی ئێوەو دادگایی کردنو پاداشتو سزاتان، بەدەست من نیە، ﴿ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ ﴾، بۆ (سزادان، یان لەنێوچوونی) هەر کۆمەڵێك، کۆمەڵگایەك کاتێکی دیارییکراو هەیە.

(الأَجَلُ: المُدَّة المَضروبة لشيء)، (أجل) بریتیە لە کاتی دیارییکراو بۆ شتێك، واتە: کۆتایی هاتنی ئەو شتە، دەگوترێ: فلان کەس ئەجەلی هاتوە، واتە: ئەو کاتەی کە کۆتایی پێ دێ، هاتوە.

﴿ إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴾، هەرکات کاتی کۆتایی هاتنیان هات، نە سەعاتێك دوا دەکەون، نە سەعاتێکیش پێش دەکەون، بە وردیی لەو کاتەدا کە بۆیان دیاریی کراوە، کۆتاییان دێ، کە لێرەدا دەگونجێ مەبەست پێی تاك تاکی مرۆڤەکان بێ، واتە: تاك تاکیان دەمرن، وە دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ، وەك چۆن ئوممەتانی پێشوو، کاتێك بوو کە تێیدا کۆتاییان هات، ئێوەش ئەی ئوممەتی پێغەمبەر! ﷺ چ ئەوانەی وەڵامی پێغەمبەری خوایان ﷺ داوەتەوەو، مسوڵمان بوون، چ ئەوانەی کە وەڵام نادەنەوە، واتە: ئەو مرۆڤانە نییە کە دوای هاتنی موحەممەد ﷺ، هەمووی لەسەر میلاکی موحەممەدە ﷺ، جا چ وەڵامی دابێتەوەو وەفادار بووبێ، چ وەڵامی نەدابێتەوەو سپڵە بووبێ، بەرانبەر بە پەیامی خوا، یاخود هەر پێی نەگەیشتبێ، وەك چۆن ئوممەتانی پێشوو، کاتێك هەبووە کە تێیدا کۆتاییان هاتوە، وەك گەلی عادو سەموودو لووطو نووحو هەموو گەلانی دیکە، ئێوەش کاتێکتان بۆ دیاریی کراوە، کە ئەم ژیانەتان کۆتایی پێدێو، ئەم سەر زەوییە یەکجاریی دەپێچرێتەوە، چونکە لە دوای پێغەمبەر موحەممەد ﷺ پێغەمبەرێکی دیکە نیەو. لە دوای ئەم کۆمەڵە مرۆڤەی کە موحەممەدیان ﷺ بۆلا ڕەوانەکراوە، هیچ کۆمەڵی

دیکە نین، بۆچی؟ چونکە موحەممەد ﷺ کۆتا پێغەمبەرە، کۆمەڵگاکەشی دوا کۆمەڵگایە لەسەر ئەم زەوییە دەژی، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾الأحزاب، واتە: موحەممەد ﷺ بابی هیچ کام لە پیاوانتان نیە، بەڵکو ڕەوانەکراوی خوایەو کۆتایی پێغەمبەرانەو، بێگومان خوا بە هەموو شتێك زانایە.

دیارە درێژترین ماوەی نێوان دوو پێغەمبەر، ماوەی نێوان عیساو موحەممەد بووە، صەڵاتو سەلامی خوا لەسەر هەردووکیان بێ، وە مەبەست ئەو ماوەیەی نێوانیان بووە، کە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ : ﴿ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُوا۟ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٍ وَلَا نَذِيرٍ ۖ فَقَدْ جَآءَكُم بَشِيرٌ وَنَذِيرٌ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٩﴾ ﴾،
واتە : ئەی خاوەن کتێبینە ! ئەوە پێغەمبەرەکەمان هاتە لاتان، پاش دابڕانێکی (هاتنی) پێغەمبەران (ئەو ڕاستییانەی کە پێویستتانن) بۆتان ڕۆشن دەکاتەوە، نەوەك بڵێن: هیچ مژدەدەرو ترسێنەرێکمان بۆ نەهاتوە، بێگومان ئەوە مژدەدەرو ترسێنەرتان بۆ هات، خواش لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

کە دەفەرموێ: (عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ ): وشەی (فَتَرَة) بە مانای پچڕان (إنقطَاع) دێ، (فَتَرَ، يَفتُرُ)، (الفُتُورُ: سُكُونٌ بَعْدَ حِدَّةٍ، وَلِينٌ بَعْدَ شِدَّةٍ، وَضَعْفٌ بَعْدَ قُوَّةٍ)، (فتُور) بەمانای وەستانی شتێك دێ، دوای ئەوەی کە زۆر بەهێز ئەو شتە بجووڵێنرێ، یاخود شتێك توندە، دوایی نەرم بێتەوە، یان شتێك بەهێزبێ، دوایی بێهێز بێ، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴾، واتە: دوای دابڕانێك لە پێغەمبەران.

پێشتریش گوتمان درێژترین ماوەی نێوان دوو لە پێغەمبەران (علیهم الصَّلاة والسلام) ئەو ماوەیە بووە، کە لە نێوانی عیساو موحەممەد دا بووە، صەڵاتو سەلامی

خوایان لەسەر، ئەگەرنا دەربارەی پێغەمبەرانی دیکە خوای میهرەبان دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا ... ﴿٤٤﴾ ﴾ المؤمنون، واتە: پاشان پێغەمبەرانی خۆمان پەیتا پەیتا، یەك لە دوای یەك ناردوون.

ماوەی نێوان عیساو موحەممەدیش شەش سەدو دە (٦١٠) ساڵ بووە.

ئنجا ئێمە کە ئێستا لە ساڵی (١٤٣٧) کۆچیی دا دەژیین، واتە: (١٤٣٧) ساڵ بەسەر کۆچی پێغەمبەردا ﷺ لە مەککەوە بۆ مەدینە، تێپەڕیوە، ئنجا ئەگەر سێزدە (١٣)ی دیکەشی بخەینەسەر[1]، مانای وایە (١٤٥٠) ساڵ بەسەر هاتنی پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕیوە، کەچی هیچ پێغەمبەرێك سەرو سۆراغی نیەو، بە تەئکید ناشبێ، ئەوانەش کە بە درۆ بانگەشەی پێغەمبەرایەتییان کرد، وەك (غولام ئەحمەد قادیانیی)و کێ و کێ، زانراوە چۆن بوونە پەندو عیبرەت، مەگەر کەسانێکی گومڕاو سەرلێشێواو، ئەگەرنا کەس حیسابی تووڕێکی بۆ نەکردوون.

دوایی خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُهُۥ بَيَٰتًا أَوْ نَهَارًا ﴾، وشەی (أرأيتم) وەك جاری دیکەش باسمان کردوە، واتە: هەواڵم پێ بدەن، یان ئایا بینیتان؟ ئەگەر بینیوتانەو دەزانن، هەواڵم پێ بدەن، ئاوای لێدێتەوە دەفەرموێ: بڵێ: هەواڵم پێ بدەن، ئەگەر سزای خوا بە شەوێ، یان بە ڕۆژێ، هات، ﴿ مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾، تاوانباران پەلەی کام بەشەی دەکەن؟ چونکە (مِنْهُ) بۆ (تَبْعِيض)ە، یانی: پەلەی کام بەشە لەو سزایە دەکەن، کە هەمووی هەر پڕ ئێش و ژانە.

کە دەشفەرموێ: ﴿ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾، واتە: تاوانبارانێك کە شایستەی سزای خوان، پەلەی چییانە کە خوا سزایان بدات، کە دەگونجێ بە شەوێ غافڵگیریان بکات، یان

---

١) چونکە : (١٣) ساڵی قۆناغی مەککە + ١٤٣٧ = ١٤٥٠ ساڵ.

بە ڕۆژێ لەبەرچاویان بێ، ئنجا ئەو سزایە، چ مەبەست هاتنی کۆتایی دنیا بێ، چ مەبەست دوای قیامەتو هەڵسانەوە بێ.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ ءَامَنتُم بِهِۦٓۚ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴾، ئایا ئێستا دوای ئەوەی کە ڕوویدا، بڕوای پێ دێنن، لێرەدا خوا ﷻ قیامەت دێنێتە پێش، ئەوە قیامەت هاتو ئەوانیش بڕوایان پێ هێناوە، کە دیارە بە ناچاریی بڕوا دێنن، بۆیە پێیان دەگوترێ، ئایا ئێستا؟! کە پێشتریش پەلەتان لێ دەکرد، ﴿ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴾، دوایی بەوانەی کە ستەمیان کرد، گوترا: بیچێژن سزای هەمیشەیی، ئایا تەنیا بەوە کە ئەنجامتان داوە سزا نادرێن؟ ئینسان چ بچێنێ، ئەوە دەدوورێتەوە.

دوایی دەفەرموێ : ﴿ وَيَسْتَنۢبِـُٔونَكَ أَحَقٌّ هُوَ ﴾، وە هەواڵت لێ دەپرسن ، ئایا ئەوە ڕاستە، چەسپاوە، دێ؟ چ مەبەست ئاخیر زەمان بێ، چ مەبەست پێی ڕۆژی دوایی‌و زیندووبوونەوەو هەڵسانەوە، بێ ﴿ قُلْ إِى وَرَبِّىٓ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ ﴾، بڵێ: بەڵێ، سوێند بە پەروەردگارم، ئەوە ڕاستەو هەر دێ، ﴿ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴾، وە ئێوە دەستەوسانکەر نین، واتە: ئێوە ناتوانن کە نەهێڵن ئەم دنیایە کۆتایی پێ بێ، یاخود ئێوە دەستەوسانکەری خوا نین، کە نەهێڵن زیندووتان بکاتەوەو، ڕۆژی زیندووبوونەوەو سزاو پاداشت بێنێتە پێش.

پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِى ٱلْأَرْضِ لَٱفْتَدَتْ بِهِۦ ﴾، وە ئەگەر هەر نەفسێك کە ستەمی کردوە، هەرچی لەسەر زەوییە هەمووی هی وی بووایە، دەیکردە بەلاگێڕەوەو قەرەبووی خۆی، جاری دیکەش باسمان کردوە، کە ستەم (الظلم) هەم کوفر دەگرێتەوە، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾ ﴾البقرة، هەم هاوبەش دانانیش دەگرێتەوە، وەك لەسەر زاری لوقمان

لە کاتی ئامۆژگارییکردنی کوڕەکەی دا، خوا دەفەرموێ : ﴿ يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ١٣ ﴾ لقمان، وە هەموو گوناهو تاوانو لادانەکانی دیکەش دەگرێتەوە، بۆچی؟ چونکە لە پێناسەی ستەم دا دەگوترێ: (الظُّلْمُ: وَضْعُ الشيءِ فِي غَيْرِ مَوْضِعِهِ)، واتە: ستەم بریتیە لە دانانی شتێك لە شوێنی نەگونجاوی خۆیدا، واتە: شتی بێجێ، ئنجا شیرکە، کوفرە، نیفاقە، بیدعەتە، دەستدرێژییکردنە بۆ سەر ماڵی خەڵك، چواندنی فەرزەکانە ... هتد، ئا ئەوانە هەموویان بێجێن، ئنجا هەر نەفسێك کە ستەمی لە خۆی کردوە، ئەگەر هەرچی لە زەوییدا هەیە، هی ئەو بێ، دەیکاتە فەرمبوو و بەلاگێڕەوەی خۆی، بەس بۆ ئەوەی ڕزگاری بێ لە سزای خوا، ﴿ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَۖ ﴾، وە پەشێمانییان پەنهان کرد، دوای ئەوەی سزاو ئازاری خوایان بینی، ﴿ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴾. وە بە دادگەرانە دادوەرییان لە نێواندا کراو، ئەوان هیچ ستەمیان لێ ناکرێ.

جێی سەرنجە یەك قسە کە بەرهەمی سۆزو عاطیفەو هەڵچوونە، لە کتێبی خوادا نابینرێ، لێرەدا ئەوان ئەو هەموو سەرەخەرییو نکووڵیی کردنو، پەلەکردن لە هێنانی سزاو، بێباکییو بێمنەتیی دەربڕینو، تۆمەتبارکردنی پێغەمبەر ﷺ کە ڕاست ناکاتو، قورئان قسەی جادووگەرانەو، چیو چی، پێشان دەدەن، کەچی خوا ﷻ لێرەدا دەفەرموێ : ﴿ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴾، وە بە دادگەرانە دادوەرییان لە نێواندا کراو، هیچ ستەمیان لێ ناکرێ.

ئەوە ئەگەر ئێمەباین، دەمانگوت: دەبیچێژن، ئنجا سێ چوار قسەشمان بە هەڵچوونەوە دەخستنە سەری، بەڵام خوا ﷻ جیایەو ئەو حاڵەتانەی نین!

لە کۆتایی دا خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ ﴾. ئاگاداربن! بێگومان هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە، هی خوایە، خوا خاوەنی

ئاسمانەکانو زەویو هەموو شتێکە، ﴿أَلَآ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾، ئاگاداربن ! بەڵێنی خوا ڕاستە، بەڵام زۆربەیان نازانن.

زۆربەیان نازانن، کە مادام خوا خاوەنی هەموو شتێك بێ، هەر کاتێك ویستی دنیا لادەباتو قیامەت دێنێ، یان هەر کاتێك ویستی ئەو خەڵکە دەمرێنێو، خەڵکێکی دی دێنێ، ئەو کۆمەڵگایە لادەبات، کۆمەڵگایەکی دیکە دێنێ، وەك دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ يَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم ٣٨﴾ محمد، واتە: ئەگەر پشت هەڵبکەن، ئەوە خوا کۆمەڵێکی دیکە دێنێ، بۆ شوێنی ئێوە، دوایی ئەوانیش وەك ئێوە نابن، خوا پەکی لەسەر کەس نەکەوتوە، مادام خوا خاوەنی هەموو شتێك بێ، لە ئاسمانەکانو زەوی دا، واتە: هەرچی لەسەرتەوەیەو، هەرچی لە خوارتەوەیە، مادام خوا خاوەنی سەرێو خوارێ بێ، کەواتە: هیچ شتێکی لێ عاسێ نابێ، کەواتە : بەڵێنی خوا دێتەدیو ڕاستە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ٨٧﴾ النساء، دەفەرموێ : ﴿وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا ١٢٢﴾ النساء، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ٩﴾ آل عمران، بۆیە دەفەرموێ : ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾، بەڵام زۆربەیان نازانن، ئەگەر عیلمو عەقڵو تێگەیشتنیان هەبووایە، نەدەبوو نکووڵییان کردبایە لەوە کە خوا ﷻ دەتوانێ زیندوویان بکاتەوەو، ڕۆژی سزاو پاداشتو زیندووبوونەوە بێنێتە پێش.

ئنجا بەدڵنیاییەوە بەبێ ئەوەش دادگەریی خوا ناچەسپێو، وە بەبێ ئەوە مانایەك بۆ ژیانی دنیا پەیدانابێ، وەك خوا لە کۆتایی سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ : ﴿أَفَحَسِبۡتُمۡ أَنَّمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ عَبَثٗا وَأَنَّكُمۡ إِلَيۡنَا لَا تُرۡجَعُونَ ١١٥ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّ ... ١١٦﴾، واتە: ئایا پێتان وایە ئێوەمان بە گاڵتە دروست کردوە، وە بۆ لای ئێمە ناگێڕدرێنەوە؟! بەرزە خوای پادشای هەق، واتە: زۆر بەرزترە لەوەی ئێوە دروست

بکاتو، دوایی پێتان ئەفەرموێ: ئەرێ ئێوە چیتان کردو، چۆنتان کرد؟ وە خراپەکار وەك بەرزەکی بانان بۆی دەربچێو، چاکەکاریش کەس پێی نەڵێ: چاکت کرد، ئەوە لە خوا ناوەشێتەوە.

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾، خوا دەژیەنێو دەمرێنێ، هەر بۆ لای ئەویش دەگێڕدرێنەوە.

کەواتە: خوا ژیانی بەدەستە، مردنی بەدەستەو، گێڕانەوەشتان هەر بۆ لای ئەوە، بۆیە خۆتانی بۆ ئامادە بکەن، بزانن بە چ چاووڕوویەك دەچنەوە خزمەت خوا ﷻ.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم** : كە دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ ﴾ ڕاستە ماناكەی ئاوەیە : دەڵێن : ئەم بەڵێنە كەنگێیە، ئەگەر ئێوە ڕاست دەكەن؟

ئەم ئایەتە دوو مانای هەن :

١ـ واتە: كاتەكەمان بۆ دیاریی بكەن، دوای چەند ساڵی دێكەیە؟

٢ـ یاخود مەبەست ئەوەیە كە ئاخیر زەمان، یان كۆتایی هاتنی ئەم ژیانە، بوونی نیە، ئەگەر بوونی هەیە، بیهێنن.

**مەسەلەی دووەم** : كە دەفەرموێ : ﴿ قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى ضَرًّا وَلَا نَفْعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾،
خوا ﷻ پێغەمبەری خۆی ﷺ فێر دەكات، ئاوا وەڵامیان بداتەوە، دەفەرموێ: بڵێ: من بۆ خۆشم هیچ زیانو سوودێكم بە دەست نیە، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، [redacted] بۆ هەر كۆمەڵێك، كۆمەڵگایەك كاتێكی دیارییكراو هەیە بۆ لەبەین چوونیان، ئەگەر كاتەكەیان هات، نە سەعاتێك دوا دەكەونو، نە سەعاتێك پێشدەكەون، واتە: ئەگەر من نەتوانم، زیان لە خۆم دووربخەمەوەو، نەتوانم سوود بۆخۆم بێنمە پێش، ئەوە لەپێشترە كە نەتوانم بۆ ئێوە ئەو كارە بكەم، واتە: كاتی سزاو كاتی تێكچوونی ئەم دنیایەو، پاشان سزای بۆ ئێوە، تێدا بێنمە پێش.

كە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ﴾، ئەو هەڵاواردن (إستثناء)ە لە زمانی عەرەبیدا بە مانای بەڵام (لَكِن) دێ، پێی دەگوترێ: (الإِستِثْنَاءُ المُنْقَطِع) واتە: بەڵام زیانو سوودی من ئەوەیە كە خوای كاربەجێ بۆ منی بوێ.

کە دەفەرموێ : ﴿لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ﴾، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە کاری خوا هەمووی بە بەرنامەیە، هەمووی بە نەخشەیە، کاتی بۆ دیاریکراوە، ئەوە نیە بە هەڕەمەکیی بێ، یان کەسانێك زۆر داوا بکەن، خواش ڕقی هەڵسێو بفەرموێ: دەباشە، ئەوە لەبەر خاتری ئێوە قیامەتم هێنا ! سەرەنجام هەموو نەخشەو بەرنامەکەی خۆی تێکبدات، نەخێر، خوا بە سۆزو عاطیفە ئیش ناکات، خوای کاربەجێ بە زانیارییەك‌و حیکمەتێکی بێ سنوورو، بە دەستەڵاتێکی بێ سنوورو ڕەها، کاروبارەکانی خۆی بەڕێوە دەبات، بۆیە دەفەرموێ : ﴿إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ﴾، ئەگەر ئەو کاتە هات، کە بۆیان دیاریکراوە تێیدا بفەوتێن، ئەوە نە کاتێکی کەم دوادەکەون، نە کاتێکی کەمیش پێش دەکەون، بە وردیی لەوکاتەدا کە دیاریکراوە، کۆتاییان پێ دێ.

وشەی (سَاعَةً ) لێرەدا واتە : ماوەیەکی کەم لە کات.

وشەی (يَسْتَـْٔخِرُونَ ) واتە : دوا دەکەون.

وشەی (يَسْتَقْدِمُونَ ) یانی : (يتقدمون) واتە : پێش دەکەون، بەڵام کە (س)یان خراوەتە سەر، زیاتر مانای دواخستن‌و پێش خستنەکە، بەهێز دەکات.

<u>**مەسەلەی سێیەم**</u> : کە دەفەرموێ : ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُهُۥ بَيَـٰتًا أَوْ نَهَارًا مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٥٠﴾﴾، پێیان بڵێ: هەواڵم پێ بدەن، ئەگەر ئازارو سزای خوا بە شەوێ بێ، {(بَيَاتًا) واتە: لە کاتێکدا کە ئێوە لە کاتی پشوودان دان} (أو نَهَارًا) یان لە کاتێکدا کە ئێوە لە ڕۆژدان (خەریك‌و سەرقاڵی ژیان‌و گوزەرانن) ئایا تاوانبارەکان، پەلەی کام بەشەی دەکەن؟!

وشەی (أَرَءَيْتُمْ ) واتە: (أَخْبِرُونِي) یانی: هەواڵم پێبدەن، خۆی لە ئەسڵدا وشەی (أَرَءَيْتُمْ ) واتە: ئایا بینیتان؟ واتە: (أَأَبْصَرْتَ حَالَتَهُ العَجِيبَة، أو أعْرَفْتَهَا ؟ فَأَخْبِرْنِي

عَنْهَـا)، ئایا حاڵەتە سەرسووڕهێنەرەکەی‌و سەیرەکەیت بینی، ناسـیت، ئاگـاداری بووی! دە هەواڵم پێبـدە، لەبارەیەوە.

وشەی (بَيَتًا ) {اسْمُ مَصْدَرِ التَّبْيِيتِ كَالسَّلَامِ لِلتَّسْلِيمِ، أَي وَقْت بَيَاتٍ، وَإِيثَارُ (البَيَاتِ) عَلَى (لَيْلاً) إِشَارَة إِلى غَفْلَتِهِمِ} (بيات) نـاوی چاوگە لە (تبييت)ەوە هاتـوە، وەك (سلام) لە (تسليم)ەوە هاتوە، واتـە: کـاتی پشـوودان، ئنجـا کە وشـەی (بيـات) هەڵبژێـردراوە بەسەر (ليلاً)دا، ئامـاژەیە بۆ بێ ئاگاییان.

کـە دەفـەرموێ: ﴿مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾، دەڵـێ: (مَّاذَا ) لـە (مـا) (الإستفهامية)و (ذا) پێکهاتوە، کە لە ئەسڵدا بۆ ئاماژەیـە، (مَّاذَا ) یانی: (ما الـذي) ئەو کاتە (ذا)یەکە دەبێتـە (خبر)ی (ما).

هەندێك گوتوویانە: (مَّاذَا ) یەك شتە لە (محلّ النَّصب)ە، بە فیعلی (يَستعْجِلُ).

بە هەر حـاڵ هـەر کامێکـیان بـێ، مانـای ئەوەیـە: پەلـە لـە چ بەشێکی ئـەو سزاو ئـازارە دەکـەن، کـە بۆتـان بـێ، واتـە: (أَيَّ جُـزءٍ مِـنَ العَـذَابِ يَسـتعْجِلُ بِـهِ هَـؤُلاَءِ الـمُجْرِمُون)، کام بەشە لە سزایە کە ئەو تـاوانبـارانە پەلە لە هاتنی دا دەکەن؟ واتـە: هیچی هی ئەوە نیە پەلەی لـێ بکەن، بۆتـان بـێ، چونکە هـەر کامێك لـەو سـزایەی خواتان بۆ بـێ، دوای ئەوەی بە ملتانـدا دێ، هـاوارو ئاهوناڵەتان لـێ بـەرز دەبێتـەوەو لێی پەشێمان دەبنەوە.

**مەسەلەی چوارەم** ، کە دەفەرموێ : ﴿ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ ءَامَنتُم بِهِۦٓ ءَآلۡـَٔـٰنَ وَقَدۡ كُنتُم بِهِۦ تَسۡتَعۡجِلُونَ ۝٥١ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡخُلۡدِ هَلۡ تُجۡزَوۡنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ۝٥٢ ﴾، واتە: ئایا دوای ئەوەی کە قەوما، بڕواتـان پێ هێنـا، ئـا ئێستـا بڕوا دێنـن! کـە پێشـتـریش پەلـەتان لـێ دەکـرد.

ئەو هەمزە (أ)یە بۆ پرسیارکردنی نکووڵیی لێکەرانەیە، توێژەرەوان هەر ئەوەیان گوتوە: ئەگەر گریمان ڕوویدا، ئەو کـاتە ئیمان دێنن؟ ئێستـا بە کەڵك نایـەت.

بەڵام من پێم وایە ـ کە ڕەنگە لە تەفسیـری دیکەش دا باسکرابێ‌و من نەمدیبێ ـ ئەمە بۆ ئەوە نیـە کـە ئەو کاتەی ڕوویدا، ئیمان دێنن، بەڵکـو ئـەوە هێنـانە پێشـی دیمەنێکی قیامەتە، یانی: دنیا کۆتـایی هاتومو قیامەتیش هـاتۆتـە پێشـێ، ئنجـا خـوا دەفەرموێ: ئایا ئێستـا بڕوا دێنن؟ چونکـە بۆ ئێمە ڕابردوو و ئێستـاو داهاتوو هەن، بەڵام بێگومان خـوای بێ وێنە، لە دەرەوەی چوار چێوەی کات‌و شوێنە، بۆیە هەنـدێك شتی ڕابردوو، وەك داهاتوو باس دەکات، هەندێك شـتی داهـاتووش وەك ڕابردوو بـاس دەکات‌و، دەیخاتە بەرچاو.

ئنجـا دەفـەرموێ: ﴿ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡخُلۡدِ هَلۡ تُجۡزَوۡنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ﴾، دوایـی بەوانــە گـوترا کـە ســتەمار بـوون: بیچێـژن سزای هەمیشـەیی، ئایا هـەر بە پێی ئەوە کە وەدەسـتتـان هێنـاوە، سزا نـادرێنـەوە؟ هەڵبەتـە هەر بە پێـی ئـەوە سـزا دەدرێنـەوە.

ئـەم ئایەتـەی دواییش پشـتگیـریی ئەو لێکدانەوەیە دەکات، کە من هەڵمبـژارد، بۆ مانـاو مەبەستی ئایەتی پێشوو: ژمارە (٥١)، واتە: ئەمە دیمەنێکە خـوا دەیهێنێتـە پـێش چـاو، لـە گەرمـەی نکوولـیی کـردن‌و مشــتومڕی ئـەوان دا لەســەر ئـەوە کـە قیامەت نـایەت‌و دنیا کۆتـایی پێ نـایەت، لەوکاتەدا خـوا ئـەم فەرمایشـتەی فەرمـووە، کـە دەفـەرموێ : ﴿ ءَآلۡـَٔنَ وَقَدۡ كُنتُم بِهِۦ تَسۡتَعۡجِلُونَ ﴾، ئـا ئێستــا بـڕوا دێنــن، کـە پێشـتـریش پەلەتـان لـێ دەکـرد؟

<u>مەسـەلەی پێنجەم</u> : کە بـە پێغـەمبـەری خاتـەم ﷺ دەفـەرموێ : ﴿ وَيَسۡتَنۢبِـُٔونَكَ أَحَقٌّ هُوَۖ قُلۡ إِي وَرَبِّيٓ إِنَّهُۥ لَحَقّٞۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ۝٥٣ ﴾، وە هـەواڵـــــت لـێ دەپرسـن: ئایا ئەوە ڕاستە، چەسپاوە، دێتە دی؟ لێرەدا چ مەبەست پێی ئاخیـر زەمـان‌و دنیـا تێکـچوون بـێ، چ مەبەسـت پێـی ڕۆژی دوایی‌و ڕۆژی هەڵسانەوە بـێ. خوای زانـاو شارەزا، ئـاوا پێغـەمبـەر ﷺ فێـر دەکات وەڵامیـان بداتـەوە، دەفـەرموێ: بڵێ: بەڵێ، بە پەروەردگارم، ئەوە ڕاستە، چەسپاوە، واتە: کاتی کۆتـایی هاتنی دنیا.

یاخود ڕۆژی هەڵسانەوەو لێپرسینەوەو سزاو پاداشت ڕاستە، ئێوەش دەستەوسانکەر نین، واتە: ناتوانن لە دەستی خوا ڕابکەن، یان ناتوانن کارێك بکەن کە قیامەت نەیەت، یاخود ناتوانن کارێك بکەن کە ئاخیر زەمان نەیەت.

وەك پێشتر ئاماژمیەکمان پێدا: وشەی (إِي: فهو مرادف "نَعَمْ"، حَرْفُ جَوَابٍ لِتَحْقِيقِ مَا تَضَمَّنَهُ سُؤَالُ سائِلٍ، وَلَكِن مِنْ خَصَائِص هَذَا الحَرْفِ، أَنَّهُ لاَ يَقَعُ إِلاَّ وَبَعْدَهُ القَسَم).

واتە: (إِي) هاوواتای (نَعَم)ە، یانی: بەڵێ، بەڵام ئەمە پیتێکە وەڵامو لێکۆڵینەوەی ئەوەیە کە پرسیاری پرسیارکەرێك دەیگرێتە خۆی، واتە: دەبێ کەسێك پرسیارێکی کردبێ، ئنجا بە (إِي) وەڵام دەدرێتەوە، بۆ ئەوەیە کە تۆ دڵنیای بکەیەوە لە تایبەتمەندییەکانی ئەم پیتەش، ئەوەیە کە حەتمەن دەبێ لە دوایەوە سوێندبێ، بۆ وێنە: (إِي واللە)، (إِي وربِّ الكعبة).

کە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ﴾، واتە: دێ، ڕاستەو، ئێوەش دەستەوسانکەر نین، دەگوترێ: (أَعْجَزَهُ : جَعَلَهُ عَاجِزاً)، واتە: دەستەپاچەی کرد، کەواتە: (مُعْجِزْ) واتە: دەستەپاچەکەر، دەستەوسانکەر، بێ دەستەڵاتکەر.

**مەسەلەی شەشەم**: کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ أَنَّ لِكُلِّ نَفۡسٖ ظَلَمَتۡ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ لَٱفۡتَدَتۡ بِهِۦۗ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَۖ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ٥٤﴾، وە ئەگەر هەر کەسێك کە ستەمی کردوە، هەرچی لە زەویدا هەیە، هی وی بێ، دەیکاتە بەلاگێڕەوەی خۆی.

کە دەفەرموێ: (لَٱفۡتَدَتۡ بِهِۦ) دەڵێ: {افْتَدَى مُرَادِف (فَدَى) وَفِيهِ زِيَادَةُ تَاءِ الإِفْتِعَالِ لِتَدُلَّ عَلَى زِيَادَةِ الـمَعْنَى، أَي لَتَكَلَّفَت فِدَاءَهَا بِهِ)[1]، وشەی (افْتَدَى) هاوواتای (فَدَى)یە، (فَدَى نَفْسَهُ بِفُلاَنٍ) واتە: فلانکەسی کردە قەرەبووو

---

١) التحرير والتنوير، للشيخ محمد الطاهر بن عاشور، ج١١، ص١٩٧.

بەلاگێڕەوەی خۆی، کە هەر یەك مانایان هەیە، بەلام (افْتَدَى) لەبەرئـەوەی (ت)ی (إفتعال)ی لەسەرە، ماناکەی بەهێزترە، چونکە لە زمانی عەرەبییدا بنچینەیەك هەیە دەڵێ: (زِيَادَةُ المَبْنَى تَدُلُّ عَلَى زِيَادَةِ المَعْنَى)، ئەگەر پیتەکانی وشەیەك زیاتر بن، ماناکەشی بەهێزتر دەبێ.

کەواتە: لێرە کە دەفەرموێ: (لَافْتَدَتْ بِهِۦ) واتە: زۆری لە خۆی دەکرد، هەرچی هەیە لەسەر زەوی بیکاتە فەرمبووو بەلاگێڕەوەی خۆی.

﴿وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ﴾، وە پەشێمانییان پەنهان کرد، دوای ئەوەی ئازارو سزایان بینی، کە زیاتر واپێدەچێ مەبەست پێی قیامەتە.

دەڵێ: (النَّدَمُ وَالنَّدَامَةُ: أَسَفٌ يَحْصُلُ فِي النَّفْسِ عَلَى تَفْوِيتِ شَيءٍ مُمْكِنٍ عَمَلُهُ فِي المَاضِي)، واتە: (نَدَم) و (نَدَامَة)، بریتیە لە خەفەت خواردنێك کە لە دڵی ئینساندا پەیدا دەبێ، بەهۆی ئەوەوە شتێکی لەدەست چووە، کە دەگونجا لە دەستی نەچێ‌و، ئەو کارە ئەنجام بدات.

ئنجا بۆچی دەفەرموێ: ﴿وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ﴾، پەشیمانییان پەنهان کرد؟ ئەوە یان مەبەست پێی سەران‌و زلەزلەکانن، لەوێش (لە قیامەت) دەیانەوێ لەبەرچاوی شوێنکەوتووانیان کارێك نەکەن، بێهێزیی پێشان بدەن، بۆیە پەنهانیان کرد!

بەلام من ئەو مانایەم پێ بێهێزە، چونکە پێم وایە کامەی لە هەمووان فیرعەونترو نەمرووترو قاروونترو لەخۆباییتر بوو، لەوێ زۆر زیاتر زەبوون‌و ملکەچ دەبێ، لەوێ ئەو فەخفەخەو بەزم‌و ڕەزمەیان نامێنێ، کە کابرا پێیی عەیب بێ، بێهێزیی لێ دەربکەوێ، بەرانبەر بە شوێنکەوتووەکانی!

ئنجا لەبەرچی ئەم ڕایەم پێ بێهێزە؟ چونکە لە قیامەت دا، ئەو حاڵەتە نەفسییانەی ئینسان لە دنیادا هەینی: خۆبەزلگریی‌و فیرعەونایەتیی‌و تاغووتایەتیی‌و، بێهێزیی خۆشاردنەوەو، کەشوفش کردن بەسەر خەڵکی دا، ئەوانەی نامێنن، ئەدی مەبەست چییە؟ من پێم وایە ماناکەی ئاوایە :

﴿ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ ﴾، واتە: پەشیمانیی پەنهان دەکەن‌و ناتوانن دەریببڕن، ئەسڵەن هەر ناتوانن هاواریش بکەن، ڕۆژی قیامەت هێندە ڕۆژێکی تووشە، هێندە کارەساتێکی مەزنە، کە هەر لە دڵی خۆیاندا پەشیمانییەکە دەکێشن‌و، توانای دەربڕین‌و هاوارکردنیان نیە.

﴿ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾، وە لە نێوانیاندا کێشەکان یەکلایی کرانەوەو دادگەرانە دادگایی کران.

لێرەدا ئەو قسەم پێ جوانە، کە (محمد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] هێناویەتی، دەڵێ: {﴿ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾: وَلَيْسَ المَعْنَى أَنَّه قُضِيَ بَيْنَ كُلِّ وَاحِدٍ وَآخَر، لأَنَّ القَضَاءَ هُنا لَيْس قَضَاء نِزَاعٍ، وَلَكِنَّهُ قَضَاءُ زَجْرٍ وَتَأْنِيبٍ، أي قُضِيَ عَلَى كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ بِمَا يَستحِقّه بالعَدْل}.

واتە: مەبەست ئەوەنیە کە لە نێوان هەرکامێکیان‌و ئەوی دیکەدا، دادگایی بکرێ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە وەك سەرزەنشت کردن‌و تەریق کردنەوە، دادگایی دەکرێن، واتە: هەرکامێکیان بەو پێیەی کە شایستەیەتی، پڕ بە پێستی خۆی سزا وەردەگرێ‌و، بەو شێوەیە بڕیاری بەسەردا دەدرێ.

کەواتە: دەبێ بڵێین: دادگایی کران، نەك دادوەرییان لە نێواندا کرا، بەو مانایە کە بڕواداران‌و کافرەکان دادوەرییان لە نێواندا بکرێ، بەڵکو هەموویان دادگایی دەکرێن، هەرکامیان بە جیا جیا.

**مەسەلەی حەوتەم و کۆتایی** : کە دەفەرموێ : ﴿ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۗ أَلَآ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ۝٥٥ هُوَ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ۝٥٦ ﴾، لەم ئایەتە موبارەکەی کۆتایی دا، خوای قسە لەجێ، دوو جاران پیتی ئاگادار کردنەوە، بەکاردێنێ، دەفەرموێ : ئاگاداربن! هەرچی لە

---

1) التحرير والتنوير، ج١١، ص١٩٧.

ئاسمانەکانو زەویدا هەیە، هی خوایەو، ئاگاداربن ! وە بێگومانو بە دڵنیایی بەڵێنو پەیمانی خوا بەجێیەو ڕاستە، بەڵام زۆربەیان نازانن، ئەو (خوا) دەژیەنێو دەمرێنێو، هەر بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە.

کە دەفەرموێ : ﴿ أَلَآ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ ﴾، (حَق) (اي ثابتٌ مُتَحَقِّق) واتە: چەسپاوەو نەگۆڕەو دێتە دی.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەیان نازانن، چونکە تێیاندا هەبووە زانیویەتی، کە بەڵێنی خوا ڕاستەو قیامەت دێتەدی‌و، دنیاش ئاخر زەمانی بەسەر دادێ، بەڵام نکوولیی کردوە، چونکە ئەگەر وایان نەکردبایە، بەرژەوەندییە دنیاییەکانیان تێکدەچوون، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ بَلۡ يُرِيدُ ٱلۡإِنسَٰنُ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ ۝٥ يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ ۝٦ ﴾القيامة، واتە: بەڵام ئینسان (ی کافر) دەیەوێ هەر بە خراپەکاریی بیداتە بەر، بۆیە دەڵێ: قیامەت کەی دێ؟.

چونکە نەبوونی قیامەتو نکوولیی کردن لە قیامەت، گوناهو تاوانی دنیای بۆ ئاچووخ دەکاتو، ڕێی بۆ تەخت دەکات.

بۆیەش دەفەرموێ: ﴿ هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾، ئەو دەژیەنێو دەمرێنێو، تەنیا بۆلای ویش دەگێڕرێنەوە.

چونکە ژیاندنو مراندن گەورەترین شتن بەنسبەت ژیاندارانەوە، کە وەك پەیدا کردنو لەبەین بردن وان، بۆ شتەکان، کەواتە: خوا ﷻ ژیانی بەدەستەو، مەرگیشی بەدەستە، هەر ئەویشە کە پەیدا کردنی بە دەستەو، دووبارە هێنانەوەی بەدەستە، پەروەردگارو خوایەکی ئاوا، نە ئاخیر زەمانی لێ عاسێ دەبێ، کە نەتوانێ بیهێنێ، نە ڕۆژی قیامەتو سزاو پاداشتیشی لێ عاسێ دەبێ، کە نەتوانێ بیهێنێتە پێش.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی حەوتەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان پێنج ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٥٧ تا ٦١)، لەم پێنج (٥) ئایەتەدا، خوا ﷻ چوار بابەتی سەرەکیی دەخاتەڕوو:

یەك: خوا بانگی خەڵك دەکات کە ئامۆژگاریی‌و شیفای بۆ ناردوون‌و، هیدایەت‌و ڕەحمەتی بۆ بڕواداران ناردوە، بەو چوار سیفەتە، خوا ﷻ پێناسەی قورئان دەکات.

دوو: خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: با تەنیا بە بەزەیی‌و بەخششی خوا شادمان بن، زۆر دڵخۆش بن، نەك بە شتێکی دی.

سێ: پاشان خوای کاربەجێ سەرزەنشتی کافرەکان دەکات، کە دەستکاریی حەڵاڵ‌و حەرام دەکەن، بەبێ ئیزنی شەریعەت، هەروەها درۆ هەڵدەبەستن بە ناوی خواوە: ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامە، خوای کارزان ئەوە بە درۆ هەڵبەستن دادەنێ.

چوار: خوا باسی زانیاریی وردو گشتگیری خۆی دەکات‌و، ڕایدەگەیەنێ کە تەنانەت گەردیلەیەکیشی لێ ون نابێ، نە لە ئاسمان‌و، نە لە زەوی دا، واتە: نە لە سەرێ‌و نە لە خوارێ بگرە لە گەردیلەش وردتر.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى
وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ (٥٧) قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا
يَجۡمَعُونَ (٥٨) قُلۡ أَرَءَيۡتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزۡقٖ فَجَعَلۡتُم مِّنۡهُ حَرَامٗا وَحَلَٰلٗا
قُلۡ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمۡۖ أَمۡ عَلَى ٱللَّهِ تَفۡتَرُونَ (٥٩) وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ
ٱلۡكَذِبَ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَشۡكُرُونَ
(٦٠) وَمَا تَكُونُ فِي شَأۡنٖ وَمَا تَتۡلُواْ مِنۡهُ مِن قُرۡءَانٖ وَلَا تَعۡمَلُونَ مِنۡ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا
عَلَيۡكُمۡ شُهُودًا إِذۡ تُفِيضُونَ فِيهِۚ وَمَا يَعۡزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثۡقَالِ ذَرَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا
فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصۡغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٍ (٦١)﴾

# مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{ئەی خەڵکینە! لە پەروەردگارتانەوە ئامۆژگاریی‌و چارەسەری ئەو (دەردو نەخۆشییان)ەی لە سینەکاندایە، بۆتان هاتوە، هەروەها ڕێنمایی‌و بەزەییە بۆ بڕواداران، ﴿٥٧﴾ بڵێ: با تەنیا بە بەزەیی خواو، بەخششەکەی، زۆر دڵخۆش بن، ئەوە باشترە لەوەی کۆی دەکەنەوە (لە ماڵو سامان) ﴿٥٨﴾ بڵێ: ئایا ئەو بژیوەی خوا بۆی ناردوونە خوارێ، هەر لە خۆتانەوە پۆلێنتان کردوە بۆ: حەڵاڵو حەرام، هەواڵم پێبدەن، ئایا خوا مۆڵەتی داون، یان درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن؟ ﴿٥٩﴾ ئایا لە ڕۆژی قیامەتدا، گومانی ئەوانە چۆنە کە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن! (پێیان وایە خوا چییان لێدەکات؟) بێگومان خوا خاوەن بەخشش‌و چاکەیە بەسەر خەڵکەوە، بەڵام زۆربەیان سوپاسگوزاریی ناکەن ﴿٦٠﴾ وە هیچ کردەوەیەك ناکەن، مەگەر ئێمە لە کاتی چوونە نێویدا، بەسەرتانەوە چاودێرین‌و، هێندەی کێشی گەردێك لە پەروەردگارت ون نابێ، نە لە زەوی نە لە ئاسماندا، لەوەش گچکەترو گەورەتریش نیە، مەگەر لە نووسینێکی ڕوون دایە (تۆمار کراوە) ﴿٦١﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(مَّوۡعِظَةٞ): (الوَعْظُ: زَجْرٌ مُقْتَرِنٌ بِتَخويفٍ) (وَعْظ) تێوە خوڕینێكە كە هاوكات بێ لەگەڵ ترساندن دا، خەلیلی كوڕی فەراهیدیی دەڵێ : (الوَعْظُ: هُوَ التَّذكِير بالخَيرِ فِيمَا يَرِقُّ لَهُ القَلْبُ وَالعِظَةُ وَالموعِظَة: اسمٌ) واتە: (وَعْظ) ئەوەیە كە تۆ بیری كەسێك بخەیەوەو ئامۆژگاریی بكەی، بە شێوەیەك كە دڵی نەرم بێت، هەركام لە (عِظَةُ)و (مَوعِظَة) ناون، بە كوردیی دەڵێین: ئامۆژگاریی.

(وَشِفَآءٞ): (الشِّفَاءُ مِنَ الـمَرَضِ مُوَافَـاةُ شَفَا السَّلامَةِ، وَصَارَ اسْمَاً لِلْبُـرْءِ)، وشەی (شفا) واتە: قەراغ، لێوار، ئنجا : (شِفَاء) واتە: گەیشتنە قەراغی سەلامەتیی.و. ئەوە بۆتە ناو بۆ چاكبوونەوەو لاچوونی نەخۆشیی.

(فَلۡيَفۡرَحُواْ): (الفَرَحُ: إنْشِرَاحُ الصَّدْرِ بِلَذَّةٍ عَاجِلَة)، (فَرَح) بریتیە لە سینە گوشاد بوون بەهۆی چێژێكی دنیاییەوە.

(شَأۡنٖ): (الحَالُ وَالأَمْرُ الَّذِي يَتَّفِقُ وَيَصْلُحُ، وَلاَ يُقَالُ إلاَّ فِيمَا يَعْظُمُ مِنَ الأحْوَالِ). (شأن) واتە: حاڵو كارێك كە باشەو گونجاوەو، ئەم وشەیە تەنیا بۆ حاڵەتێك بەكاردێ، كە شتێكی گەورەو جێی بایەخو گرنگیی پێدان بێ.

(شُهُودًا): واتە شایەدیی دەدەن، یاخود ئامادەدەبن، یاخود دەبینن، (من الشُّهُودُ والشّهادةُ: الحُضُورُ مَعَ الـمُشَاهَدَةِ، إمَّا بالبَصَرِ، أو البَصِيرَةِ) واتە: (شهوداً) لە (شهُودُ)و (شَهَادة)ەوە هاتوە، كە بەمانای ئامادەبوون دێت لەگەڵ بینیندا، چ

بینینی بە چاو، چ بینینی بە عەقڵ، (الشَّهَادَةُ: قَوْلٌ صَادِرٌ عَنْ عِلْمٍ حَصَلَ بِمُشَاهَدَةِ بَصِيرَةٍ أو بَصَرٍ) (شَهَادة) بریتیە لە قسەیەك كە دەردەچێ لە كەسێكەوە، كە عیلمێكی هەیە، بەهۆی ئەوەوە كە بە چاو شتی بینیوە، یاخود بە عەقڵ دەركی پێكردوە بۆی پەیدابووە.

(تُفِيضُونَ فِيهِ): دەیچنە نێو، {فَاضَ المَاءُ : إِذَا سَالَ مُنْصَبًّا، وَمِنْهُ اسْتُعِيرَ: أَفَاضُوا فِي الحَدِيثِ، إِذَا خَاضُوا فِيهِ}، (فَاضَ المَاءُ) واتە: ئاوەكە هەڵرژا، لەوەوەش خوازراوەتەوە : (أَفَاضوا فِي الحَدِيثِ) چوونە نێو قسانەوە، قسەكردن وەك گۆمە ئاوێك، یان شتێكی شل دانراوە، ئەوانەش كە قسە دەكەن، دەچنە نێو ئەو شتەوە.

(يَعْزُبُ): (العَازِبُ: المُتَبَاعِدُ فِي طَلَبِ الكَلأِ عَنْ أَهْلِهِ، يُقَالُ عَزَبَ يَعْزُبُ وَيَعْزِبُ)، (عازِبْ) لە ئەسڵدا بە كەسێك دەگوترێ كە دوور كەوتۆتەوە لە ماڵەوە، لەبەر ئەوەی بە دوای لەوەڕدا ڕۆیشتوە، ئنجا (عَزَبَ يَعْزُبُ) و (عَزَبَ يَعْزِبُ) هەردووكیان بەكارهاتوون، (عَزبَ) واتە: دووركەوتەوە، یان ونبوو.

(مِثْقَالِ): (المِثْقَالُ: مَا يُوزَنُ بِهِ، وَهُوَ مِنَ الثِّقَلِ، وَذَلِكَ اسْمٌ لِكُلِّ سَنجٍ)، (مثقال) شتێكە كە شتی پێ بكێشرێ‌و، ناوە بۆ هەر (سنج)ێك كە هەم بە (س)ە، هەم بە (ص)ە (صنج)، پێم وایە لە (سنگ)ی فارسییەوە هاتوە، (سنگ) ئەو شتەیە كە دەخرێتە تا تەرازوویەكەوە ئەو شتەش كە دەتەوێ بزانی كێشەكەی چەندە: میوەیە، دانەوێڵەیە، گۆشتە، هەر شتێكە، دەیخەیە تا تەرازووەكەی دیكەوە.

ئنجا ئەو سەنگەی دەخرێتە ئەو تا تەرازووەوە، ئەندازەیەكی دیارییكراوی هەیە، بۆ وێنە: كیلۆیەكە، دوو كیلۆیە، تەنێكە، هەرچەندەو، شتەكەی دیكەی پێ هەڵدەسەنگرێ، ئەو شتە پێی دەگوترێ: (مثقال).

(ذَرَّةٍ ): (الـذَّرُّ: جَمْـعُ ذَرَّةٍ، وَهِـيَ أَصْـغَرُ النَّمْـلِ، وَذَرَّ الحَـبَّ وَالـمِلْحَ وَالـدَّوَاءَ: فَرَّقَـهُ)[1]، (ذر) كۆی (ذرة)یە، كە بە بچووكتـرین جۆری مێروولــە دەگـوترێ، دەگوترێ: (ذَرَّ الحَبَّ وَالـمِلْحَ وَالدَّوَاءَ) دانەوێڵەكەی‌و، خوێیەكەی‌و، دەرمانەكەی بڵاوكـردەوە .

(كِتَٰبٍ ) : (كَتَـبَ كِتَـاباً وكِتَـابةً، والكِتَـابُ أَيضَـاً: الفَـرْضُ وَالحُكْـمُ وَالقَـدَر) [2]، (كِتَـاب) بە مانـای نووسـین‌و تۆماركردنــەو، جـاری وایە بە مانـای فەڕزو حوكم‌و ئەندازەگیـریش دێ، كە دوایی زیاتر تیشكی دەخەینـە سـەر.

---

١) مختار الصحاح، مادة: ذرر، ص ٢٢٦.

٢) مختار الصحاح، مادة : ك ت ب، ص ٥٨٦.

## مانای گشتی ئایەتەكان

خوا ﷻ هەر لە سیاقی قسەكردن دا لەگەڵ هاوبەش بۆ خوادانەرەكانو، ئاڕاستەكردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵ كردنی بێبڕواكان دا، كە كاتی خۆی لە ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ دابوونو، لە هەموو ڕۆژگارەكانی دیكەدا، دەبن، هەر لەو سیاقەدا: بانگی مرۆڤایەتیی دەكات بەگشتی، ئاگاداریان دەكاتەوە كە ئامۆژگارییەكی زۆر گەورەو گرنگی بۆیان پێیە، كە شیفاو چارەسەرێكی زۆر كاریگەری بۆ ئەو نەخۆشییەی كە لە سینەو دەروونەكانیاندا هەیە، ناردوە، هەروەها ڕێنماییو بەزەیی خۆی ناردوە، بۆ بڕواداران، دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ﴾، پیتی (قد) كاتێك دەچێتە سەر كرداری ڕابردوو، بۆ ساغكردنەوە (تحقیق)یە، واتە: ئەی خەڵكینە! بە دڵنیاییەوە لە پەروەردگارتانەوە (لەو كەسەوە كە بەخێوتان دەكات، پەروەردگارتانە) ئامۆژگارییتان بۆ هاتوە، (ئامۆژگارییش واتە: ئاڕاستەكردنێك كە هەستو نەستو تەماو وەبەرنانو ترساندنی لەگەڵ دا بێ) وە شیفاو چارەسەری ئەوەی كە لە سینەكاندا هەیە، بۆتان هاتوە، وەك: كوفر، ئیلحاد، شیرك، یاخود ئەو گوناهو تاوانانەی كە ڕەگو ڕیشەی گوناهە ئاشكرایەكانن، وەك: بوغز، حەسەد، غەرەز، گومانی خراپ، ﴿وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، وە ڕێنمایی واتە: بەرچاو ڕوونییو ڕێ پیشاندانو، بەزەیی بۆ بڕواداران، واتە: هۆكاری دابەزینی بەزەیی خوایە، بۆ دنیاو دواڕۆژی بڕواداران، كە بە دڵنیایی مەبەست پێی قورئانە.

ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ﴾، بڵێ: با بەخششی خواو بە بەزەییەكەی، تەنیا با بەوە دڵخۆش

بن، تەنیا با بەوە زۆر دڵخۆش و شادمان بن، ئەو (بەخشش و بەزەیی)ە، باشترە، لەوەی کۆی دەکەنەوە، ئنجا ئەوەی کۆی دەکەنەوە : ماڵ و سامانە، خزم و کەسە، کەلوپەلە هەرچی هەیە، هەمووی پەیوەندیی بە بەرژەوەندییەکانی دنیاوە هەیە، بەڵام ئەگەر هەوڵبدەی شایستەی بەزەیی و بەخششی خوا بی، ئەوە جێی ئەوەیە کە زۆری پێ شادمان بی و زۆری پێ دڵخۆش بی.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر بابەتێکی دی، کە بریتیە لەوەی هاوبەش بۆ خوادانەرو کافرەکان و خەڵك بە گشتی، کاتێك لە وەحی خوا دوور دەکەوێتەوە، لەخۆوە دەستکاریی ڕزق و بژیوی خوا دەکات و، پۆلێنی دەکات، بە ناهەق و لەسەر بنەمایەکی نازانستیی و نادروست، بێ بەرچاوڕوونیی لە وەحی و پەیامی خواوە: ئەوەیان چاکە، ئەوەیان خراپە، ئەوەیان حەڵاڵە، ئەوەیان حەرامە، بۆیە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، کە بە کافرەکان بفەرموێ: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ﴾، بڵێ: هەواڵم پێبدەن، ئەوەی خوا بۆی دابەزاندوون لە بژیو، بۆچی دەفەرموێ: بۆی دابەزاندوون؟ چونکە فەرمانی خوا بە دروست کردنی ئەو بژیوانە لە زەوی و ئاسماندا، لەلایەن خواوەو لە سەرێوە دابەزیوە، یاخود هۆکارەکانی پەیدابوونی بژیو، هەموویان لە سەرێوە دابەزیون، ئەوە بە نسبەت ئێمەی مرۆڤەوە، چونکە زەوی کاتی خۆی لە خۆر جیابۆتەوە، وە پاشان ئەگەر تیشکی خۆرە ئەگەر (با)یە، ئەگەر بارانە، هەموویان لەلای سەرێوەن، ﴿فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ﴾، وە ئێوەش هەندێکیانتان گێڕاوە بە حەرام و، هەندێکیشتان گێڕاوە بە حەڵاڵ، بڵێ: ئایا خوا مۆڵەتی داون؟ ﴿أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ﴾، یان درۆ بە ناوی خواوە دەکەن؟ لێرەدا ڕەخنەگرتن لە قەدەغەکردنەکەیە، ئەگەرنا هەموو شتێك لە ئەسڵدا حەڵاڵە، مەگەر ئەوەی زیانی هەبێ، ئەویش پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی کردۆتەوە، کەواتە: شوێنی ڕەخنەگرتن، ئەوە بووە کە ئەوەی زیانیشی نەبووە، هەروا بە ئارەزووی خۆیان و

لەسەر بناغەی ئەفسانە، هاوبەش بۆخوادانەرەکان، قەدەغەیان دەکرد، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر ڕوونی دەکەینەوە.

دوایی خوا هەر لەوبابەتەوە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، وە ئایا گومانی ئەوانەی بە ناوی خواوە درۆ دەکەن چییەو، لە ڕۆژی دوایی دا چاوەڕێی چی دەکەن؟ (جگە لەوەی کە خوای بالآدەست سزایان بدات، لەسەر ئەوەی دەستکاریی ئەو بژیوە خۆش و باشانەیان کردوە، کە خوا بۆ مرۆڤەکانی دروست کردوون و، ئەوانیش پۆلێنیان کردوون، لە ژێر ناوونیشانی جیاجیادا، لەسەر بناغەیەکی ئەفسانەیی لە خۆیان و خەڵکیان قەدەغە کردوون، ئایا چی چاوەڕێ دەکەن و گومانیان چییەو ئەوە نەبێ کە خوا سزایان بدات؟!

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَشۡكُرُونَ ﴾، بێگومان خوا خاوەن بەخششە، بۆ خەڵك، بەڵام زۆربەیان سوپاسگوزار نین، لە جیاتی ئەوەی لەسەر نیعمەت و بەخششەکانی سوپاسی بکەن و، پەیام و بانگەوازەکەی قبووڵ بکەن و، پابەندبن بە شەریعەتەکەیەوە، بانگەوازەکەی ڕەفز دەکەن و، بە ئارەزووی خۆشیان دەستکاریی شتەکان دەکەن.

ئنجا دێتە سەر بابەتی چوارەم و کۆتایی، کە ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خوایە ﷺ بە پلەی یەکەم، لە دوای ویش ڕوو لە هەموو ئەو کەسانەیە کە مسوڵمانن و قورئان دەخوێنن، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأۡنٍ وَمَا تَتۡلُواْ مِنۡهُ مِن قُرۡءَانٍ وَلَا تَعۡمَلُونَ مِنۡ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيۡكُمۡ شُهُودًا إِذۡ تُفِيضُونَ فِيهِ ﴾، تۆ لە هیچ حاڵێکدا نابی و، هیچ ئەندازەیەك لە قورئان ناخوێنی و، هیچ کردەوەیەك ئەنجام نادەن، مەگەر ئێمە ئامادەین و ئاگادارین، دەبینین کاتێك کە دەچنە نێوی، واتە: لە هەر حاڵێکدابن، چ حاڵەتێکی مەعنەویی، یان بیرمی، یان کرداریی، حاڵەتی مەعنەویی، بۆ وێنە: دڵخۆشبی، دڵناخۆشبی، هەر چۆنێك بی، خوا ئاگای لێتە، حاڵەتی بێژەیی ئەگەر قورئان بخوێنی، یان قسەیەکی چاك یان خراپ بکەی، خوای پەنهانزان، هەر ئاگادارە هەروەها هەر کردەوەیەك ئەنجام بدەی، خوا ئاگادارتە.

خـوا دەفـەرموێ: ئێمـە ئاگـادارین، کاتێـك ئێوە دەچنە نێوی، ﴿ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾، وە پەروەردگـارت بـە ئەنـدازەی قورسایی گەردیلەیەك (شتێکی بچووك) نە لە زەوی نە لە ئاسمان دا ، لێی ون نابێو لێی پەنهان نیە، ﴿ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴾، بەڵكو لەوەش بچووکترو، لەوەش گەورەتر، لە خوا پەنهان نابێ، بۆچی؟ چونکە هیچ شتێك نیە لە گەردیلە بچووکتر یان گەورەتر، مەگەر لە کتێبی ڕوونو ئاشکرا دایە.

وە (کتاب) واتە: نووسین، یان تۆمار کردن، بەڵام وا پێدەچێ لێرەدا مەبەست پێی زانیاریی خوای زاناو شارەزا بێو، هەندێکیش دەڵێن: مەبەست پێی (لوح المحفوظ)ە. هەندێکیش گوتوویانە: تەعبیری (لوح المحفوظ)یش، هێمایەکە بۆ تێگەیشتنی ئێمە، ئەگەرنا مەبەست پێی زانیاریی گشتگیرو ڕەهای خوای پەروەردگارە، بە هەموو دروستکراوەکان.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**، کە دەفەرموێ : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾﴾، وشەی (يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ) واتە: ئەی خەڵکینە! ڕەش بن، یان سپی، عەرەب بن، یان غەیری عەرەب، نێربن، یان مێ، خوێندەواربن، یان نەخوێندەوار ... هتد، دڵنیاو مسۆگەربن کە لە پەروەردگارتانەوە ئامۆژگارییتان بۆ هاتوە، واتە: ئەم قورئانەی کە لەبەر دەستتانە، ئامۆژگاریی خوایە بۆ ئێوە، ئامۆژگارییش بنچینە وایە: لە لایەنێکی دڵسۆزی، بە پەرۆشی، بە تەنگەوە بووی مشوورخۆرەوە، ئاراستەی کەسێك دەکرێ، بۆ بەزەیی‌و دڵسۆزیی لەگەڵ نواندن‌و مشوور لێخواردن، ئنجا ئایا کێ شایستەترە لە خوا ﷻ کە مشوور بخوات لە بەندەکانی‌و، بۆیان بە بەزەیی بێ‌و بە تەنگیانەوە بێ‌و، پەرۆشی بن ؟! بێگومان کەس، کەواتە: وەك ئامۆژگاریی ئەم قورئانە وەربگرن.

﴿وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ﴾، قورئان وێڕای ئەوەی کە سیفەتی ئامۆژگاریی هەیە، سیفەتی چارەسەر (شفاء)ی هەیە،(شفاء)یش لە (شفا)وە هاتوە، (شَفا) واتە: (حرف) لێوار، کەنار، قەراغ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠٣﴾﴾ آل عمران، واتە: ئێوە لەسەر کەناری چاڵی ئاگر بوون، یانی: ئەو کەسەی شیفای بۆ هاتوە، کەوتۆتە کەناری سەلامەتیی‌و بێ بەڵایی‌و نەمانی دەردو ئازار.

کەواتە: دەگونجێ بگوترێ: (شفاء) یانی: نەمانی ئەزیەت‌و ئازارو لاچوونی کەم‌و کوڕییەکان‌و گومڕایی‌و سەرگەردانیی.

لە ڕاستییدا چەمکی ﴿ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ ﴾، لەوەش فراوانترە یانی: لاچوونی کوفرو شیرکو نیفاقو ئەو سیفەتە پەستو نزمانەی کە لە دەرووندا هەن، وەك خۆ بەزلگرییو بوغزو حەسوودییو ڕقو کینە، کە دوایی دەبنە بنكو ڕیشەی سیفەتە خراپەکان، پاشان ئەو نەزانییو نەفامییو بێئاگاییەی کە لە زیهندا هەیە، کەواتە: قورئان شیفایە بۆ هەرچی کەموکوڕییو ناتەواویی هەیە لە بوونو کەینوونەی ئینساندا، بەتایبەتی لە دیوی پەنهانی دا، ئنجا ئایا هەر ئەوەندەیە؟ بێگومان نەخێر، ﴿ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾، وە ڕێنماییەو بەزەییە بۆ بڕواداران، (هُدَى) چییە؟

(الهُدَى: الدَّلاَلَةُ عَلَى الطَّرِيقِ المُوَصِّلِ إلى المَقْصُودِ).

(هُدَى) بریتییە لە ڕێنمایی کردنێك بۆ ئەو ڕێیەی کە ئینسان دەگەیەنێتە ئامانج، واتە: بەرچاوڕوونییو ڕێ پێشاندان، (رحمة)یش بریتییە لە بەزەییو پەرۆش، بەلاّم خوا ﷻ (هُدَى) و (رحمة)، تایبەت دەکات بە بڕوادارانەوە. کەواتە: بە پێی ڕیزبەندیی، دەبێ:

١- ئامۆژگاریی خوا وەربگرین، ئنجا هەر کەسێك ئامۆژگاریی خوای وەرگرت. کە ئەم قورئانەیە .

٢- بۆی دەبێتە هۆکاری شیفا، واتە: پاکبوونو چاکبوونی دەروونی لە نەخۆشییەکانو، لە سیفەتە پەستو نزمەکان.

٣- ئنجا قۆناغی سێیەم ئەویش کە کاتێك شیفای بۆ دێ، بۆی دەبێتە ڕێنمایی کە بە ڕێی ڕاست بزانێو بەرچاوی ڕوون بێ، چی بکات؟ چۆن بکات؟

٤- ئەویش دەبێتە هۆی ئەوە کە شایستەی بەزەیی خوابێ، شایستەی ئەوە بێ کە خوای پەروەردگار لە دنیاو دوارۆژدا بە لوتفو بەزەییو میهرەبانیی خۆی، مامەڵەی لەگەڵدا بکات، کەواتە: قورئان ئامۆژگارییو شیفایە بۆ خەڵك بە گشتیو، بۆ بڕواداران بە تایبەت: ڕێنماییو ڕەحمەتە.

**مەسەلەی دووەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾، بڵێ: با تەنیا بە بەخششی خواو، بە بەزەیی خوا، زۆر دڵخۆش بن، ئەوە باشترە لەوەی کە کۆی دەکەنەوەو پەزمەندەی دەکەن‌و دەیخەنە سەر یەك.

هەندێك گوتوویانە: (فَضْل) بریتیە لە ڕێنمایی خوا لە قورئاندا، (هداية اللّهِ في القرآن) ئێمەش دەڵێین: دەگونجێ بە پێی سیاقی ئایەتەکان بڵێین: مەبەست پێی نەك ڕێنمایی خوایە لە قورئان دا، بەڵکو قورئانە بە گشتی، بە هەموو کاریگەرییەکانیەوە کە لەسەر ئینسانیان دادەنێ، چ کاریگەریی ڕێنمایی‌و بەرچاوڕوونکردنەوە، چ کاریگەریی شیفا بوون، چ کاریگەریی بوونە مایەی ڕەحمەت، ئەگەرنا (فَضْل) واتە: بەخششی خوا، چاکەکردنی خوا، نیعمەتەکانی خوا، (رحمة)یش هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (التَّوْفِيقُ عَلَى إِتِّبَاعِ الشَّرِيعَةِ) هاوکاریی‌و ئاسانکاریی خوا، بۆ ئەوەی ئینسان بە دوای شەریعەتی خوا بکەوێ.

واتە: با بەو بەزەیی‌و بەخششەی خوا دڵخۆش بن، کە لە قورئاندا بەرجەستەیە، ئەوەش لە ڕاستییدا ماناکەی بەهێزترە یانی: ئەو بەزەیی‌و بەخششەی خوا ﷻ کە بە هۆی ئامۆژگاریی خواوە کە قورئانە‌و، بە هۆی وەرگرتنی‌و بە هۆی پەیڕەویی لێکردنیەوە، دەستیان دەکەوێ، با هەر بەوە زۆر دڵخۆش بن.

(فَرَح)یش بریتیە لە (شِدَّةُ السُّرور) واتە: زۆر دڵخۆش بوون، هەر بۆیە زۆر دڵخۆش بوون، لە هەموو قورئاندا سەرزەنشت کراوە، مەگەر لێرەدا، چونکە زۆر دڵخۆش بوون بە سەروەت‌و سامان، ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەو مرۆڤە دنیای کردۆتە ئامانج‌و، مەبەستێکی لە دنیا گەورەتری نیە، بۆیە زۆر زۆر دڵخۆشە بە سەروەت‌و سامانی دنیا، بەڵام خوا دەیەوێ ئێمە دنیا وەك خۆی تەماشا بکەین، وەك پردی پێدا ڕەتبوون، وەك هۆڵی تێدا تاقیکرانەوە، وەك هۆکارێك بۆ تێدا ئەنجامدانی بەندایەتیی‌و، تێدا وەدەست هێنانی سەرفرازیی‌و بەختەوەریی دواڕۆژ، بەڵام دەبێ زۆر جێی دڵخۆش بوونمان، بریتی بێ لە قورئان‌و لایەنی مەعنەویی، کە لە خوامان نیزیك دەخاتەوەو کە یارمەتییمان دەدات کە لەم تاقیکردنەوەی ژیانی دنیا

دەربچین، ئەگەرنا تۆ باهەموو دنیات هەبێ، بەڵام کە لە تاقیکردنەوەی خوا لە دنیادا دەرنەچووی، ئەگەر ئامانجو حیکمەتێک کە لە دروستکرانتدا هەیە، نەتهێنایە دی، مانای وایە هیچ، ئەسڵەن هەر نیعمەتێک کۆتاییەکەی سەرفرازیی نەبێ، سەرەنجام دەبێتەوە نیقمەتو بەڵا، بە پێچەوانەوە، هەر بەڵایەک ببێتە هۆکاری ئەوە کە ئینسان ڕەزامەندیی خوای پێ وەدەستبێنێ، ئەوە لە ڕاستییدا ئەو نیقمەتو بەڵایە پێچەوانە دەبێتەوەو دەبێ بە نیعمەت.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ : ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾،

(أَرَءَيْتُمْ) یانی: ئەو شتەی ئێوە بینیتانو لێی ئاگادارن، هەواڵم پێبدەن، بەڵام کورت کراوەتەوە، ( قُلْ أَرَءَيْتُمْ ) یانی: (قُل أَخْبِرُونِي) بڵێ : هەواڵم پێبدەن.

ئەو بژیوەی کە خوا بۆی دابەزاندوون، دیارە هەمزە (أ)ی (أَرَءَيْتُمْ) هەمزەی پرسیارکردنە بۆ تەقریر، بینینیش، بینینی زانستییە، نەک بینینی چاویی[1].

یانی : ئایا دەزانن ئەو بژیوەی خوا بۆی دابەزاندوون، هەواڵم پێبدەن بۆچی هەندێکیانتان گێڕاوە بە قەدەغەو، هەندێکیانیشتان گێڕاوە بە ڕەوا؟ بۆچی دەستکاریی هەندێکیانتان کردوە، بۆچی پۆلێنتان کردوە، بەبێ بەڵگە، ئەگەرنا. هەندێ شت هەیە قەدەغەیەو هەندێ شت هەیە ڕەوایە، بەڵام خوای کارزان لێرەدا ڕەخنە لەوە دەگرێ کە بەبێ بەڵگەی شەرعییو، بەبێ بەرچاوڕوونیی لە وەحی. گوتوویانە: فڵان شتە حەرامە.

هەڵبەتە زیاتر جێی ڕەخنەگرتن، بە قەدەغە دانانی ئەو شتانەیە، کە خوای کاربەجێ بۆ بەندەکانی دروست کردوون، بۆ وێنە: لە سووڕەتی ئەنعام دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ

---

١) الرؤية: قلبية وليست بصرية .

بِزَعۡمِهِمۡ وَأَنۡعَٰمٌ حُرِّمَتۡ ظُهُورُهَا وَأَنۡعَٰمٌ لَّا يَذۡكُرُونَ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا ٱفۡتِرَآءً عَلَيۡهِۚ سَيَجۡزِيهِم بِمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿١٣٨﴾ وَقَالُواْ مَا فِي بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ خَالِصَةٞ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِنَاۖ وَإِن يَكُن مَّيۡتَةٗ فَهُمۡ فِيهِ شُرَكَآءُۚ سَيَجۡزِيهِمۡ وَصۡفَهُمۡۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ﴿١٣٩﴾﴾.

واتە: وە گوتیان: ئەوە ئاژەڵو کشتوکاڵێکە بە بۆچوونی هەڵەی خۆیان قەدەغەیەو، نابێ هیچ کەسێك بیخوات، مەگەر کەسێك بمانەوێ، وە ئاژەڵێك کە پشتی قەدەغەکراوە بۆ بارو سواری بەکاری ناهێنن، وە ئاژەڵێك کە بە درۆ هەڵبەستنەوە بە ناوی خواوە، ناوی خوای لەسەر ناهێنن، بە دڵنیاییەوە لەمەودوا بە هۆی درۆ هەڵبەستنیانەوە خوا سزایان دەدات. وە گوتیان: ئەوەی لە سکی ئەم ئاژەڵانەدا بێ، تایبەتە بە نێرینەکانمانەوەو، لە هاوسەرەکانمان قەدەغەیە، بەڵام ئەگەر ئەو بەچکەیە مردار بێ، ئەوە نێرو مێ تێیدا هاوبەشن، بێگومان (خوا) سزای ئەو وەسفکردنە بێ بنەمایانەیان دەدات، بەڕاستیی خوا کاربەجێی زانایە.

وەك پێشتر لە تەفسیری سوورەتی ئەنعام دا باسمان کردوە، کافرەکان هەر لەخۆوە هەندێ ئاژەڵیان قەدەغە دەکردن‌و نە بۆ بار، نە بۆ سواریی، بەکاریان نەدەهێنان، جا ئەو ئاژەڵە حوشتر بووایە، گا بووایە، زیاتر حوشترو گا بەکارهێنراون بۆ بارو سواریی (بۆ بارلێنان‌و بۆ سواریی).

ئنجا دەفەرموێ : ﴿قُلۡ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمۡۖ أَمۡ عَلَى ٱللَّهِ تَفۡتَرُونَ﴾، بڵێ: ئایا خوا مۆڵەتی داون، یاخود درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن، واتە: دوو ئەگەر هەن:

أ) یان دەبێ خوا مۆڵەتی دابن، ئەگەر مۆڵەتی داون، کوا بەڵگەتان، بەڵگەی نەقڵیی، چییە ؟!.

ب) یان دەبێ مۆڵەت نەدرابن، بەڵگەیەکی نەقلیی و شەرعییتان بەدەستەوە نەبێ، کەواتە: درۆ هەڵدەبەستن.

ئنجا ئەگەر درۆش بەناوی خواوە هەڵدەبەستن و، هەر لەخۆوە ئەو نازو نیعمەتانەی خوا بۆ بەندەکانی دروستی کردوون، بێن بەشێك لەو نازو نیعمەتانە لەو خەڵکە قەدەغە بکەن، بە تەئکید ئەوە تاوانێکی زۆر گەورەیە، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴿٦٠﴾ ﴾، وە ئایا گومانی ئەوانەی درۆ بەناوی خواوە هەڵدەبەستن، ڕۆژی قیامەتێ چییە؟ واتە: چاوەڕێی چ شتێك دەکەن، چ گومانێك دەبەن، کە لەسەر ئەو کردەوە خراپەیان، لەگەڵیان بکرێ؟ بە دڵنیایی سزا دەدرێن، جگە لە سزادان، نابێ هیچ گومانێکی دیکەی چاکیان هەبێ، چونکە گومانی چاك دەبێ کەسێك بیبێ، کە کردەوەی چاکی ئەنجام داوە، بەڵام کەسێك کە کردەوەی خراپی ئەنجام داوە، بە تەئکید دەبێ چاوەڕێی سزای خراپیش بکات.

<u>مەسەلەی چوارەم</u>: کە دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾، بێگومان خوا بەرانبەر بە خەڵك خاوەن بەخششەو پێیان دەبەخشێ، (چاکە لەگەڵ خەڵك دەکات) بەڵام (خەڵك) زۆربەیان سوپاسگوزارنین.

خوا ﷻ ڕێنماییان بۆ دەنێرێ، کەچی ئەوان پێی بێبڕوا دەبن، ڕزق و ڕۆزییان بۆ دەنێرێ، کەچی ئەوان لەخۆوە قەدەغەی دەکەن، لەش ساغیان دەکات، کاری خراپەی پێ دەکەن، ماڵ و سامانیان دەداتێ، کەچی ڕژدیی و چرووکیی پێدەکەن و. پێی لە خۆبایی دەبن، دەستەڵاتیان دەداتێ، کەچی ئەوان پێی لە سنوور دەردەچن. چونکە (شکر) تەنیا بریتی نیە لەوە کە بڵێی: خوایە سوپاس بۆ تۆ، (شکر) بە سێ شتان دەکرێ و، پەیوەندیی بە سێ شتانەوە هەیە:

١/ پەیوەندیی بە زمانەوە هەیە.

٢/ پەیوەندیی بە دڵەوە هەیە.

٣/ پەیوەندیی بە ئەندامەکانی جەستەوە هەیە.

١ـ ئەوەی پەیوەندیی بە دڵەوە هەیە، ئەوەیە کە هەرچی نیعمەتە لە دڵەوە بیگێڕیەوە بۆ خوای بەخشەر، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾النحل، واتە: وە هەر نیعمەتێکتان هەیە لە خواوەوەیە... سوپاسکردنی دڵ، ئەوەیە کە بە عەقڵو دڵ، هەرچی خێرو چاکەیە هەیە، لە ژیانتو دەوروبەرتدا، لە خوای بزانی.

٢ـ (شکر)ی زمان ئەوەیە، کە نیعمەتەکانی خوا، بە زمان باس بکەی، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾ ﴾الضحى، واتە: وە ئەو نیعمەتەی پەروەردگارت پێی بەخشیوی، باسی بکە.

٣ـ سوپاسکردنی ئەندامەکانیش، ئەوەیە کە بە کردەوە نیعمەتەکانی خوا لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربێنی، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ﴿١٣﴾ ﴾سبأ، واتە: ئەی ئالی داوود شوکر ئەنجام بدەن، کەواتە: شوکر ئەنجام دەدرێ، نەك تەنیا بگوترێ، ئەنجامدانی شوکری خواش، ئەوەیە کە ئەو نیعمەتانەی خوای پەروەردگار، لە ڕەزامەندیی خوای باڵادەست دا بەکاربێنی، وەك داوود سەلامی خوای لێ بێ، خوا دەنگێکی خۆشی پێدا بوو، موناجاتو ڕازونیازی پێ لەگەڵ خوادا دەکرد، توانای پێدا بوو، لە ئاسن زرێی دروست دەکرد، بۆ ئەوەی جەنگو جیهادی پێ لە پێناوی خوادا بکات، وە سولەیمان سەلامی خوای لێ بێ، خوای باڵادەست (با)و (جن)ی بۆ دەستەمۆ کردبوون، زمانی زیندەوەرانو باڵندانی فێرکردبوو، ئەویش ئەوانەی هەموو بەکاردەهێنا، بۆ وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خواو بڵاوکردنەوەی پەیامی خوا، کەواتە: ئەوە شوکرو سوپاسی ڕاستەقینەیە، کە تۆ نیعمەتەکانی خوا بگێڕیەوە بۆ خواو،

بە زمان دانیان پێدابێنیو، بە کردەوەش ﷺ ڕەزامەندیی خوای پەروەردگاردا بەکاریان بێنی.

بۆیە دەفەرموێ: خوا خاوەن بەخششە بەڵام زۆربەی خەڵك سوپاسگوزارنین، لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ۝١٣﴾ سبا، واتە: وە کەمێك لە بەندەکانم سوپاسگوزارن.

**مەسەلەی پێنجەم** : کە دەفەرموێ : ﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُواْ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ۝٦١﴾.

(الشـأن): (العَمَلُ المُهِم والحالُ المهم) (شأن) یانی، کردەوەو حاڵێکی گرنگ، واتە: تۆ لە هیچ حاڵێکدا نابی، (واتە، حاڵەتی دەروونییو مەعنەویی) وە هیچ ئەندازەیەك لە قورئان ناخوێنیەوەو، هیچ کردەوەیەکیش ئەنجام نادەن {بە جەستەتان، کە گرنگترین حاڵەت کە ئینسان جەستەی پێ بجووڵێنێ، بریتیە لە زیکری خوا کردن بە زار} مەگەر ئێمە ئامادەو چاودێر بووین، کاتێك ئێوە دەیچوونە نێو.

وشەی (شهود) کۆی (شاهد)ە، {الشاهد: الحاضر، وأُطْلِق على العالِم بطريقة المجاز المُرسَل، ولذلك عُدِّي بحرف (على)}، (شاهد) لێرە بە مانای ئامادەیە، بە شێوەی مەجازی مورسەل بەکارهێنراوە بۆ زانا (واتە: لێی ئاگاداربووین، پێی زانا بووین) هەر بۆیەشە وشەی (شهود) بە (على) تەعەددای کردوە، یانی : خوای پەنهانزان شایەد بووە بەسەرتانەوەو ئاگادار بووە پێتان، کە چییتان دەکرد؟ ﴿إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ﴾، کاتێك دەیچوونە نێو، پێشتریش باسمان کرد لە شیکردنەوەی

وشەکاندا: (الإِفَاضَةُ فِي العَمَلِ: الإِنْدِفاعُ فِيهِ، أَي الشروعُ فِي العَمَلِ بقُوَّةٍ وَاهْتِمَام)، واتە: (الإِفَاضَةُ فِي العَمَلِ) بریتییە لە بەهێزو گرنگیی پێدانەوە خۆپێدادانی کارێكو دەست پێکردنی.

واتە: ئێوە هەر کاتێك یەکێك لەو سێ حاڵەتانەتان هەبێت، ئێمە پێی ئاگادارین.

نەك هەر ئەوەندە بەڵکو: ﴿وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾، وە بەقەدەر گرانایی گەردێك، شتێکی زۆر بچووك، نییە، لە زەوییدا، یان لە ئاسماندا، بچووکتر لەوە، یاخود گەورەتر، مەگەر هەمووی لە نووسینێکی تۆمارێکی ئاشکراو ڕووندا هەیە.

لە قۆناغی مەککەدا پێغەمبەر ﷺو، بڕواداران و هاوەڵان بە دەستی کافرەکان تووشی ئەشکەنجەو ئازار بوون و، قسەی ناخۆشیان بیستوەو، هەڵوێستی نەگونجاوی ئەوانیان ڕووبەڕوو بۆتەوە، ئنجا خوای کاربەجێ وەك دڵدانەوەیەك بە پلەی یەکەم بۆ پێغەمبەر ﷺ، پاشان بۆ هاوەڵانی بەڕێزی، دەفەرموێ: ئاگاداری هەموو حاڵەتەکانتانم: چ حاڵەتی مەعنەوییتان، چ حاڵەتی بێزەیی و دەربڕین، چ حاڵەتی کردەیی، خوا لە هەموو حاڵەتەکان ئاگادارەو چاودێرە، دەزانێ چیتان بەسەر دێ و، چۆنە؟ ئەگەر نارەحەتکران و ئازاردانە، ئەگەر هەڵسانی تۆیە بە کارو کردەوەی چاك، وەك قورئان خوێندن و، خۆڕاگریی و...هتد، بەدڵنیایی خوا بە هەر هەمووی ئاگادارە.

ئنجا ئەمە هەڕەشەیە بۆ کافرو بێبڕوایەکانیش، کە خوا هیچ شتێکی ئێوەی لێ ون نابێ، بە هەموو هەڵسوکەوتەکانتان ئاگادارە، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو گرانایی گەردێك، لە خوای پەنهانزان شێرراوە نییە، وەك پێشتر گوتمان : (ذَرَّة) هەم بە مێروولەی زۆر بچووك دەگوترێ، هەم بە تۆزو گەرد (هباء) ئەوەی کە کاتێك تیشکی خۆر لە پەنجەرەیەکەوە دێتە ژوور، شتی ورد دێتە بەرچاوت، بەویش دەگوترێ، واتە : شتی زۆر زۆر بچووك و، بچووکتر لەوەش و، گەورەتر لەوەش، نییە ﴿إِلَّا فِي

كِتَٰبٖ مُّبِينٍ ﴾، مەگەر هەمووی لە کتێبێکی ڕووندا هەیە، واتە: لە زانیاریی خوادا، یان لە (لوح المحفوظ)دا واتە: هیچ شتێك لە خوای پەنهانزان شاراوە نیە.

لە ڕووی خوێندنەوەوە : ﴿ وَلَآ أَصۡغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٍ ﴾، خوێنراویشەتەوە : (ولا أصغرُ من ذلك ولا أكبرُ)، هەرچەندە یەك مانایان هەیە، بەڵام زۆربە ناوایان خوێندۆتەوە : ﴿ وَلَآ أَصۡغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٍ ﴾.

وشەی (مُّبِينٍ) (إسم فاعل)ە و لە (أبانَ) ەوە هاتوە، ئنجا (أبانَ) هەم بە (لازم) دێ، هەم بە (متعَدي).

وێنەی (لازم): (أَبانَ الفَجْرُ) یانی: بەرەبەیان دەرکەوت.

وێنەی (متعَدي): (أبان المدرِّسُ الدرسَ) یانی: وانەبێژەکە وانەکەی ڕوونکردەوە.

وشەی (مُبین) لێرەدا، دەگونجێ لە (أبان)ی (لازم)ەوە بێ، یانی: ڕۆشن.

دەشگونجێ لە (أبان)ی (متعَدي)ەوە بێ، یانی: ڕوونکەرەوە.

بەڵام (إسم فاعل)ی (بانَ) بریتیە لە (بیِّن) واتە: ڕۆشن.

کەواتە: ئەو (کتاب)ەی کە لێرەدا بە (مُبین) وەسف کراوە، چ مەبەست پێی (لوح المحفوظ) بێ، یان زانیاریی بێ سنووری خوا، هەردووك وەسفەکەی لەگەڵدا دەگونجێن، چونکە زانیاریی خوا (علم الله)و (لەوحی پارێزراو)یش هەم ڕۆشنن و هەم ڕۆشنکەرەوەشن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

# دەرسی هەشتەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە نۆ (٩) ئایەت (٦٢ تا ٧٠) پێك دێ، سەرەتا خوای بەرزو مەزن پێناسەی دۆستو نیزیکانی خۆی دەکات، بە پێنج سیفەتی بنەڕەتییان.

پاشان ئامۆژگاریی پێغەمبەر ﷺ دەکات، کە بە قسەو قاڵی کافرەکان دڵتەنگ نەبێو دڵنیابێ کە عیززەت هەمووی هی خوایە.

ئنجا خوا باسی موڵکدارێتیی گشتی خۆی بۆ ئاسمانەکانو زەوی دەکاتو، ڕایدەگەیەنێ: کە هاوبەشدانەرەکان تەنیا شوێنی گومان کەوتوونو، هیچ هاوبەشێك نیە بیپەرستن.

دوایی خوای میهرەبان باسی دیاردەی شەوگارو ڕۆژگار دەکات، کە مایەی تێدا پشوودانو کارو کاسبیین.

ئنجا لە کۆتایی دا بەرپەرچی قسەی موشریکەکان دەداتەوە، کە گوتوویانە: خوا ڕۆڵەی هەیەو، هەڕەشەی سەختیان لێ دەکات.

﴿ أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ (٦٣) لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ
لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ (٦٤) وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ ۘ
إِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ۚ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ (٦٥) أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَن فِى
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ
شُرَكَآءَ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ (٦٦) هُوَ ٱلَّذِى
جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ
لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ (٦٧) قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ۗ سُبْحَٰنَهُۥ ۖ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ۖ لَهُۥ مَا
فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ إِنْ عِندَكُم مِّن سُلْطَٰنٍۭ بِهَٰذَآ ۚ أَتَقُولُونَ
عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ (٦٨) قُلْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا
يُفْلِحُونَ (٦٩) مَتَٰعٌ فِى ٱلدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلْعَذَابَ
ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ (٧٠) ﴾

# مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{ئاگاداربن! دۆستانی خوا هیچ مەترسییان لەسەر نیەو، ئەوان دڵتەنگ نابن ﴿٦٢﴾ ئەوانەی بڕوایان هێناوەو پارێزیان دەکرد ﴿٦٣﴾ لە ژیانی دنیاو لە دواڕۆژدا، موژدەیان هەیە، وشە (بڕیارە)کانی خوا گۆڕانیان بۆ نیە، ئا ئەوە بە مراد گەیشتنی مەزنە ﴿٦٤﴾ وە با قسەی ئەوان دڵتەنگت نەکات، باڵادەستیی هەمووی هی خوایە، ئەو بیسەری زانایە﴿٦٥﴾ ئاگاداربن! هەرچیو هەرکەس کە لە ئاسمانەکانو لە زەویدایە، هی خوایەو، ئەوانەی لە جگە لە خوا دەپاڕێنەوە، شوێن هاوبەشان ناکەون، بەڵکو تەنیا شوێن گومان دەکەونو، بەس درۆ دەکەن ﴿٦٦﴾ (خوا) ئەو کەسەیە کە شەوگاری بۆ گێڕاون بە کاتی تێدا پشوودان، ڕۆژگاریشی بۆ کردوون بە مایەی تێدابینین، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێک ببیستن ﴿٦٧﴾ (کافرەکان) گوتیان: خوا ڕۆڵەی بۆ خۆی داناوە ! پاکیی بۆ وی، ئەو بێ نیازە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوی دا هەیە، هی ویە، لەوبارەوە هیچ بەڵگەیەکتان لەلا نیە، ئایا بە نەزانیی لە بارەی خواوە دەدوێن؟ ﴿٦٨﴾ بڵێ : بە دڵنیایی ئەوانەی درۆ لەبارەی خواوە هەڵدەبەستن، سەرفراز نابن﴿٦٩﴾ (ژیانەکەیان) ڕابواردنێکی کەمە لە دنیادا، دواپی گێڕانەوەیان بۆ لای ئێمەیەو، بەهۆی ئەوەوە کە بێبڕوا بوون، ئازارێکی توندیان پێ دەچێژین ﴿٧٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(أَلَآ ): لە زمانی عەرەبییدا دەڵێ: (أَدَاةُ التَّنْبِيه) ئامرازی ئاگادارکردنەوەو ورياکردنەوەيە، لە زمانی کوردییدا دەبێتەوە بە (ئەها)، وەك كەسێك يەكێك ئاگادار دەكاتەوە دەڵێ: (ئەها فلاّن كەس!).

(أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ ): واتە: ئەوانەی كە لە خوا نیزیكن، (اولیاء) كۆی (ولي)یە، (الوَلِيُّ وَالمَوْلى: النَّصيرُ وَالمُعينُ وَالمُحِبُ وَالقَرِيب، وَهُوَ مِنَ الوَلْي: وَهُوَ القُرْبُ)، واتە: وشەی: (مَولی)و (وَلي) یانی: یاریدەدەرو هاوكارو خۆشویستەرو نیزیك، كە لە (وَلْي)ەوە هاتوەو ئەویش بەمانای نیزیكیی دێ.

(ٱلْبُشْرَىٰ): (البِشَارَةُ وَالبُشْرَى: الخَبَرُ السارُّ)، وشەی (بشارة)و (بشرى) هەردووكیان بە مانای هەواڵی خۆش دێن، هەواڵێك كە دەمو چاوی ئینسان گەش دەكات، یانی (تَنْبَسِطُ بە بَشْرَة وجه المَرْءِ)، پێستی دەمو چاوی ئینسان بە هۆی ئەو هەواڵەوە، خۆشو گەشو جوان دەبێ.

(لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ): واتە: گۆڕان نیە بۆ فەرمانو بڕیارەكانی خوای بالادەست، (الإبدَال وَالتبدِيلُ والتبدُّلُ والإستبدَال: جَعَلُ شَيءٍ مَكَان آخَر. والتبدُّلُ هو التغييرُ مطلقاً) وشەی (إبدَال، تبدِيلُ، تَبَدُّلُ، إستبدَال) هەر چواریان: ئەوەیە كە شتێك لە شوێنی شتێك دابنێی، بەلاّم (تَبَدُّل) ئەوەیە كە بە موتڵەقیی شتێك بگۆڕی.

(ٱلْعِزَّةَ ): (العِزَّةُ: حَالَةُ مَانِعَةُ للإنْسانِ مِنْ أَنْ يُغْلَبَ)، (عزة) بریتیە لە حاڵەتێك بۆ مرۆڤ كە ڕێ دەگرێ لەوەی تێكبشكێو، كەس بەسەریدا زاڵ بێ.

(يَخْرُصُونَ ): (الخَرْصُ: حَرْزُ الثمرَةِ، وَقِيلَ الكَذِبُ، وَذَلِكَ أَنَّ كُلَّ قَولٍ مَقُولٍ عَنْ ظَنّ وَتَخمِينٍ، يُقَالُ لَهُ: خَرْص)، وشەی (خرص) لە كوردیی دا دەڵێن:

قرساندن، قرساندنی میوە بیخەملێنی ئەو باغە چەندی میوە دەبێ‌و، هەندێك گوتوویانە: (خرص) واتە: درۆ، ئەویش لەبەر ئەوەی هەر کەسێك شتێك بە خەملاندن بکات، زۆر جار ڕاست دەرناچێ.

(لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ ): (السُّكُونُ: ثُبوتُ الشَّيءِ بَعْدَ تحَرُّكٍ) (سكون) بریتیە لە وەستانی شتێك دوای ئەوەی کە جووڵانەوەی هەبووە.

(مُبْصِرًا ): (أَي مُضِيئَاً للأَبْصَارِ، أَو صَارَ أَهْلُهُ بصراء)، (مُبْصِر) واتە: بینەر، دیارە ڕۆژگار بۆخۆی نابینێ، بۆیە گوتوویانە: (مُضِيئَاً للأَبْصَارِ) وا دەکات چاوەکان ببینن، یاخود (صَارَ أَهْلُهُ بصراء) کەسانێك کە لە ڕۆژگاردان، دەبینن، واتە: بەرچاویان ڕوونە، بەهۆی ڕووناکیی ڕۆژگارەوە، بەرپێی خۆیان دەبینن.

(سُلْطَـٰنٍۭ ): لێرەدا بە مانای بەڵگە هاتوە، بەڵام لە ئەسڵدا دەڵێ : (مِنَ السَّلاَطَةِ: التَمَكّن مِنَ القَهْرِ)، ئەویش بریتیە لەوەی کە ئینسان لە ئەنجامی دەستەڵات‌و دەستڕۆیشتوویی دا جێگیربێ لە شوێنێك، (وَمِنْهُ سُمِّي الحُجَّة سُلْطَاناً) هەر بۆیەش بەڵگە پێی گوتراوە: (سُلْطَانَ) چونکە بەڵگەی ڕاست‌و ڕەوان، دەستەڵاتی هەیە بەسەر عەقڵ‌و دڵی ئینساندا‌و جێگیر دەبێ.

(يَفْتَرُونَ ): (يَخْتَلِقُون، والإِسْمُ: الفِرْيَةُ، شَيْئَاً فَرِيَّاً، يعني: مصنوعاً مُخْتَلَقاً)، وشەی (یفترون) واتە: درۆ هەڵدەبەستن، ناوی (إفتراءْ) پێی دەگوترێ: (فريةُ)، دەڵێ: (هذه فريةٌ ما فيه مرية) ئەوە درۆیە، هیچ گومانی تێدانیە، لە سووڕەتی (مریم)دا هاتوە، کە مەریەم خوا لێی ڕازی بێ دێتەوە، عیسا (علیه السلام)ی پێیە، پێی دەڵێن: ﴿ قَالُوا۟ يَـٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًٔا فَرِيًّا ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: ئەی مەریەم! شتێکت هەڵبەستوە منداڵێك کە هی خۆت نیە، یان منداڵێك کە بابی نیە پاڵی دەدەیە لای خوا، یانی: بە درۆ هەڵبەستنیان بۆ لەقەڵەم داوە.

# مانـای گشـتی ئایەتەکـان

خـوای پەروەردگـار لـەم نـۆ ئایـەتەدا، سـەرەتـا باسـی دۆسـتـانو خۆشـەویسـتـانو بەنـدە تـایبـەتییەکـانی خۆی دەکات، ئنجـا لەبـەرئەوەی ئێمـە لە مەسـەلە گرنگەکان دا، باسێکی تـایبەتمـان دەربارەی دۆسـتـانی خـوا بەدەسـتەوەیە، لێرە بـە خێرایی بەسـەریدا دەرۆیـن، خـوا دەفـەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾، وریابنەوە! بێگومان دۆستانی خـوا، نە ترسیان لەسـەرەو نە دڵتەنگـیش دەبن، نە خەمو پەژارەش دادەگرن، ترسیان لەسـەر نیـە بۆ داهاتوو، خـەمو پـەژارەش دانـاگرن بـۆ ڕابـردوو، ئـەوەی پەرێـزی پاکـە بێباکـە، بۆیـە بـۆ داهـاتوو ترسـیان نیـە، کەسێکیش ژیانەکەی بە پاکـیی گوزەراندبـێ، خەفـەتو مـەراق نـاخـوا بڵـێ: بریـا وام نەکردبـاو، وام کردبا، ئەوەی دۆسـتی خـوا بـێ، خـوا لەگەڵی بـە لوتـفو میهرەبـان بـێ ئـاوا دەبـێ.

ئنجا بـە دوو سیفەتی دیکەیان پێنـاسـەیان دەکـات: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ﴾، ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە، واتـە: بـە هـەموو ئـەو شـتـانەی پێویسـتە بڕوایان پـێ بهێنـرێو، پارێزیشیان دەکـرد، واتە: بـەردەوام لە خۆپاراسـتنو لـە لەخـۆ وریـابوونـدا بـوون.

ئنجـا سـیفەتێکی دیکەیـان ئەوەیـە: ﴿لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾، دڵخۆشـیو موژدەیـان بـۆ هەیـە لـە دنیـاو لـە دواڕۆژدا، دوایـی لـە مەسـەلە گـرنگەکان باسی دەکەین چـۆنە؟

﴿لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ﴾، گـۆڕان نیـە، بـۆ وشـەکانی خـوا، یـانی: بـۆ بڕیـارەکانی خوا، بڕیارەکانی خـوا هـەرگیز گـۆڕانیان بەسـەردا نـایەت، ﴿ذَٰلِكَ هُوَ

﴿ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾، ئا ئەوە بە مراد گەیشتنی مەزنە، (فوز) بریتیە لەوە كە ئینسان لە تەنگانەیەك دەرباز بێتو بچێتە دەشتاییەكەوەو، لە دەرووێكەوە بچێتە دەر، بۆیە گوتوویانە: (فوز) بریتیە لە بە ئاوات گەیشتن، بە مراد گەیشتن، سەركەوتن، سەرفرازیی، بە هەموو ئەو شتانە دەكرێ تەعبیر بكرێ، واتە: ئەو دۆستی خوا بوونە، سەركەوتنی هەرە مەزنو گەورەیە.

ئنجا ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەكات، دەفەرموێ : ﴿ وَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡۘ إِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًاۚ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾، با قسەی ئەوان، (قسەی ناحەزانو بێبڕوایان) دڵ تەنگت نەكات، (قسەكانیان بریتی بوون لە درۆو بوختانو بە درۆدانانو، لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشا كردن) بێگومان دەستڕۆیشتوویی‌و باڵادەستیی‌و هێزو توانا، تەنیا هی خوایەو، ئەو بیسەری زانایە.

مادام هەموو هێزو دەسەڵات هی خوابێ‌و، ئەویش بیسەرو زانابێ، واتە: ئەو هەم قسەی تۆ، هەم هی ئەوانیش دەبیستێ، حاڵی تۆو ئەوانیش دەزانێ، ئنجا هەر بەو عیززەتو دەستڕۆیشتوویەی خۆی، سزای نەیارەكانت دەداتو، یارمەتی تۆش دەدات.

پاشان خوا ﷻ دێتە سەر باسێكی دیكەو دەفەرموێ : ﴿ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِۗ ﴾، ئاگاداربن! هەرچی لە ئاسمانەكانو زەویدایە، هی خوایە، هەمووی موڵكی خوایەو خوا خاوەنیەتی، ﴿ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَۚ ﴾، وە ئەوانەی لە خوار خواوە، لە جگە لە خوا دەپاڕێنەوە، بە دوای هیچ هاوبەشان ناكەون، (چونكە هیچ هاوبەشێك بۆ خوا بوونی نیە، تاكو ئەوان شوێنی بكەون، ئەدی بە دوای چی دەكەون؟) ﴿ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ ﴾، ئەوانە تەنیا شوێن گومانو وەهمی خۆیان دەكەونو، ئەوانە تەنیا درۆ دەكەن.

کە دەڵێن: فلان کەسە، یان فلان لایەنە، یان فلان هۆکارە هاوبەشی خوایەو تکامان بۆ دەکات لە لای خوا، یانی: شتێکی بەدەستە، لەو شتانەی کە تەنیا بە خوا دەکرێن، ئا ئەوە بەس درۆیەکە دەیکەن و هیچ بنەمایەکی نیە.

ئنجا خوا ﷻ باسی کردەوەو سیفەتێکی دیکەی خۆی دەکات، کە ئینسان بەبێ ئەو سیفەتەی پەروەردگار ژیانی نەدەسووڕاو بەردەوام نەدەبوو، دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ﴾، (خوا) ئەو کەسەیە کە شەوگاری بۆ گێڕاون بە هۆکاری ئەوەی تێیدا پشوو بدەن و ئیسراحەت بکەن، ڕۆژگاریشی بۆ گێڕاون بە مایەی بینین، تاکو بتوانن جموجۆڵ و کاروکاسبی بکەن، یاخود ڕۆژگاری ڕۆشن کردۆتەوە، ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴾، لە ڕاستییدا لەوەدا نیشانە هەن، بۆ کەسانێك ببیستن، کەسانێك هەر ببیستن، لە دیاردەی جێگۆڕکەی ڕۆژو شەواندا، لەوەدا کە شەوگار بایی پشوویەکی باش دەکات و. ڕۆژگار بایی جموجۆڵ و کارو کەسابەتێکی باش دەکات، نیشانەکانی پەروەردگارێتی خوا دەبینن.

پێشتر گوتمان: ئەگەر بەهۆی هێزی ڕاکێشانی مانگەوە نەبووایە، زەوی زۆر بەخێرایی بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە، کە ئێستا بەهۆی هێزی ڕاکێشانی مانگەوەیە. زەوی بەخێرایی بە دەوری خۆیدا ناخولێتەوەو لە ماوەی بیست و چوار سەعات دا جارێك دەخولێتەوە، کە دابەش دەبێ بۆ شەوو ڕۆژ، ئەو ڕووەی بەرەو خۆرە دەبێتە ڕۆژ، ئەو ڕووەی دیکەی کە پشتی لە خۆرە، دەبێ بە شەو، کە دیارە ئەوانیش کورت و درێژیان دەبێ، ئنجا وەك باسمان کرد: ئەگەر بەهۆی هێزی ڕاکێشانی مانگەوە نەبووایە، زەوی هەر چوار سەعات جارێك بەدەوری خۆیدا دەخولایەوە، واتە: شەوو دوو سەعات و ڕۆژ دوو سەعات دەبوو، ئنجا بزانە ژیان و گوزەران چۆن دەبوو؟! هەر چوار سەعات جارێك شەوو ڕۆژ بە دوای یەکدا دەهاتن !!

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی قسەیەکی زۆر بێ بنەماو ئەفسانەیی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، کە لە ڕاستییدا تەنیا ئەو هاوبەش بۆ خوادانەرانە نا، کە بت و صەنەمیان دەپەرست، بەڵکو نەصرانیی و جوولەکەو زۆرێك لە بتپەرست و هاوبەش

بۆ خـوادانەرەکان لـە دنیـادا، گیـرۆدە بـوون بـەوەوە کـە رۆڵـە پاڵـدەنە لای خـوا، دەفـەرموێ: ﴿ قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا ﴾، وە گوتیـان: خـوا رۆڵەی پەیدا کـردوە، کـوڕ یـان کـچ، وەك لـە سـوورەتی ئەنعـام دا دەفـەرموێ: ﴿ وَجَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ الْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ وَخَرَقُوا لَهُ بَنِينَ وَبَنَاتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَنَّى يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُنْ لَهُ صَاحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٠٢﴾ ﴾.

واتـە: وە (هاوبەش بۆ خـوا دانەرەکـان) لە جنۆکـان هـاوبەشـیان بـۆ خـوا دانـان، لـە حـاڵێکدا کە هەر ئـەویش دروسـتی کـردوون، وە بـەبێ زانیـاریی کـوڕان‌و کچانیان بـۆی هەڵبەسـتن، (خـوا) پـاك‌و بـەرزە لـەوەی ئـەوان دەیڵێـن ﴿١٠٠﴾ داهێنـەری ئاسمانـەکان‌و زەوییـە، مـادام هـاوسـەری نەبـێ، چۆن رۆڵـەی دەبـێ! وە هـەموو شتێکی دروستکـردوەو بـە هـەموو شـتێك زانایـە ﴿١٠١﴾ ئـا ئەوەتـان خـوای پەروەردگـارتـانە، جگـە لـەو هـیچ پەرسـتـراو نیـن، وەکیل‌و مشـوورخـۆرە.

لێـرەش دەفـەرموێ: ﴿ سُبْحَانَهُ هُوَ الْغَنِيُّ ﴾، پاکـیی بـۆ وی، ئـەو (خـوا) بێـنیـازە.

کـێ رۆڵـەی دەبـێ؟ بەشـەر، چونکـە پێویسـتی بـەوە هەیـە لـە دوای خـۆی درێـژە بـە بوونـی بـدات، کـە بوونی خـۆی لە وەچـەکەیدا دەبینێتـەوە، بـەڵام خـوای پـەروەردگـار نـە نەبـوون (عـدم)ی بـە پێشـکەوتوەو، نـە نەبوونیشـی بـە دوادا دێ، ﴿ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ﴾، هەرچی لـە ئاسـمانەکان‌و زەویـدا هەیـە، هـەمووی هـی خـوایە، کەواتـە: هیچیان هـی ئـەوە نیـن، رەچەڵەکیـان بچێتـەوە سـەر خـواو ببنـە

ڕۆڵەی خوا، ﴿إِنْ عِندَكُم مِّن سُلْطَٰنٍۭ بِهَٰذَآ﴾، (إِنْ) لێرەدا بە مانـای (ما)ی (نـافیـة) دێ، واتە: هیچ بەڵگەیەکتـان لەوبارەوە لەلا نیە.

خوا نـاوی لە بەڵگە نـاوە (سلطان) لەبەرئەوەی دەستەڵاتی هەیە بەسەر عەقڵـداو تێیدا جێگیـر دەبێ. ﴿أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾، ئایا شتێك لەسـەر خوا دەڵێن کە زانیـارییتـان دەربارەی نیـە، ئایا چۆن بەبـێ زانیـاریـی قسە لەسـەر خوا دەکـەن؟ ﴿قُلْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ﴾، بلـێ: ئەوانەی درۆ بە نـاوی خـواوە هەڵدەبەسـتن، سـەرفراز نـابن، بە مراد نـاگەن، بەختـەوەر نـابن، ﴿مَتَٰعٌ فِى ٱلدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلْعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾﴾، (ژیـانەکەیان) گوزەرانێکی کەمی ژیانی دنیـایە، دوایی گەڕانـەوە تەنیـا بۆ لای ئێمەیـە، یان شـوێنی گـەڕانەوەیـان بۆ لای ئێمەیە، پاشـان سـزای تونـدو سـەختیان پـێ دەچێـژین، بەهـۆی ئـەوەوە کـە بێبـڕوا بـوون.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾﴾.

ئێمە لە ژێر ڕۆشنایی ئەم سێ ئایەتە موبارەکانەدا، کورتە باسێك لە چوار بڕگەدا لەبارەی دۆستانی خوا ﷻ (أولیاء الله)ەوە دەکەین:

## کورتە باسێک لەبارەی دۆستانی خوا (أولیاء الله)وە

**بڕگەی یەکەم:** پێناسەی دۆستانی خوا (أولیاء الله):

أ/ وشەی (ولیّ) لە ڕووی زمانەوانییەوە، بەم شێوەیە: {الأَوْلِيَاءُ جَمْعُ وَلِي، الْوَلْيُ: القُرْبُ وَالدُّنُوُّ، يُقَالُ تَبَاعَدَ بَعْدَ وَلْيٍ، (وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ) أَي مِمَّا يُقَارِبُكَ ... الـمُوَالاَةُ ضِدُّ الـمُعَادَاةِ، وَالَى بَيْنَهُمَا وِلاَءً أَي تَابَعَ، وَافْعَلْ هَذِهِ الأَشْيَاءَ عَلَى الوِلاَءِ أَي مُتَتَابِعَةً، وَتَوَالَى عَلَيَّ شَهْرَانِ، تَتَابَعَا)[1]، (أولیاء) کۆی

١) مختار الصحاح، ص٧٤٠.

(ولْي)یە، ئەویش لە (ولْي)یەوە هاتوە، كە بە مانای نیزیكیو لە تەنیشت بوونو لە پەنا بوون، دێ، دەگوترێ: (تَبَاعَدَ بَعْدَ وَلْيٍ) واتە: دوای ئەوەی نیزیك بوو، دووركەوتەوە، وە لە فەرمایشت دا هاتوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتی ئامۆژگاریی كردنی مێرد منداڵێك دا لە كاتی نان خواردن دا، فەرموویەتی: {يَا غُلَامُ! سَمِّ اللهَ تَعَالَى، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ} {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٠٦١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٠٢٢)}.

واتە: ئەی ڕۆڵە! ناوی خوای بەرز بێنەو، بە دەستی ڕاستت بخۆو، لەوەی كە لێتەوە نیزیكە، لەپێش خۆت بخۆ.

ئنجا دەڵێ: (مُوَالَاة)یش دژی (مُعَادَاة)ە، (مُوَالَاة) نیزیكیی، (مُعَادَاة)یش دووریی، كە هەر كەسێك بچێتە دۆڵێكو بەرانبەرێك، دەگوترێ: (وَالَى بَيْنَهُمَا وِلَاءً أَيْ تَابَعَ) واتە: بە دوای یەكدی داهێنان، وە دەگوترێ: (وَافْعَلْ هَذِهِ الأَشْيَاءَ عَلَى الوِلَاءِ أَيْ مُتَتَابِعَةً) ئەم شتانە لە نیزیكەوەو بەدوای یەك دا بیانكە، (وَتَوَالَى عَلَيَّ شَهْرَانِ، تَتَابَعَا) واتە: دوو مانگم لەسەر یەك بەسەردا هاتن.

ئنجا لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە، كە دەبێ كێ لە نیزیك پێشنوێژ خوێن ڕاوەستێ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێكدا فەرموویەتی: {لِيَلِيَنِي مِنْكُمْ أُولُوا الأَحْلَامِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ} {أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٣٥٢٧)، وَأَحْمَد برقم: (١٧١٤٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٣٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢١٧٢) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ}.

واتە: با ئەوانەتان كە خاوەنی عەقڵو تێگەیشتنی زیاترن، لە ڕیزی نوێژدا لە منەوە نیزیكتربن، دوایی ئەوانەی دوای وان، دوایی ئەوانەی دوای وان.

بۆئەوەی ئەگەر پێشەوا هەڵەیەكی كرد، كەمو كوڕییەكی بوو، شتێكی لەبیرچوو، ئەگەر ئەوەی كە شارەزایە، لە تەنیشتیەوە بێ، ئاسانتر دەتوانێ بۆی ڕاست بكاتەوەو هاوكاریی بكات.

كەواتە: مانای ڕیشەی وشەی (ولي) بریتیە لە نیزیك، ئنجا (أولياء الله) واتە: نیزیكانی خوا، ئەوە مانا زمانەوانییەكەی.

ب/ مانا زاراوەییەکەیشی بەو جۆرەیە : (ولـيّ) واتـە: کەسێك کە لە خوا نیزیکە، کەسێك کە خۆشەویستو دۆستی خوایە، ئنجا ئایا ئینسان بە چی دەبێتە دۆستی خوا؟ لە بڕگەی دووەمدا باسی دەکەین.

**بڕگەی دووەم : خەسڵەتە سەرەکییەکانی دۆستانی خوا ﷻ:**

دیارە ئێمە لەم سێ ئایەتەی کە خوێندمانن، پێنج سیفەتی سەرەکیی لە دۆستانی خوا باسی دەکەین، خوای پەروەردگار ئەم پێنج سیفەتەی لێ هەڵداون :

وشەی ﴿ أَلَآ ﴾، بۆ ئاگادارکردنەوەو وریاکردنەوەیە.

﴿ إِنَّ ﴾، ئامرازی جەختکردنەوەیە، بۆ دڵنیا کردنەوەیە، خوا دەفەرموێ: ئاگاداربن، دڵنیابن دۆستانی خوا:

١) ﴿ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ ﴾، جێگای مەترسیی نین، یاخود ترس ڕوویان تێناکات.

٢) ﴿ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾، دڵتەنگیش نابن، خەمو خەفەت ناخۆن، پەژارەدار نابن.

٣) ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە، بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ.

٤) ﴿ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴾، عادەتیشیان وابوو، هەمیشە پارێزیان دەکرد.

٥) ﴿ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾، ئەوانە دڵخۆشیو مۆژدەیان بۆ هەیە، لە ژیانی دنیاو لە دوارۆژدا.

دواییش دەفەرموێ :﴿ لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾، وشەکانو بڕیارەکانی خوا گۆڕانیان بۆ نیە، ئا ئەو جۆرە نیزیکییە لە خوا، ئەم جۆرە دۆست بوونەی خوا، سەرکەوتنو بە مراد گەیشتنی هەرە مەزنە.

ئێستاش با ئەم پێنج سیفەتە تۆزێك شی بکەینەوە:

١/ کە دەفەرموێ: ﴿لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾، واتە: کاتێك ئینسان زۆر دەبێتە دۆستو نیزیکی خوا، دەزانێ هەموو شتێك بەدەست خوای پەروەردگارەو، خوا خاوەنی ڕەهای هەموو شتێکە، کەواتە: ئەو مرۆڤە دەزانێ ئەوەی کە هەیەتی، وە ئەوەش کە لە دەوروبەریەتیو، خۆیشی هەمووی، خاوەنەکەی خوایە، بۆیە ئەگەر شتێکیشی لەدەست بچێ، مەترسیی نیە، چونکە دەزانێ لە بنچینەدا ئەو شتانە هی ئەو نین، هەر لە بنەڕەتدا خوا خاوەنی هەموو شتەکانە.

ئنجا خوای پەروەردگاریش کە خاوەنی ئەوپەڕی حیکمەتو ڕەحمەتو لوتفو میهرەبانییو کەرەمو بەخششەو، خاوەنی هەموو چاکەیەکە، شتێك ناکات بە زیانی ئەو بەندەیە تەواوبێ، بۆیە بۆ داهاتوو هیچ ترسیان لەسەر نیە، واتە: لەو شتانەی کە خەڵکی ئاسایی لێیان دەترسێن، ئەگەرنا، ئەوە مانای وانیە کە دۆستی خوا، لە هیچ شتێك ناترسێ، چونکە مووسا (علیه السلام) پێغەمبەرێکی پایە بەرزی خوایە، بەڵام کاتێك گۆچانەکەی فڕێ دەدات، دەترسێ، هەروەها کاتێك جادووگەرەکان گوریسو پەتو گۆچانەکانیان فڕێ دەدەن، خوا دەربارەی دەفەرموێ: ﴿فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾﴾ طە، مووسا لە ناخی خۆی دا ترسی لێ نیشت، یان دەفەرموێ: ﴿يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفْ إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿١٠﴾﴾النمل، واتە: ئەی مووسا! مەترسێ، پێغەمبەران لە خزمەت مندا نابێ بترسێن، کەواتە: مەبەست ئەوەیە: دۆستانی خوا لەو شتانە ناترسێن، کە خەڵك لێیان دەترسێن، بەڵام ترسی سروشتییو ئاسایی، ئەوە جیایە، مەبەست ئەوەیە لەوە ناترسێن لە دوارۆژدا شەرمەزاربن، عەیبداربن، یاخود لە ژیانی دنیا شتێکیان بەسەربێ، کە مایەی تووڕەبوونی خوا بێ، بۆچی لەوە ناترسێن؟ چونکە لە خو

نیزیکن‌و، خوا بە خاوەنی خۆیان دەزانن‌و، بۆخۆشیان خوا چۆنی پێ خۆشە، ئاوا ڕەفتار دەکەن.

٢/ ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾، دیسان ئەویش بە هەمان شێوە: دڵتەنگیش نابن، بەو شتە ئاساییانەی کە خەڵك پێیان دڵتەنگ دەبێ، خەڵك زیاتر بە چی دڵتەنگ دەبێ‌و خەم لە چی دەخوا؟ دیارە خەم لە بەرژەوەندیی دنیا دەخوات، خەم لە پارەو سامان دەخوات، خەم لە نەخۆشیی دەخوات، بەڵام خەمی ئەوان‌و ئەوەی کە ئەوان بۆی دڵتەنگ دەبن، شتێکی دیکەیە، ئەویش ئەوەیە ئەگەر چاکەیەکیان لەدەست چووبێ، خێرێکیان لەدەست چووبێ، خراپەیەکیان لەدەست قەوماببێ، ئا بەوە دڵتەنگ دەبن، نەك بەرژەوەندییەکی ئاساییان لەدەست چووبێ، پێی دڵتەنگ بن ! دەبێ ئاوا تەفسیر بکرێ، هەڵبەتە هەندێ لە زانایانیش گوتوویانە: ئەوانەی کە دەبن بە ئەهلی تەوحیدی ڕاستەقینە، حاڵەتێکیان بەسەردا دێ، کە هیچ جۆرە ترس‌و دڵەڕاوکەو خەم‌و پەژارە لە دڵ‌و دەروونیاندا نامێنێ، بەڵام وەك گوتم لەبەرئەوەی خوای زاناو شارەزا کە باسی پێغەمبەرانی کردوە (علیهم الصلاة والسلام)، خەمبارییشیان بەسەردا هاتوەو، تووڕەش بوونە، بۆ وێنە: خوا ﷻ لە چەندان شوێنی قورئان دا بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: دڵ تەنگ‌و خەمبار نەبێ :

﴿وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٨﴾﴾الحجر، یان دەفەرموێ :

﴿لَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾﴾الشعراء، واتە : خەریکە خۆت بفەوتێنی لەبەرئەوەی نابنە بڕوادار بڕوا ناهێنن، کەواتە: پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) ترس‌و خەم‌و دڵتەنگییان بووە، بەڵام ئەو ترس‌و خەم‌و دڵتەنگییەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) جیا بووە لە هی خەڵك، خەڵك بۆ بەرژەوەندییەکانی دنیا، ئەو خەم‌و خەفەت‌و ترسانەیان هەیە، بەڵام ئەوان ئەگەر ترسێکیان بووبێ، یان حاڵەتێکی جبیللی بەشەریی بووە، یاخود ترسیان لەوە بووە، خوا لێیان تووڕەبێ، یان ترسیان لە ئایندەی پەیام‌و بەرنامەی خوای پەروەردگار بووە، کە پێیدا ناردوون، واتە: خەمی مەعنەوییان هەبووە.

٣/ ئنجا سیفەتی سێیەمیان کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ: ئیمان بە خوا، بە فریشتەکانی، بە کتێبەکانی، بە ڕۆژی دوایی، بە پێغەمبەرانی، وە بە هەموو ئەوەی کە پێغەمبەران هەواڵیان پێداوە.

٤/ سیفەتی چوارەم دەفەرموێ: ﴿ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴾، ئەم تەعبیرە وادەگەیەنێ کە هەمیشەو بەردەوام خەریکی پارێزکردنو لە خۆ وریان بوون بوون، چەندان جار گوتوومانە: مەبەست لە پارێزکردن، پارێزکردنە لە هەر شتێك کە خوا پێی ناخۆشە، دیارە خوا بەگشتی دوو شتی پێ ناخۆشن:

١) ئەوەی کە پێویستی کردوە بیچوێنێ.

٢) وە ئەوەی کە قەدەغەی کردوە بیشکێنێ.

کەواتە: ﴿ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴾، واتە: خەریکی ئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرشانیان بوونو، بەردەوام خەریکی لە خۆ وریابوون بوون، بۆ ئەوەی توخنی ئەو شتانە نەکەون کە خوا پێی ناخۆشنو، ئەو ئەرکانەش نەچوێنن کە خوا پێویستی کردوون.

٥/ بۆ سیفەتی پێنجەمیان دەفەرموێ: ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ﴾، ئەوانە دڵخۆشییو موژدەیان بۆ هەیە لە ژیانی دنیاو دواڕۆژدا، دڵخۆش دەبن یانی چی؟ دوایی لە ژێر ڕۆشنایی هەندێ فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا ﷺ باسی دەکەین، بەڵام وەك تەبەری گوتوویەتی: لە ڕاستییدا واتای تەواوی (بشری)، واتە: شادمانییو دڵخۆشیی، هەموو جۆرەکانی دڵخۆشیی دەگەیەنێ:

١- دڵخۆشن بەوەی کە بەندەی خوان.

٢- بەوە دڵخۆشن کە خوا ئەو هەموو نیعمەتانەی پێ بەخشیون.

٣ـ دڵخۆشن بەوەی خوا هیدایەتی داون، بۆ سەر ڕاستە شەقامی خۆی.

٤ـ دڵخۆشن بەوەی خوا یارمەتی داون، خۆیان بە سیفەتە بەرزەکان برازێننەوە لە پێش هەموویانەوە، ئیمانو تەوحیدو، خۆیان لە سیفەتە خراپەکان بە دوور بگرن، لە پێش هەموویانەوە شیرکو کوفر.

٥ـ دڵخۆشن بەوەی خوا کاریان بۆ ئاسان دەکات.

٦ـ دڵخۆشن بەوەی خەڵکی ئیماندار خۆشی دەوێن.

٧ـ بەڵکو دڵخۆشن بەوەی ئەوەی کە دێتە ڕێی ئەوان هاتۆتە ڕێی پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام)، لە دژایەتیی کردنو پروپاگەندە بۆ کرانو، ناچار بوون بۆ کۆچو ئاوارەییو گیرانو ناڕەحەتیی.

لە دنیادا، بە هەموو ئەو شتانە دڵخۆش دەبن.

٨ـ لە دواڕۆژیشدا بە ڕەزامەندیی خوای پەروەردگارو بە بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوە دڵخۆش دەبن.

دوایی خوای دادگەرو قسە لەجێ دەفەرموێ: ﴿لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾، بۆچی وای فەرمووە؟

چونکە ڕەنگە شەیتان وەسوەسەیەك بۆ ئینسان بکات، بڵێ: باشە ئەوە ئەو مرۆڤانە لە دنیادا، دۆستی خوا بوون، چی خوا پێی خۆش بووە، وایان کردوە، بەڵام کێ دەڵێ خوا ئەو بڕیارەی خۆی جێبەجێ دەکات، زیندوویان دەکاتەوەو دەیانخاتە بەهەشت؟ بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: وشەکانی خوا یانی: بڕیارەکانو یاساکانی خوا، گۆڕانیان بۆ نیە، ئا ئەو جۆرە دۆستایەتییو نیزیکییە لە خوا، سەرکەوتنو بە مراد گەیشتنی هەرە مەزنە.

**بڕگەی سێیەم: چەند فەرموودەیەك دەربارەی دۆستانی خوا ﷻ:**

١/ {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ: (إِنَّ اللهَ تَعَالَى قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيهِ، وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحبَبْتُهُ، كُنْتُ سَمعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا، وَإِنْ سَأَلَنِي لَأُعْطِيَنَّهُ، وَلَئِنِ اسْتَعَاذَنِي لأُعِيذَنَّهُ)} {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦١٣٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣٤٧)، وَالبَيْهَقِيُّ برقم: (٢٠٧٦٩)، وَأَبُو نُعَيْم فِي (الحلية) (ج١، ص٤)}.

واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، خوای بەرز فەرموویەتی: هەر کەسێك دژایەتیی دۆستێکی من بکات، ئەوە من ئاگادارم کردۆتەوە بە جەنگ، (واتە: جەنگەکەی لەگەڵ منە)، وە بەندەکەم بە هیچ شتێك خۆشەویستتر لە لام لە من نیزیك نەبۆتەوە، بەوەی کە لە سەرم فەرز کردوە، وە بەندەکەم بەردەوام بەهۆی نەوافل (واتە: ئەو شتانەی کە زیادن لە فەرزەکان) لێم نیزیك دەبێتەوە، تاکو خۆشم دەوێ، کە خۆشم ویست، دەبمە ئەو بیستنەی کە پێی دەبیستێ‌و، ئەو بینینەی کە پێی دەبینێ‌و، ئەو دەستەی کە شتی پێ‌دەگرێ‌و، ئەو پێیەی کە پێی دەڕواتو، ئەگەر داوای لێکردم پێی دەدەم، ئەگەر پەنای پێهێنام، پەنای دەدەم.

دیارە کە دەفەرموێ: دەبمە گوێ‌و چاوو دەستی‌و پێی، مەبەست ئەوەیە کە ئەو ئەندامانە تەنیا بە پێی فەرمان‌و شەرعی خوا دەجووڵێن، هەرکات ئەوەندە باش، ئیمان لە دڵ‌و دەروونی ئینسان دا جێگیر بوو، ئەو ئیمانە دەچێ بۆ هەموو خانەکانی لەشیشی‌و، هەرچی گوناهو تاوان‌و سەرپێچییە، لە کەینوونەو بوونیدا نامێنێ.

٢/ {عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسولَ اللهِ! الرَّجُلُ يَعْمَلُ الْعَمَلَ فَيَحْمَدُهُ النَّاسُ عَلَيْهِ، وَيُثْنُونَ عَلَيْهِ بِهِ؟ فَقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ: (تِلْكَ عَاجِلُ بُشْرَى

الْمُؤْمِنِ)} {أَخْرَجَهُ الطيالِسي برقم: (٤٥٥)، وَأَحْمَد برقم: (٢١٤١٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٤٢)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٢٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣٦٦)}.

واتە: ئەبو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! پیاوێك كارێك دەكات، دوایی خەڵك مەدحی دەكەن‌و ستایشی دەكەن لەسەری، چۆنە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو مەدح‌و ستایشە، موژدەی خێرای ئینسانی بڕوادارە.

واتە: ئەو موژدەیەی كە خوا ﷻ دەربارەی دەفەرموێ: ﴿ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾.

٣/ لە فەرموودەیەكی دیكەدا كە بەڕاء خوا لێی ڕازی بێ، زۆر بە تەفصیلْ فەرموودەكەی هێناوە، بەڵام ئێمە شوێنی مەبەستی لێ دەهێنین: {عَنِ البَرَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُول الله ﷺ أَنَّ المُؤْمِنَ إِذَا حَضَرهُ المَوْت جَاءَهُ المَلَائِكَة بِيض الوُجُوه، بِيض الثِّيَاب، فَقَالُوا: أُخْرجِي أَيتها الرّوح الطَّيِّبَة! إِلَى روح وَرَيْحَان، وَرَبٍّ غَيْر غَضْبَان، فَتَخْرُجُ مِنْ فَمه كَمَا تَسِيلُ الْقَطْرَةُ مِنْ فَم السِّقَاءِ} {أَخْرَجَهُ الطَّيَالِسي برقم: (٧٥٣)، وَأَحْمَد برقم: (١٨٥٥٧)، وَقَالَ الهَيْثَمِيُّ (٣/ ٥٠): رجاله رجال الصحيح، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٧٥٣)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٧٠) وَقَالَ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْن).

واتە: بەڕاء خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیماندار كاتێك كاتی مردنی دێ، فریشتەكان دێن، دەموچاویان گەش‌و جوانە، جل‌و بەرگی جوان‌و سپییان لەبەردایە، پێی دەڵێن: ئەی ڕووحی پاك! بچۆ دەرێ بەرەو ڕەحمەتی خواو باغ‌و بێستان‌و بۆنی خۆش، وە بەرەو پەروەردگارێك كە لێت تووڕە نیە، ئنجا ئەو ڕووحە لە زاری ئەو ئینسانە دێتە دەرێ، وەك چۆن دڵۆپە ئاوێك لە دەمی كوندەو مەشكەیەك دێتە دەرێ.

٤/ {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو عَنْ رَسولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، قَالَ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يُبَشَّرُهَا الْمُؤْمِنُ، هِيَ جُزْءٌ مِنْ تِسْعَةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءاً مِنَ النُّبُوَّةِ، فَمَنْ رَأَى ذَلِكَ فَلْيُخْبِرْ بِهَا} {أَخْرَجَهُ البَيْهَقِي فِي (شعب الإيمان) برقم: (٤٧٦٤)، وَأَحْمَد برقم: (٧٠٤٤) قَالَ الهَيْثَمِي: رواه أحمد من طريق ابن لهيعة عن دراج وحديثهما حسن، وفيهما ضعف، وبقية رجاله ثقات، قال شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: دەربارەی ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْأَخِرَةِ ﴾، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەمە خەونی باشە، ئینسانی بڕوادار موژدەی پێ دەدرێ، بەهۆی ئەم خەونە باشەوە، وە بەشێکە لە چلو نۆ بەشی پێغەمبەرایەتیی، هەرکەسێك بینی، با هەواڵی پێبدات.

٥/ {سَالَ عُبَادَةُ بْنَ الصَّامِتِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، رَسولَ اللهِ ﷺ عَنْ هَذِهِ الآيَةِ: ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، فَقَالَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ: لَقَدْ سَأَلْتَنِي عَنْ شَيءٍ مَا سَأَلَنِي عَنْهُ أَحَدٌ قَبْلَكَ، هِيَ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُؤْمِنُ، أَوْ تُرَى لَهُ} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢٨١٩) وَقَالَ شُعَيْب الأرنؤوط: صحيح لغيره}.

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْأَخِرَةِ ﴾، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەی تۆ لێت پرسیم، لە پێش تۆدا، یان جگە لە تۆ کەس لێی نەپرسیوم، مەبەست پێی خەونی باشە، بڕوادار دەیبینێ، یان پێوەی دەبینرێ.

هەڵبەتە ئەوە هەمووی موژدەی باشی دنیایە، موژدەی دوارۆژیش وەك گوتم، ئەوەیە جارێ لەسەرە مەرگدا، ئاوا موژدەی پێ دەدرێ، لە قیامەتیش دا خوا دەربارەیـــــان دەفـــــەرموێ : ﴿ لَا يَحْزُنُهُمُ ٱلْفَزَعُ ٱلْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا يَوْمُكُمُ ٱلَّذِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾الأنبيـــاء، واتـــە: ترسی گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا، دڵتەنگیان ناکات، وە فریشتەکان پێشوازییان دەکەن، پێیان دەڵێن: ئەمە ئەو ڕۆژە بوو کە موژدەتان پێ دەدرا.

کەواتـــە: ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْأَخِرَةِ ﴾، هـــەموو ئەوانەو غەیری ئەوانەش دەگرێتەوە.

**<u>بڕگەی چوارەم</u> : پوختەی ڕاو تێگەیشتنم لەبارەی دۆستانی خواوە:**

بە ڕای بەندە، بە پێی تێگەیشتنم لەو سێ ئایەتەو، لە کۆی ئەو ئایەتانەی کە لەوبارەوە هاتوونو، لە کۆی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئامـاژەمان بە هەندێکیاندا، وە لە ژێر ڕۆشنایی قسەی زانایانو شەرعزانـانو لێکۆڵەرەوانـدا، ئاوا لە مەسەلەی دۆستیەتیو دۆستیاتی خوا تێدەگەم :

**١/ چۆنیەتی بوون بە دۆستی خواو لێ نیزیکبوونەوەی :**

سەرەتا مرۆڤ ئیمـانو عەقیدەیەکی ڕاستو دروستی بنیاتنـراو، لەسـەر بناغـەی بوونناسیو جیهانبینیەکی وردو ڕوون، کە لە ڕێی وەحیو دوایین نوسخەی هیدایەتی خواوە دەستگیر دەبێ، وەدەست دێنێ، کە بە دڵنیایی ئەوە هەنگاوی یەکەمی بوونە دۆستی خوایە، دیارە کە دەڵێین: ئیمان، یانی: بە هەر پێنج پایەکانیەوە :

١) بڕوا بە خوا، ئنجا ئەویش:

أ - بڕوا بە پەروەردگارێتیی خوا.

ب - بڕوا بە تەنیا پەرستراوێتیی خوا.

ج - بڕوا بە ناوو سیفەتە هەرە بەرزەکانی خوا.

٢) بڕوا بە فریشتەکانی خوا.

٣) بڕوا بە کتێبەکانی خوا.

٤) بڕوا بە ڕۆژی دوایی .

٥) بڕوا بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام).

وە بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ.

ئنجا لە ئەنجامی ڕۆچوونو جێگیربوونی ئیمانو عەقیدەیەکی ڕاستو دروست، کە ئەویش بنیات دەنرێ لەسەر بووناسییەکی وردو ڕوون، کە مەبەستمان لە بووناسیی ئەوەیە: مرۆڤ حاڵی بێ لەوەی، ئەم بوونە چییە؟ بە بەدیهێنەر (خالق)و دروستکراو (خلق)ەوە، ئەم دروستکراوانە کێ هێناونیەدی؟ چۆن هێناونیە دی؟ لە کوێوە هێناونیە دی؟ بۆچی هێناونیە دی؟ دەرەنجامیان چی دەبێ؟ مرۆڤ لەم بوونەدا شوێن (محل)ی (إعراب)ی چییە؟ ئەرکی چییە؟ ئایا ژیانی مرۆڤ هەر ئەم ژیانەیە، یان قۆناغی دیکەی بە دوادا دێن؟ کۆی ئەم بابەتانە پێیان دەگوترێ: (بووناسیی).

ئنجا لە ئەنجامی ئەوەدا کە مرۆڤ ژیرانە مامەڵە لەگەڵ بووناسیی دا دەکات. مادام ئەم بوونە، بە دیهێنەرو خاوەنێکی هەبێ، کە خوایە ﷻ و، مرۆڤی لە نێو ئەو دروستکراوانەدا داناوە، تاکو تاقیبکاتەوەو، کردوویەتی بە جێنشینی خۆیو، ئەمانەتی پێ سپاردوە دوایی زیندووی دەکاتەوەو لێی دەپرسێتەوە. ئەمەش ئەوە دەخوازێ کە ئینسان بەندایەتیی بۆ ئەو خوایە بکات.

ئنجا ئایا بەندایەتیی چۆن بۆ ئەو خوایە دەکرێ؟ بێگومان لە ڕێی ئەو هیدایەتو ئەو بەرنامەوە، کە خوا ناردوویەتی لە ڕێی پێغەمبەرانەوەو بە فریشتەکاندا.

ئنجا کاتێک ئەو ئیمانو عەقیدەیە لە دڵی ئینسان دا جێگیر دەبێ، بە ئەندازەی جێگیربوونی، سیفەتی تەقوا لە ئینساندا پەیدا دەکات، پارێزکاریی.

یانی: لەخۆ وریابوون، بە هۆشیارییەوە ژیان، وە بە شێوەیەك جووڵەكردن، كە جێگای پەسندیی و ڕەزامەندیی خوای بالادەست بێ‌و، خۆ پاراستن لە هەر شتێك كە خوا پێی ناخۆش بێ، چ شكاندنی قەدەغەكان، چ چواندنی ئەركەكان، ئنجا هەر كاتێكیش كە ئینسان بوو بە خاوەنی ئیمان‌و تەقوا ئەوكاتە ئەو حاڵەتە دەروونییە خراپانەی كە بە نەخۆشیی دادەنرێن، وەك : ترس لە داهاتوو، خەم‌و پەژارە بۆ ڕابردوو، دڵەڕاوكێ‌و دڵ دانەمەزران، ئەوانە هەموویان لادەچن.

بەڵام لێرەدا خوا ﷻ بە چی دەستی پێكردوە؟ بە سیفەتە دەروونییەكان دەستی پێكردوە، ئەگەرنا لە ئەسڵدا سیفەتی بنەڕەتیی‌و سەرەكیی، مەرجی گەورەو بنەڕەتیی، بۆ بوونە دۆستی خوا، بریتیە لە ئیمان بەو شێوەیەی كە باسمان كرد، پاشان تەقوا، دیارە تەقواش بەهۆی ئیمانەوە پەیدا دەبێ‌و، لە ئەنجامی ئیمان‌و تەقوادا، حاڵەتی دەروونی ئینسان پەیدادەبێ، چونكە كە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾، واتە: پێچەوانەی ئەومیان هەیە، پێچەوانەی ترس، بریتیە لە دڵنیایی، بێ باكیی، ئارامیی، وە پێچەوانەی دڵتەنگیی بریتیە لە شادمانیی، دڵخۆشیی.

٢/ بەرهەم و شوێنەوارەكانی بوونە دۆستی خوا :

زانایان گوتوویانە: (مَنْ كَانَ مُؤْمِنا تَقِيًّا، كَانَ لله وَلِيًّا)، واتە: هەر كەسێك بڕوادارو پارێزكار بێ، ئەوە دۆستی خوایە یانی: هەر كەسێك ئیمانێكی ڕاستی هەبێ، وە تەقوایەكی باشی هەبێ، هیچ گومانی تێدانیە، كە عەقڵ‌و دڵی پاك دەبنەوە، لەو شتانەی كە بە نەخۆشیی دادەنرێن، وە دەڕازێنەوە، بەو سیفەتانەی، كە سیفەتی ئەرێنیین لە ژیانی ئینساندا.

ئنجا لە ئاكامی ئەوەشدا، كەسێك بەو شێوە بژی، وە بەو شێوە مامەڵە بكات، پاشان بەو شێوەیەش بمرێ، شایستەی ئەوە دەبێ، كە خوای بە بەزەیی موژدەی پێ بدات، ئا ئەوانە دڵیان خۆش‌و شاد دەبێ، بە چەندان جۆر:

١) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ جُزْءٌ مِنْ ستةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ} {أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ برقم: (٣٠٤٦٠)، وَأَحْمَد برقم: (١٢٠٥٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٥٩٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٢٦٤)، وَالتِّرمِذِيُّ فِي (الشمائل المحمدية) برقم: (٤١٥)}.

واتە: خەونی باش بەشێکە لە چل‌و شەش بەشی پێغەمبەرایەتیی، واتە: جۆرێکە لە وەحی.

٢) خەڵکی باش پشتگیریی دەکەن‌و، هانی دەدەن‌و مەدحی دەکەن، وەك لە فەرموودەکەدا باسمان کرد، پێغەمبەر ﷺ ناوی لێنا: (تِلْكَ عَاجِلُ بشرى المؤمن).

٣) هەست دەکات لەسەر ڕێیەکە، بەرپێی خۆی دەبینێ، ئینسانی بڕوادار بەرپێی خۆی دەبینێ، دەزانێ کێ یە؟ دەزانی بۆچی هاتوە؟ دەزانێ بۆ کوێ دەچێ؟ دەزانێ کێ هێناویەتی؟ دەزانێ دەبێ چی بکات‌و چۆن بکات؟ حەلاڵ‌و حەرام، چاك‌و خراپ، ڕاست‌و چەوت، دۆست دوژمن، لەیەك جیا دەکاتەوە.

٤) هەڵبەتە ئینسانێك لەبەر ڕۆشنایی دا بژی، بە دڵ ڕۆشنیی بژی، بەتەئکید شادمان دەبێ، هەرچەندە لە دنیادا تووشی گرفتاریی‌و ناڕەحەتیی‌و دەردەسەریی دەبێ، بەڵام دڵنیایە کە هەمووی بۆ بە پاداشت دەنووسرێ.

٥) دڵنیایە کە خوایەك چاودێریی دەکات‌و ئاگای لێیەو پشتگیریی دەکات‌و. فریشتەکان لەگەڵێنی‌و کردەوەکانی هەڵوێستەکانی هەموویان تۆمار دەکرێن‌و. لە دواڕۆژدا زۆر بە باشتر لەو کردەوانەی خۆی، پاداشتی دەدرێتەوەو. ژیانێکی هەمیشەیی دەست دەکەوێ، لە خزمەت خوای پەروەردگارو. پێغەمبەران (عَلَيهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)دا.

٦) هەروەها دەگونجێ ئەو خۆشییە ئەوەبێ، کە فریشتەکان ئیلهامی بۆ بکەن‌و دڵی خۆش بکەن، وەك لە ئایەتەکەی سووڕەتی (فصلت)دا هاتوە: ﴿إِنَّ

ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾﴾.

٧) دەشگونجێ ئەو شادمانییە ئەوەبێ، کە ئینسانی ئیماندار تەماشای ئایەتەکان و فەرمایشتەکان دەکات: مەدحی ئیمانداران دەکەن، مەدحی ئەهلی تەقوا دەکەن، مەدحی دۆستانی خوا دەکەن و، باسی ئەو هەموو پاداشتە دەکەن، کە خوای بەخشەر دایناوە بۆ دۆستانی خۆی، باسی بەهەشت دەکەن، باسی ئەوە دەکەن کە بڕواداران لە دۆزەخ دەپارێزرێن، ئەوانە هەموویان مایەی دڵخۆشیی ئینسانی ئیماندارن لە دنیادا.

٨) لە دوارۆژیشدا دیارە دڵخۆشییەکەو موژدەکە ئەوەیە، کە مسوڵمان لەوێ بۆی دەردەکەوێ، کە ئەوەی پێغەمبەران (عَلَيهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هەواڵیان پێدا، هەمووی سەدا سەد ڕاست بوو: بەهەشت هەیە، دۆزەخ هەیە، پاداشت هەیە، سزا هەیە.

٩) لەوێ ـ لە دوارۆژدا ـ دەزانێ کە خوا لێی ڕازییە، چونکە بە ڕێیەکی ڕاستدا ژیانە دنیاییەکەی بردۆتە سەر.

بەڵێ من ئاوا لەم سێ ئایەتە تێدەگەم، کە خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٦٤﴾﴾.

واتە: وریابن! ئەها، بێگومان نیزیکان و خۆشەویستانی خوا، بەندە تایبەتەکانی خوا، نە ترسیان لەسەرە، نە خەم و پەژارە دادەگرن.

دڵو دەروونیـــان پـڕ نـەبووە لـە تـرسو حەژمـەتو خـەمو مـەراقو قەڵـەقو دڵەڕاوكـە، بەڵـكو دڵـێكی ئارامو پـڕ ئۆخـژنو ئارامیىو هێمنییـان هەیـە، ئـەوەی پەرێـزی پاكە، بێ باكـەو بەرچاوی ڕووناكە.

ئا ئـەوە حاڵەتە دەروونییـەكـەیانە، ﷺ وەك گوتـم: ئەو حاڵەتـە دەروونییـە، لەو دوو سیفەتەی دواتر پەیدا دەبـێ، كە دەفـەرموێ : ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴾، ئەوانـەی ئیمانیان هێنـاوەو پارێـزیـان دەكرد.

كـەواتە: بەهـۆی ئیمـانو پارێزكـارییەوە ئـەو حاڵەتـە دەروونییـە موبـارەكو گرنگەیان دەسـتگیـر دەبێ، كە ترسیان لەسەر نابێو خـەمو پەژارە داناگـرن، بەڵـكو پێچـەوانـەی ئەوانـەیـان دەبێ، كە بریتـیە لە: حاڵـەتە دەروونیـــیە باشـەكانی وەك: ئارامیىو هێمنـیىو ئۆخـژنو دامـەزراویىو بـڕوا قووڵـیىو، بەرچاو ڕوونیـی.

ئنجا سـەرەنجامەكـەشیان ئەوەیە : ﴿ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ ﴾، موژدەو دڵخۆشـیىو شـادمانییـان بـۆ هـەیـە، هـەم لـە دنیـاداو، هـەم لـە دواڕۆژیشـدا.

دوایـی خـوا ﷻ بـۆ دڵـنیـاكـردنەوەی دۆسـتـانی خـۆی، دەفـەرموێ: ﴿ لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ٦٤ ﴾، وشـەكانی خـوا، بڕیارەكـانی خـوا، یاساكانی خـوا، گۆڕانیـان بۆ نیـە، وە ئـەوەش {كـە ئینسـان خـاوەنی ئیمـانو تەقـوا بێ، خـاوەنی ئەو سـیفەتە بـەرزو جوانـانە بـێ، كە لـە ئیمـانو تەقـوا پەیدا دەبـن، كە نەمانی ترسو دڵەڕاوكـەیەو، نەمـانی خـەمو پەژارەیـەو، دڵـپـڕبـوونە لـە ئارامیـىو ئۆخـژنو، دڵـپـڕبوونـە لـە خۆشـیی} : ئـا ئـەوە: بردنـەوەو بـە مـراد گەیشـتنی هـەرە مەزنـە.

٣/ ڕەواندنەوەی چەند تەم ومژێك لەبارەی دۆستانی خواوە:

یەك : وەهمی زۆر لەبارەی دۆستانی خوا (أولیاء الله)وە لە زەمینی زۆر لە خەڵکدا هەیە، بۆ وێنە :

أ) هی وا هەیە کەسێکی شێت دەبینێ، کەسێکی گێلو حۆل دەبینێ، کە عەقڵی بە پاكو پیسیی ناشکێ، کەچی پێی وایە ئەوە دۆست (ولی)ی خوایە .

ب) یاخود کەسێك کە بابایەکی قۆڵبڕی ساختەچییەو لە بەرگی ئاییندا کەسابەت دەکات، خۆی بە دین دەڕژێنێو، لە جیاتی ئەوەی خەڵك هۆشیار بکاتەوەو لە ئایین تێیان بگەیەنێ، گێلیان دەکاتو فێڵیان لێدەکاتو، بەهرە وەردەگرێ لە بێئاگایی خەڵك، لە سادەیی خەڵكو هەڵیاندەخەڵەتێنێو، تەماعی لە دنیایەکەیاندا هەیە، بێئەوەی کە لە ڕووی دینەوە بەهرەمەندیان بکات، هەرچەندە ئەو لە دنیای خەڵکەکە بەهرەمەندە! ئەوە لە ڕاستییدا جۆرێکە لە کەسابەتو خۆ ژیاندن ! کەچی کەسانێك ئەو جۆرە مرۆڤانە بە دۆستی خوا دەزانێ ! بەڵام دۆستانی خوا، لە لووتکەی مەعریفەتو شارەزاییو زانیاریی دان، لە لووتکەی ئیمانو تەقوادان، لە لووتکەی دنیا بەکەمگرتن دان، لە لووتکەی ڕەوشتی بەرزو جوان دان، وە لە لووتکەی دڵسۆزیی بۆ خەڵك دان.

دوو : ئینسان بەبێ شارەزایی لە قورئانو سوننەت، نابێتە دۆستی خوا، دەبێ بزانێ: چۆن خوا بپەرستێ، تەنانەت ئەگەر خوێندەواریش نەبێ، دەبێ بزانێ حەڵاڵو حەرام چییە؟ دەبێ بایی ئەوەندە تێبگات، خوا کێیە؟ وە لەبارەی ڕۆژی دواییو فریشتەکانو کتێبەکانو پێغەمبەرانی خواوە، دەبێ بەرچاوی ڕوون بێ، دەبێ لە پایەکانی ئیمان حاڵی بووبێو، پایەکانی لە ئیسلام حاڵی بووبێ، بەڵام کەسێك کە شارەزای شەریعەت نەبێ، یان شارەزابێ، بەڵام بە شارەزاییەکەی ڕەفتار نەکات، وە تەماعی لە ماڵو

سامانی خەڵکدا هەبێ‌و، لە جیاتی ئەوەی خەڵك فێری دینداریی بکات، فێری ئەفسانەو داهێنان‌و لادان لە شەریعەتیان بکات‌و، خۆی لە لایان بکاتە شتێکی موقەددەس‌و پیرۆزو گەورە، وە بەهۆی بە پیرۆز گرتن‌و بە گەورەگرتنی ئەوەوە خەڵك تووشی شیرك ببن! لە ڕاستییدا ئەوە دوورترین کەسە لە دۆستایەتیی خوا.

سێ: دۆستانی خوا هەمیشە خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەکەن‌و، لە خەمی ئەوە دان، خوا ﷻ لە لای خەڵك بناسرێ، بە پاك‌و بەرزو گەورە بگیرێ‌ چۆن شایستەیە ئاوا بپەرسترێ‌و، بە هیچ جۆرێك نەك خۆی، تەنانەت پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ کە باشترین بەندەی خوایەو سەرووەری پێغەمبەرانە، وریا دەبن کە ئەویش لە زیهنی خەڵکدا نەچێتە ڕیزی خواوە ﷻ، بەڵکو تەنیا لە شوێنی خۆی دا بێ، کە سەرووەری پێغەمبەرانە. باشترین مرۆڤە، بەڵام هەر دروستکراوی خوایە، بەندەی خوایەو، هیچ کام لەو سیفەتانەی کە تایبەتن بە خوای پەروەردگارەوە، وەك: سەرخستن‌و ژێر خستن، شیفا بۆ هێنان، بەرزکردن‌و نزم کردن‌و، هەموو ئەو سیفەتانەی کە خوای باڵادەست تایبەتی کردوون بەخۆیەوە، ئەوانە هیچیان عایدی پێغەمبەر ﷺ نین.

بۆیە بەڕاستیی مسوڵمانان پێویستییان بە چاو بە خۆدا گێڕانەوەیەکی باش هەیە، لە ڕووی ئەم ئایەتانەوە، وە لە ڕووی فەرمایشتەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ، بۆ تێگەیشتنیان لە چەمك‌و واتای دۆستایەتیی خواو، دۆستانی خواو نیزیکان‌و خۆشەویستانی خوا ﷻ.

**مەسەلەی دووەم**: کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٦٥﴾﴾، ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ. هەر کەسێکیش کە بە ڕێی ئەودا، ڕێ دەکات‌و هەنگاو دەنێ، دەفەرموێ: با قسەی ئەوان تۆ دڵتەنگ نەکات، قسەی ئەوان کوفر بووە، گاڵتەکردن بووە، بە درۆ دانان

بووە، پڕوپاگەندەی خراپ بووە، قسەی ناڕێك بووە، بەرانبەر بە خوا ﷻ، بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ، بەرانبەر بە ئایینی خوای پەروەردگار... هتد.

خوا دەفەرموێ: با ئەو قسانە تۆ دڵتەنگ نەكات، بۆچی؟ دەفەرموێ : ﴿إِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴾، بێگومان باڵادەستیی و توانایی و زاڵبوون، تەنیا هی خوایە، ئنجا بەو عیززەت و باڵادەستییە، لەو كاتەدا كە حیكمەتی خوا دەیخوازێ، تۆ سەردەخات، پشتت دەگرێ، پاشان بەو عیززەت و توانایی و باڵادەستییەی خۆی، بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ نەیاران و دوژمنانی تۆدا دەكات، كە شایستەیانە.

وە ئەو بیسەری زانایە، دەزانێ چۆن پشتی تۆ دەگرێ، چۆن سەرت دەخات، چۆن پیلان و فێڵی ئەوانیش پووچەڵ دەكاتەوە.

زانایانی شارەزای قورئان خوێندن دەڵێن: پێویستە ئینسان لێرەدا بوەستێ، كە دەفەرموێ : ﴿ وَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡ ﴾، پێویستە لێرەدا بوەستین.

ئنجا بڵێین: ﴿إِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴾، چونكە ئەگەر قورئان خوێن نەوەستێ، مانایەكەی ئاوای لێدێ: با تۆ دڵتەنگ نەكات، ئەو قسەیان كە دەڵێ: باڵادەستیی تەنیا هی خوایە! كە بێگومان هەڵەیە، بگرە كوفرە، یانی: بۆئەوەی وا نەیەتە بەرچاو، كە ﴿إِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴾، گوتراو (مقول)ی ئەوانە، دەبێ لە دوای گوتنی : ﴿ وَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡ ﴾ ، با قسەی وان تۆ دڵتەنگ نەكات، بوەستی، دوایی بڵێی: ﴿إِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴾، بە دڵنیایی باڵادەستیی هەمووی هی خوایە ﷻ، ﴿هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾، ئەو بیسەری زانایە.

وشەی (العزة) كە ئەلیف و لام (ال)ی تەعریفی لەسەرە، مانای ومنێوخۆگرتن (إستغراق) دەگەیەنێ، واتە: هەرچی عیززەت و باڵادەستیی هەیە، هەمووی هی خوای پەروەردگارە.

وشەی (عـزة) پێشتـریش باسمان کـردوە، دەگوترێ: (أرضٌ عزاز) زەوییەکی پتەو، کە پاچی تێنەچێو چاك هەڵنەقەنرێ، (العَزِيزُ: أَي مَمْنُوعُ الجَانِبِ)، (عِزَّة)یش ئەو سیفەتەیە ﷻ وا لەو کەسە بکات، کەس نەتوانێ بەسەریدا زاڵبێو تێکیبشکێنێ.

**مەسەلەی سێیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٦٦﴾ ﴾، واتە: ئاگاداربن! ئەها! هەرچیو، هەر کەس لە ئاسمانەکانو لە زەویدا هەیە، هی خوایە، واتە: هەرچی خاوەن ئیرادەو عەقڵو هەستە، چونکە وشەی (مَنْ) بۆ خاوەن عەقڵان بەکاردێو، وشەی (ما) بۆ خاوەن عەقڵانیشو بۆ ئەوانەش کە هەستو شعورو هۆشیان نیە، بەکاردێ، هەموو ئەوانەی کە هۆشو شعووریان هەیە، لە مرۆڤەکان، لە فریشتەکان، لە جندەکان، لە دروستکراوەکانی دیکە، ئەگەر هەبنو ئێمە نەزانین، هەموویان هی خوان، خاوەنیان خوایە، ئنجا کەسێك خاوەن بێ، بۆ هەرچی خاوەن هۆشو عەقڵە، دیارە باشتر خاوەنی ئەو شتانەیە کە هۆشو عەقڵیان نیە، لە نێویاندا ئەو بتو صەنەمانەن، کە ئەوان دەیانپەرستن، ئنجا ئەو پەرستراوانە: مانگو خۆرن، دارو بەردن، ڕووەکن، ئاژەڵن، هەوای نەفسن، حیزبێکی بێ دینن، ڕژێمێکی طاغوتیین، هەر شتێکی هەن.

﴿ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَ ﴾، وە ئەوانەی کە لە خوار خواوە، لە جگە لە خوا، دەپاڕێنەوە، ئەوانە بە دوای هاوبەشان ناکەون، واتە: ئەوانە هاوبەشی خوا نین، کە ئەوانە لێیان دەپاڕێنەوە، چونکە هاوبەشی خوا، بوونی نیە، تاکو داوای لێ بکرێ، ئەدی ئایا ئەوان بە دوای چی دەکەون؟ دەفەرموێ: ﴿ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴾: ئەوانە بەس بە دوای وەهمو گومان دەکەون، بە خەیاڵی خۆیان، ئەو شتانە بە هاوبەشی

خـوا دادەنـێن‌و، پەرسـتنیان بـۆ ئـەنجام دەدەن، ﴿وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ﴾، واتـە: (وما هم) هـەردوو (إن)ەکـە، (نافیـة)ن، یانـی: ئەوانـە تەنیـا درۆ دەکـەن، چونکە هاوبەشەکان، تەنیا لە وەهم‌و خەیاڵی ئەواندا، هاوبەشی خـوان، ئەگـەرنـا لە دنیای واقیعدا بوونیان نیە.

وشـەی (ظـن) کـە پێشـتریش باسمـان کـردوە: زانینێکـە کـە ئەگـەری بەهەڵەداچوونیشی هەبێ، ئنجا جاری وایـە (ظـن) بـە مانـای یەقـین‌و دڵنیـاییش دێ، جـاری واش هەیە لەسـەر ئەسڵی واتـای خۆیەتی، لێرەدا بـە مانـای زانیارییـەکی هـەڵە دێ.

وشـەی ﴿يَخْرُصُونَ﴾، (الخَرْصُ: القَوْلُ بـالحَزْرِ وَالـتَّخْمِين)، واتـە: قسـەی گـۆتـرەو قـرساندن‌و قـەبلاندن، هـەروا بە مەزەنـدە بڵـێ: ئـەو شتە وایـە.

<u>مەسـەلەی چوارەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٧﴾﴾، واتـە: (خـوا) ئەو کەسـەیە [redacted] شـەوگاری بۆ گێـڕاون بە مایـەی ئەوە کە تێـیدا ئـارام بگـرن، تێیـدا پشـوو بـدەن، بخـەون، ڕۆژگـاریشی بۆ گێـڕاون بە بنیـەر...، واتـە: ئێـوە تێیدا بینەر دەبن، یاخود (مُبْصِرْ) واتە: ڕوونـاك، وەك دوایی باسی دەکەین.

خـاوەنی (التحريـر والتنـوير)[1] دەڵـێ: (وَصَـفَ النَّهَـارَ بالإِبْصَـارِ وَهُـوَ صِـفَةُ العُقَـلاَءِ، لأَنَّـهُ شَـيءٌ وَجُـودِيٌّ، بخِـلاَفِ اللَّيْـلِ، فَـإِنَّ ظُلْمَتَـهُ عَدَمِيَّـةٌ، فَاقْتَصَـرَ فِـي العِبْرَةِ بهِ عَلَى ذكْرِ الفَائِدَةِ الحَاصِلَةِ فِيهِ، وَهِيَ أَنْ يَسْكُنُوا فِيـهِ).

واتـە: ڕۆژگـاری بە بینین (إبصار) وەسـف کردوە، کە ئـەوە سیفەتی هۆشدارانە، چـونکە ڕۆژگـار سـیفەتێکی بـوونیی (وجـودي)یـە، بـە پێچـەوانەی شـەوگـارەوە، کـە تـاریکیی شـەو، سـیفەتێکی نەبوونییـە، واتـە: لـە ئـەنجامی نـەبوونی ڕوونـاکیی دا،

١) ج ١١، ص ٢٢٧.

تاریکیی پەیدا دەبێ، ئەگەرنا تاریکیی بوونێکی خودیی نیە، بۆیە لە باسی شەوێدا، تەنیا باسی ئەو سوودەی کە لێی وەردەگیرێ، کە بریتیە لە تێدا ئارامگرتن، کراوە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًا﴾، دەگونجێ مانایەکەی ئاوابێ: (مُبْصِراً صَاحِبُهُ) واتە: خاوەنەکەی، ئەوەی لە ڕۆژگاردایە، دەبینێ، وەك عەرەب دەڵێن: (نَهَارُهُ صَائِمٌ، ولَيلُه قَائِمٌ) واتە: ڕۆژگارەکەی بە ڕۆژوویەو، شەوەکەی شەونوێژ دەکات، یانی: لە ڕۆژگارەکەیدا بە ڕۆژوویەو، لە شەوگارەکەیدا شەونوێژ دەکات، بەڵام ئەوان ڕۆژوو گرتنەکەیان پاڵداوەتە لای ڕۆژەکەو، شەونوێژەکەیان پاڵداوەتە لای شەوەکە.

(قطرب) یەکێکە لە زانایان دەڵێ: (يُقَالُ: أَظْلَمَ اللَّيْلُ: صَارَ ذَا ظُلْمَة، وَأَضَاءَ النَّهَار: صَارَ ذَا ضِيَاء)، واتە: دەگوترێ: (أَظْلَمَ اللَّيْلُ) واتە: شەو بوو بە خاوەن تاریکیی، وە دەگوترێ: (أَضَاءَ النَّهَارُ) واتە: ڕۆژگارەکە ڕووناك بووەوە، یاخود (أَبْصَرَ النَّهَارُ) ڕۆژگارەکە بوو بە خاوەن بینین، لەبەر ئەوەی خەڵك تێیدا دەبینێ. کەواتە: (مُبْصِراً) واتە: (مُبْصَراً فِيهِ) واتە: تێیدا دەبینرێ، وەك پێشتر باسمان کرد.

هەڵبەتە ئەوە کە خوای کارزان شەوگاری بەو شێوە لێکردوەو، ڕۆژگاری بەو شێوە لێکردوە، وەك جاری دیکەش باسمان کردوە، لە ڕاستییدا ژیانی مرۆڤ بەبێ ئەوە نەدەگونجاو، نەدەسووڕا.

ئنجا وەك لە دەرسێکی پێشووتردا باسمان کرد: ئەگەر بە هۆی هێزی کێشندەی مانگەوە نەبووایە، لە جیاتی ئەوەی کە زەوی بە بیستو چوار سەعات جارێك بە دەوری خۆیدا، لە بەرانبەر خۆردا، بخولێتەوە کە دەبێتە هۆی پەیدا بوونی شەوو ڕۆژ، کە موعەددەل، دوازدە سەعات بە دوازدە سەعاتن، ئەگەرنا کورتو درێژییان دەبێ، وەك زانایانی گەردوونناس دەڵێن: ئەگەر بەهۆی هێزی کێشندەی مانگەوە نەبووایە، زەوی لە هەر چوار سەعات دا، جارێك بە دەوری خۆی دەخولایەوە، واتە: ئەو کاتە شەو دەبوو بە دوو سەعات، ڕۆژیش دەبوو بە دوو سەعات، ئنجا ئینسان با تەماشا بکات: چۆن ئەو کاتە ژیانی هەڵدەسووڕا؟ یان ئەگەر مانگ دوورتر

بووایە، بە تەئکید سووڕانەوەکەی هێواشتر دەبوو، واتە: لەجیاتی ئەوەی ڕۆژ دوازدە سەعات بێ، ڕۆژ دەبوو بە بیست، یان بیست و چوار سەعات، شەویش بە هەمان شێوە، ئەوکاتە بە تەئکید ئەو بارودۆخە گونجاوەی کە ژیانی مرۆڤی تێدا بەڕێوە دەچێ، لەسەر زەوی نە دەڕەخسا.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە دەرس و پەند وەرگرتن لە دیاردەی جیاوازیی شەوگارو ڕۆژگار زۆر ئاسانە، بۆیە خوا فەرموویەتی: ﴿... إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٧﴾﴾ بە دڵنیایی لەوەدا نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێک ببیستن، یانی: بەس ببیستن نیشانەو بەڵگەکانی پەروەردگارێتیی خوا لەو دیاردەیە دەبینن.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا ۗ سُبْحَانَهُ ۖ هُوَ الْغَنِيُّ ۖ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۚ إِنْ عِندَكُم مِّن سُلْطَانٍ بِهَٰذَا ۚ أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٨﴾﴾.

لەم ئایەتە موبارەکەدا، خوا قسەو دەعوایەکی کافرەکان دێنێ، دەفەرموێ: ﴿قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا...﴾، {هاوبەش بۆ خوادانەرەکان و کافرەکان بە گشتی} گوتیان: خوا ڕۆڵەی پەیدا کردوە.

وشەی (إتخاذ)، لە وشەی (أَخَذَ)یە، واتە: گرتی، (إتخذ) (إفتعل)یە لە (أخذ)، واتە: بە گرنگیی پێدان و بە هەڵبژاردنەوە ئەو شتەی گرت، کەواتە: (إتخاذ) وەک لە سوورەتی ئالی عیمران دا دەفەرموێ: ﴿... وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاءَ ... ﴿١٤٠﴾﴾، واتە: (يصطفي) واتە: وە شەهیدانتان لەنێودا هەڵبژێرێ.

وشەی: ﴿وَلَدًا﴾، (الوَلَدُ: يَستوِي فِيهِ الوَاحِدُ وَالجَمْعُ، وَيُوصَفُ بِالمَصْدَرِ) وشەی (وَلَدْ) تاک و کۆ دەگرێتەوە.

لە سوورەتی ئەنعام، لە ئایەتی ژمارە (١٠٠)دا خوا ﷻ ئەو قسەیان دێنێ، کە لە بەرگی پێنجی ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە بە تەفصیل، دەفەرموێ: ﴿...وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيۡرِ عِلۡمٖۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ۝١٠٠﴾، واتە: وە بۆیان هەڵتاشیو بۆیان دروست کرد، کوڕانو کچان بەبێ زانیاریی.

دەیانگوت: شەیتانەکان کوڕی خوان، فریشتەکان کچی خوان، لەوێ خوای پەروەردگار وەڵامێکی ددانشکێنیان دەداتەوە، کە پێشتر باسمان کردوە، لێرەش وەڵامێك دەداتەوە، لە پێنج بڕگەدا:

١) ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ﴾، واتە: پاکیی بۆ ئەو (خوا) .

(سُبْحَانَ: اسْمُ مَصْدَرٍ لـ(سَبَّحَ) إِذَا نَزَّهَ، نَائِبٌ عَنِ الفِعْلِ أَي: نُسَبِّحهُ تَسْبِيْحاً).

واتە: ئێمە خوا بە پاك دەگرین بە بە پاکگرتن، پاکیی بۆ خوا، بە پاکگرتن بۆ خوا، کە ڕۆڵەی هەبێو پێویستیی بە ڕۆڵە هەبێ.

٢) ﴿هُوَ ٱلۡغَنِيُّۖ﴾، خوا بێنیازە، خوا دەوڵەمەندە، (الغَنِيّ: المَوْصُوفُ بالغِنى فَعِيلُ لِلْمُبَالَغَةِ فِي فِعْلِ (غَنِي) عَنْ كَذَا)، وشەی (غنيٍّ) کەسێك کە بە دەوڵەمەندیی، بە بێ نیازیی مەدح دەکرێ، (فعیل)ە بۆ زێدەڕۆیی کردن لە ماناکەی دا، (غَنِيَ عَنْ كَذَا) واتە: بێ نیاز بوو، پێویستیی پێی نەبوو. دەوڵەمەند بوو، کەسی دەوڵەمەند پێویستی بە غەیری خۆی نیە.

٣) ﴿لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکانو هەرچی لە زەویدا هەیە، هی ئەوە، ئەوەش بەڵگەی بێ نیازییو دەوڵەمەندییەکەیەتی. ئنجا مادام ئەو خاوەنی هەموو شتێك بێ، هەموو شتێك دروستکراوی ویە. بۆیە هیچیان شایستەی ئەوە نین، بیانکاتە ڕۆڵەی خۆی، ئەسڵەن تەصەووڕ ناکرێ، کە خوای بێ وێنە ڕۆڵەی هەبێ.

٤) ﴿إِنْ عِندَكُم مِّن سُلْطَٰنٍ بِهَٰذَآ﴾، (إِنْ) بەمانای (ما النافیة)یە، یانی: (مَا عِنْدَكُمْ مِنْ سُلْطَانٍ بِهَذَا) وشەی (مِن) کە لەسەر (سلطان)ە، زیاد کراوە بۆ جەخت کردنەوەی لابردن (نفي)، یانی: (مَا عِنْدَكُمْ مِنْ أيِ سُلْطَانٍ بِهَذَا) ئێوە هیچ جۆرە بەڵگەیەك لەوبارەوە، شك نابەن {(إِنْ) نَافِيَة، و (مِنْ) زَائِدَة لِتَاكِيد النَّفِي بالإِستغْرَاق، أَي إِستغْرَاق نَفِي جَمِيع أَنْوَاع الحُجَّةِ عِنْدَكُمْ)، واتە: (إِنْ) بۆ لابردنو (من) بە مەبەستی جەختکردنەوەی لابردنەکە زیادکراوە بەوەخۆگرتن، واتە: وەخۆگرتنی هەموو جۆرەکانی بەڵگان، لەلاتان.

وشەی (سُلطان)یش پێشتر ئاماژەمان پێداوە، کە بۆ بەڵگە بەکارهاتوە، چونکە هەر کەسێك بەڵگەی بەدەستەوە بێ، دەستەڵاتی دەبێ بەسەر بەرانبەرەکەیدا، بەسەریدا زاڵ دەبێ، بێ قسەی دەکات، ئیلزامی دەکات، (بەڵگە)ش دەستەڵاتی هەیە بەسەر عەقڵو دڵو هۆشی ئینساندا، هەر کەسێك بە ئینصافو بە ویژدانەوە، مامەڵە لەگەڵ بەڵگەدا بکات، دەبێ تەسلیمی ئەو بەڵگەیە ببێ، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (لە هەقێ ئاو ڕادەوەستێ).

٥) ﴿أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾، ئەو هەمزە (أ)یە، هەمزەی پرسیارکردنی نکووڵیی لێکەرانەیە، یاخود بۆ سەرزەنشت (توبیخ)ە، واتە: ئایا شتێك لەسەر خوا دەڵێن: کە زانیارییتان لەبارەیەوە نیە، ئەوە شتێکی زۆر بێجێیە، کە لەسەر خوا شتێك بڵێی زانیارییت لەسەری نەبێ.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە حەرامو قەدەغەیە، ئینسان شتێك بە ناوی ئایینو خواوە بڵێ، بێئەوەی بەڵگەی بەدەستەوە هەبێ، شتێکت نەزانی، بڵێ: نازانم، پێشینی چاکمان ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێ بێ لەوبارەوە، زۆر خاکییانەو خۆ بە کەمگرانە، شتێکیان نەزانیبێ، گوتوویانە: نازانین، نەك هەر لەخۆوە قسەیەك بڵێنو هیچ شتێکیان لێ عاسێ نەبێ! وەك خەڵکی ئەم ڕۆژگارو زەمانە، کە زۆر دەربەست نین: ئایا بە ناوی خواوە ڕاست دەکەن، یان درۆ دەکەن، بۆیە وەڵامی هەموو پرسیارێك دەدەنەوە!

**مەسەلەی شەشەم:** خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَٰعٌ فِى ٱلدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلْعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾.

لە پێنج بڕگەدا ئەم دوو ئایەتە موبارەکە شی دەکەینەوە:

١/ ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴾، بڵێ: ئەوانەی درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن، سەرفرازنابن، ئەمە دەرخستنی تاوانەکەیە، کەواتە: ئەوانە درۆ بە ناوی خواوە دەکەن، درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن، کە دەڵێن: خوا ڕۆڵەی هەیە، یان خوا هاوسەری هەیە.

٢/ ﴿ لَا يُفْلِحُونَ ﴾، بێگومان سەرفراز نابن، بێ ئاکام دەبن، بە مراد ناگەن. ئەوەش سەرەنجامی تاوانەکەیانە.

٣/ ﴿ مَتَٰعٌ فِى ٱلدُّنْيَا ﴾، گوزەران و ڕابواردنێکی کەمی ژیانی دنیایە، ئەوەش باسی ئەم ژیانە دنیاییەیانە، کە زۆر کەم و زوو تێپەڕە.

٤/ ﴿ ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ﴾، دوایی گەڕانەوەیان هەر بۆ لای ئێمەیە، یاخود شوێنی گەڕانەوەیان، لەلای ئێمەیە، چونکە (مَرْجِع) هەم دەگونجێ چاوگ (مَصْدَر) بێ، هەم دەگونجێ ناوی شوێن (اسم مكان) بێ، گەڕانەوەیان بۆ لای ئێمە، یاخود شوێنی گەڕانەوەیان بۆ لای ئێمەیە.

٥/ ﴿ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلْعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴾، دوایی سزای توندو سەختیان پێ دەچێژین، بەهۆی ئەوەوە کە بێبڕوا بوون، بێبڕواییان دەکرد. واتە: خوا لەخۆوە سزایان نادات، بەڵکو کردەوەکانی خۆیانن، دێنەوە ڕێیان.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی نۆیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە چوار ئایەت، پێك دێ، ئایەتەکانی: (٧١ تا ٧٤) لەو چوار ئایەتەدا، خوای زاناو توانا، سەرەتا بە کورتیی بەسەرهاتی نووحو گەلەکەی دەگێڕێتەوە، کە لە ئەنجامی کەللەڕەقیی‌و بەردەوام بوونیان لەسەر کوفرو خراپەکاریی، چۆن لە تۆفانێکی بێ ئاماندا خنکێنران.

پاشان خوای پەنهانزان، ئاماژەیەکی کورتیش بە ڕەوانەکردنی پێغەمبەرانی دیکەی دوای نووح (علیه السلام) بۆ لای گەلەکانیان، دەکات، کە بە زۆریی هەڵوێستیان ناحەزانەو نەگونجاوانە بووەو، سەرەنجامیشیان سەر بە فەتارەت چوون بووە.

﴿ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ نُوحٍ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكُم مَّقَامِى وَتَذْكِيرِى
بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْتُ فَأَجْمِعُوٓا۟ أَمْرَكُمْ وَشُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُنْ أَمْرُكُمْ
عَلَيْكُمْ غُمَّةً ثُمَّ ٱقْضُوٓا۟ إِلَىَّ وَلَا تُنظِرُونِ ﴿٧١﴾ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ ۖ
إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٧٢﴾ فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيْنَٰهُ
وَمَن مَّعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَعَلْنَٰهُمْ خَلَٰٓئِفَ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۖ فَٱنظُرْ
كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم
بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ بِمَا كَذَّبُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ ۚ كَذَٰلِكَ نَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ
ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{وە هەواڵی نووحیان بەسەردا بخوێنەوە، کاتێک بە گەلەکەی گوت: ئەی گەلەکەم! ئەگەر مانەوەم لە نێوتانداو بیرخستنەوەم بۆ ئایەتەکانی خوا (بۆتان) لەسەر (دڵ)تان گەورەو قورسە، ئەوە من تەنیا پشتم بە خوا بەستوە، ئێوەش‌و هاوبەشەکانیشتان بێ دواخران بڕیاری خۆتان یەکبخەن، ئنجا با هیچ لێڵیی لە بڕیارتاندا نەبێ، پاشان کاری خۆتانم لە دژ بکەن‌و، چاوەڕێشم مەکەن ﴿٧١﴾ ئنجا ئەگەر پشتتان هەڵکرد (لە پەیامەکەم، هیچ بیانووتان نیە، چونکە) هیچ جۆرە کرێیەکم لێ داوا نەکردوون، کرێ (و پاداشت)م تەنیا لەسەر خوایەو، فەرمانم پێکراوە کە: لە گەردنکەچان بم ﴿٧٢﴾ ئیدی (قسەکەیان) بە درۆ دانا، ئێمەش خۆی‌و ئەوانەی لەگەڵی بوون، لە کەشتیی دا دەربازمان کردن‌و، کردمانن جێنشین (ی فەوتاوەکان)، ئەوانەشمان لە ئاودا خنکاند کە ئایەتەکانمانیان بە درۆ دانا، دەجا سەرنج بدە! سەرەنجامی وریاکەرەوانی ترسێنراو چۆن بوو! ﴿٧٣﴾ ئنجا دوای وی پێغەمبەرانێک (ی زۆر)مان بۆ لای گەلەکانیان ناردن، بە بەڵگە ئاشکرایەکانەوە چوونە لایان، بەڵام نەدەگونجا بڕوا بەوە بێنن، کە پێشتر بە درۆیان دانا بوو، بەو شێوەیە دڵی سنوورشکێنیان مۆر دەکەین ﴿٧٤﴾}.

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(وَٱتْلُ): (التِّلاَوَةُ: أَخَصُّ مِنَ القِرَاءَةِ، لاَ يُقَالُ تَلَوْتُ رُقْعَتَكَ، وَإِنَّمَا يُقَالُ فِي القُرْآنِ فِي شَيْءٍ إِذَا قَرَأْتَهُ، وَجَبَ عَلَيْكَ اتِّبَاعُهُ)، (تِلاَوَة) تایبەتترە لە (قِرَاءَة) ناگوترێ: (تَلَوْتُ رُقْعَتَكَ) واتە: کاغەزەکەی تۆم تیلاوەت کرد، بەڵکو (تَلَوْتُ) بۆ قورئان بەکاردێ، کە ئەگەر هەرشتێکت لێ تیلاوەت کرد، لەسەرت پێویست بێ شوێنی بکەوی.

( نَبَأَ ): (النَّبَأُ: خَبَرٌ ذُو فَائِدَةٍ عَظِيمَةٍ يَحْصُلُ بِهِ عِلْم، أَوْ غَلَبَةُ ظَنٍّ)، (نَبَأ)، بریتیە لە هەواڵێکی سوودبەخشی گەورە، کە زانیاریی، یاخود گومانێکی زاڵی پێ وەدەست بێ، تەنیا ئەو کاتە پێی دەگوترێ: (نَبَأ).

( كَبُرَ ): (كَبُرَ، عَظُمَ، وَالكَبْرُ: وَفْرَةُ حَجْمِ الجِسْمِ بِالنِسْبَةِ لأَمْثَالِهِ)، (كَبُرَ)و (عَظُمَ) واتە: گەورە بوو، مەزن بوو، (كَبْرُ) بریتیە لەوەی جەستەیەك بەنسبەت وێنەکانی گەورەتربێ.

( مَّقَامِى ): واتە: مانەوەی من، (مَقَام: مَصْدَرُ مِيمِيٌّ مُرَادِفٌ لِلْقِيَام: وَيُقْصَدُ بِهِ الشَّأْنُ وَالحَالُ)، (مَقَام) چاوگێکی میمییە، هاوواتای (قِيَام)ە، (قيام)یش لێرە مەبەست پێی حاڵو کاروبارە.

( فَأَجْمِعُوٓاْ أَمْرَكُمْ ) : (إِجْمَاع الأَمْرِ، العَزْمُ عَلَى الفِعْلِ بَعْدَ التَرَدُّد... وَيُقَال : جَاءوا وَأَمْرُهم جَمِيعٌ، وَالأَمْرُ : الشَّأْنُ، وَيُقْصَدُ بِهِ دَفْعُهُ وَأَذَاه)، (إِجْمَاع الأَمْر) بریتیە لەوەی دوای ئەوەی ئینسان دڵ لە دڵدانێکی بۆ دروست دەبێ، دڵی خۆی ساغ بکاتەوە، لەسەر ئەنجامدانی، دەگوترێ: (جَاءوا وَأَمْرُهم جَمِيعٌ) هاتنو هەموو

کارەکـەی خۆیـان ڕێکخســتبوو، مەبەسـت لـە (أمـر)یش حـاڵو باڵـە، لێـرەش دا مەبەست ئەوەیە کە: کاری خۆتان ڕێك بخەن لەسەر پاڵپێوەنانی منو ئەزیەتدانی من.

(غُمَّةً ) : لـێرە مەبەسـت پێـی داپۆشـینە، (الغَـمُّ: سترُ الشَيء، وَمِنْهُ الغَمَامُ لِكَوْنِهِ ساتِراً لِضَوْءِ الشَّمْسِ ... وَغُمَّةٌ: كُرْبَةٌ، غَمَّ يَغُمُّ غُمَّةً)، وشـەی: (غَمّ) بریتیـە لـە داپۆشـینی شتێك، هـەور پێـی دەگـوترێ : (غَمَامْ) لەبـەر ئـەوەی تیشکی خـۆر دادەپۆشـێ، (غُمَّـة)ش بەمانـای خەفـەت دێ، دەگـوترێ: (غَـمَّ، يَغُـمُّ، غُمَّةً).

(اَقْضُوٓاْ إِلَيَّ) : (اَقْضـوا: أمـرٌ مِـنَ القَضَـاءِ، وَيَحْتَمِـل الحُكْم أَوِ التنفيـذ، وَعُـدِّيَ بـ (إلى) لأَنَّهُ ضُـمِّنَ مَعْنَى الإيْصَالِ وَالإبْلاَغِ)، واتـە : (اَقْضوا)لە (قَضَـاء)ەوە هاتوە، واتە: چی لـە دەستتـان دێ بیکـەن لە دژم، کە دیـارە وشـەی (قَضَـاء) دەگونجـێ مەبەست پێی بڕیاربـێ، یان جێبەجێ کردنی بڕیار بـێ، بەڵام لێرە بۆیە بـە (إلـى) تەعەددای پێکراوە، چونکە مانـای گەیاندنو گەیشـتنی، خراوەتە نێـو.

( وَلَا تُنظِرُونِ ) : (الإنْظَـار : التأخِيـر)، دواخسـت، واتـە : دوام مەخـەن، چـاوەڕێم مەکـەن.

( أَجْرٍ ) : (الأَجْـرُ : العِـوَضُ الَّـذِي يُعْطَـى لأَجْـلِ عَمَـلٍ يَعْمَلَـهُ، أَخْـذُ العِـوَضِ)، (أَجْـر) بریتیە لەو قەرەبووەی کە کەسێك کارێکی کردوە بەهۆی کارەکەیەوە، دەیدرێتـێ، واتە: پاداشت.

(خَلَـٰٓئِفَ): (جَمْعُ خَلِيفَة، وَهُوَ اسْمٌ لِمَنْ يَخْلُفُ غَيْرَهُ)، (خَـلاَئِف) کۆی (خَلِيفَـة)یە، کە ئەویش نـاوە بۆ کەسێك کە لە شـوێنی کەسێکی دیکە دادەنیشــێ.

(وَأَغْرَقْنَا )؛ واتـە: خنکـاندمانن، (غَـرِقَ فِـي الـمَاءِ يَغْـرَقُ غَرَقـاً: غَلَبَـهُ الـمَاءُ فَهَلَـكَ بِالإِخْتِنَاقِ أَو كَادَ)، کەسێك کە ئاوی وەسەر دەکەوێ، ئنجا چ بخنکێ، چ نەخنکـێ، بەڵام ئاوەکە نوقمی کـردبـێ.

(ٱلْمُنذَرِينَ) : ترسێنراوان، وریاکراوان.

(نَطْبَعُ) : (الطَّبْعُ: الخَتْمُ، وَهُوَ استعَارَةٌ لِعَدَمِ دُخولِ الإِيْمَانِ قُلُوبِهِم)، (طبع) واتە: (ختم) یانی: مۆرکردن، کە خوازراوەتەوە بۆ ئەوە کە دڵیان ئیمانی نەچێتە نێوی.

(ٱلْمُعْتَدِينَ) : (الإِعْتِداءُ: افْتِعَالٌ عَنْ : عَدَا عَلَيْهِ، إِذَا ظَلَمَهُ...)، (إِعتداء) (افْتِعَال)ە، لە (عَدا) واتە: دەستدرێژیی کردە سەریْو ستەمی لێکرد.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ هەر لە سیاقی ئاراستەکردنی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ و شوێنکەوتووانو پەیڕەوانی دا، تاکو ڕۆژی دوایی، بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ دەوروبەریاندا، بۆ گەیاندنی پەیامی خواو، ئارام گرتنیان بەرانبەر ئازارەکانو، خۆڕاگریی لەبەردەم کۆسپو تەگەرەکاندا، لەم سوورەتە موبارەکەی (یونس)دا، بەسەرهاتی نووح (علیه السلام) بە کورتی ئاماژە پێدەدات، لە سێ ئایەتدا، لە ئایەتی چوارەمیاندا، ئاماژەش دەکات بە پێغەمبەرانی دوای نووح (علیه السلام) کە خوا پێغەمبەرانێکی زۆری ڕەوانە کردوون.

لە دوای ئەمە ئنجا باسی مووساو هاروون دەکات، صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، کە بۆ میسر بۆ لای گەلی فیرعەونی ناردبوون، بۆ ڕزگارکردنی گەلی چەوساوەی خۆیان، (بەنی ئیسرائیل) ئنجا ئاماژەیەکیش دەکات بە بەسەرهاتی پێغەمبەر یونوس صەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ.

﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي ﴾، واتە: وە هەواڵی نووحیان بەسەردا بخوێنەوە، کاتێك کە بە گەلەکەی خۆی گوت: ئەی گەلەکەم! ئەی خەڵکەکەم! ئەی ئەو کۆمەڵگایەی کە من لە نێوتاندام! ئەگەر مانەوەی من لە نێوتاندا، لەسەرتان قورسە، پێتان ناخۆشە، ﴿ وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ﴾، وە ئەگەر ئەوە کە من ئایەتەکانی خواتان دەخەمەوە بیر، لەسەر دڵتان گرانەو پێتان ناخۆشە کە: من دڵسۆزییتان بۆ بنوێنمو ئایەتەکانی خواتان بخەمەوە بیرو، لە نێوتان دا بمێنمەوە، بۆ ئەوەی بەهرەمەندتان بکەم لە وەحی خوای پەروەردگارو، بتانخەمە سەر ڕاستە ڕێی خوای بەخشندەو، واتان لێبکەم، کە واز لە ڕێی چەوت بێنن، واز لە کوفرو شیرك بێنن، واز لە ستەمو سیفەتی خراپ بێنن، وە ئەوە کە

من دەمەوێ : کۆمەڵگایەکی پاكو چاكو بەختەوەرتان هەبێ، کە دادگەریی تێدا بچەسپێنرێ، ئەگەر من بۆ ئەوە لە نێوتاندابم، ئایەتەکانی خواتان بخەمەوە بیر، کەچی ئێوە پێتان ناخۆشبێو لەسەر دڵتان قورسو زەحمەت بێ، ﴿فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْتُ﴾، ئەوە من تەنیا پشتم بە خوا بەستوە، {(الجار والمجرور) کاتێك پێش (فعل وفاعل) دەکەوێ، واتای کورت هەڵهێنان دەگەیەنێ} تەنیا پشتم بە خوا قایمە، پشتم بە هیچ شتێکی دیکە نەبەستوە، ﴿فَأَجْمِعُوٓاْ أَمْرَكُمْ وَشُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُنْ أَمْرُكُمْ عَلَيْكُمْ غُمَّةً﴾، ئێوەش کاری خۆتانو بڕیاری خۆتان کۆبکەنەوەو، هاوبەشەکانی خۆشتان کۆبکەنەوە، با هاوکارتان بنو، دوایی با بڕیارەکەتان هیچ لێڵیی تێدا نەبێو، دڵی خۆتانی لەسەر ساغ بکەنەوە، وەك شاعیر گوتوویەتی:

إذا كنت ذا رأي فكن ذا عزيمة          فإنَّ فساد الرأي أن تترددا

واتە: ئەگەر خاوەن عەقڵو بۆچوونی باش بووی، خاوەن عەزیمەتیش بە، چونکە ئەگەر ڕاوبۆچوونی باشت هەبێو نەتوانی جێبەجێی بکەی، عەقڵی باشو ڕاو بۆچوونی چاكو ڕاست بێ سوودە. بۆیە لێرە دەفەرموێ: دوایی با بڕیارو کارەکەی خۆتان هیچ لێڵیی لەسەر نەبێ، ﴿ثُمَّ ٱقْضُوٓاْ إِلَيَّ﴾، دوایی ئەو بڕیارەی خۆتان دەربارەی من، بدەن، یاخود بڕیارەکەتان جێبەجێ بکەن.

چونکە (ٱقْضُوٓاْ) بە هەرکام لە: بڕیاردانی حوکمەکەو، جێبەجێ کردنی حوکمەکەش دەگوترێ :

١/ وەك خوا دەفەرموێ : ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ... ﴿٢٣﴾﴾الإسراء، پەروەردگارت بڕیاری داوە، حوکمی داوە، کە جگە لەو هیچی دیکە نەپەرستن، لێرەدا (قضى) بە مانای بڕیاردانو حوکمە.

٢/ بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ١١ ﴾فصلت، لێرەدا (فَقَضَىٰهُنَّ) یانی: (نَفَذهن)، حەوت ئاسمانی جێبەجێی کردن، دروستی کردن لێرەش ئەگەری هەردوو لای هەیە، واتە: بڕیاری خۆتانم لە دژ بدەن، یاخود بڕیارەکەی کە داوتانە، جێبەجێی بکەن لە دژم، بۆیەش وشەی (قضى) بە (إلى) تەعەددای کردوە، یانی بیگەیەننە من، ﴿ وَلَا تُنظِرُونِ ﴾، واتە: وە چاوەڕێم مەکەن، مۆڵەتم مەدەن، چونکە (أَنْظِر) یانی: (أَخِّر) واتە: دوای خست، بەمانای ئیهمال کردنیش دێ.

واتە: لێرەدا نووح (علیه السلام) زۆر بە بێ‌منەتییو زۆر بە بێ‌باکییو بە لەخۆڕا دیتوویی، قسە دەکات، بۆچی؟

چونکە تەواو پشتی بە خوا بەستوە، بۆیە دەڵێ: چیتان نەکردوە، بیکەن، ﴿ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَمَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٍ ﴾، ئەگەر پشتتان هەڵکرد{ئێوە هیچ بیانوومیەکتان نیە بۆ ئەو پشت هەڵکردنە، کە پەیامو بانگەوازەکەی خوا کە بە مندا ناردوویەتی، قبووڵتان نەکرد} خۆ من هیچ کرێو پاداشتێکم لێ داوا نەکردوون، واتە: هیچ بیانووتان نیە، ﴿ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ﴾، پاداشتی من تەنیا لەسەر خوایە، ﴿ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴾، وە فەرمانم پێکراوە، کە لە گەردنکەچان بم بۆ خوا.

(مُسْلِمْ) واتە: گەردنکەچ بۆ خوا، واتە: من ملکەچو گەردنکەچی خوام، پاداشتی خۆشم هەر لەو داوا دەکەم، کەواتە: ئێوە هیچ بیانوویەکتان نیە، پەیامی خوا لە من وەرنەگرن.

﴿ فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ خَلَٰٓئِفَ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾، بە درۆیان داناو درۆیان پاڵدایە لا، ئێمەش خۆیو ئەوانەشی کە

لەگەڵیدا بوون، لە کەشتییدا هەموویانمان دەرباز کرد، وە کردمانن بە جێنشین، بە جێنشینی ئەو خەڵکەی کە خنکان، ئەوانەی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دانا، خنکاندمانن، نغرۆمان کردن، ژێر ئاومان خستن.

﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُنذَرِينَ﴾، سەرنج بدە! سەرەنجامی ترسێنراوان و وریاکراوان چۆن بوو، واتە: ئەوانە وریا کرانەوەو ترسێنران و هۆشداریان پێدرا، وەنەبێ بە بێئاگاییانە سزادرابن، بەڵکو ئاگادار کرانەوەو هۆشیار کرانەوەو ترسێنران، کەچی گوێیان پێ نەدا، تەماشا بکە! سەرەنجامیان چۆن بوو!

ئەمە ئاماژەیە بۆ خەڵکی کافری ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، وە خەڵکی کافری هەموو ڕۆژگارەکانی دیکە، کە ئێوەش پەند لە گەلی کەللەڕەق و نەسەلمێنی نووح وەربگرن، ئیمانداریـنە! ئێوەش دڵخۆش بن بە سەرەنجامی خۆتان، ئەگەر لە ڕێی خواوە بڕۆن، سەرەنجامتان وەك سەرەنجامی نووح و ئەوانەی کە لە خزمەتی دابوون، دەبێ، ئێوەش بە دڵنیایی سەرفرازو دەرباز دەبن، نەیارەکانیشتان بە مەرەدی گەلی نووح دەچن.

دوایی خوا لە کۆتایی دا دەفەرموێ : ﴿ثُمَّ بَعَثْنَا مِن بَعْدِهِ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَاءُوهُم بِالْبَيِّنَاتِ﴾، دوای وی پێغەمبەرانێکمان ڕەوانە کردن بۆ لای گەلەکەیان، بە بەڵگە ڕوون و ئاشکرایەکانەوە، بە موعجیزەکانەوە، بە بەڵگەیەکی واوە، کە بەرانبەرەکەیان دەستەوسان بکات، هاتن بۆ لایان، ﴿فَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا بِمَا كَذَّبُوا بِهِ مِن قَبْلُ﴾، بەلام نەدەگونجا بڕوا بە شتێك بێنن، کە پێشتر پێی بێبڕوا بوون، پێشتر کەی؟ ئەمە دوو واتایان بۆ لێکداونەوە :

١/ واتە: هەر لە سەرەتاوە کە پێغەمبەران هاتوون، ئەوانە هەڵوێستێکی بێبڕوایانەو بە درۆ دانەرانەو کەللەڕەقانەیان هەبووە، دوایی هەر لەسەر ئەوە بەردەوام بوون و نەیانتوانیوە دواییش بڕوا بێنن.

٢/ واتە: خوا ﷻ لێرەدا هەموو گەلو میللەتەکان، وەك یەك گەل تەماشا دەکات، هەموو پێغەمبەرەکانیش، وەك یەك پێغەمبەر، وە هەموو پەیامەکانیش، وەك یەك پەیام تەماشا دەکات، واتە: کە ئەوانەی پێشێیان بڕوایان نەهێنا، ئەوانەی دوای وانیش بڕوایان نەهێنا، چونکە لاسایی یەکدییان دەکردەوە، دەیانگوت: ﴿إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾﴾الزخرف، واتە: ئێمە باب و باپیرانمان لەسەر ڕێیەك بینیوەو هەر بە دوای وانیش دەکەوین، ئنجا لەبەرئەوەی بە لاسایی کردنەوەی کوێرانە، بە دوای یەك دەکەوتن، ئەگەر ئەوانی پێشێ بڕوایان نەهێنا، ئەوانی دواییش هەر چاویان لەوانی پێشێ کردو، بڕوایان نەهێنا، ﴿كَذَٰلِكَ نَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْمُعْتَدِينَ﴾، ئاوا مۆر بەسەر دڵی سنوور شکێنانو سنوور بەزێنانەوە دەنێین، کە لە بەرانبەر وەرگرتنی هیدایەتی خوادا، دڵیان مۆر بکرێو دابخرێ، بەهۆی هەڵوێستی خۆیانەوە، کردەوە خراپەکانی ئینسانن، کە هەستەوەرەکانی ئینسان پەك دەخەن، عەقڵی ئینسان پەك دەخەن، دڵی ئینسان تاریك دەکەنو، هێزی بیستنو بینینی پەك دەخەن، وەك پێشتریش چەندان جار باسمان کردوە.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە دەفەرموێ: ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡتُ فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ عَلَيۡكُمۡ غُمَّةٗ ثُمَّ ٱقۡضُوٓاْ إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ ٧١﴾، هەواڵی نووحیان بەسەردا بخوێنەوە، {بەسەر بڕواداراندا بە تایبەتیو. بەسەر خەڵکەکەدا بە گشتی، کە وا پێدەچێ، زیاتر مەبەست پێی خەڵکەکە بێ. بەڵام لە نێویاندا بە تەئکید ئەوانەی کە زیاتر لە گێڕرانەوەی ئەو بەسەرهاتانە بەهرەمەند بوون، بڕواداران بوون} کاتێك بە خەڵکەکەی خۆی فەرموو:

١) ﴿يَٰقَوۡمِ﴾، ئەی گەلەکەم! وشەی (قوم) بە کۆمەڵە خەڵکێك دەگوترێ ئنجا کە دەڵێ: ئەی خەڵکەکەم! کۆمەڵگایەکەم! یانی: منیش یەکێکم لە نێوە ویستوویەتی هەستو سۆزیان بجووڵێنێ، چونکە کەسێك لە نێو کۆمەڵێکدا بێ، ئەگەر تووشی سوودێك بن، ئەویش وەك وان بەهرەمەند دەبێو، ئەگەر تووشی زیانێك بن، ئەویش وەك ئەوان زەرەرمەندە، بۆیە: تەعبیری (یا قوم) یانی، من لە ئێوەو، ئێوەش لە منن، کەواتە: قسەکەم بە دڵسۆزانە لێوەربگرن.

٢) ﴿إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾، ئەگەر مانەوەم لە نێوتانداو بیرخستنەوەم بۆ ئایەتەکانی خوا (بۆتان) لەسەر (دڵ)تان گەورەو قورسە.

ئایەتەکانی خوا دەگونجێ مەبەست پێیان دێڕەکانی فەرمایشتی خوابێ، دەشگونجێ مەبەست نیشانەکانی خوابن، لە بوونەوەرو دەوروبەریاندا، کە لێرەدا هەر ئەم دوو مانایە هەڵدەگرێ، ئەگەرنا وشەی (آیات) موعجیزەکانی پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) دەگرێتەوە، واتە: ئەو دوو ئەرکەم هەن، کە لە ڕاستییدا دوو نیعمەتی گەورەن بۆ ئێوە:

یەکەم : لە نێوتانداو لەگەڵتان دەژیم.

دووەم : ئایەتەکانی خواتان دەخەمەوە بیر، ئنجا ئەگەر ئەوەتان پێ ناخۆشەو لەسەر دڵتان قورس و گرانە!

٣) ﴿فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْتُ﴾، ئەوە من تەنیا پشتم بە خوا بەستوە، ئێوەش ئەو چوار شتانە بکەن:

أ/ ﴿فَأَجْمِعُوٓاْ أَمْرَكُمْ وَشُرَكَآءَكُمْ﴾، بڕیاری خۆتان کۆبکەنەوەو قسەی خۆتان یەك بخەن، چونکە بڕیاری پەرش و بڵاو، بڕشتی نابێ، ئاو هەرچەندە زۆربێ، کە بڵاوبۆوە، ناتوانرێ ئاودێریی پێ بکرێ، یاخود دەبێتە هۆی وێرانکاریی، هەربۆیەش کاتی خۆی ئاشی ئاو هەبووە، ئاوەکەیان هەموو لە شوێنێك کۆ کردۆتەوە، تاکو ئاشەکە بگێڕێ.

﴿وَشُرَكَآءَكُمْ﴾، وە هاوبەشەکانیشتان کۆ بکەنەوە.

خوێنراویشەتەوە: (وَشُرَكَاءُكُمْ)، یانی: هاوبەشەکانیشتان با بڕیاری خۆیان یەك بخەن.

ب/ ﴿ثُمَّ لَا يَكُنْ أَمْرُكُمْ عَلَيْكُمْ غُمَّةً﴾، دوایی کارو حاڵ و هەڵوێستی خۆتان، بڕیارەکەتان، با هیچ لێڵیی تێدا نەبێ، چونکە بە لێڵیی بڕیار نادرێ، بیکەم، نەیکەم، وا بچێ، وا نەچێ، ئاوای بکەین، ئاوای نەکەین؟ ئاوا بڕیار نادرێ، بەرچاو ڕوونانە دڵی خۆتانی لەسەر ساغ و یەکلابکەنەوە، ئنجا بە بەرچاو ڕوونییەوە، بڕیاری خۆتان بدەن.

ج/ ﴿ ثُمَّ ٱقْضُوٓا۟ إِلَىَّ ﴾، دوایی بڕیاری خۆتان بەرانبەر بە من بدەن، یاخود جێبەجێی بکەن، وەك پێشتر باسمان کرد، (ٱقْضُوٓا۟) هەم بە مانای بڕیاردان دێ، هەم بە مانای جێبەجێ کردن دێ، کە لێرەدا بە هەردوو مانایان دێ، واتە: بڕیارەکە بدەن، کە دوایی جێبەجێ کردنیشی بەدوادا دێ، یاخود بڕیارەکە دوای ئەوەی کۆتانکردۆتەوە، جێبەجێی بکەن.

د/ ﴿ وَلَا تُنظِرُونِ ﴾، واتە : وە دوام مەخەن، کە بڕیارەکەم زوو بەسەردا نەدەن، هیچ چاوەڕێم مەکەن.

ئەمە وەك گوتم ئەوپەڕی ئازایەتیی‌و بێ منەتیی نووح (علیه السلام) دەگەیەنێ، دیارە پێغەمبەرێکی پایەبەرزی وەك نووح، وەك لە سووڕەتی عەنکەبووت دا هاتوە، خوا دەربارەی دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ العنكبوت، واتە: نووحمان نارد بۆ لای گەلەکەی، هەزار ساڵ جگە لە پەنجا، لە نێویاندا مایەوە (نۆسەدو پەنجا ساڵ لە نێویاندا مایەوە) خەریکی بانگەواز بوو، پێغەمبەرێکی پایەبەرز، خاوەنی ئەو هەموو صەبرو خۆڕاگرییە بووبێ، دیارە خاوەنی ئەو هەموو ئازایەتیی‌و جورئەتەش بووە، صەبرو خۆڕاگرییەکەی لە ترسان نەبووە، بەڵکو لە زێدەپەرۆشیی‌و بەزەییان بووە، هەر بۆیەش دوایی ئەو دوعا توندەی نووح (علیه السلام) لە گەلی خۆی کردوە، هیچ پێغەمبەرێکم نەبینیوە دوعای ئاوا توند لە گەلەکەی خۆی بکات، چونکە ئەو صەبرەی ئەو گرتوویەتی، کەس ئەو هەموو صەبرەی نەگرتوە، ئەو هەموو ماوە درێژە، کە دوایی خوا ﷻ لە سووڕەتی (نوح)دا لێی دەگێڕێتەوە، کە ئەگەر تەمەن باقی بێ دەیگەینێ، دەڵێ : ﴿ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟

إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾﴾، واتە: نووح گوتی : پەروەردگارم! یەك خانوونشینی کافر لەسەر زەوی مەهێڵە، چونکە ئەگەر لێیان بهێڵییەوە بەندەکانت گومڕا دەکەن‌و، تەنیا وەچەی تاوانباری سپڵەو بێبڕوایان لێ پەیدا دەبێ.

بەڵێ لەبەرئەوەی زۆرترین خۆڕاگریی هەبووە لەسەریان، داوای لە خوای کارزان کردوە، توندترین سزایان بدات، کە ئەوە بوو خوای دادگەریش سزای دان‌و، کەسیش وەك گەلی نووح، بەو شێوەیە بنەبڕو قڕەبڕ نەبووەو، خوا سەر زەمینی لێ پاك کردوونەوە.

**مەسەلەی دووەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴿٧٢﴾﴾.

واتە : ئنجا ئەگەر پشتتان هەڵکرد (لە پەیامەکەم)

{ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە : ئێوە هیچ بیانوویەکتان نیە، هیچ پاساوێکتان نیە کە پشتم تێبکەن، چونکە هیچ بارگرانییەکم بۆ ئێوە نیە، هیچ جۆرە کرێیەکم لێ داوا نەکردوون، هیچ ناڕەحەتییەکم بۆتان نیە، وە پاشان من یەکێکم لە خۆتان‌و، دڵسۆزم بۆتان}، ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴿٧٢﴾﴾، کرێ‌و پاداشتی من تەنیا لەسەر خوایە، واتە: لەسەر هیچ کەسێکی دیکە نیە، دڵ لە دڵ مەدەن، بڵێن: ئەگەر بە دەم بانگەوازەکەیەوە بچین‌و پەیامەکەی لێ وەربگرین، دوایی دەڵێ : وەرن دەی من گەورەو سەرۆکتانم، هیچ چاوەڕوانییەکم لێتان نیە، بەس دەمەوێ خۆتان باش بن، ﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾، فەرمانیشم پێکراوە کە من لە گەردنکەچان بم، لە ملکەچان بم (بۆ خوا).

**مەسەلەی سێیەم** : خوای پەروەردگار سەرەنجامەکەیان دەخاتەڕوو، زۆر بە کورتی هێناویەتی، دەفەرموێ : ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيْنَاهُ وَمَن مَّعَهُ فِي الْفُلْكِ وَجَعَلْنَاهُمْ

خَلَٰٓئِفَ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ ﴾،

**واتە: بەڵام بە درۆیان دانا، ئێمەش خۆیو ئەوانەی لەگەڵی بوون، لە کەشتیی دا دەربازمان کردنو، کردماننە جێنشینو جێگرەوەی ئەو گەلە بێبڕوایەی کە بڕوایان پێ نەهێنا.**

**خوا تۆفانێکی بێ ئامانی بۆ ناردن :** ﴿ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ ﴾**، ئەوانەشمان لە ئاودا خنکاندو ژێر ئاومان خستن، کە ئایەتەکانمانیان بە درۆ دانا، دەجا سەرنج بدە! سەرەنجامی وریاکەرەوانی ترسێنراو بیانوو بڕکراوان، چۆن بوو!**

**هەڵبەتە ئێمە بەسەرهاتی نووحو گەلەکەیمان لە سوورەتی ئەعرافیشدا شتێك باس کردوە، خوا پشتیوان بێ لە سوورەتی (هود)دا درێژەکەی دێنین.**

**<u>مەسەلەی چوارەم</u>، کە دەفەرموێ :** ﴿ ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ رُسُلًا إِلَىٰ قَوۡمِهِمۡ فَجَآءُوهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُۚ كَذَٰلِكَ نَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾.

**دوایی لە دوای وی (واتە: لە دوای نووح) پێغەمبەرانێکی زۆرمان بۆ لای گەلەکانیان ناردن، بە بەڵگە ئاشکرایەکانەوە چوونە لایان.**

**وەك ئەوە کە هەموویان یەك گەل بووبن، ئەگەرنا دیارە هەر پێغەمبەرێك بۆ لای گەلێك چووە، یان جاری وایە چەند پێغەمبەرێك بۆ لای یەك گەل، یان کۆمەڵگا چوون، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ ئاوا پێشان دەدات، کە هەموویان یەك گەل بووبن، لە دوای نووح.**

**جاری دیکەش باسمان کردوە: خوا ﷻ هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە، مەگەر موعجیزەو بەڵگەیەکی داوەتێ بۆ ئەوەی بەرانبەرەکانی دەستەوسان بکات، پێیان**

بسەلمێنێ کە ڕاست دەکاتو پێغەمبەری خوایە، ئنجا موعجیزەی هەر کام لە پێغەمبەران، بە پێی ئەو هەلو مەرجو بارودۆخە بووە، کە ئەو خەڵکو کۆمەڵگایە تێیدا ژیاونو، بەگوێرەی ئاستی فیکریو شێوەی کلتوورو فەرهەنگیان بووەو، بۆ ئەوان مایەی قەناعەت هاتن بووەو، بۆتە مایەی ئەوە کە دڵنیابن ئەو کەسەی دەڵێ: پێغەمبەری خوام، ڕاست دەکات، چونکە شتێکی هێناوە، کە لە توانای بەشەردا نیە.

ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە کە خوا ﷻ لێرەدا دەفەرموێ : ﴿فَمَا كَانُواْ لِيُؤْمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ بِهِۦ مِن قَبْلُ﴾، بەلاّم نەدەگونجا بڕوا بەوە بێنن، کە پێشتر بە درۆیان دانابوو، واتە نەك هەر بڕوایان نەهێنا، بەڵکو هەر نەدەگونجا بڕوا بێنن!

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە دوای ئەوەی مرۆڤ بە خراپەکاریی دا زۆر ڕۆدەچێ، ڕێی گەڕانەوە لە خۆ دەگرێ، وەك جاری دیکەش نموونەم هێناوەتەوە: مرۆڤ کە لەسەر لێژاییەك ڕادەوەستێ، یان لەسەر قەراغی باتلاّغێك (واتە: قوڕو لیتاوی نەرم)، هەتا دەخزێ، بەدەست خۆیەتی، بەلاّم کە خزا، بەدەست خۆی نیە، گوناحو تاوانیش وایە، بۆیە لێرەدا دەفەرموێ : ﴿فَمَا كَانُواْ لِيُؤْمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ بِهِۦ مِن قَبْلُ﴾، نەدەگونجا بڕوا بە شتێك بێنن، کە پێشتر پێی بێبڕوابن.

کە ئەمە دوو واتای هەن :

١/ گەلە دوایینەکان نەدەگونجا ئیمان بێنن، (ئەو گەلانە هەموویان وەك یەك گەل حیساب کراون) ئەوانەی دوایی نەدەگونجا بڕوا بە شتێك بێنن، کە ئەوانەی پێشێ پێی بێبڕوابوون.

٢/ یاخود هەر گەلێك کە لە سەرەتاوە کوفری کردوە، دوایی نەیتوانیوە بگەڕێتەوە، وەك وێنەکەم بۆ هێنایەوە.

لە کۆتـایی دا خـوا ﷻ دەفـەرموێ : ﴿ كَذَٰلِكَ نَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾، ئـا بەو شـێوەیە دڵی سنوورشکێنـانو سنووربەزێنـان مـۆر دەکـەین، مۆرێکـیان بەسـەر دڵـەوە دەنێـیـن، کە نەتـوانن بـڕوابێنـن.

هـەڵبەتـە لێرەدا خـوا ﷻ باسی یاسـایەکی خـۆی دەکات، ئەگەرنـا خـوا سـتەم لـە بەنـدەکان ناکــات، بـەڵام یاسـای خـۆی بەسـەریاندا دەچەسـپێـنـێ، بـۆ وێنـە: ئەگـەر کەسێك ژەهـر بخوات، دوایـی ژەهرەکە بیکـوژێ، دەکرێ پێی بڵـێی تۆخـۆت ئـاوات بەخۆت کـرد، یانی چی؟

یانی یاسایەکت لەسەرخۆت جێبەجێ کـرد، یان کەسێك کەمتەرخەم بێ لـەوەی خۆی بپـارێـزێ لە سـەرماو گەرما، دوایی تووشی نەخۆشییو دەردو ئازار ببێ، یـانی : یاسای خـوای بەسـەردا چەسـپیوە، ئنجـا ئەگەر خـوا بفەرموێ : وام لـێکـرد، یـانی بە پێـی یاسـای من وای لـێهـاتوە.

سُبْحَانَكَ اللّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان نۆزدە (١٩) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی : (٧٥ تا ٩٣)، کە لە حەوت بڕگەدا باسی بەسەرهاتی مووساو هارۆونی برای و گەلەکەیان و، فیرعەون و دارو دەستەکەی دەکات:

١- ڕەوانەکردنی مووساو هارۆونی برای بۆ لای فیرعەون و دارو دەستەکەی، بە مەبەستی دەربازکردنی گەلەکەیان، بەڵام یاخییبوونی فیرعەون و تۆمەتبارکردنی مووسا بە جادووگەریی..

٢- داوا کردنی فیرعەون بە کۆکردنەوەی جادووگەران و بەکارهێنانی جادووەکەیان لە دژی مووساو هارۆون و، بێ باکیی مووسا لێیان.

٣- بڕواهێنانی کۆمەڵێکی گەنج و تازە پێگەیشتووی بەنی ئیسرائیل بە مووساو ئامۆژگاریی کردنی مووسا بۆیان، کە خۆڕاگربن.

٤- سروش کردنی خوا بۆ مووساو هارۆونی برای، کە جێگاو ڕێگای تایبەت و نهێنییان هەبێ و، سەرگەرمی خواپەرستیی بن.

٥- داواکردنی مووسا لە خوا کە: سامانی فیرعەونییەکان بفەوتێنێ و دڵیشیان ڕەق بکات، لە بەرانبەر ئیمان هێناندا..

٦- پەڕاندنەوەی بەنی ئیسرائیل لە دەریاو، خنکاندنی فیرعەون و سوپایەکەی و ئیمان هێنانی ناچارییانەی فیرعەون و، ڕەتکرانەوەی لەلایەن خواوە هەروەها دەربازکردنی لاشەی فیرعەون، تاکو ببێتە پەند بۆ دوای خۆی.

٧- نیشتەجێکردنی بەنی ئیسرائیل و کەوتنە نێو نازو نیعمەت، کەچی دوای زانیاریی و بەرچاو ڕوونییان، کەوتنە نێو گێژاوی ڕاجیایی و دووبەرەکیی ... .

﴿ ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِم مُّوسَىٰ وَهَٰرُونَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ بِـَٔايَٰتِنَا فَٱسۡتَكۡبَرُواْ
وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰذَا لَسِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٧٦﴾
قَالَ مُوسَىٰٓ أَتَقُولُونَ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمۡۖ أَسِحۡرٌ هَٰذَا وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّٰحِرُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُوٓاْ
أَجِئۡتَنَا لِتَلۡفِتَنَا عَمَّا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا نَحۡنُ لَكُمَا
بِمُؤۡمِنِينَ ﴿٧٨﴾ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ٱئۡتُونِي بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٖ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم
مُّوسَىٰٓ أَلۡقُواْ مَآ أَنتُم مُّلۡقُونَ ﴿٨٠﴾ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئۡتُم بِهِ ٱلسِّحۡرُۖ إِنَّ ٱللَّهَ
سَيُبۡطِلُهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصۡلِحُ عَمَلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٨١﴾ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ
ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٨٢﴾ فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٞ مِّن قَوۡمِهِۦ عَلَىٰ خَوۡفٖ مِّن فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِمۡ
أَن يَفۡتِنَهُمۡۚ وَإِنَّ فِرۡعَوۡنَ لَعَالٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٨٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوۡمِ
إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسۡلِمِينَ ﴿٨٤﴾ فَقَالُواْ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَا رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا
فِتۡنَةٗ لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٥﴾ وَنَجِّنَا بِرَحۡمَتِكَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ
مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوۡمِكُمَا بِمِصۡرَ بُيُوتٗا وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةٗ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَۗ
وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيۡتَ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةٗ وَأَمۡوَٰلٗا
فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِكَۖ رَبَّنَا ٱطۡمِسۡ عَلَىٰٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ
قُلُوبِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴿٨٨﴾ قَالَ قَدۡ أُجِيبَت دَّعۡوَتُكُمَا فَٱسۡتَقِيمَا

وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٨٩﴾ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتۡبَعَهُمۡ
فِرۡعَوۡنُ وَجُنُودُهُۥ بَغۡيٗا وَعَدۡوًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا
ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ وَكُنتَ
مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗۚ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ
ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾ وَلَقَدۡ بَوَّأۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مُبَوَّأَ صِدۡقٖ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ
ٱلطَّيِّبَٰتِ فَمَا ٱخۡتَلَفُواْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقۡضِي بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ
فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾.

# مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

{پاشـان لـە دوای ئـەوان (پێغـەمبـەران) مووسـاو هارووونمـان بـە نیشانەکـانمانەوە نـاردنە لای فیـرعەونو دەسـتەو دایەرەکـەی، کەچـی خۆیـان بەزلگـرتو کۆمەڵـێکی تـاوانبار بوون ﴿٧٥﴾ ئنجا کاتێك (بەرنـامەی) هەقیـان لەلایەن ئێمـەوە بۆ هات، گوتیـان : بە دڵنیایی ئەوە جادوویەکی ڕوونە ﴿٧٦﴾ مووسـاش گوتی، ئایا دوای ئـەوەی هەقتـان بۆ هات، دەڵێن : ئایا ئەوە جادوویە؟ لە حاڵێکدا کە جادووگەران بە مـراد نـاگـەن؟ ﴿٧٧﴾ گوتیان ، ئـایـا بۆیە هاتوویە لامان کە لە ئەو (ڕێی)ەی بابو باپیـرانمان لەسـەری بـوون، لامـان بدەیو، گەورەیی لە زەوییدا بۆ هەردووکتـان بـێ؟ (مـادام وایـە) ئێمـە بە هیچ جۆرێك بۆ ئێوە نـابینـە بـڕوادار ﴿٧٨﴾ فیـرعەونیش گوتی: هەرچی جـادووگـەری زانـاو کارامەیە بۆم بێـنن ﴿٧٩﴾ ئنجـا کاتێك جادووگەرەکان هـاتن، مووسا پێی گـوتن: هەرچی دەتـانەوێ (لە گوریسو پەتو گۆچان) فڕێی بدەن ﴿٨٠﴾ ئنجـا کـاتێك شـتەکانیان فڕێدا (بـۆ جادووکـردن) مووسـا گـوتـی: هەرچی کردووتـانە جـادوویەو، بـە دڵـنیایی خـوا پووچەڵی دەکاتەوە، مسۆگەر خـوا کاری خراپەکـاران چاك نـاکات ﴿٨١﴾ خـوا بـە وشـە (بڕیارە)کانی هەق دەچەسپێنێ، هەرچەندە تـاوانباران پێیان نـاخۆش بـێ ﴿٨٢﴾ ئیدی جگە لە وەچە (تـازە پێگـەیشـتووان)ێـك لە گەلەکـەی (لە سـەرەتـاوە) کـەس بـڕوای بە مووسـا نەهێنا، بەهـۆی ترسانیان لە فیـرعەونو قسە ڕۆیشـتووان (ی گەلەکەیان)ەوە، کە ئەشکەنجەیان بدات، بێگومان فیـرعەونیش خـۆ بە بەزلگـر بوو لە زەوی (میسـڕ)داو. بە دڵنیـایی ئەو لە زێـدەڕۆیی کـاران بوو ﴿٨٣﴾ مووسـاش گـوتی: ئەی گەلەکەم ! ئەگـەر بڕواتـان بە خـوا هێنـاوە، تەنیـا پشـت بەو ببەسـتن، ئەگـەر ملکـەچـن (بۆ خـوا) ﴿٨٤﴾

(ئەوانیش) گوتیان: تەنیا پشتمان بە خواوە بەستوە، پەروەردگارمان! مەمانکە بە ئازارو ئەشکەنجە دراوی کۆمەڵی ستەمکاران ﴿٨٥﴾ وە بە بەزەیی خۆت لە کۆمەڵی بێبڕوایان قوتارمان بکە ﴿٨٦﴾ ئنجا سروشمان بۆ مووساو برایەکەی کرد: کە لە میسڕدا مەنزڵگایان (ی تایبەت) بۆ گەلەکەتان دابین بکەن، با ماڵەکانتان بەرەو ڕووی یەکدی بن، نوێژ بەرپا بکەن و موژدە (ی سەرکەوتن) بە بڕواداران بدە ﴿٨٧﴾ مووساش گوتی: پەروەردگارمان! بێگومان تۆ جوانیی و سامانت بە فیرعەون و دارو دەستەکەی داوە کە سەرەنجام (خەڵك) لە ڕێی تۆ لادەدەن، پەروەردگارمان! سامانەکانیان بسڕەوە، دڵیشیان ببەستە، با بڕوا نەهێنن، هەتا سزاو ئازاری بە ئێش دەبینن ﴿٨٨﴾ (خوا) فەرمووی: پاڕانەوەکەتان گیرا بوو، دەجا ڕێك و ڕاست بن، هەرگیز نەکەونە شوێن ڕێبازی ئەوانەی نازانن ﴿٨٩﴾ ئنجا بەنی ئیسرائیلمان لە دەریا پەڕاندنەوە، یەکسەر فیرعەون و سەربازەکانی، سنوورشکێنانە و ستەمکارانە، شوێنیان کەوتن، هەتا کاتێك کە خنکانی گەیشتێ (فیرعەون) گوتی: بڕوام هێنا کە: جگە لەوەی بەنو ئیسرائیل ئیمانیان پێهێناوە هیچ پەرستراوێکی دیکە نیە، من لە گەردنکەچانم (بۆ خوا) ﴿٩٠﴾ (خوا فەرمووی :) ئایا ئێستا (بڕوا دێنی؟) لە حاڵێکدا کە پێشتر سەرپێچیت کردو لە تێکدەران بووی؟ ﴿٩١﴾ ئێمەش ئەمڕۆ جەستەکەت دەرباز دەکەین، تاکو بۆ خەڵکی دوای خۆت ببیە نیشانە (و پەندو عیبرەت)، بێگومانیش زۆرێك لە خەڵکی لە نیشانەکانی ئێمە بێئاگان ﴿٩٢﴾ بە مسۆگەریی (هۆزی) بەنی ئیسرائیلمان لە شوێنێکی باشدا نیشتەجێ کردن، لە بژێوە خۆش و چاکەکان پێماندان، ئنجا هەتا زانیارییان بۆ نەهات، نەکەوتنە ڕاجیایی و ناکۆکییەوە، (هیچ بیانوو پاساوێکیان نەبوو)، بە دڵنیاییی لە ڕۆژی قیامەتدا پەروەردگارت بڕیاریان لە نێواندا دەدات، (دادوەرییان لە بەیندا دەکات) لەوەدا کە تێیدا کەوتوونە ڕاجیایی یەوە ﴿٩٣﴾}.

# شیكردنـەوەی هـەندێـك لە وشـەكان

( ثُمَّ ): (حَرْف عَطْفٍ يَقْتَضِـي تـأخُّرَ مَـا بَعْـدَهُ عَمَّـا قَبْلَـهُ، بالـذَّاتِ، أَو بالـمَرْتَبَـةِ، أو بالوَضْعِ)، (ثم) گـێڕانەوەو بـادانەوەیە، ئـەوە دەخـوازێ كـە ئـەوەی دوایـی دێ، دواكەوتبـێ لـەوەی كـە پێشـێ هـاتوە، چ وەك خـودی خۆی، چ وەك پلـە، چ وەك ڕێـزبەنـدیی كـاتیی دواكـەوتبێ.

(بَعَثْنَا ): نـاردمـان، (أَصْلُ البَعْثِ: إثَـارَةُ الشَّـيءِ وَتَوجِيهُـهُ) وشـەی (بَعْـث) بریتیـە لـە ورووژانـدنـی شـتێكو ئاڕاستەكـردنی.

(وَمَلَإِيْهِۦ ): (الـمَـلأُ: جَماعَـةٌ يَجْتَمِعُـونَ عَلَـى رَأْيٍ، فَيَمْلَـؤُونَ العُيُـونَ رِوَاءً وَمَنْظَـراً. وَالنُّفُوسَ بِهَاءً وَجـلالاً، وَالـمَقصودُ بِهِ: سُراة القَـوْمِ وَأَشرافه) (مَلأ) من (بەدەست ڕۆیشـتووان)، یـان (قسـە ڕۆیشـتووان) تەفسـیـرم كـردوە، واتـە: (مـلأ)ی هـەر كۆمـەڵێك ئەوانەن كە لە نێو خەڵكـدا، قسـەیان دەڕواو دەسـتیان دەڕواو، ئـەمرو نەهییـان بەدەسـتە، لەوەشـەوە هـاتوە، كە دڵو چاوی خـەڵك پڕدەكەن لە تـرسو سامو ڕێـزو هەیبـەت.

(لِتَلْفِتَنَا ): واتـە: بـۆ ئـەوەی لامـان بـدەی، (لَفَتَـهُ: صَرَفَهُ، إلتَفَـتَ: إذَا عَـدَلَ عَنْ قِبَلِـه بِوَجْهِـهِ)، (لَفَتَهُ) واتە: لایـدا، بەڵام (إلتَفَتَ) واتە: ئەوە كـە ئینسـان كاتێك ڕووی لە شـتێكە، دوایی پشـتی تێبكـاتو، ڕووی وەربگێـڕێ، واتە: ئـاوڕدانــەوە.

(ٱلْكِبْرِيَآءُ ): (الكِبْرِيَـاء: التَرَفُّـعُ عَنِ الإِنْقِيَـادِ، وَذَلِكَ لاَ يَسْـتحقُّهُ إلاّ اللهُ)، (كِبْـرِيَـاء) خۆ بەزلـگرتن لـەوەی كـە ملكـەچ بـێ، ئـەوەش تەنیـا شایسـتەی خـوایە، خـوای باڵادەست نابێ بۆ هیچ كەس ملكەچ بێ، چونكە گـەورەیی ڕەها تەنیا بۆ خوایە.

(وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ ) : واتە: خوا هەق دەچەسپێنێ، (أَصْلُ الحَقِّ: المُطَابَقَة وَالمُوَافَقَة)، وشەی (حَق) واتە : شتی چەسپاو، شتێك كە لەگەڵ شتێك پڕ بە پێست بێ‌و لەگەڵی گونجاوبێ.

(سَيُبْطِلُهُۥٓ ): واتە: پووچەڵی دەكاتەوە، (الإِبْطَالُ: إِفْسَاد الشيء وَإِزَالَتَه، وَالبَاطِلُ ضِدّ الحَق)، (إِبْطَال) بریتیە لەوە كە شتێك بپووكێنیەوە، یان لایبەری، (بَاطِل) پێچەوانەی (حَق)ە، (حَق) واتە: چەسپاو، (بَاطِل)یش واتە: شتێكی پووچ‌و بێ بنەما.

(ذُرِّيَّةٌ ): (ذُرِّيَّةُ الرَّجُل: وَلَدهُ، وَالجَمْع: الذَّرارِيُّ وَالذُّرِّيَّات)، (ذُرِّيَّةُ الرَّجُل) واتە: ڕۆڵەكانی، بە (ذَرارِيّ وَذُرِّيَّات) كۆدەكرێتەوە، (ذُرِّيَّة)ش بۆخۆی كۆیە.

(أَن يَفْتِنَهُمْ ): واتە: سزایان بدات، (الفِتْنَةُ: الإِخْتِبَارُ وَالإِمْتِحَانُ، فَتَنَ الذَّهَبَ يَفْتِنُهُ فِتْنَةً)، (فتنة) بە مانای تاقیكردنەوەو جەرباندن دێ، بەڵام لێرە مەبەست پێی سزاو ئازاردانیانە، چونكە ئەسڵی خۆی (فَتَنَ الذَّهَبَ يَفْتِنُهُ فِتْنَةً) زێڕ كە دەخرێتە سەر ئاگر، قاڵ دەبێتەوە، چونكە بەهۆیەوە ساغ‌و ناساغەكەی جیا دەبێتەوە.

(لَعَالٍ فِى ٱلْأَرْضِ ): واتە: خۆی بە بەرز دەگرت لە زەوییدا، (عَلاَهُ: غَلَبَهُ، التَّعَالِي: الإِرْتِفَاعُ)، (عَلاَهُ) واتە: بەسەریدا زاڵ بوو، (تعَالِي) واتە: خۆ بەرز كردن.

(تَبَوَّءَا ): نیشتەجێ بكەن، (تَبَوَّءَ مَنْزِلاً وَنَزَلَه، بوَّء لَهُ مَنْزِلاً: هيَّأه وَمَكَّنَ لَهُ فِيهِ)، (تَبَوَّءَ مَنْزِلاً) واتە: نیشتەجێ بوو لەو شوێنەدا، (بوَّء لَهُ مَنْزِلاً) واتە: شوێنێكی بۆ ئامادە كرد، تێیدا نیشتەجێ بێ.

(قِبْلَةً ): (القِبْلَةُ: الجِهَةُ)، (قبلة) بە مانای (لا) دێ، بەڵام دەشگونجێ بە مانای بەرانبەر یەكدی بێ، واتە: (مُتَقَابِلَةً).

(وَأَشُدُّ ) : (شُدَّهُ: أوثقه، شَدَّه، يَشُدُّهُ)، واتە: گرێبدە، گرێیدا، گرێ دەدات، دەبەستێتەوە.

(وَجَٰوَزْنَا ) : واتە: تێمانپەڕاند، (جَازَ الموْضِعَ، سَلَكَهُ وَصَارَ فِيهِ، يَجُوزُ جَوَازًا)، واتە: بە شوێنەکەدا تێپەڕیو گوزەری کرد.

(وَعَدْوًا ) : (عَدَاهُ يَعدوه: جَاوَزَهُ) واتە: تێیپەڕاند، سنووری بەزاند، (عَدَا عَلَيْهِ: عَدْواً وَعُدواً، وَاعْتَدَى عَلَيْهِ، وَتَعَدَّى عَلَيْهِ)، هەموویان بە مانای دەستدرێژیی کردە سەرو سنووری لە بەرانبەریدا شکاند، دێن.

(أَدْرَكَهُ ): (الإدْرَاكُ: اللُّحُوقُ وَاللّحَاق، وَأَدْرَكَ: رَآهُ، وَأَدْرَكَ: بَلَغَ)، (أدرك) بە مانای پێگەیشتنو تێگەیشتنو بینین، دێ.

(مُبَوَّأَ صِدْقٍ ): (مَنْزِلاً جَيِّداً) شوێنێکی نیشتەجێی باش.

# مانـــای گـشـــتـی ئایەتەکـــان

خـوا ﷻ دوای ئـەوەی کە باسی بەسەرهـاتی نـووح (علیـه السلام)ی کـرد، لـە سـێ ئایـەتداو زۆر بە کورتیی، دوایی لە یەك ئایەتدا ئاماژی کرد بە ڕەوانەکردنی ژمارەیەکی زۆر لە پێغـەمبـەران، بۆ لای گەلەکانیان لە دوای نووح، ئنجا دێتە سـەر باسی مووسـاو هـارۆونی برای، صەلاتو سـەلامی خوا لەسـەر هەموویان بێ، دەفـەرموێ: ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ وَهَـٰرُونَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ بِـَٔايَـٰتِنَا فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴾، وشـەی ( ثُمَّ) لێـرەدا گـێڕانـەوەو بـادانەوەی شتێکە بۆ سـەر ئـەوی دی، بـەڵام زانـایان دەڵێن: لێـرەدا بۆ (التَّراخي الرُتبي) بە دواداهـاتنـی پلـەییە، بۆچی؟ چونکە مووسـا (علیه السلام) وەرچەرخانێك دروست دەکات لـە پێغـەمبەرایەتییـداو، بە نسبەت پێغـەمبـەرانی پێش خۆیەوە، هـەندێ شـتی تـازە دێنـێ، وەك دوایـی وردتـر باسـی دەکـەین :

١ـ گەلێك دەرباز دەکات لە ژێر چەنگاڵو چەپۆکی دەوڵەتێکی داگیـرکارو حوکمڕانێکی خوێن ڕێـژ، کـە فیـرعەونـە.

٢ـ پاشـان ئەو گـەلـە دەبـات نیشـتمانێکیان بۆ دیـاریی دەکـات.

٣ـ دوایـی شـەریعـەتێکی بـۆ دەنێـردرێتـە خـوار.

٤ـ ژیـانی ئابووریی‌و سیاسیی ئەو کۆمەڵگایە ڕێـك دەخـات.

کە پێغـەمبـەرانی پێشـتـر صـەلاتو سـەلامی خـوایان لەسـەر بـێ، کەمـتـر وابـووە، بتـوانن: قەوارەیـەکی سیاسـی لـە نیشـتمانێکی دیـاریی کـراودا، بـۆ گـەلو کۆمەڵگـایەك دروسـت بکـەن، بۆیـە خـوا دەفـەرموێ: (ثُمَّ) دوایـی واتـە: ئنجـا لـە ڕەوانـەکردنی

پێغەمبەراندا گواستمانەوە بۆ قۆناغێکی دیکە، ﴿ بَعَثْنَا مِنْ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ وَهَٰرُونَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ ﴾، دوای ئەو پێغەمبەرانە، ئنجا مووساو هارونمان ناردن (سەلامی خوایان لێ بێ) بۆ لای فیرعەون و قسە ڕۆیشتووەکانی.

(مَلأ) وەك زۆر جاری دیکەش گوتوومانە: ئەوانەن کە چاوو دڵی خەڵك پڕ دەکەن لە سامو هەیبەت و، مەبەست پێیان قسە ڕۆیشتووان و زلە زلان و ئەوانەن، کە دەگونجێ بڵێین: دەستەو دایەرەو دەست و پێوەندو، ئەوانەن کە فیرعەون پشتی پێ بەستوون بۆ حوکمڕانییەکەی خۆی ﴿ بِـَٔايَٰتِنَا فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴾، (ئێمە مووساو هارونمان بۆ لای فیرعەون و دەست و دایەرەکەی نارد) بە نیشانەکانمانەوە، لێرەدا (آيات) دەگونجێ ئەو ڕستانە بن، کە فەرمایشتی خوایان لێ پێك دێ، دەشگونجێ مەبەست پێیان موعجیزەکان بن، واتە: بەو بەڵگە ڕۆشنانەوە کە دەیسەلمێنن: مووساو هارون پێغەمبەری خوان، ﴿ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴾، کەچی ئەوان خۆیان بە زلگرت و، کۆمەڵێکی تاوانبار بوون، یانی: بەهۆی تاوانبارییانەوە سیفەتی خۆبەزلگرییان تێدا بوو.

﴿ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوٓا۟ إِنَّ هَٰذَا لَسِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾، کاتێك لە لایەن ئێمەوە هەقیان بۆ هات، گوتیان: بێگومان ئەمە جادوویەکی ڕوون و ئاشکرایە.

تەماشایان دەکرد: موعجیزەکەی مووسا کاریگەرییەکی ناسروشتیی و نا ئاسایی هەیە، هەڵبەتە دەیانزانی کە جادوو نیە، بەڵام بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵك و چەواشەکردنیان، ئەو قسەیە لەلای خەڵکێکی سادە، ڕەنگە ڕەواجی بوو بێ، گوتبیان: تەماشا بکەن! کاریگەرییەکی نا ئاسایی هەیە، کەواتە: ئەوە جادوویە!

ئنجا دەفەرموێ : ﴿ قَالَ مُوسَىٰٓ أَتَقُولُونَ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمْ ۖ أَسِحْرٌ ﴾، مووسا فەرمووی: ئایا دوای ئەوەی هەق بۆ لاتان هات، پێی دەڵێن: ئایا ئەوە جادوویە؟!

﴿ وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّٰحِرُونَ ﴾، لە حاڵێکدا کە جادووگەران بە مراد ناگەنو سەرفراز نابن (بەڵام من سەرکەوتنم بە پیشتوانیی خوا، مسۆگەرە) کەواتە: ناگونجێ کارەکەی من جادوو بێ، ئەو پەیامەی هێناومە، هەقو ڕاستو ڕەوانەو، بەرنامەی تێروتەواوی ژیانو گوزەرانە، وە ناشگونجێ من جادووگەر بم، چونکە ئایندەیەکی ڕۆشنم هەیەو، دوایی دەشیبینن !

ئەوان چییان گوت؟ ﴿ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِتَلۡفِتَنَا عَمَّا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَا ﴾، ئایا هاتوویە لامان تاکو ئەوەی ئێمە بابو باپیرانی خۆمان، پێشینانی خۆمانمان لەسەر بینیوە، لەوە لامان بدەی؟ ﴿ وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، وە گەورەییو باڵادەستیی لە زەوییدا، (واتە: لەسەر زەمینی میسردا) بۆ ئێوە بێ، ئایا بۆ ئەوە هاتوون؟ ﴿ وَمَا نَحۡنُ لَكُمَا بِمُؤۡمِنِينَ ﴾، وە بە دڵنیایی ئێمە بۆ ئێوە نابینە بڕوادار، واتە: بە ڕاستتان دانانێین.

چونکە ئێوە بۆیە هاتوون ئێمە لە بەرنامەو ڕێبازی پێشینانمان لابدەنو، خۆشتان گەورەییمان بەسەردا بکەن، کە دیارە ئەوە تۆمەتێکی بێ بنەما بووە چونکە هەر لە ئەسڵدا مووساو هاروون چوون بۆ دەربازکردنی بەنی ئیسرائیلو، گوتیان : گەلەکەمان وێ بدەنەوە، با بڕۆینو چیدیکە مەیانچەوسێننەوە، وەك دەفەرموێ : ﴿ فَأۡتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبۡهُمۡ ... ﴿٤٧﴾ ﴾طه، واتە: بچنە لای (فیرعەون)و بڵێن: ئێمە پێغەمبەری پەروەردگارتین، بەنی ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێرەو سزایان مەدە.

ئەو گەلەی کە ساڵەهای ساڵە سۆغرەو بێگاریان پێ دەکەیو، دەیانچەوسێنیەوە، نێرەومزەکانیان سەردەبڕیو، مێیینەکانیان دەهێڵیەوە، وێمانبدە با بیانبەینو خوا حافیز!

ئنجا ئایا فیرعەون چی گوت؟ ﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ٱئۡتُونِي بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٖ﴾، وە فیرعەون گوتی: هەموو جادووگەرێکی زاناو کارامەو شارەزام بۆ بێنن.

چونکە ئەوەی مووسای بە جادوو تەفسیر کرد، دیارە جادووش بە جادوو بەرپەچ دەدرێتەوە، بە حیسابی خۆی! ﴿فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلۡقُواْ مَآ أَنتُم مُّلۡقُونَ﴾، کاتێك جادووگەرەکان هاتن، مووسا پێی گوتن: هەرچی فڕێی دەدەن، فڕێی بدەن، هەرچی دەیهاوێن، بیهاوێن، گۆچان‌و پەت‌و گوریسیان پێ بوون فڕێیان داون‌و لە پێش چاوی خەڵك بوونە مارو حەزیا، مووسا زۆر بێ منەتانەو بێ باکانە گوتی: هەرچی فڕێی دەدەن، فڕێی بدەن، چ جادوویەك دەیکەن، بیکەن.

لە سوورەتی (طـه)و لە سوورەتی (الشعراء)داو، لە سوورەتی (الأعراف)دا، زۆر بە وردیی‌و بە تەفصیلێ باسی ئەو ڕووداوی کۆکردنەوەی جادووگەران لە دژی مووساو هارون، کراوە.

ئنجا سوورەتی (یونس)یش دوای ئەو سوورەتانە هاتۆتە خوار، بۆیە کە لەوێدا تەفصیل‌و درێژەکەی هاتوە، لێرەدا بە پێویستی نەزانیوە دووبارەی بکاتەوە، چونکە لێرەدا گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتە بۆ ئەوە نیە، داخۆ جادووگەرەکان چۆن هاتن‌و. فیرعەون چی کرد؟ بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە لەلایەکەوە : مسوڵمانان پەند وەربگرن لەو بەسەرهاتە، کە ئێوەش داهاتووو سەرەنجامتان، وەك هی مووساو هاروون‌و ئەو خەڵکەی کە لەگەڵیاندا بوون، دەبێ، لەلایەکی دیکەشەوە، هۆشداریی پێدان‌و ترساندنی کافرەکانیشە کە: ئێوەش سەرەنجامتان، وەك هی فیرعەون‌و دارو دەستەکەی دەبێ.

هەروەها بۆ هەموو بڕوادارانێك لە هەر چاخ‌و سەردەمێك دابن‌و، هەموو نەیارانێکی ئیسلام‌و مسوڵمانان، لە هەر چاخ‌و سەردەمێك دابن، لە گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتەدا، ئامانج ئەوەیە، بۆیە ناچێتە نێو وردەکاریەکانی دیکەوە.

ئنجــا دەفــــەرموێ: ﴿ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ ٱلسِّحْرُ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبْطِلُهُۥٓ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾، کاتێك کە هەڵیاندان {واتە: ئەوەی کە هـەڵیاندا، هەڵیاندا، گۆچان بوون، گوریس بوون، هەرچی بوون} مووسا گوتی: ئەوەی کە کردتـان، جادوویە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبْطِلُهُۥٓ ﴾، بێگـومان خـوا هەڵیدەوەشـێنێتـەوەو پووچەڵـی دەکاتـەوە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾، بێگومـان خــوا کـاری تێکدەران چاك نـاکات (ئەمە یەکێکە لە یاساکانی خـوا) ﴿ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾، خـواش هـەق دەچەسـپێنـێ بە وشەکانی خۆی، بە یاساکانی خۆی، بە بڕیـارەکانی خـۆی (کە لێرەدا مەبەست پێی بڕیارە قەدەرییەو تەکوینییەکانی خـوای پـەروەردگارن)، خـوا هەق دەچەسپێنـێ) هەرچەندە تـاوانبـارانیش پێیـان نـاخـۆش بـێو لەسـەر دڵیـان قـورس بـێ.

ئنجــا دەفــــەرموێ: ﴿ فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوْمِهِۦ عَلَىٰ خَوْفٍ مِّن فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِمْ أَن يَفْتِنَهُمْ ﴾، جگـە لـە وەچـەیەکی تــازە پێگەیشتوو، جگـە لـە کۆمەڵێکی گەنجو تازە پێگەیشتوو لە گەلەکەی، کەسی دیکە بڕوای بە مووسا نەهێـنـا، ئەوانیـش بە مەترسیی زۆرەوە لە فیـرعـەونو لە دەست ڕۆیشتووانی خۆشیان {واتـە: لە دەست ڕۆیشتووانی بەنی ئیسرائیلیش، کە کرێگرتەو پێوەندو پاشکۆی فیـرعەونو دارو دەستەکـەی بـوون} دەترسـان کـە سـزایان بـدەن، ئەشـکەنجەیان بـدەن، ﴿ وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، بێگومان فیـرعەون زۆر خـۆی بەرز کـردبۆوە لە زەویـدا، واتە: زۆر باڵادەستیی دەنواند، ستەمی دەکردو خۆی بەسـەردا فـەرز کردبوون، ﴿ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾، بێگـومان فـیـرعەون لـە زێـدەڕۆیی کـاران بـوو.

کەواتە: ئەو کۆمەڵە گەنجە کە بڕوایان بە مووسا هێناوەو ترساون، فیرعەون سزایان بداتو، ترساون قسە ڕۆیشتووەکانی گەلی بەنی ئیسرائیل، کە لە دەوری فیرعەون بوونو، ئەوانیش هاوکاری فیرعەون بوون، بۆ سزادانو ئازاردانیان، ناهەقیان نەبووە ! چونکە فیرعەون هەم باڵادەست بووە، هەم زۆر زێدەڕۆییکارو تێپەڕێنەر بووە، لە هەموو سنوورەکان، ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوْمِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴾، وە مووسا گوتی: ئەی گەلەکەم! ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خوا هێناوە، هەر پشت بەو ببەستن، ئەگەر بۆ وی ملکەچن.

هەڵبەتە کە دەفەرموێ: تەنیا وەچەیەك لە گەلەکەی مووسا ئیمانیان بە مووسا هێنا، وا پێدەچێ، ئەوە لە سەرەتاوە بووبێ، چونکە دوایی هەموو بەنی ئیسرائیل لەگەڵ مووسادا دەچنو، دەربازیان دەکات لە میسرو، پێشیان دەکەوێو دەریای سووریان بۆ شەق دەبێ، دوایی دەیانپەڕێنێتەوە بۆ دەشتی (سینا) دیارە هەموو بەنی ئیسرائیلی لەگەڵ چووە، مەگەر کەسێکی وەك قاروون، کە ئەویش هەر لە گەلی مووسا بووە، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ... ٧٦ ﴾القصص، واتە: بێگومان قاروون لە گەلی مووسا بوو ستەمی لێکردن. مەگەر کەسێکی ئاوا، تاکو تەرایەك، ئەگەرنا هەموویان لەگەڵی چوون.

کەواتە: دیارە لە سەرەتاوە، تەنیا گەنجەکان بڕوایان بە مووسا هێناوە، ئەگەرنا گەلی بەنی ئیسرائیل بە گشتی بڕوایان پێ هێناوە بۆیەش مووسا دەڵێ: ئەی گەلەکەم! ئەگەر بڕواتان بە خوا هێناوە، هەر پشت بەو ببەستن، ئەگەر بۆ وی ملکەچن ﴿ فَقَالُواْ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾.

گوتیان: پشتمان هەر بە خوا بەستوە ئەو وەکیلی ئێمەیە، ئەو کار پێ سپێردراوی ئێمەیە، پەروەردگارمان! مەمانکە بە جێی ئەشکەنجەو ئازار بۆ کۆمەڵی ستەمکاران. واتە: وا مەکە، کە ئەوان ئەشکەنجەمان بدەنو ئازارمان بدەن، یاخود: وا مەکە کە ئێمە ببینە هۆکاری ئەوەی ئەوان بەهۆی ئێمەوە، کە ژێردەستو زەبوونو بێدەسەڵاتین، لە ئاینەکەمان لە پەیامەکەی مووسا (علیه السلام) بکەونە گومانەوە

﴿ وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾، وە بە بەزەیی خۆت لە كۆمەڵی بێبڕوایان دەربازمان بكەو قوتارمان بكە.

هەڵبەتە خوا ﷻ دوعاكەی قبووڵ كردوون، چونكە دوایی سەرەنجامەكە وابووە، ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتًا ﴾، وە سرووشمان كرد بۆ مووساو بۆ برایەكەی، كە لە میسر جێگاو ڕێگا بۆ خەڵكەكەتان پەیدا بكەن.

حەتمەن پێشتر جێگاو ڕێگەیان هەبووە، بۆیە دەبێ لێرەدا مەبەست ئەوەبێ كە جێگاو ڕێگایەكی تایبەتو نهێنیی، یاخود جێگاو ڕێگایەكی وا كە لاچەپو دووربێ دەسەڵاتی فیرعەون، یاخود لە چاوی جاسووسو سیخوڕەكانی فیرعەون، بۆئەوەی هەركاتێك كە پێویست بوو، شار بەجێبهێڵنو بڕۆن ،﴿ وَٱجْعَلُوا۟ بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾، باماڵەكانیشتان بەرەو ڕووی یەكدی بن (ئەوە واتایەكی) یاخود: ماڵەكانی خۆتان بكەن بە پەرستگا، واتە: هەر لە ماڵەكانی خۆتاندا پەرستنو طاعەت بۆ خوا ئەنجام بدەن ﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، وە نوێژ بەرپا بكەنو، بڕوادارانیش دڵخۆش بكە، موژدەیان پێ بدە {كە سەرەنجام بۆ ئەوانەو، دەرباز دەبن لەو ئیهانەو سووكییو سۆغرەو بێگارو زوڵمو ستەمەی فیرعەون} .

﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا ﴾، وە مووسا گوتی: ئەی پەروەردگارمان! تۆ جوانییو سامانێكی زۆرت لە ژیانی دنیادا، بە فیرعەونو دەستەو دایەرەو دەست ڕۆیشتووەكانی فیرعەون، بەخشیوە، ﴿ رَبَّنَا ﴾، ئەی پەروەردگارمان! (بۆیەش پێتداون:) ﴿ لِيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِكَ ﴾، كە سەرەنجام خەڵك لە ڕێی تۆو لە ڕێبازی تۆ لابدەن، واتە : لەجیاتی

ئەوەی کە ئەوە وەك نیعمەتێکی خوا بەکار بێنن، لە ڕەزامەندیی تۆدا، سەرەنجامەکەی وایە ئەو سەروەت و سامان و جوانیی و زرق و برقە، بەکاردێنن بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵك و چەواشەکردنی خەڵك و لە ڕێی خوا لادانی خەڵك، ﴿رَبَّنَا ٱطۡمِسۡ عَلَىٰٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ﴾، ئەی پەروەردگارمان! ماڵەکانیان بسڕەوە (واتە: لە بەینی بەرە، با هیچی لێ نەمێنێ) دڵیشیان ببەستە، دڵیان گرێ بدەو توندی بکە، ﴿فَلَا يُؤۡمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ﴾، با بڕوا نەهێنن تاکو ئازاری بە ئێش دەبینن.

ئنجا ئازاری بە ئێش یان خنکانە لە دەریای سووردا، دوای ئەوەی کە ڕاوەدووی مووساو هاروون و گەلەکەیان دەنێن، یاخود مەبەست پێی سزای بەرزەخ و پاشان سزای دۆزەخە.

﴿قَالَ قَدۡ أُجِيبَت دَّعۡوَتُكُمَا فَٱسۡتَقِيمَا﴾، خوا فەرمووی: پاڕانەوەکەتان گیرا بوو، وەڵام درایەوە، ئێوەش ڕێك وەستاو بن ڕاست بن، ﴿وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ۝٨٩﴾، وە نەچن، (زۆر بە جەخت کردنەوە) بەدوای ڕێبازی ئەوانە بکەون، کە نازانن، مادام خوا لەگەڵتان بە لوتف و میهرەبانە، ئێوەش فەرمانبەریی بۆ بکەن و بە دوای ڕێچکەی نەزانان مەکەون.

لە کۆتایی دا دەفەرموێ : ﴿وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ وَجُنُودُهُۥ بَغۡيٗا وَعَدۡوًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ۝٩٠﴾، وە بەنی ئیسرائیلمان لە دەریاکە تێپەڕاند، پەڕاندمانەوە، فیرعەون و سەربازەکانیشی دەستدرێژکارانەو ستەمکارانە شوێنیان کەوتن {هەتا ئەوان پێیان زانیوە، دیارە ماوەیەك دوور کەوتوونەوەو، هەتا

فیرعەونیش بە خۆیو سوپایەکەی، ساز دەبێ، ماوەیەکی پێدەچێ}، یاخود زۆر بە خێرایی شوێنیان کەوتن، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ ﴾، {ئنجا کاتێك کە دوا کەسی گەلی ئیسرائیل لە دەریاکە پەڕینەوەو، دوا کەسی فیرعەونو دارو دەستەکەشی هاتنە نێو دەریاکەوە، دیارە مەسافەیەکی زۆر بووە، چەند کیلۆمەتر بووە، دەریا وێك کەوتەوە} وە کاتێك کە (فیرعەون) کەوتە ژێر ئاوو خەریکی خنکانێ بوو، ﴿ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴾، گوتی : بڕوام هێنا کە جگە لەو پەرستراوەی بەنی ئیسرائیل بڕوایان پێ هێناوە، هیچ پەرستراوی دیکە نیەو، من لە ملکەچانمو لە گەردن کەچانم (بۆ خوا).

خواش ﷻ، (یان فریشتەکان)، فەرمووی: ﴿ ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٩١﴾ ﴾، ئایا ئێستا {ئەو هەمزە(أ)یە هەمزەی پرسیارکردنی نکوولیی لێکەرانەیە (هَمزة الإستفهام الإنكاري)} بڕوا دێنی، لە حاڵێکدا کە پێشتر سەرپێچییت کردوەو، تۆ لە تێکدەرانو خراپەکاران بووی؟! ﴿ فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗ ﴾، ئەمڕۆ جەستەکەت دەرباز دەکەین {جەستەکەشت بۆیە دەرباز دەکەین} تاکو بۆ خەڵکی دوای خۆت، ببیە پەندو عیبرەتو نیشانە ﴿ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾، وە بێگومان زۆرێك لە خەڵکی، لە نیشانەکانی ئێمە، لە بێئاگایانن (پەندیان لێ وەرناگرن).

ئنجا لە دوا برگەو دوا قۆناغی ئەم بەسەرهاتەدا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ بَوَّأۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مُبَوَّأَ صِدۡقٖ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ فَمَا ٱخۡتَلَفُواْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقۡضِي بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾، وە بێگومان ئێمە بەنی ئیسرائیلمان نیشتەجێ کرد، بە نیشتەجێکردنێکی چاك.

واتە: لە سەر زەمینێکی باشدا، کە پڕ بوو لە نازو نیعمەت، سەرەتا لە دەشتی سینا کە خوای پەروەردگار گەزۆی بۆ دەباراندن‌و، باڵندەی سەمانیی دەهاتن لە نیزیکیان دەنیشتن‌و، لێیان بەهرەمەند دەبوون، ئنجا دوایی چوونە شام، ﴿وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ فَمَا اخْتَلَفُوا حَتَّىٰ جَاءَهُمُ الْعِلْمُ﴾، وە لە ڕزقە خۆش‌و بەتام‌و بە سوودەکان بژیومان دان، هەتا زانیارییان بۆ نەهات، نەکەوتنە دووبەرەکیی‌و ناکۆکیی لە نێوان خۆیاندا، واتە: کە کەوتنە دووبەرەکیی‌و ناکۆکیی، هیچ بیانوویەکیان نەبوو، چونکە بەرچاویان ڕۆشن کرابۆوەو، زانیاریی وەحییان لەبەردەستدا بوو، ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾، بێگومان پەروەردگارت لە ڕۆژی قیامەتدا، لە ڕۆژی هەڵسانەوەو زیندووکرانەوەدا، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونەتە ڕاجیایی‌و کێشەو مشتومڕەوە، دادوەرییان لە بەیندا دەکات.

واتە: دیاریی دەکات: کێ لەسەر هەق بووەو، کێ لەسەر ناهەق بووە؟ کێ چەندەی خەتا بووەو؟ کێ کەمتر؟ کێ زیاتر؟ یاخود کێ ڕێی ڕاستی گرتوەو؟ کێ ڕێی چەوتی گرتوە؟

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :**

**قۆناغی یەکەم:** کە ئایەتەکانی (٧٥ و ٧٦ و ٧٧ و ٧٨) دەگرنەوە واتە: چوار ئایەت، ئاوا دەست پێ دەکات: ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ وَهَٰرُونَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ بِـَٔايَٰتِنَا فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوٓا۟ إِنَّ هَٰذَا لَسِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٦﴾ قَالَ مُوسَىٰٓ أَتَقُولُونَ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمْ ۖ أَسِحْرٌ هَٰذَا وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّٰحِرُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ ﴿٧٨﴾ ﴾.

وشەی ﴿ ثُمَّ ﴾، پێشتریش باسمان کرد کە (ثُمَّ) زانایان دەڵێن: (للتراخي الرُّتْبي، لأنَّ بعثَة موسى و هارون كَانَتْ أَعْظَمَ مِنْ بعثَةِ مَنْ سَبَقَهما)، (ثُمَّ) لێرەدا بۆ ئەوەیە کە شتێك بە دوای ئەوی دیکە دابێ، بەڵام لە ڕووی پلە بەندییەوە، لە ڕووی پلەیەکی بەرزترو گرنگتر لەوەی پێشێ، چونکە ڕەوانەکرانی مووساو هاروون مەزنتر بوو لە ڕەوانەکرانی ئەوانەی پێشیان کەوتبوون لە پێغەمبەران صەڵاتو سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ .

١/ لە ڕووی عەقیدەیی و فیکرییەوە:

بەنی ئیسرائیل دوای هاتنی مووساو هاروون، کە هەر لە خۆشیان بوون، وەرچەرخانێکی عەقیدەییو فیکریی سەدو هەشتا (١٨٠) پلەییان بەسەر داهات، کە پێشتر دیارە سەرگەردانو سەرلێشێواوو بێ ناسنامە بوون، واش پێدەچێ زۆریان هەر لەسەر ئایینو بەرنامەی فیرعەون بووبن، بەڵام بە هاتنی مووسا، خوا هیدایەتیان دەدات بۆ ئایینی خوا بە یەکگرتنو، یەك خوا پەرستن، ئەوە لە ڕووی عەقیدەییو فیکرییەوە.

٢/ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە:

کە پێشتر ملیان کەچ کردبوو، ملیان درێژ کردبوو بۆ سۆغرەو بێگاری فیرعەونو دەستەو دایەرەکەی، ملیان کەچ کردبوو کە فیرعەون بە کەیفی خۆی لە پیاوەکانی دەکوشتن، ئافرەتاکانیشی دەهێشتنەوە، دوای هاتنی مووسا، جۆرێك لە پێکەوە پەیوەست بوونی کۆمەڵایەتییو، جۆرێك لە نەفس بەرزیی (عزة النفس)و باوەڕ بەخۆبوونو، متمانە بەخۆبوونیان بۆ دروست بوو، بەهۆی ئایینو بەرنامەو هیدایەتی خواوە، کە هەمیشە شەریعەتو بەرنامەی خوا، ئەو گۆڕانکاییە ئیجابییانە بەسەر کۆمەڵگایەکاندا دێنێ.

٣/ لە ڕووی ئابووریی و لە ڕووی سیاسییەوە:

بە تایبەتی دواتر کە لە ژێر چەنگاڵو پۆستاڵی فیرعەونو داروودەستەکەی دەربازیان دەبێو، دەچنە دەشتی سینا، پاشان دەچنە شام، لەوێ قەوارەی سیاسییان بۆ دروست دەبێ، دوایی نیشتمانێکیان بۆ پەیدا دەبێو، دەبنە قەوارەیەكو کۆمەڵگایەك، دوایی مووسا (علیه السلام) خوا تەوراتی پێدەدات، کە تەورات یانی: شەریعەت، بەرنامە، وە بەو تەوراتە بەو شەریعەتە لایەنەکانی: خێزانییو ئەخلاقییو کۆمەڵایەتییو سیاسییو، عەسکەرییو ئەمنییان، ڕێك دەخات، بۆیە بەڕاستی هاتنی مووساو هاروون صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، بۆ لای بەنی ئیسرائیلو، پاشان دەربازکردنی بەنی ئیسرائیلو، لەبەین چوونو لەبەین برانی

دوژمنەکانیان، کە فیرعەونو دارو دەستەکەی بوون، ئەوە گۆڕانکاریی‌و وەرچەرخانێکی گەورە بووە، لە مێژووی پێغەمبەراندا صەلاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ.

ئێستاش با ئەو چوار ئایەتە کە باسی قۆناغی یەکەم دەکەن، لە چواردە بڕگەدا بتوێژینەوە:

**بڕگەی یەکەم** : ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنْ بَعْدِهِم ﴾، واتە: لە دوای پێغەمبەرانی پێشوو ناردمان، کێی نارد؟

**بڕگەی دووەم** : ﴿ مُّوسَىٰ وَهَٰرُونَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ ﴾، مووساو هارووغمان صەلاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، ناردن، بۆ لای فیرعەونو دارودەستەکەی، ئنجا ئایا: ئەو فیرعەونە کێ بووە؟!

هەندێ لە زانایان دەڵێن (منفَطاح الثاني) بووە، کە یەکێك بووە لە فیرعەونەکانی خێزانی نۆزدەیەم، (الأسرة التاسعة عشرة)، لەو خێزانو بنەماڵانەی کە حوکمی گەلی (قِبْط)یان کردوە، لە میسر، کە بە مەزەندە: (١٤٩١) ساڵ پێش لەدایکبوونی عیسا علیە السلام بووە،[١] وەك زۆرێك لە سەرچاوەکان ئامازەیان پێداوە، بەڵام لە ناوەکەیدا هەندێك دەڵێن: ئەو ناوە بووە، هەندێ دەڵێن: ناوێکی دیکە بووە.

**بڕگەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَمَلَإِيْهِۦ ﴾، (المَلأُ: خَاصَّةُ النَاسِ وَسَادَتُهُم) خەڵکی تایبەتو قسە ڕۆیشتووانو کاربەدەستانی خەڵك.

**بڕگەی چوارەم** : کە دەفەرموێ: ﴿ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾، دیارە (آیات) وەك پێشتریش باسمان کرد، هەم دەگونجێ ئەو پەیامو بەرنامەیەی خوا بێ، کە لە ڕستەکان پێك دێ، وەك چۆن قورئان لە ئایەتەکان پێك دێ، هەر سوورەتێك لە چەند ئایەتێك پێك دێ،

---

١) التحرير والتنوير، ج ١١ ، ص ٢٤٧، هێناویەتی.

دەشگونجێ مەبەست پێی ئەو موعجیزانە بێ، كە خوا بە مووسای دابوون، كە لە سوورەتی (الإسراء)دا خوای پەروەردگار ژمارەكەیان باس دەكات، دەفەرموێ ؛

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ ﴾، واتە: وە ئێمە نۆ نیشانەو موعجیزەمان بە مووسا دابوون، لە بەنی ئیسرائیل بپرسە، كاتێك كە مووسا هات بۆ لایان، فیرعەون پێی گوت: ئەی مووسا! من بە جادووگەرت دەزانم، بە جادووگەرت تێدەگەم، دوایی مووساش علیه السلام وەڵامی دەداتەوە.

<u>**بڕگەی پێنجەم**</u> : كە دەفەرموێ : ﴿ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ ﴾، خۆیان بە زلگرت، شارەزایانی زمان دەڵێن: (سین)و (تاء)ی سەر وشەی (استكبروا) بۆ گەیاندنی زێدەڕۆیی كردنە، لە خۆ بە زلگرییاندا، ئەگەرنا خوا دەیتوانی بفەرموێ : (فَتَكَبَّرُوا) بەڵام (فاستكبروا) یانی: زۆر خۆیان بە زلگرت.

<u>**بڕگەی شەشەم**</u> : كە دەفەرموێ : ﴿ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴾، واتە: پێشتر هەر كۆمەڵێكی تاوانبار بوون، یانی؛ عادەتیان تاوانكردنو خراپە كردن بوو، بەهۆی تاوانكارییو خراپەكارییانەوە، خۆیان بە زلگرت، بابای خراپەكارو تاوانكار، چۆن ملكەچ دەكات بۆ پەیامو بەرنامەیەك كە دەڵێ: تۆ لەگەڵ ئەوی دیكە وەك یەكو، بۆت نیە دەستدرێژیی بكەیە سەر ماڵو نەفسو ناموسی هیچ كەس؟ ئەو كاتە ڕێی ئیجرامو تاوانی لێ دەگیرێ، بە حەقیقەت لە ئەنجامی تاوانبارییدا، ئینسان خۆ بەزلگریی بۆ پەیدا دەبێ، كە دەفەرموێ ؛ ﴿ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴾، دیارە لە سوورەتی (المؤمنون)دا خوا ﷻ ئاوا دەفەرموێ : ﴿ فَقَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە؛ فیرعەونو دارودەستەكەی گوتیان: ئایا بڕوا بێنین بە دوو بەشەران، كە گەلەكەشیان ملكەچی ئێمەن،

کۆیلەو ژێردەستی ئێمەن، واتە: ئێمە ناچین بڕوا بە دوو کەسی وا بێنین، کە خەڵکەکەیان ژێردەستو زەبوونو زەلیلە لەبەردەستی ئێمەدا!

**بڕگەی حەوتەم** : ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰذَا لَسِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴾، ئنجا دوای ئەوەی هەقیان بۆ هات، (حق) یانی: شتی چەسپاو، شتێك كە حەقیقەتی هەبێ، نێوەرۆکی هەبێ، كە بەرانبەرەکەی بریتیە لە باطڵ، واتە: شتی پووچو بۆشو بێ نێوەرۆك، هەق لێرەدا بە پلەی یەکەم مەبەست پێی: خوا بەیەکگرتنو دادگەرییە، گومانی تێدا نیە : ئەو پەیامو بەرنامەیەی خوا بە مووسایدا ناردوە، کاکڵەکەیو بناغەکەی بریتیە لە خوا بە یەکگرتن، تەنیا خوا پەرستنو، بڕوا بوون بە دیداری خوا.

پاشان چەسپاندنی دادگەرییو، نەهێشتنی ستەم زۆرو، ڕازاندنەوەیان بە سیفەتی بەرزو جوانو، خۆ پاککردنەوەیانو خۆ لە بێزینگ دانیانو خۆبژاردنیان لە سیفەتی نزمو خراپ، لەسەر ئاستی تاکیی، خێزانیی، سیاسیی، کۆمەڵایەتیی، تا دوایی.

**بڕگەی هەشتەم** : كە دەفەرموێ: ﴿ مِنۡ عِندِنَا ﴾، واتە: لەلایەن ئێمەوە ئەو هەقەیان بۆ هات، نەك لە لایەن جگە لە ئێمەوە، ئنجا بەرنامەیەك هەق بێو لەلایەن خواوە بێ، كە خاوەنو بەدیهێنەرو پەروەردگاری هەموو كەسە، دیارە دەبێ وەربگیرێ، بەڵام ئەوان چییان کردو چییان گوت؟

**بڕگەی نۆیەم** : دەفەرموێ : ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰذَا لَسِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴾، گوتیان: ئا ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە، (مُبین) (إسْم فَاعل)ە لە (أَبَانَ)ی (لازم)و، هاوواتای (بانَ)یە، (أبانَ)ی (لازم)یش، وەك (بانَ) واتە: (ظَهر)، دەرکەوت، کەواتە: (مبین) واتە ڕوونو ئاشکرا، واتە: لێرەدا مەبەستیان موعجیزەکانی مووسا (علیه السلام) بووە، بەتایبەت گۆچانەکەیو گوتوویانە: ئەوە جادوویەکی ڕوونە.

**بڕگـــەی دەیـــەم** : دەفـــەرموێ : ﴿قَالَ مُوسَىٰٓ أَتَقُولُونَ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمْ أَسِحْرٌ هَٰذَا﴾، مووسا گوتی: ئایا دوای ئـەوە هەقتـان هاتە لا، پێی دەڵێن: ئایا ئەوە جـادوویە؟! ئەم هـەمزەیەی سـەر (أَسِحْرٌ هَذَا) بۆ نکوولـیی لـێکردنە، واتـە: نـابێ وا بڵێـن.

**بڕگـەی یـازدەیـەم** : ﴿وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّٰحِرُونَ﴾، چونکە بێگـومان جادووگـەرەکان سـەرفـراز نـابن، بە ئامانج نـاگـەن، سـەرکـەوتوو نـابن، بـەڵام ئێـوە تەماشا بکـەن داخۆ سـەرەنجامی ئێمـە چۆن دەبێ، بە دڵنیـایی ئێمـە خـوامان لەگەڵـەو، ئەوەی ئێمە دەیکەین، جادوو نیە، بەڵکو موعجیزەیە، بەڵـگەیەکە بـۆ ئیسپاتی ڕاسـتیی ئێمـە، هـەڵبـەتـە سـەرکـەوتووش بـوون.

**بڕگـەی دوازدەیـەم** : ﴿قَالُوٓاْ أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَا﴾، پێشـێ ئـەوەی کە مووسـا دەیکرد، تۆمەتبـاریان کـرد بـەوەی کـە جـادوویە، ئێستـا لـەوە دەگـوازنـــەوەو دەڵـێن: ئێـوە (واتـە: تـۆو هـارِوونی بـرات) بۆیـە هـاتوون، کـە ئێمـە لەسـەر ڕێبازی بابـو باپـیـرانمـان (کـە ڕێبازێکـی زۆر باشـە) لابـدەن‌و، سـەرەنـجـام گـەورەیی بۆ خۆتــان بـێ.

یــانی: ئەو بەرنـامەیەتـان بۆیە هێـنـاوە تـاکو بیکەنە هۆکارێك بـۆ گـەورەیی‌و کوێخـــایەتیی کردنـی خۆتـــان بەســـەر ئێمـــەوە. ﴿لِتَلْفِتَنَا﴾، (لَفَـتَ: يَعْنِـي صَرَفَ وَجْهَهُ عَنِ النَّظَرِ إلى شيءٍ مُقابلِ لوجهِهِ) مرۆڤ لەو کاتەدا ڕووی لـە شـتێك بـێ، دوایی ئـاوڕ بـداتـەوە، واتە: لاتەنیشت، یاخـود پشـتی تـێ بکات، پێـی دەگـوتـرێ : (لَفَـتَ) ﴿لِتَلْفِتَنَا﴾، واتـە: ڕوومان پـێ وەرگـێڕن، ڕوومـان پـێ لابـدەن لـەوەی کـە بابـو باپـیـرانمـان لەسـەری بوون (إلتفات) یـانی: ئـاوڕدانەوەو ڕوو وەرگـێڕان.

ئنجا ئەوەش یاسایەکی خـوایە لە ژیانی بەشەردا، بە زۆریـی خۆشـگوزەرانـان‌و خـۆ بەزلگـرەکان هـەروا بـوون، لـە بەرانبـەر پێغـەمبـەراندا، وەك لـە سـووڕەتی

(سبأ)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ٣٤ ﴾، واتە: وە لە هیچ ئاوەدانییو ولاتێکدا ترسێنەرێکو وریاکەرەوەیەك (واتە: پێغەمبەرێك)مان نەناردوە، مەگەر خۆشگوزەرانەکانی گوتوویانە: ئەوەی ئێوەی پێ ڕەوانکراون، ئێمە پێی بێ بڕواین.

هەمیشە ئەوە عادەتیان بووە.

بڕگەی سێزدەیەم : ﴿ وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، وە (دەتانەوێ) گەورەیی بۆ خۆتان بێ لەسەر زەوی، کام سەر زەوی؟ مەبەست پێی سەر زەمینی میسرە.

چەمکی وشەی (کبریاء) چییە؟

(الكِبْرِيَاء: هُوَ العَظَمَةُ وَإِظْهَارُ التَّفَوّقِ عَلَى النَاسِ) (کبریَاء) بریتیە لە مەزنییو پێشاندانی بالادەستی بەسەر خەڵکەوە، کە دیارە (کبریَاء) هەر شایستەی خوای بەرزو مەزن، هەر خوا گەورەیی ڕەهای هەیە، گەورەیی بێسنوور هەر هی خوایە ﷻ، بەلام گەورەیی خوا لەگەڵ میهرەبانییو حیکمەتیو زانایییەکەی دایە، بەلام مرۆڤ کە خۆی بە زل دەگرێ، لەسەر بناغەی نەفامییو ستەمو دەستدرێژیی، خۆی بە زل دەگرێ.

بۆیە خوا ﷻ کە گەورەیی ڕەها هەر هی ئەوە، بەلام مانای وا نیە کە ستەم دەکات، چونکە خوای پەروەردگار خاوەنی هەموو سیفەتە بەرزو پەسندەکانە، هەموو سیفەتەکانی خوای بێ وێنە پێکەوە تێکهەڵکێشن، گەورەییەکەی خوا ﷻ لەگەڵ میهرەبانییەکەیو لەگەڵ کار بەجێیییەکەیو لەگەڵ زانایییەکەیو لەگەڵ بەخششەکەی، هەموویان پێکەوەن.

ئنجا لەکۆتایی دا فیرعەونو دەستەودایەرەکەی، دوا بڕیاری خۆیان ڕادەگەیەنن:

**بڕگەی چواردەیەم :** ﴿ وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ ﴾، وە ئێمە هەرگیز ئێوە بە ڕاست دانانێین، یاخود هەرگیز بۆ ئێوە نابینە بڕوادار.

ئەوە لە قۆناغی یەکەم دا بەو شێوەیە، فیرعەون و دارو دەستەکەی، هەڵوێستی خۆیان زۆر ڕوون و ڕاشکاوانە، دەخەنەڕوو، بەڵام بەداخەوە نەرێنییانەو کەللە ڕەقانە، لە بەرانبەر مووساو پەیامەکەیدا.

**مەسەلەی دووەم :**

**قۆناغی دووەم:** ئەمیش لە چوار ئایەت پێك دێت، ئایەتەکانی : (٧٩ و ٨٠ و ٨١ و ٨٢)، قۆناغی دووەم بریتییە لە بانگکردنی فیرعەون بۆ جادووگەرەکان، جادووگەرانی شارەزاو، بێباکیی مووسا (علیه السلام) لە جادووەکەیان و، ڕاگەیاندنی بێئاکامیی جادووەکەیان، خوای پەروەردگار ئاوا دەست پێدەکات : ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ٱئْتُونِى بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٨٠﴾ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ ٱلسِّحْرُ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبْطِلُهُۥٓ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨١﴾ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾:

**ئەم چوار ئایەتەش لە چوار بڕگەدا شی دەکەینەوە:**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ٱئْتُونِى بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿٧٩﴾ ﴾، وە فیرعەون گوتی: هەموو جادووگەرێکی شارەزاو زاناو کارامەم بۆ بێنن، خڕیان بکەنەوە هەرچی جادووگەرە لە وڵاتدا بۆم بێنن، واتە: لە هەر شوێنێك جادووگەرێك چنگ دەکەوێ، کێ جادوویەکی گەورەی پێ دەکرێ، هەموویان خڕ بکەنەوە.

بڕگـــەی دووەم : ﴿ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾، دوای ئـەوەی ساحیـرەکان هاتنـە لای فـیرعەونو خڕبوونـەوە، وەك لـە سـوورەتی (الشعراء)داو، لە سوورەتی (طه)دا بە تەفصیلْ خوای پەنهانزان باس دەکـات، هەروەهـا لـە سـوورەتی (الأعـراف)دا، باسـکراوە: چـۆن هـاتوونو، داوای کـریْو پاداشتو خەلاتیان لە فیـرعەون کردوە؟ بـەلام لـێرەدا هـەر بـە کورتیـی دەفـەرمویْ: هـەر دوای ئـەوەی جادووگـەرەکان هاتنـە لای فیـرعەون، مووسـا پێـی گوتـن: ﴿ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴾، هەرچی فڕێـی دەدەن، فڕێـی بـدەن، دیـارە جـادووەکە لـەو جۆرە بـووە، کە گۆچانیان فڕیْ داون، گوریسو پەتیان فڕیْ داون، لـە پـێش چـاوی خەلـْك بوونـە مـار، ئـەم (ف)ایـەی سـەر (فلمّا) واتـە: کـە جادووگـەرەکان هـاتن، یەکسەر دوای هـاتنیـان، مووسـاش گوتی: هەرچی دەتـانەوی فڕێـی بـدەن، لـە پـەتو گـۆچان، بیهاوێن، هـیچ درێغـی مەکـەن، ئـەوەش دەکـاتە بێمنـەتییو بێباکـیی مووسا (علیه السلام).

(الإِلْقَـاء: رمـي الشـيء فِي اليـد إلـى الأَرْضِ)، (إلقـاء) ئەوەیـە کـە شتێکـت بەدەستەوە بیْ، فڕێـی بدەیـە سـەر عـەرزیْ.

ئەمەش بەلْگەیە لەسـەر ڕەوابوونی، داواکـردنی ئەهلی هەق، کە ئەهلـی باتیـلْ قسە بکـەنو، شـتی خۆیـان بخـەنەڕوو، واتە: تـۆ بۆت هەیـە ئەگەر لەگەلْ کەسێکی مولـحیددا، کەسێکی نەیـارو دژ بـە ئیسلام دا، گفتوگـۆت کـرد، بـۆت هەیـە پێـی بلێی: پێشـیْ فـەرموو : قسـەی خـۆت بکـە، چی پێتـە بیلـێ، چی لـە هەگبـەتـدا هەیــە، هەلْیـڕێـژە، چونکـە مووسـا (علیه السلام) بـە جادووگەرەکـانی گـوت: جادووەکانی خۆتـان فـڕیْ بدەن، چی پێتـانە فڕێـی بـدەن! بۆئـەوەی دەربکـەویْ بایـی چـەندە، تاکـو دواییش هـەق دێتـە بەرانبـەریو، سـەرەنجـام: پووچـییو بۆشـییو بیْ نێوەڕۆکیی ئەو باتیلە دەربکـەویْ.

**بڕگــەی ســێیــەم :** ﴿ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ ٱلسِّحْرُ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبْطِلُهُۥٓ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨١﴾ ﴾، ئنجا کاتێک فڕێیانـدا (هەرچی پێیان بوو، گۆچانو پەتو گوریسو هەرچی بوو) مووسا پێی گوتن: ئەوەی کە ئێوە هێناتان، جادوویە، ئەوەی کە کردتان جادوویە، بێگومان خوا هەڵیدەوەشێنێتەوەو پووچەڵی دەکاتەوە.

چونکـە هـەر بۆخـۆی پووچـە، وشـەی: (باطل) هـەر جـەرِسی بێژەکـەی دەلالەت دەکات لەسـەر شتێکی بـۆشو بـێ نێوەرِۆك، (باطل)و (طبل)و ئـەو وشـانەی کـە بـە (ب، ط، ل) پێـك دێـن، وەك (إبن فارس) لە (مُقاييس اللُغة)دا دەڵێ : دەلالەت دەکەن لەسـەر شتێك کە دەنگی هەبێ، بەڵام سەنگ نەبێ، یاخـود ڕواڵەتی هەبێ، بەڵام نێوەرِۆکی نەبێ، بـەڵام دەبێ هـەق بێتـە بەرانبـەر باطیـڵ، ئەوجار ئەو (باطل)ە پووچییـەکەیو، بێ نێوەرِۆکییەکەی دەردەکەوێ.

دوایـی مووسـا ﷺ وەك یاسـایەکی خـوا لـە ژیـانی بەشـەردا، دەیخاتـە ڕوو، دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾، بـە دڵنیـایی خـوا کـاری تێکـدەران چـاك نـاکات، واتـە: نـاهێڵـێ ئـەنجامی هەبـێ، بەڵـێ زەرِ دەدا، خـەڵك چەواشـە دەکـات، بـەڵام دوایی بـێ ئاکامو ئەنجـامە.

کـە دەفـەرموێ: ﴿ مَا جِئْتُم بِهِ ٱلسِّحْرُ ﴾، دەڵـێ : ئـەو (ما)یـە لـە زمـانی عەرەبییـدا (ما موصولـةٌ) بـە مانـای (الـّذي) دێ، یانـی: ئـەوەی کـە هێنـاتـان جادوویـە، هەروەها خوێنراویشـەتەوە: (مَا جِئْتُمْ بِهِ آسِحْرُ) ئایا ئەوەی هێنـاتـان، جادوو بـووە؟!

ئنجا لە کۆتـایی ئەم قۆنـاغـەدا دەفـەرموێ :

**بڕگـەی چـوارەم :** ﴿ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾، وە خوا بە وشەکانی خۆی حەق دەچەسپێنێ، هەرچەندە تاوانباران پێشیان ناخۆش بێ، هەرچەندە ناڕازیش بن.

لێرەدا وشەی (كلمات) وەك زۆر جاری دیکەش گوتوومانە، (الكلمات مستعارة لتعلق قدرة الله تعالى بالإيجاد والتكوين) واتە: (كلمات) وشەکان، خوازراوەتەوە بۆ چۆنیەتی پەیوەست بوونی دەسەڵاتی خوا، بە دروست بوونو هێنانە دی شتەکانەوە.

دەشگونجێ بڵێین: (كَلِمَات) ﴿ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ ﴾ {کە خوێنراویشتەوە: (بِكلِمَتِهِ) لە شوێنی دیکەش دا (كَلِمَة) هاتوە} واتە: بڕیارەکانی خوا، یان یاساکانی خوا، یان ویستو ئیرادەی تەکوینیو قەدەریی خوای پەروەردگار، کە سیفەتێکی خوایەو شتەکانی پێ ئەنجام دەدات.

واتە: مووسا (عليه السلام) لێرەدا ئەو ڕاستییە ڕادەگەیەنێ کە کردەوەی ئەوان، بێ ئەنجام دەبێ، مادام تێکدەرو خراپەکارن، خوا کردەوەکەیان دەپووچێنێتەوە، پیلانەکەیان هەڵدەوەشێنێتەوە، ئەو هەقەش کە مووسا هێناویەتی خوا بە هاروونو مووسادا ناردوویەتی، ئەو هەقەش، خوا بە بڕیارەکانی خۆی، بە یاساکانی خۆی، دەیچەسپێنێ، چونکە ئەوەی کە لە ژیانی خەڵکدا سوودی هەیە، دەمێنێتەوە، ئەوەی کە زیانی هەیە، دەڕوات، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ ... فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَآءً وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمْكُثُ فِى ٱلْأَرْضِ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿١٧﴾ ﴾ الرعد، پووشو پەڵاشو خشب خاڵو کەفو کوڵی سەر دەریاو لافاو دەڕوات، بەڵام ئەوەی سوودی هەیە بۆ خەڵك، کە ئاوەکەیە دەمێنێتەوە، عەرەب دەڵێن: (لا يَصِحُّ إلاّ الصَّحِيح) هەر ئەوە ڕاست دەردەچێ، کە ڕاستە، بەڵام شتی دیکەی پووچ، با خەڵکێکیش پێی هەڵخەڵەتێ، سەرەنجامەکەی دەردەکەوێ، وەك گوتراوە: (مەیدانی درۆیە کورتە).

**مەسەلەی سێیەم :**

**قۆناغی سێیەم:** ئەمیش لە چوار ئایەت پێك دێ: (٨٣، ٨٤، ٨٥، ٨٦)، ئەم قۆناغەش بریتیە لە باسی: بڕواهێنانی گەنجەکانی گەلی مووسا (علیه السلام) و داواکردنی مووسا لێیان کە خۆڕاگر بن‌و پشت بە خوا بەستوو بن، هەروەها باسی ئەوەیە کە خوا ﷻ دوای ئەوەی جادووگەرەکان هاتوون‌و جادووی خۆیان کرد، مووسا (علیه السلام)ی دڵنیاکردەوە کە جادووەکەی ئەوان بێ ئەنجامەو، ئەو هەقەی کە بەودا نێردراوە، ئایندە لە گرەوی ئەودایە.

**ئێستاش با ئەو چوار ئایەتە لە شەش بڕگەدا شی بکەینەوە :**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوۡمِهِۦ عَلَىٰ خَوۡفٖ مِّن فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِمۡ أَن يَفۡتِنَهُمۡۚ وَإِنَّ فِرۡعَوۡنَ لَعَالٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٨٣ ﴾، واتە: جگە لە وەچەیەك لە گەلەکەی، (گەلی مووسا) کەس بڕوای بە مووسا نەهێنا، جگە لە تازە پێگەیشتوانێك لە گەلەکەی، کەس بڕوای بە مووسا نەهێنا.

وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا، واپێدەچێ ئەوە لە سەرەتاوە بوو بێ، یاخود لەو کاتەدا کە مووسا (علیه السلام) لەگەڵ جادووگەرەکاندا ڕووبەڕوو بۆتەوەو، گۆچانە موعجیزەکەی هەموو جادووەکانی ئەوانی هەڵلووشیوەو، بۆڕی داون‌و شکاون لە بەرنبەریدا، لەو کاتەدا جگە لە تازە پێگەیشتووانێك لە گەلی مووسا، کەس بڕوای پێ نەهێنا، چونکە دوایی هەموو گەلی بەنی ئیسرائیل کەوتۆتە شوێن مووسا، کەواتە: هەموویان بڕوایان پێ هێناوە، بەڵام واپێدەچێ ئەمە لە سەرەتایەکەیەوە بوو بێ.

هەمیشە چینی گەنج‌و تازە پێگەیشتوو، عەقڵیان ئازادترە، چونکە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەست‌و پێی نەبەستوون، وە عادەت‌و نەریت‌و فەرهەنگ‌و

کلتووری کۆمەڵگا، عەقڵو مێشکی داگیر نەکردوونو ئازاترنو، ئازادتریشن، بۆیە ئەوانە بڕوایان پێ هێناوە.

**بڕگەی دووەم** : ﴿عَلَىٰ خَوْفٍ مِّن فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِمْ أَن يَفْتِنَهُمْ﴾، وێڕای، وە سەرباری ترسیش لە فیرعەونو دەستەو دایەرەو قسە ڕۆیشتووەکانیاندا، کە ئەشکەنجەیان بدەنو سزایان بدەن.

کە دەفەرموێ: ﴿عَلَىٰ خَوْفٍ﴾، (علی) لێرەدا بە مانای (مَعَ)یە، واتە: (مَعَ خوفٍ) لەگەڵ ترسیشدا، وێڕای ترسیش، بەڵام هەر بڕوایان پێ هێنا، کە ئەمە مەدحێکی گەورەیە بۆ ئەو چینە گەنجە، بۆ ئەو وەچەیە، ئەو تازە پێگەیشتووانە، کە ئیمانیان بە مووسا هێناوە، لەگەڵ ئەوەش دا کە ترسیان لە فیرعەونو، دەست ڕۆیشتووەکانیان، هەبووە، وا پێدەچێ مەبەست پێی دەست ڕۆیشتووەکانی بەنی ئیسرائیل بێ، ئەوانەی کە لە خزمەت فیرعەون دابوون، بەرژەوەندییەکانیان لە ژێر سایەی دیکتاتۆریەتی فیرعەوندا بۆ دەستەبەر بوون، یەکێکی وەك قاروونو، کەسانی دیکەی هاوشێوەی.

هەندێکیش گوتوویانە: (وَمَلَإِيْهِمْ) هەرچەندە ڕاناوی کۆیە، بەڵام بۆ فیرعەون دەچێتەوە، چونکە پادشاو دەسەڵاتدارەکان، ئاوا بە گەورە گیراون، واتە: خوای کاربەجێ لێرەدا بە پێی عەقڵیەتی خەڵکی میسرو ئەوانە کە فیرعەونیان بە گەورە گرتوە، ڕاناوی کۆی بۆ بەکارهێناوە، واتە: دەست ڕۆیشتووەکانی فیرعەون، بەڵام وا پێدەچێ زیاتر مەبەست پێی ئەو دەست ڕۆیشتووانەو ئەو دەستە دایەرەی فیرعەون بێ، کە لە گەلی مووسا بوون، کە هەر خەڵکی ئەو گەنجو تازە پێگەیشتووانە بوون.

ئنجا ترسەکەیان لە چی بوو؟ (أَن يَفْتِنَهُمْ) یانی: (أَنْ يُعَذِّبَهُمْ) چونکە ئەسڵی وشەی (فَتْن) ئەوەیە کە زێڕنگەر زێڕ بخاتە سەر ئاگر، تاکو قاڵی بکاتەوەو دەربکەوێ چەندەی زێڕەو، چەندەی کانزای دیکەی ڕەگەڵ خراوە،

واتە: هەرچەندە ئەو ترسەشیان هەبوو، وێڕای ئەو ترسەش، بەڵام هەر بڕوایان پێی هێنا.

<u>بڕگەی سێیەم :</u> ﴿ وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾،
وە بێگومان فیرعەون خۆ بەرزكەرەوە بوو لە زەویدا، دەست ڕۆیشتووو بالأدەست بوو لە زەویداو، بێگومان زۆریش لە زیدەڕۆیی كاران بوو، تێی دەپەڕاند لە هەموو شتێكدا، لە سزادانی خەڵكو ئەشكەنجەداندا، لە خۆ بە زلگرییدا، لە هەموو شتێكدا، عادەتی وابوو تێی دەپەڕاند.

كەواتە : ئەو كۆمەڵە گەنجە، ئەو تازەپێگەیشتووانە ترسەكەیان بە بەلاش نەبوو، هەڵبەتە ئەوەش مەدحو ستایشێكی گەورەی خوای پەروەردگارە بۆ ئەوان، یانی هەرچەندە ئەو فیرعەونە، خۆ بەزلگرو بالأدەست بوو، زۆر زێدەڕۆیی كارو تێپەڕێنەریش بوو، لەو لاشەوە : قسە ڕۆیشتووانو دەستەو دایەرەی گەلەكەی خۆشیان ڕەگەڵی كەوتبوونو بە كرێگیراوی بوون. لەبەرئەوەی بەرژەوەندیی ناشەرعییان لە ژێر سایەی ڕژێمە دیكتاتۆرەكەی فیرعەوندا بۆ دەستەبەر دەبوو، بەڵام هەر ئیمانیان هێنا.

دەڵێ : (العلوُّ : مُستعَارٌ للغَلَبَةِ والإستبْداد)، وشەی (عُلو) یانی: بەرزییو بالأدەستی، بەڵام خوازراوەتەوە بۆ زاڵبوونو تاكڕەوییو خۆ سەپاندن، وەك لە سووڕەتی (القصص)یشدا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ ﴾، واتە: فیرعەون لە زەویدا خۆی بە بەرز گرت، واتە : زاڵ بوو بەسەر خەڵكەكەداو، تاكڕەوانە حوكمی دەكرد...

﴿ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾، (إنَّ) ئامرازی تەئكیدەو (ل) لامەكەش بۆ تەئكیدو جەخت كردنەوەیە، ئنجا كە دەفەرموێ : ﴿ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾، ئەوە زۆر

لەوە بەهێزترە بگوترێ: (إِنَّهُ كَانَ مُسْرِفاً)، یان (مِنَ الـمُسْرِفِين)، چونکە ﴿ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾، واتە : فیرعەون سیفەتی زێدەڕۆیی‌و تێپەڕاندن‌و سەرکێشیی، هێندە تێدابوو، چووبووە نێوقەدی ئەو کۆمەڵەوە، کە پێیان دەگوترێ: زێدەڕۆییکاران‌و تێپەڕێنەران.

__بڕگەی چوارەم__ : ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوْمِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾ یونس، وە مووسا گوتی: ئەی گەلەکەم! ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خوا هێناوە، هەر پشت بەو ببەستن، ئەگەر بۆ ئەو ملکەچن !

یانی ئەگەر ئێوە بەڕاستیی بڕواتان هێنابێ، دەبێ هەر پشتیش بە خوا ببەستن، چونکە هەر کەسێ بڕوای بە خوا هێنا بێ، بۆ خوا ملکەچ‌و گەردنکەچ دەبێ، متمانەو باوەڕی ڕەهای بە خوای پەروەردگاری دەبێ، بۆیە پشتی پێ دەبەستێ : ﴿ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴾، ئەگەر بڕواتان بە خوا هێناوە بۆ خواش ملکەچن، پشتی پێ ببەستن، واتە: دوو مەرجی باسکردوون :

یەکەم : بڕوا پێ هێنان.

دووەم : ملکەچ بوون.

واتە: (الإيمان والإسلام) کە یەکەمیان پەیوەندیی بە دڵ‌و دەروون‌و بە ناخی ئینسانەوە هەیە، کە ئیمانە، ئەوی دیکەشیان پەیوەندیی بە ڕواڵەتی ئینسانەوە هەیە، واتە: ئەگەر بە (قلب)و (قالب)، بە دەروون‌و ڕوواڵەت، ئەگەر بە پەنهان‌و ئاشکرا، ئێوە بەندایەتیی خۆتان بۆ خوا ساغ کردۆتەوە، پشت هەر بەوی ببەستن.

برگـــەی پێنجـــەم : ﴿ فَقَالُواْ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، خەڵكی ئیماندار ئاوایە بۆ قیادەی خۆی، بۆ سەرپەرشتیارو بۆ ڕێنمایی كاران‌و سەركردەی خۆی، چونكە (ف)ی (فقالوا) دەگونجێ بۆ (تعقیب) بێ، یانی: یەكسەر بەدوای ئەوەدا گوتیان: تەنیا پشتمان بە خوا بەستوە، چونكە (الجار المجرور) كە پێشدەكەوێ، مانای كورت هەڵهێنان (حصر) دەگەیەنێ، یانی: (حَصَرْنا تَوَكُّلَنا عَلَيْهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالى) یانی: پشت بەستنی خۆمان لە خوادا كورت هەڵهێناوە تەنیا پشتمان بە خوا قایمە ﴿ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، پەروەردگارمان! مەمانكە بە مایەی، یاخود: جێی ئەشكەنجە دران بۆ كۆمەڵی ستەمكاران، واتە: با نەتوانن سزامان بدەن‌و ئەشكەنجەمان بدەن.

(الطبري) لە تەفسیرەكەی خۆی (جامع البيان)[1] دوو واتای بۆ لێكداونەوە، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدان :

یەكەم/ (لا يَظْهَرُوا عَلَيْنا، فَيَروا أَنَّهُمْ خَيْرٌ مِنّا، فَيَزْدَادُوا طُغْيَاناً)، واتە: با ئەوان بەسەر ئێمەدا سەرنەكەون، كە دوایی پێیان وابێ : ئەوان لە ئێمە چاكترن‌و، ئایین‌و بەرنامەی ئەوان لە هی ئێمە ڕاستترە بەهۆی ئەوەوە زیاتر سەركێش‌و یاخیی ببن لە تۆ.

دووەم/ (لا تُسَلِّطْهُمْ عَلَيْنا فَيَفتِنونا وَيُعَذِّبُونا) واتە: ئەوانمان بەسەردا زاڵ مەكە، كە سزاو ئەشكەنجەمان بدەن‌و ئازارمان بدەن.

هەردووك ڕایەكانیش جوانن.

(الشعراوي)یش لە (مُختصر الخواطر)ەكەی خۆیدا[2] دەڵێ: (لاَ تَجْعَلْنا مَفْتُونِيْنَ بسببِهِم، وَلا فَاتِنِينَ لَهُمْ) واتە: ئێمە مەكە بە ئەشكەنجەدراو بەهۆی

---

١) ج ١١، ص ١٦٦.

٢) ج ٢، ص ٧٠٠.

ئەوانەوە ئەوان ئێمە تووشی فیتنە بکەن، یاخود ئێمە ئەوان تووشی فیتنە بکەین، بەهۆی بێ دەسەڵاتییمانەوە، پێیان وابێ کە ئەوان لەسەر هەقن، بۆیە بەسەرماندا زاڵن .

لە کۆتایی دا دەپاڕێنەوە دەڵێن:

**برگەی شەشەم :** ﴿ وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، وە بە بەزەیی خۆت لە کۆمەڵی بێ بڕوایان دەربازمان بکە، قوتارمان بکە.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەست ئەوەیە، کە ئێمە هیچ بە خۆمان نازانین، خۆمان تەسلیمی تۆ کرد، تۆش قوتارمان بکەو دەربازمان بکە، ئێمە لەسەرمانە خۆڕاگربین، بەڵام دەرووکرانەوەو دەربازکران، عایدی تۆیە.

ئنجا ئەگەر تەماشا بکەین دەبینین: خوای دادگەر گەلی فیرعەون بە (ظالمین، کافرین، مُجرمین ، فاسقین) بەو هەموو سیفەتانە ناوزەدو پێناسە دەکات، کە دیارە کەسانێکیش ئاوا بن: ستەمکار بن، لادەر بن، بێبڕوا بن، تاوانبار بن، سەرەنجامیان هەر بەو شێوەیە دەبێ، کە خوا باسی کردوە.

**مەسەلەی چوارەم :**

**قۆناغی چوارەم:** ئەم قۆناغە لە ئایەتی (٨٧)دا خراوەتەڕوو، بریتیە لە: ڕێنمایی کردنی خوا بۆ مووساو هاڕوون سەلامی خوایان لێ بێ، کە خۆیانو گەلەکەیان مەنزڵگای تایبەتییان هەبنو، خوا پەرستیی بکەنو، دڵخۆشو شادمان بن کە دەروویان لێ دەکرێتەوەو دەرباز دەبن.

**ئێمە لە چوار برگەدا ئەو ئایەتە شی دەکەینەوە :**

**برگەی یەکەم :** ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتًا ﴾، وە سرووشمان کرد بۆ مووساو برایەکەی (هاڕوون) کە مەنزڵگایان بۆ گەلەکەی خۆتان ساز بکەن.

(التَّبَوُّؤُ: إتِّخَاذ مَكَانٍ يَسْكُونهُ، وَهُوَ تَفَعُّلٌ مِنَ البَوْءِ، وَهو الرُّجُوعِ، كَأَنَّ صَاحِبَ المَسْكَنِ يُكَلِّف نَفْسَهُ الرجوعَ إلى مَسكَنِهِ، بعد العمل والإكتساب).

(تَبَوَّءْ) بریتیە لەوە کە ئینسان جێورێیەك پەیدا بکات، خانوویەك، ماڵێك، (تَفَعُّلْ)ە، لە (بَوْء)، یانی: (رُجُوع) (بَاءَ، يَبُوءُ، بَوْءًا) یانی: (رَجَعَ، يَرجِعُ، رُجُوعًا) وەك ئەوە کە بابای خاوەن ماڵ خۆی ئەزیەت بدات، بەوە کە چۆتە دەرو دەشت بۆ کارو کەسابەت دوایی بگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی. یانی: وا لە خۆی دەکاتو خۆی ناچار دەکات، بگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی.

ئنجا لێرەدا دەربارەی چەمكو واتای ئەم ڕستەیە، ڕستەی دوایش کە دەفەرموێ :﴿ وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةً ﴾:

**<u>بڕگەی دووەم :</u>** ﴿ وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةً ﴾، وە ماڵەکانی خۆتان بکەنە قیبلە.

لەوبارەوە زانایانو توێژەرەوانی قورئان، زۆر شتیان گوتوە، بەڵام ئەوەی من بۆم دەرکەوتوە، بەم شێوەیە :

ناگونجێ کە پێشتر گەلی بەنی ئیسرائیل جێگاو ڕێگاو ماڵو حاڵی خۆیان نەبوو بێ، چونکە هەندێك لە توێژەرەوان وایان لێکداوەتەوە، یانی : با ماڵو حاڵیان پەیدا بێ، خانوو جێورێیان پەیدا بێ، بەڵام ناگونجێ لە حاڵێك دا کە چەند پشتیان لەوێ بڕاونەوە، خانوو جێگاو ڕێگایان نەبوو بێ !

کەواتە: مەبەستێکی دیکەی هەیە، بۆیە وا دیارە مەبەست جێگای سەفەریی بووە، بۆ ئامادە بوون بۆ ڕاکردن.

کە ئەمە لە (سفر الخروج) لە (الكتاب المُقَدَّس)دا هاتوە، دەڵێ : (ثُمَّ قَال الرب لِمُوسَى: أُمثُلْ أَمَامَ فِرْعَوْنَ، وَقُلْ لَهُ هَذَا مَا يُعْلِنُهُ الربّ : أَطْلِقْ سَرَاح شَعْبِي لِيَعْبُدُونِي) واتە: پەروەردگاری مووسا بە مووسای فەرموو: بچۆ بۆ لای فیرعەونو، پێی بڵێ: پەروەردگارم ئەوەی ڕاگەیاندوە: گەلەکەم بەربدە

ئازادیان بکـە، تـاکو بەندایەتیـی بۆ من بکـەن، (واتە: بەندایەتیی بۆ خـوا بکەنو چی دیکـە کۆیلـەی تۆ نەبـنو نەیانچەوسـێنیـەوە)[1].

کەواتـە: مووسا (علیه السلام) کە چووە بۆ لای فیـرعەون، لە تەوراتدا چەندان جار دووبـارەی کردۆتـەوە، کـە بـە فیـرعـەونی گوتـوە: گەلـی بـەنی ئیسرائیلم لەگەڵ بنێرە، ئـەویش چـەند جارێك بەڵێنـی پێداوە، بـەڵام دوایی لـێی پاشگەز بۆتـەوە، ئنجـا خـوای کارزان دوای ئەوەی مووسـاو هاروون نـا ئومێدبوون، لـەوەی کە بەنـی ئیسـرائیل بە خۆشیـی دەربـاز بکەنو، فیـرعەون مۆڵـەتیـان بـدات بـڕۆن میسـڕ بەجێ بهێڵـن، فەرموویـەتی: جێگاو ڕێگایەکی وایان بـۆ سـاز بکـە، بۆ ئەوەی لەبەرچاوی فیـرعەونییەکاان نەبن، لەبەرچاوی سیخوڕو جاسووسەکانی فیـرعەون نەبـن، هەندێـك دوور بن، بۆ ئەوەی کـە دەرفـەتی ڕاکـردنو هەڵاتنیـان ببێو، کە ڕایـان کـرد، یەکسـەر فیـرعەونو دارو دەسـتەکەی پێیـان نـەزانن، بێن بیانـگرنـەوە.

ڕۆژی دەرچوونیشـیان، کە دوایی لە لایـەن جوولـەکەکـانەوە کـراوە بـە جـەژن، پێـی دەگوتـرێ: (عید الفصح) ئەو ڕۆژە بووە، کـە دەرچوون لە میسڕو دەربـازیـان بـووە، کردوویـانە بە جـەژن.

ئنجا کـە دەفەرمـوێ :

﴿ وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةٗ ﴾، زانایان سێ واتایان بۆ لێکداونەوە، ڕاستە مانـایەکەی : {ماڵەکانی خۆتـان بکەنە قیبلـە} بەڵام مەبەست پێی چییـە؟!

یـەك : واتـایەکی ئەوەیە کـە : بـا ماڵەکانتـان ڕووبـەڕووی یەکـدی بـن، واتـە: ئاگـاتـان لە هەستو خـوسـتی یەکـدی بـێ، ئەگـەر جـەندرمەکانی فیـرعەون هاتنـە سـەر ماڵێکتـان، ئەوانی دیکە بزانـنو بەرگـریی لـێ بکـەن، بـا ئاگـایان لە یەکدی بێ، هـەر ماڵە لـە سووچێكو لە پەڕگـەیەك نەبـێ، کـە ئاسانتـر زەفـەرتـان پـێ دەبـەن.

---

[1]) التَفسير التَطبيقي للكتاب المُقَدَس، العهد القديم، سِفر الخروج، الإصحاح ٨، ص ١٤٤.

دوو : یاخود (مُتَجِهةً للقِبلَة) با ماڵەکانتان ڕوو بە قیبلە بن، کە مەبەست پێی کەعبەیە، ڕوو بە کەعبە بن.

سێ : یاخود (إجعلوها مَكَانَ صَلاَتِكُمْ) واتە: ماڵەکانتان بکەن بە ڕووگە. بیکەنە شوێنی خوا پەرستییو مزگەوت، واتە: بۆ خوا پەرستیی مەچنە شوێنەکانی دیکە، هەر لە ماڵەکانی خۆتاندا خوا پەرستیی بکەن.

بەڵام من مانای یەکەمیانم پێ ڕاستترە، کە ئەویش لەبەر لایەنی ئەمنیی بووە، چونکە لە ڕووی ئەمنییەوە: ئەگەر خەڵکێك زەختو فشاری دەسەڵاتێکی لەسەر بێ، وا باشە لە نیزیك یەکدی بن، چاکتر لە فریای یەکدی دێن. قووەتو هێزو پێزیان زیاتر دەبێو دوژمن زیاتر حیسابیان بۆ دەکات، نەك هەر ماڵێ لە شوێنێكو هەر کەسە ڕووی لە جێیەك بێ.

ئەو قۆناغە دیارە قۆناغێکی زۆر سەخت بووە، بۆ بەنی ئیسرائیل، بۆیە خوا ﷻ ئاوا بەو میهرەبانییو سۆزو بەزەییە بێ سنوورەی خۆی، خەمی لێخواردوون، لە ڕووی ئەمنییەوەو، لە ڕووی پارێزرانو سەلامەتییانەوە.

پاشان بۆ زەمینەسازیی بۆ دەربازبوونیان، پێویستییان بەوە هەبووە، جێگاو ڕێگای دیکەیان هەبێت.

**برگەی سێیەم :** ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾: وە نوێژ بەرپا بکەن، سەرگەرمی تاعەت بن، خۆڕاگر بن، هەڵبەتە بەهۆی تاعەتو پەیوەندیی لەگەڵ خواوە ئینسان خۆڕاگر دەبێو، زیاتر دەتوانی بەرهەڵستیی کۆسپو تەگەرەکان بکات.

**برگەی چوارەم :** ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾: وە بڕواداران دڵخۆش بکەو موژدەیان پێ بدە، واتە: با شادمان بنو لە حاڵەتی دڵ ئارامییدا بن، نەك لە حاڵەتی دڵەڕاوکەدا، پێیان وا نەبێ کە ئەوەی فیرعەونو داروددەستەکەی لە دژیان دەکەن، بۆیان دەچێتە سەر، نەخێر، تەنگانە بەریان کورتەو لە دوای هەورازان نشێوە، ئاوا دڵخۆشیان بکات.

**مەسەلەی پێنجەم :**

**قۆناغی پێنجەم:** پاڕانەوەی مووسا (علیه السلام) لە خوا كە ماڵو سامانی فیرعەونییەكان لەبەین بەرێو، دڵیان ڕەق بكات : ئیمان نەهێنن، تاكو سزای خوا دەبینن‌و، گیرابوونی پاڕانەوەكەیان لەلایەن خواوە.

ئەمیش لە هەردووك ئایەتی : (٨٨ و ٨٩) خراوەتە ڕوو، لە چوار برگەدا شیییان دەكەینەوە :

**برگەی یەكەم:** ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِكَ ﴾، وە مووسا گوتی: پەروەردگارمان! تۆ بەخشیوتە بە فیرعەون‌و دەستەو دایەرەكەی : جوانیی‌و سەروەت‌و سامانێك لە ژیانی دنیادا، پەروەردگارمان ! كە سەرەنجام خەڵك لە ڕێبازی تۆ گومڕا دەكەن‌و لادەدەن.

ئەم لام (ل)ە، زانایان دەڵێن: لامی (تعلیل) نیە، واتە: خوایە! تۆ بۆیە ماڵو سامانت پێداون، تاكو خەڵك لە ڕێی تۆ لادەن، چونكە مەعقووڵ نیە، خوای پەروەردگار پێی خۆش بێ خەڵك لە ڕێی ئەو لابدرێو، كەسێك كە خەڵك لە ڕێی ئەو لادەدا، سەروەت‌و سامانی زیاتری پێ بدات، بۆ ئەوەی چاكتر ئەو كارە خراپەی بۆ ئەنجام بدرێ !

بەڵكو ئەو (ل)ە پێی دەگوترێ : (لام العاقبة) واتە : لامی سەرەنجام، لە زمانی عەرەبییدا ئەو (ل)ە، بۆ ئەو مانایەش بەكاردێ، ئایا وێنەی ئەوەمان هەیە؟! بەڵێ...

لە سوورەتی (القصص) ئایەتی (٨)دا، خوای پەروەردگار لە باسی ئەوە دا كە ماڵی فیرعەون، مووسای مەلۆتكە، هەڵدەگرنەوە كە لەو صندوقەدا بووە، كە دایكی بە ڕووباری نیلی داداوە، دەفەرموێ: ﴿ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ

لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾﴾، واتە: دەستەودایەرەو بنەماڵەی فیرعەون هەڵیانگرتەوە، تاکو بۆیان ببێ بە دوژمنو بە جێی خەمو دڵتەنگیی، ئنجا بێگومان (ل)ی سەر: ﴿لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا﴾ واتە: تاکو سەرەنجام ببێتە دوژمنیانو جێی خەمو دڵنارەحەتییان، نەك ئەوان بۆ ئەوەی ببێتە دوژمنیان هەڵیانگرتبێتەوە! چونکە هیچ کەس دوژمن لە ماڵی خۆیدا پەروەردە ناکاتو، هیچ کەس زیان بۆخۆی ناهێنێ، بەڵکو واتە: تاکو سەرەنجام وای لێ بێ، کە سەرەنجامیش وای لێهات.

ئنجا (لِيُضِلُّوا۟) دوو شێوە خوێندنەوە (قراءة) هەن :

١) (لِيُضِلوا) واتە: بۆ ئەوەی گومڕا بکەن.

٢) (لِيَضِلُّوا) واتە: بۆ ئەوەی خۆیان گومڕا بنو سەرلێشێواو بن.

ئنجا مووسا داوا دەکاتو، دەپاڕێتەوە :

<u>**برگەی دووەم:**</u> ﴿رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾، خوایە ماڵو سامانەکانیان بسڕەوە.

(الطَمْسُ : الـمَحوُ وَالإِزَالَـة) (طَمَسَهُ وَطَمَسَ عَلَيْهِ) (طَمْس) بریتیە لە سڕینەوە، کوژاندنەوە، لابردن، واتە: ماڵو سامانەکانیان مەهێڵە، (طَمَس) دیارە هەم بە (لازم) هاتوە هەم بە (مُتَعَدِّي)، (طَمَسَهُ) واتە: سڕیەوە (طَمَسَ عَلَيهِ) واتە: نەیهێشتو سڕیەوەو لایبرد.

مووسا سەلامی خوای لێ بێ کە تەماشا دەکات: ئەوانە بەهۆی سەروەتو سامانو جوانییو زرقو برقی دنیاوە، زیاتر لە خوا یاخی بوونو لە خۆیان گۆڕاونو لە

كەوڵی خۆیان دەرچوون، داوا لە خوای كارزان دەكات، كە لووتیان بشكێنێ‌و زەبری ئابوورییان پێ بكەوێ‌و ماڵ‌و سامانەكەیان بفەوتێ، یەكێك لەوانە قارِوون، بووە، كە خوای بالادەست دەفەرموێ : ﴿ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾ ﴾ القصص، واتە: خۆی‌و خانووبەرەو كۆشك‌و تەلارەكەیمان بە زەویدا بردە خوار، هەرچی سەروەت‌و سامان‌و خەزێنەو عەمبارەكانی بوون، نەمان.

كە خوا لەبارەیانەوە، دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ ﴾القصص، واتە: كلیلەكانی خەزنەكانی ئەو صندوقانەی كە سەروەت‌و سامانەكەی تێدا هەڵگرتبوون، كۆمەڵە پیاوێك بە زەحمەت پێیان هەڵدەگیران.

ئنجا كە سامانی قارِوون لە بەین چووە، دیارە هی ئەوانی دیكەش بە پێی پارِانەوەی مووسا (علیه السلام) وەك شتێكی یاسادڕ (خارق العادة)، لەبەین چووەو، ئەوەش موعجیزەیەكی دیكەی مووسا بووە.

دیارە مووسا (علیه السلام) پارِانەوەیەكی دیكەش دەكات، داوایەكی دیكەش لە خوا دەكات، دەفەرموێ :

<u>**برگەی سێیەم:**</u> ﴿ وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴾، وە (پەروەردگارمان!) دڵیان توند بكە، دڵیان گرێ بدە، با ئیمان نەهێنن، تاكو ئازاری بە ئێش دەبینن.

(أُشْدُدْ: مُشْتَقٌ مِنَ الشدِّ وهو العُسْرُ، ومِنهُ الشِدَّةُ للمُصيبَةِ، وَمِنَ الشَدِّ وهو الهجومُ، شدَّ عَلَيهِ: هَجَمَ)، وشە (أُشدُدْ) یان لە (شدّ)ەوەیە، یانی: وە زەحمەت خستن‌و شیددەت‌و قورسیی، یاخود لە (شَدَّ)ەوە هاتوە، دەگوترێ: (شَدَّ عَلَيْهِ) یانی: (هَجَمَ عَلَيْهِ) هێرشی بۆ برد، واتە: مەهێڵە بروا بێنن، تاكو سزای توند

دەچێژن، ئنجا چ جای سزای دنیایی بێ، کە خنکانە لە دەریای سووردا، چ سزای دوایی بێ، کە سزای قۆناغی بەرزەخە، پاشتریش قۆناغی چوونە نێو دۆزەخە.

ئنجا خوا وەڵام دەداتەوە:

**برگەی چوارەم:** ﴿قَالَ قَدۡ أُجِيبَت دَّعۡوَتُكُمَا فَٱسۡتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ﴾، واتە: (خوا) فەرمووی : پاڕانەوەکەتان وەڵام درایەوە، گیرا بوو، ئێوەش ڕێك وەستاو بن، بەملاولادا لامەدەن و تێمەپەڕێنن و، بەدوای ڕێبازی ئەوانە مەکەون کە نازانن.

وشەی (قد) لەگەڵ کرداری ڕابردوودا، مانای دڵنیا کردن (تحقیق) دەگەیەنێ، کە ئەو شتە دێتە دی لە داهاتوودا، وەك ڕابردووی لێ دەکات، کە دەفەرموێ : ﴿قَالَ قَدۡ أُجِيبَت دَّعۡوَتُكُمَا﴾، هەرچەندە لە داهاتوودا دێتە دی، بەڵام (قد) کە دێتە سەر کرداری ڕابردوو، وای لێ دەکات کە ئەوە بە دڵنیایی لە داهاتوودا دێتە دی.

کە دەفەرموێ : ﴿فَٱسۡتَقِيمَا﴾، (الإستقامَةُ: الإعْتِدَالُ وَمُلاَزَمَةُ الحَقِ والرُّشْدِ) (إستقامة) بریتییە لە هاوسەنگیی و پەیوەست بوون بە هەق و سەر ڕاستییەوە.

کە دەفەرموێ : ﴿وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ﴾، بە دوو شێوە خوێنراوەتەوە :

١) (ولا تَتَّبِعآنِّ). ٢) (وَلاَ تَتَبِعَانِ) .

هی یەکەمیان دوو (ن)ە، نوونی خۆی کە نوونی دووان (تَثنیة)یە، نوونی دووەمیش، نوونی تەئکیدە (ولا تتبعآنِّ) ئەو کاتە دەبێ بە قەد شەش حەرەکە درێژ بکرێتەوە، یانی: زۆر بە جەخت کردنەوە پێتان دەڵێم: نەکەونە شوێن نەزانان.

ئەگەر ئەوی دیکەش بێ (ولا تتَّبِعانِ) واتە: بەدوای ڕێبازی نەزانان مەکەون.

**مەسەلەی شەشەم :**

**قۆنـاغـی شـەشـەم:** کە لە هەرسێك ئایەتی: (٩٠، ٩١، ٩٢)دا هاتوە: پەڕاندنەوەی گەلی مووسا لە دەریای سوورو، دەربازبوونیان لە فیرعەونو، خنکانی فیرعەونو سوپایەکەی، فوتاربوونی جەستەی فیرعەون، تاکو ببێتە پەند بۆ خەڵکی دوای خۆی :

**ئێمە لە شەش بڕگەدا ئەو سێ ئایەتە شی دەکەینەوە :**

**بڕگەی یەکەم:** ﴿ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ ﴾، واتە: بەنی ئیسرائیلمان لە دەریا پەڕاندنەوە.

کە لێرەدا مەبەست پێی دەریای سوورە، وەك لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا، بە تەفصیلْ باسم کردوە، وەك لە پەیمانی کۆن لە (سِفْر الخروج)، (الإصحاح) (١٤)دا، باس دەکات[1]، دەڵێ (عُبور البَحْرِ الأَحْمَر) پەڕینەوە لە دەریای سوور، کەواتە: خوا بەنی ئیسرائیلی لە دەریای سوور پەڕاندەوە.

**بڕگەی دووەم:** ﴿ فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ وَجُنُودُهُۥ بَغۡيٗا وَعَدۡوًاۖ ﴾، فیرعەونو سەربازەکانی {سوپایەکەی} شوێنیان کەوتن، دەستدرێژکارانەو ستەمکارانە.

(تَبِعَ) یانی: شوێنی کەوت، بەڵام مەرج نیە بیگرێ، بەڵام کە گوتی: (أَتْبَعَهُ) شوێنی کەوتو گرتیشی، پێی گەیشت، کەواتە (فَأَتْبَعَهُم) یانی: (فَلَحِقَهُمْ) فیرعەونو سوپایەکەی شوێنیان کەوتنو پێیان گەیشتن، پێگەیشتنەکەش ئەوە بووە کە گەیشتوونە سەریانو، خەریك بوون بیانگرن، بەڵام نایانگرن، لە سوورەتی (الشعراء)دا باس دەکات، لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا بە تەفصیلْ باسمان کردوە، دوای ئەوەی هاوەڵەکانی مووسا دەڵێن: ئێمە تازە

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المُقَدَّس، ص ١٦٠.

گیراین، وەك خوا فەرموویەتی : ﴿ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ ٦١ ﴾الشعراء، واتە: کاتێك دوو کۆمەڵەکە لەیەك وەدەرکەوتن، هاوەڵەکانی مووسا گوتیان: ئێمە گیراین!

مووسا پێیان دەفەرموێ: ﴿ قَالَ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ٦٢ ﴾ الشعراء، نەخێر وا نیە، پەروەردگارم لەگەڵم دایە، ڕێم پێشاندەدا چی بکەم.

پشتی سوپای فیرعەونەو پێشیشی دەریای سوورە، ئاسمان دوورو زەوی سەخت ! بەڵام مووسا صەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ، متمانەی بە خوای خۆی هەیە، پشت ئەستوورە بە خوای خۆی، کە زایەی ناکا، مادام فەرموویەتی: ڕا بکەن، دیارە دەبێ ڕێیەکیشیان بۆ بکاتەوە بۆ ڕاکردن، ئنجا خوا وەحی دەکا بۆ مووسا : ﴿ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ ٦٣ ﴾الشعراء، واتە: وەحییمان بۆ مووسا کرد، کە بە گۆچانەکەت لە دەریا بدە، ئنجا دەریاکە شەق بوو، وەك چیای مەزن.

چونکە دەریای سوور وەك هەر دەریایەکی دیکە، چەندان مەتر قووڵە، ئنجا دیارە هەمووی وەك بەستەڵەکێك بەستوویەتیو بۆتە دالان دالان، هەتا بووە بە دوازدە دالان، چونکە بەنی ئیسرائیل دوازدە تیرە بوون، تاکو هەر تیرەی بە ڕێیەکدا بڕوا، ئیدی دەریا لە سەرێوە بەستوویەتی تا خوارێ‌و، زەوی وشك دەرکەوتوە بەو شێوەیە دەربازیان بووە فیرعەونو سوپایەکەشی شوێنیان کەوتوونو پێیان گەیشتوون، بەڵام وەك گوتمان: دەریا بۆ وان شەق بوو، ئەوان چوونە نێو ئەو دالانانەوە کە خوای پەروەردگار دروستی کردبوون لە نێو دەریای سووردا، فیرعەونو سوپایەکیشی بەدوایان کەوتن، تا کۆتا نەفەری بەنی ئیسرائیل دەرباز بووو، کۆتا کەسی سوپای فیرعەونیش هاتە نێو ئەو دالانانەوە، ئیدی یەکسەر دەریا وێك کەوتەوە، هەر هەموویان غەرق بوون.

بەڵێ خـوا ئـەو کەسـەیە، ئـاوا لـە فریـات بـێ، دەریـات بـۆ شـەق بکـاتو لـە فیـرعەون دەربـازت بکـات، کـە ئـەو هـەموو لەشـکرو سوپـایەی هـەبـووە، خەڵکێکی چەوساوەو بێ کەسو دەست خاڵیی، ئـاوا دەربـازیان بکات، پەرسـتـراو دەبێ ئـاوا بـێ!

**بڕگەی سێیەم:** ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴾، هەتـا کـاتـێ کـە (فیرعـەون) خنکانی گەیشتێ، ئاوی بەسەر گـەڕاو خەریك بوو بخنکێ، گوتی : بـڕوام هێنـا کـە : جگـە لـەو پەرسـتـراوەی بـەنی ئیسـرائیل بڕوایـان پـێ هێنـاوە هـیچ پەرسـتـراوی دیکە نین.

ئنجـا دەڵـێ : ﴿ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴾، وە من لـە ملکەچانم بۆ خـوا.

وشەی (حَتَّىٰٓ ) بۆ سەرەتـایە، (إِذَآ ) (إذا: فُجَائِيَّةٌ) یـانی : بەردەوام بوو لەسـەر ڕاوەدوونـان شوێنکەوتنـی بـەنی ئیسـرائیل، هەتـا کـاتێك کتوپـڕ: دەریـا وێککەوتـەوە.

﴿ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ ﴾، (أدرَكَهُ يَعْنِي لَحِقَهُ) پێی گەیشت، خنکانی گەیشتە سەری، (الإِدْرَاكُ: هُوَ اللِّحَاقُ وَانْتِهَاءُ السَّيرِ).

(لحاق) ئەوەیە کە شتێك بە شتێك بگـات، وە دوای ئەوەی ڕۆیشـتووە، کۆتـایی بێ، چونکە دیارە پلە پلە ئینسـان دەخنکـێ، خۆ یەکسەر نەخنکـاوە، لەو کـاتەدا کـە ڕووحـی گەیشتۆتە گـەروێ، ئنجـا ئیمـانی هێنـاوە، کـاتێك لەگـەڵ مەرگـدا ڕووبەڕوو بۆتـەوەو، نـائومێـد بـووە لـە ژیـان، زانیویـەتی دەربازی نـابـێ، بۆیـە خوای دادگەر ئیمانەکەی لـێ قبووڵ نەکردوە، ئنجـا خـوا، یاخـود فریشـتەکان، پێی دەڵێن :

**بڕگــەی چــوارەم:** ﴿ ءَآلْـَٔـٰنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾، بـە سەرسوڕمانەوە: ئا ئێستا بڕوا دێنی، کە پێشتر سەرپێچییت کردو یاخیی بووی‌و، تۆ لە تێکدەران‌و لە خراپەکاران بووی؟ ئەم پرسیارکردنە پرسیارکردنی نکووڵیی لێکەرانەیە، واتە: ئێستا تازە کەی بەکەڵك دێ، ئەو ئیمان هێنانەت؟!

( ءَآلْـَٔـٰنَ ) (ظَرْفٌ لِفِعْلٍ مَحْذُوفٍ دَلَّ عَلَيْهِ قَوْلُهُ : آمَنْتُ، يَعْنِي : الآنَ تُؤْمِنُ) یانی: ئەوە زەرفێکە کە کردارێکی فڕتێنراو دەلالەتی لەسەر دەکات، قسەی فیرعەون کە دەڵێ: (آمَنْتُ) دەیگەیەنێ، واتە: ئێستا ئیمان دێنی ؟ کە گوتی : ئیمانم هێنا، خوا دەفەرموێ: ئێستا ئیمان دێنی؟! واتە: ئێستا بەکەڵك نایەت، کەواتە: نکووڵییەکە لە کاتی نەگونجاوی ئیمانەکەیە، نەك لە خودی ئیمانەکە، یانی: خوای کارزان نکووڵیی لەوە نەکردوە، کە بۆچی ئیمانی هێناوە، نکووڵیی لەوە کردوە، کە بۆچی لەو کاتەدا ئیمانی هێناوە، ئەو هەموو وەختەی بەدەستەوە بوو، کەچی لەو چەند چرکەیەدا کە خەریکە گیانی دەرچێ ئێستا بڕوا دێنی! ئێستا هیچ ئازایەتیی تێدا نیە، تازە بۆت دەرکەوت کە مووسا ڕاست بوو، بۆت دەرکەوت کە خوا ﷻ فریای مووساو گەلەکەی هات، ئەو مەزلوومانەی دەربازکردن‌و، ئێستا سزای تۆ دەدات، دوای ئەوەی تۆ لەگەڵ سزاو پەتو سێدارەی خۆتدا ڕووبەڕووی، ئیمان دێنی؟ ئەوە چ ئازایەتییەکی تێدایە؟

ئنجا خوا ﷻ دوو هۆکار باس دەکات بۆ وەرنەگیرانی گەڕانەوەکەی :

یەك : ﴿ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ ﴾، واتە: پێشتر سەرپێچییت کردوە، هەر بە تاوان‌و سەرپێچییەوە ژیانت گوزەراندوە، ئێستا لە نێو ئەو دەریایەدا، لەگەڵ مەرگدا ڕووبەڕوو بوویەوە، هیچ چاکەت پێ ناکرێ، پێشتریش هەر خراپەو سەرپێچییت کردوە.

دوو : ﴿ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾، تۆ پێشتر هەر تێکدەرو خراپەکار بووی، ئێستا چ چاکەیەکت پێ دەکرێ، تازە تۆ ئەو سەرپێچییە، چۆن قەرەبوو

دەکەیەوە بە تاعەت، ئەو هەموو تێکدانو خراپەکارییە، چۆن قەرەبوو دەکەیەوە، بە چاکەکاریی هیچت بۆ ناکرێ، کەواتە: ئەو ئیمانە ڕووکەشییە وەرناگیرێ، بۆیە دەفەرموێ :

**برگەی پێنجەم:** ﴿ فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗ ﴾، ئەمڕۆ تۆ بە جەستەکەت دەرباز دەکەین، واتە: تەنیا جەستەکەتو لاشەکەت دەرباز دەکەین، ئەویش نەك وەك ڕێزگرتن لە تۆ، وەك هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە، یەکێك لەوانە: (محمد الطاهر بن عاشور) کە زۆر بۆچوونی وردو جوانیشی هەن، بەڵام لێرەدا قسەیەکی کردوە، پێم وایە نەگونجاوە، دەڵێ: ئەو دەربازکردنی جەستەیە، جۆرێك بووە لە ڕێزگرتن لە فیرعەون، خوا ڕێزی لە جەستەکەی گرتوە، بەهۆی ئەو ئیمانە ڕووکەشییەوە کە هێناویەتی!!

بەڵام مادام دوایی خوا ﷻ هۆکارەکەی‌و، حیکمەتەکەی بەیان کردوە، پێویست ناکات ئێمە شتێکی دیکەی بۆ هەڵتاشین، چونکە لە ڕاستییدا کەسێك کە بە ناچاریی ئیمان دێنێ، هیچ نیە، ئنجا ئەگەر خوا ڕێزی لێنابایە، ئیمان هێنانەکەی لێ قبووڵ دەکرد، ئنجا ئەو گوتوویەتی : خوا ڕێزی لە جەستەکەی گرتوە، بەڵام لەڕاستیی دا ئەوە وانیە، چونکە خوا ﷻ ڕوونی کردۆتەوە، حیکمەتەکەی چییە : ﴿ فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗ ﴾، ئەمڕۆ جەستەکەت دەرباز دەکەین (نەك لەبەر ڕێزلێنانت) بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی دوای خۆت ببیە پەندو نیشانەو، خەڵك عیبرەتت لێ وەربگرێ، ئێستاش جەستەی فیرعەون لە مۆزەخانەکانی میسرو، هەندێك لە فیرعەونەکان لە مۆزەخانەکانی لەندەن دا هەن، ئنجا هەندێك دەڵێن: ئەویان فیرعەونەکەی مووسا بووە، هەندێك دەڵێن: ئەویانە، گرنگ ئەوەیە جەستەی فیرعەونی مووساو، جەستەی هەندێك فیرعەونی دیکەش دەرباز بوون، کە لە مۆزەخانەکان دا دانراون، گرنگ ئەوەیە خوای پەروەردگار بایی ئەوەندە کە خەڵك بزانێ کە یەکێك لەو فیرعەونانە، فیرعەونی مووسا بووە، کە ئیددیعای پەروەردگارێتیی‌و پەرستراوێتیی بەسەر خەڵکەوە دەکرد ! ئێستا جەستەکەی دانراوە بۆ ئەوەی خەڵك دەرس‌و عیبرەتی لێ وەربگرێ.

وشەی (بِبَدَنِكَ) چوار وشە هەن بەكاریان دێنین، لە زمانی عەرەبییدا: (بَدَن، جِسْم، جَسَدْ، جُثْمَان) هەموویان بە مانای لاشەو كەلەش دێن، بەڵام هەریەكەی بە ئیعتیبارێك :

١/ زانایان گوتوویانە: بە ئیعتیباری بە خۆوە بوونو بە كەلەش بوون دەگوترێ : (بدن)، چونكە: (بَدَانَة) یانی: قەڵەویی‌و بەكەلەشیی.

٢/ پێی دەگوترێ : (جَسَدْ) بە ئیعتیباری ئەوە كە ڕووحی تێدا نیە.

٣/ بە ئیعتیبارێكی دیكە پێی دەڵێن: (جِسْم)، كە بریتیە لە: دیارو بەرچاوبوون.

٤/ پێی دەگوترێ : (جُثمان) بە ئیعتیبارێكی دیكە، كە بریتیە لە : بە زەوییەوە نووسان.

كە دەفەرموێ (لِمَنْ خَلْفَكَ) واتە: (لِمَنْ وَرَائَكَ) بۆ ئەوەی كە لە پشتتەوەیە، یانی: ئەوانەی لەپشت تۆوەن‌و لەدوای تۆ دێن.

**بڕگەی شەشەم:** ﴿ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴾، وە زۆرێك لە خەڵكی لە نیشانەكانی ئێمە بێئاگان.

بەڕاستیی وایە، فیرعەونەكانی دوایی پەند وەرناگرن لە فیرعەونەكانی پێشێ، هەر فیرعەونێك دێ سەری بە فەتارەت دەچێ‌و، هەر بەڕێی هی پێشخۆی دا دەچێ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ وَسَكَنتُمْ فِي مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ ﴾ إبراهيم، واتە: لە جێگاو ڕێگای ستەمكارەكانی پێش خۆتاندا، نیشتەجێ بوون‌و، بۆتان دەركەوت چیمان بەوان كردوەو، وێنەمان بۆتان هێناوەتەوە، كەچی هەر دەرسیشی لێ وەرناگرن.

**مەسەلەی حەوتەمو کۆتایی :**

**قۆناغی حەوتەمو کۆتایی :** کە لە ئایەتی: (٩٣)دا باسکراوە: نیشتەجێ کردنی گەلی بەنی ئیسرائیلو، کەوتنە نێو نازو نیعمەتەوە، کەچی دوای زانیاریی‌و بەرچاو ڕوونیی کە بۆیان هات، کەوتنە نێو گێژاوی ڕا جیایی‌و دووبەرەکیی :

**ئنجا ئێمە ئەم ئایەتە بە پێزە لە سێ بڕگەدا شی دەکەینەوە :**

**بڕگەی یەکەم :** ﴿ وَلَقَدْ بَوَّأْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مُبَوَّأَ صِدْقٍ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾ وە بێگومان ئێمە بەنی ئیسرائیلمان بە شێوەیەکی باش، لە شوێنێکی چاک دا نیشتەجێ کرد.

واتە: نازو نیعمەتێکی زۆرمان بەسەردا ڕشتن، دوای ئەوەی لە ژێر چەکمەو پۆستاڵی فیرعەونو دارو دەستەکەی دەربازمان کردن، دەریامان بۆ شەق کردن، بە بیابانی سینادا هێنامانن، ئنجا گەزۆو سەلوامان پێدان، هەورمان لەسەر کردنە سێبەر، ئەو هەموو نیعمەتانەمان پێدان، پاشان خوای پەروەردگار لە شام نیشتەجێی کردن، دیارە ئەو کاتە خەڵکی لێ نەبووە، یاخود میللەتێکی کافری لێ بووە، کە بۆیان هەبووە ئەوانیش لەوێدا جێیان ببێتەوە، لە شام نیشتەجێ بوون، کە شوێنێکی پڕ بەرەکەتو نازو نیعمەتەو، لە ڕزقو بژیوە خۆش‌و بە تامو بە لەززەتو بە سوودەکان پێمان دان، بەڵام...!

**بڕگەی دووەم :** ﴿ فَمَا ٱخْتَلَفُوا۟ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ ﴾، لە نێو خۆیاندا ناکۆکو ڕاجیا نەبوون، تاکو زانیارییان بۆ هات، واتە: دوای زانیاریی‌و شارەزایی، کەوتنە ناکۆکیی‌و دووبەرەکیی‌و ڕاجیایی، مانای وایە هیچ بیانووو پاساوێکیان نەبوو، کە ئاوا بکەونە ڕاجیاییەوە.

سبحان الله ! زۆرجاروایە کە ئەهلی دین، ئەو عیلمەی کە لە خواوە بۆیان دێ، دوایی یەکێکیان لایەکی دەگرێ، یەکێکی دیکەیان لایەکی دیکەی دەگرێ، ئەمیان بە جۆرێك تێیدەگات، ئەوی دیکەیان بە جۆرێکی دیکەو، ئیدی دەکەونە ناکۆکیی‌و دووبەرەکیی لە بەینی خۆیاندا، کە بە زۆریی لە ئەنجامی :

١/ سەرکێڵ (سَطحي) تێگەیشتن‌و ڕووکەش تێگەیشتن.

٢/ یاخود لە ئەنجامی هەبوونی نەخۆشیی دەروونیی، وەك ئێرەیی (حسد)و بوغزو خۆ بەزلگریی.

٣/ یاخود لە ئەنجامی هەبوونی بەرژەوەندیی ناشەرعیی، وەك بەزم‌و بازاڕو گرووپ‌و تاقم بۆ خۆ دروستکردن دا : ناکۆکیی پەیدا دەبێ.

لە کۆتایی دا خوا ﷻ دەفەرموێ :

**بڕگەی سێیەم:** ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾، بێگومان پەروەردگارت لە ڕۆژی قیامەتدا دادوەرییان لە نێوانیدا دەکات، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونەتە ڕا جیایی‌و ناکۆکییەوە.

واتە: داخۆ کێ لەسەر هەق بووەو، کێ لەسەر ناهەق بووە؟ ئەمەش هۆشداریی دانە بە ئۆممەتی ئیسلام، کە ئێوەش لە ئەزموونی شکست خواردووی گەلی جوولەکە (بەنی ئیسرائیل) پەند وەربگرن، کە دوای ئەوەی خوا تەوراتی بۆ دابەزاندن‌و پێغەمبەری بۆ ناردن‌و دەربازی کردن، ئەو هەموو نیعمەتانەی پێدان، بەرچاوی ڕۆشن کردنەوە، کەچی دوایی کەوتنە ناکۆکیی‌و دووبەرەکیی‌و ڕاجیایی لە بەینی خۆیاندا، ئێوەش ئەی ئۆممەتی ئیسلام لە خۆتان وریا بن! لەدوای زانست‌و زانیاریی‌و لەدوای ئەو شارەزاییەی کە خوا پێی داون، بەهۆی پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ لە بەینی خۆتاندا، بەهۆی ئەو هۆکارانەوە کە ئاماژەمان پێدان، نەکەونە ڕاجیایی‌و دووبەرەکیی‌و ناکۆکییەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی یازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە دە (١٠) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی: (٩٤ ـ ١٠٣)، خوای بەرزو مەزن لەم دە ئایەتەدا، سەرەتا ڕوو دەکاتە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، پێی دەفەرموێ: کە ئەگەر گریمان لە دوو دڵییدایە، لەوەدا کە بۆی نێردراوەتە خوار، با لە خاوەن کتێبە پێشووەکان پرسیار بکات، چونکە ناوونیشانو سیفەتەکانی پێغەمبەری خاتەم ﷺو، پەیامو بەرنامەکەی، لە کتێبە پێشووەکاندا هەیە.

پاشان پێی دەفەرموێ: کە لە دوو دڵانو لە بە درۆدانەرانی ئایەتەکانی خوا نەبێ، ئەگەرنا لە زیانباران دەبێ، کە وەك دوایی باسی دەکەین، لێرەدا هەرچەندە ڕووی دواندن لە پێغەمبەرە ﷺ، بەڵام مەبەست پێی ئەو نیە، بەڵکو مەبەست پێی جگە لەوە، وەك دەڵێ: دیوار لەگەڵ تۆمە، گوێسوانە گوێت لێبێ.

پاشان خوا ڕایدەگەیەنێ کە ئەوانەی بڕیاری خوایان لەسەر چەسپیوە واتە: بەپێی یاسای خوا، کە لە ژیانی بەشەردا دایناوە، ئەوانە کارێکیان کردوە، کە ناتوانن بڕوابێنن، ئەگەر هەرچی موعجیزە هەیە، بۆیان بێت، هەر بڕوا ناهێنن.

دوایی وەك تاکە نموونەی بڕواهێنانی کۆمەڵگایەك، وە دەربازبوونیان لە سزای دنیایی، خوا باسی گەلی یونوس دەکات، پاشان خوا باسی ئەو ڕاستییەی کردوە کە خەڵکی ئازاد کردوە لە نێوان بڕواهێنانو بڕوا نەهێنان دا، ئەگەرنا دەیتوانی بەزۆر بیانکاتە بڕوادار، بەڵام وای نەکردوەو نەیویستوە وابێ، ویستوویەتی مرۆڤ ئازاد بێ، بۆئەوەی بە کەڵکی جێنشینایەتیی خواو، هەڵگرتنی ئەمانەتی خواو، تاقیکرانەوە

بێ لەسەر زەوی، هەروەها ئەو ڕاستییەش دەخاتە ڕوو، کە بەبێ ویستو مۆڵەتی قەدەریی خوا، هیچ کەس ناتوانێ ئیمان بێنێ.

دوایی بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: کە هانی خەڵکی بدات بۆ سەرنجدانی نیشانەکانی خواو، شوێن دەستی خوا، لە ئاسمانەکانو لە زەویدا.

لە کۆتایی دا باسی سەرەنجامی شوومی گەلانی پێشووو، یاساکانی خوا ﷻ لەگەڵیاندا دەکاتو، ڕایدەگەیەنێ، کە خوا هەمیشە لە فریای بڕواداران دێ، وە دەربازیان دەکاتو، دوژمنو نەیارانیشیان لەبەین دەبات.

﴿ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ فَسۡـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقۡرَءُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِن
قَبۡلِكَۚ لَقَدۡ جَآءَكَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ
ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ
عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ
ٱلۡأَلِيمَ ﴿٩٧﴾ فَلَوۡلَا كَانَتۡ قَرۡيَةٌ ءَامَنَتۡ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوۡمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُواْ
كَشَفۡنَا عَنۡهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَمَتَّعۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ حِينٖ ﴿٩٨﴾ وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ
لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ
﴿٩٩﴾ وَمَا كَانَ لِنَفۡسٍ أَن تُؤۡمِنَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَيَجۡعَلُ ٱلرِّجۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ
لَا يَعۡقِلُونَ ﴿١٠٠﴾ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَا تُغۡنِي ٱلۡأٓيَٰتُ وَٱلنُّذُرُ
عَن قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٠١﴾ فَهَلۡ يَنتَظِرُونَ إِلَّا مِثۡلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن
قَبۡلِهِمۡۚ قُلۡ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ نُنَجِّي رُسُلَنَا
وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيۡنَا نُنجِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ ﴾

# مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

{ئنجا ئەگەر لەبارەی (ئـەو قورئـان)ەوە کـە بۆمـان دابەزانـدووی، لـە دوو دڵـییـدای، پرسـیار لەوانـە بکـە کە لە پێش تـۆدا کـتێـب (ی خـوا)یان خـوێـنـدوە (شـارەزای کـتێـبە ئاسمانییەکانن)، بە دڵنیـایی هـەقت لە پەروەردگارتەوە بۆ هـاتوە، (لەبـارەیەوە) لە دوو دڵان مەبە ﴿٩٤﴾ وە لەوانە مەبە کە ئایەتەکانی خـوایان بە درۆ دانان، کە سـەرەنجام بەو هۆیـەوە لە زیانباران بی ﴿٩٥﴾ مسۆگـەر ئەوانەی وشە (بڕیـار)ی پەروەردگارتیـان لەسـەر هاتۆتە دی، بڕوا نـاهـێـنـن ﴿٩٦﴾ ئەگەر هـەرچی نیشانەو موعجیزەشـە بۆیان بێ، تـاکـو ئازاری بـە ئـێش و ژان دەچێـژن ﴿٩٧﴾ دەبووایـە ئاوەدانییـەك (کـە پێغـەمبەری ﷺ بـۆ دەنێـردرێ) بـڕوا بێنــێ و بڕوایەکـەی سـوودی پـێ بگەیـەنێ، (نـەك دوای دەسـتەو یەخەبوونی مەرگ و سزادان، بڕوابێنـێ و سوودی نەبـێ)، جگـە لە گەلی یونوس (هیچ کۆمەڵگایەکی دیکە وای نەکرد)، کە کاتێك بڕوایان هێنا، سزای زەبوونییمـان لـە ژیـانی دنیـادا لەسـەر لابـردن و، هەتـا کـاتێکـی دیـارییکراو، پێمـان گوزەرانـدن، ﴿٩٨﴾ ئەگـەر پەروەردگارت ویستبای (تۆبزیی بکات)، هەموو ئەوانەی لەسەر زەمینن، تێکڕایان، وێکڕا بڕوایان دەهێنـا ﴿٩٩﴾ ئنجا ئایا تۆ خەڵك نـاچار دەکـەی تـاکو ببنـە بـڕوادار، مسۆگـەر هیچ کەسێك بە مۆڵـەتی خـوا نەبێ، بۆی نیـە بـڕوا بێنـێ، وە (خـوا) پیسیی (کوفـر) دەخاتە سەر ئەوانەی نـافامن ﴿١٠٠﴾ بڵـێ: سـەرنج بـدەن! چـی لـە ئاسـمانەکان و زەویـدا هەیە، کوا نیشـانەکان و وریاکەرەوە ترسـێنەرەکان، چ سـوودێك بە کۆمەڵـێك دەگـەیەنن، کە بڕوانـاهێـنـن ﴿١٠١﴾ ئایـا جگـە لە وێنـەی ڕۆژانـی (تێـدا سـزادرانی) ئەوانـەی پێـش وان ڕابــردوون، چاوەڕێی چی دیکە دەکەن! بڵێ: دە چاوەڕوان بن، منیش لەگەڵتـان لە چاوەڕوانـانم ﴿١٠٢﴾ دوایی (هەرکـات سزامان نـارد) پێغـەمبـەرانمـان و ئەوانــەی بڕوایـان هێنـاوە، ڕزگـار دەکەین، بەو شێوەیە (یاسای نەگـۆڕمانە) لەسـەر خۆمانمـان پێویسـت کـردوە، کە بڕواداران ڕزگـار بکـەین (لە هـەر ڕۆژگـارێکـدا) ﴿١٠٣﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

وشەی ﴿شَكٍّ﴾، (الشَكُّ : اعْتِدَالُ النَّقِيضَيْنِ عِنْدَ الإِنْسان وَتَساوِيهِمَا، وَاشْتِقَاقُهُ إِمَّا مَنْ شَكَكْتُ الشيء أي خَرَقْتُهُ، أو من الشَكّ وَهُوَ لَصُوقُ العَضُدِ بالجَنْبِ)، (شك) بە كوردیی (دوو دڵیی)یە، هەرچەندە زۆربەی خەڵك بە گومان لێكیان داوەتەوە، بەڵام لە ڕاستییدا وشەی (ظن) بە مانای گومانە، كە گومان ئەومیە تۆ پێت وابێ شتێك وایەو، زیاتر لای وابوونی، یان لای وانەبوونی زاڵ بكەی‌و بڵێی: گومانم هەیە، ئەو شتە وابێ، یان گومانم وایە ئەو شتە وانەبێ، بەڵام ﴿شَكٍّ﴾، بریتیە لەوە كە دوو شتی پێچەوانەی یەكدی، لەلای مرۆڤ، وەك یەك بن، بە هیچ لایەكیاندا نەشكێت.

وشەی (شك)ش یان لە (شَكَكْتُ الشيء)ەوە هاتوە، واتە: ئەو شتەم دڕی، یاخود لە (شك)ەوە هاتوە، كە بریتیە لەوە قۆڵ بە تەنیشتی ئینسانەوە بنووسێ، ئەو دوو دڵییەش ئاوا بە ئینسانەوە دەنووسێ.

خاوەنی (المعجم الوسيط) جوانی كورت كردۆتەوە، دەڵێ: (الشك: حَالَةٌ نَفْسِيَّة يَتَرَدَّد مَعَهَا الذِّهْنُ بَيْنَ الإِثْبَات وَالنَّفِي، وَيَتَوَقَّفُ عَنِ الحُكْمِ)، واتە: دوودڵیی حاڵەتێكی دەروونییە، كە عەقڵ بەهۆیەوە لە نێوان چەسپاندنی شتێك‌و لابردنیدا، ڕادەوەستێ‌و، هیچ بڕیارێكی بۆ نادرێ.

(ٱلۡمُمۡتَرِينَ ): (امْتَرى فِي الشيء شَكَّ فِيهِ، تَمَارَى القَوْم: تجادَلوا، المِرْيَة: الجدل، وَالشَكُّ، يُقَالُ: هَذِهِ فِرْيَةٌ بِلاَ مِرْيَة)[1] (امْتَرى : فِي الشيء) واتە: تێیدا دوودڵ

١) المعجم الوسيط، ص ٨٦٦.

بوو، دەگوترێ: (تَمَارَى القَوْم) واتە: کۆمەڵەکە موناقەشەیان کرد، لەبەر ئەوەی کە لە شتێکدا دوو دڵبن، دەبێتە مشتومڕیان.

(مِرْيَة) بە مانای شەڕە قسەش دێ‌و، بە مانای دوو دڵییش دێ، دەگوترێ: (هَذِهِ فِرْيَةٌ بِلاَ مِرْيَة) واتە : ئەمە درۆیە بەبێ هیچ دوو دڵییەك.

هەروەها هەندێکیشیان وایان لێکداوەتەوە دەڵێن : (المِرْيَةُ: التَرَدُّدُ فِي الأَمْرِ، وَهُوَ أَخَصُّ مِنَ الشَّكِّ، إِذْ هُوَ شَكٌّ، حَيْثُ لا مُوجِبَ للشكِّ، والمُمَارَاةُ: المحاجّة فِيمَا فِيهِ مِرْيَةٌ).

واتە: (مِرْيَة) بریتیە لە دڵ لە دڵدان لە شتێکدا، کە ئەمە تایبەتترە لە دوو دڵیی، چونکە (مِرْيَة) بریتیە لەوە کە تۆ لە شتێکدا دوو دڵبی، کە نابێ تێیدا دوو دڵبی، وشەی (مُمَارَاة)یش بریتیە لە شەڕە قسە لە شتێکدا کە دوو دڵیی تێدایە.

(حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ) : واتە: بڕیاری خوا، وشەی خوا بەسەریان دا چەسپیوە (حَقَّ الشيء يَحِقُّ، أي: وَجَبَ وَثَبَتَ يثبت)، واتە: ئەو شتە پێویستە بوو، چەسپا، پێویست دەبێ‌و دەچەسپێ.

(كَلِمَتُ رَبِّكَ) : واتە: (قَوْلُ رَبّك، حُكْمُ رَبّك، سنةُ رَبّك) هەموویان دەگرێتەوە، کە دەفەرموێ: وشەی پەروەردگارت، یانی: فەرمودەی پەروەردگارت، بڕیاری پەروەردگارت، یاسای پەروەردگارت.

(قَرْيَةٌ ): دەڵێ: (اسمٌ لِلْمَوْضِعِ الّذِي يَجْتَمِع فِيهِ الناس، والناس جَمِيعَاً، وَلِكُلّ مِنْهُمَا)، وشەی: (قَرية) بە پێچەوانەی مانا باوەکەی، کە ئێستا وشەی (قَرية) بۆ گوندو دێ‌و ئاوەدانیی بچووك بەکاردێ، بەڵام لە بەکارهێنانی قورئاندا، ناوە بۆ شوێنێك کە خەڵکێکی زۆر لێی کۆدەبنەوە، ئاوەدانییەکی گەورە، وە بە شوێنەکە دەگوترێ‌و بە خەڵکەکەش دەگوترێ‌و، بە هەردووکیان دەگوترێ.

(كَشَفْنَا) : واتـــە: لامانبـــرد، (أَزَلْنـــا)، (كَشَـفَ اللهُ غَمَّـهُ، أَي: أَزَالَـهُ)، واتـــە: خـــوا خەفەتو دڵ ناڕەحەتییەكەی لابرد.

(ٱلْخِزْيِ) : (خَزِيَ، خِزْيـاً: ذَلَّ وَهَانَ)، واتـە: سەرشۆڕ بوو، زەبـوون بوو.

(وَمَتَّعْنَاهُمْ) : واتە: ژیاندمانن، پێمان گوزەراندن، (أَمْتَعَ اللهُ فُلانـاً ومَتَّـعَ: أَنْسـأَلَهُ أَجَلَـهُ وَأَبْقَاهُ لِيَنْتَفِعَ بِهِ) لە زمانی عەرەبییدا کە بگوترێ : (أَمْتَعَ اللهُ فُلانـاً) یان (مَتَّعَ اللهُ فُلانـا) واتـە: کـاتی مـەرگو مردنـی دواخسـتو، هێشـتیەوە، تـاكـو سـوود ببینـێ لە ژیـانی خۆی.

(حِينٍ) : (مُدَّةٌ مِنَ الوَقْـتِ، وَحَانَ حِينُـهُ: قَرُبَ وَقْـتُهُ)، واتە: حیـن بریتیە لە ماوەیەك لـە کـات، لـە عەرەبییـدا دەگـوترێ: (حَانَ حِينُـهُ: قَرُبَ وَقْتُـهُ) کاتەکـەی نیزیـك بـووەوە، ئـەو کاتەی پێویسـتە ئەو شتەی تێدا ئەنجام بـدرێ.

(ٱلرِّجْسَ) : (الرِّجْسُ: القَذَرُ، العِقَابُ، وَالغَضَـبُ)، (رجس) بە مانـای پیسیی دێو، بە مانـای تـووڕەیی خـواو، سـزای خـواش دێ.

(وَٱلنُّذُرُ) : بـە مانـای گـەیانـدن دێ، بـەڵام تـەنیا لـە کـاتێك ترسیشی لەگـەڵدا بـێ، (النـذر) کـۆی (نذیـر)ە واتـە : ئاگـادارکـەرەوە، یاخـود ئـاگـادار کـردنـەوە.

(أَيَّامِ) : کۆی (يَوْمَ)ە، واتـە: ڕۆژ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی، ڕۆژانـی تێدا سـزادرانی ئـەو گـەلانـەیە.

## مانــای گـشــتـی ئایەتەکــــان

خـوا ﷻ لە دوا دوای ئەم سوورەتە موبارەکـەدا، ڕوو دەکاتە پێغـەمبـەری خاتەم ﷺ، کـە بـە ڕواڵـەت خـوای پەروەردگـار پێغـەمبـەری خاتـەم ﷺ دەدوێنــێ، بـەڵام بـە وردبوونـــەوەو تێوەرامـانی ئایەتـەکانو سـیاقی ئایەتـەکان، پاشـان حـاڵو وەزعـی پێغـەمبـەری خاتەم ﷺ، دەزانیـن کە خـوای کـاربەجێ لە پشت پێغـەمبـەری خاتەمەوە ﷺ هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکـانو، بێبـڕوایەکان دەدوێنـێ، بـەڵام لـە ڕێـی دوانـدنی ئـەوەوە، پەیامی خۆی دەگەیەنێ بەوان.

دەفەرموێ: ﴿ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ﴾، ئەگەر لە دوو دڵـیـیـدای لـەوەدا کە دامانبـەزانـدوە بۆ لای تۆ، واتە: ئەگەر لەبارەی قورئانەوە لە دوو دڵـییدای، ﴿ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكَ ﴾، لەوانە بپرسە کە لە پێش تـۆدا کتێبیـان خوێنـدۆتـەوە، واتە: ئەوانەی کە شـارەزای کـتێبەکـانی خـوان، ﴿ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ﴾، بە دڵـنیاییـەوە لە پەروەردگـارتەوە هەقت بۆ هاتوە، بەرنامەیەکی چەسپاوو ڕاست، ﴿ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴾، بـە هـیـچ جۆرێـك لـە دوو دڵان مەبـە، لەوانـە مەبە لە شتێکدا دەکـەونە دوو دڵیی، کە نـابێ تێیدا دوو دڵ بن.

وەك گوتمان : لێـرەدا ڕووی دواندن لە پێغـەمبـەرە ﷺ، بەڵام لە پشت ئەوەوە خـوای پەروەردگار بێبـڕوایەکان دەدوێنـێ، واتە: ئێوە ئەگەر لـە دوو دڵـییدان، لـە شـارەزایانی کـتێبە ئاسـمانییـەکان بپرسـن، کە لە پێش ئێوەدا پێغـەمبەریان بۆ هاتوونو کتێبیـان بۆ دابەزێنـراون، لەوان بپرسـن، نـاوونیشانەکـانی پێغـەمبـەری خاتـەم ﷺ لە کـتێبەکـانی ئەواندا هەن، پاشـان ئەگەر قەنـاعەتتان نـایەت : خـوا مرۆڤـێك بکاتە ڕەوانەکراوی خۆی،

لە خاوەن کتێبە پێشووەکان بپرسن، کە ئێوە دانیان پێدا دەهێنن، کە جوولەکەو نەصرانیی هەن، ئەدی ئەوە نیە خوای پەروەردگار لە نێوان ئەواندا مرۆڤێکی کردۆتە پێغەمبەری خۆی، کەواتە: جێی سەرسوڕمان نیە موحەممەدیش ﷺ وەك یەکێك لەو مرۆڤە هەڵبژێردراوانە، خوا بیکاتە نوێنەرو ڕەوانەکراوی خۆی .

﴿ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴾، وە بە هیچ جۆرێك، بە جەخت کردنەوە لەوانە نەبی کە ئایەتەکانی خوایان بە درۆ دانا، ئەگەرنا سەرەنجام لە زیانباران دەبیٚ.

بۆیە گوتم: ئەگەر ئینسان لە ئایەتەکان ورد بێتەوە، دەزانیٚ کە مەبەست پێغەمبەری خاتەم ﷺ نیە، چونکە بە تەئکید پێغەمبەری خاتەم ﷺ بۆخۆی زۆر چاك دڵنیابووە کە پێغەمبەری خوایە، وەحی بۆ دێ، هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) گوتوویانە: ﴿ قَالَ يَـٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى ... ﴿٢٨﴾ ﴾ هـود، واتە: هەواڵم پێبدەن، ئەگەر من لەلایەن پەروەردگارمەوە لەسەر بەڵگەیەکی ڕۆشن بم، یان وەك لە سووڕەتی (هود)دا خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِۦ ﴿١٧﴾ ﴾، کە بێگومان لێرەدا پێش هەموو کەسێك پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەگرێتەوە: ئایا کەسێك کە لەلایەن پەروەردگاریەوە لەبەر ڕۆشنایی دایە، بەڵگەیەکی ڕوونی بەدەستەوەیە (وەك کەسێك وایە کە سەرگەردانە؟!) بەڵام وەك گوتمان لێرەدا ڕووی دواندن لە پێغەمبەرە ﷺ، بەڵام مەبەست پێی غەیری ئەوە، بە تایبەت بێبڕوایەکان، کە هەڵبەتە لەوبارەوە ڕای دیکەش هەن، کە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا دەیانهێنین.

پاشان خوا دەفەرمویٚ : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٩٧﴾ ﴾، بێگومان ئەوانەی وشەی پەروەردگارتیان بەسەردا پێویست بووەو چەسپیوە، {واتە: یاسای خوایان بەسەردا هاتۆتە دی، بڕیاری خوایان بەسەردا چەسپیوە} ، ئەگەر هەرچی بەڵگەو نیشانەیە بۆیان بیٚ،

بڕوا نـاهێنن، هەرچی نیشانەیە، واتە: هەرچی موعجیزەیـە، کە موعجیزەکان نیشانەی ڕاستیی پێغەمبەران بوون (علیهم الصلاة والسلام) کە لەلایەن خـواوە ڕەوان کـراون.

ئنجا ئایا بۆچی ئەگەر هەرچـی موعجیزە هەیە لە پەروەردگـاریانەوە بۆیان بـێ، هـەر بـڕوا نـاهێنـن؟ چونکـە یەکیان لەسـەر بەڵگـەو نیشانە نەکـەوتوە، بـۆ زانینـی ڕاستیی تۆ، بەڵکو هەر نـایانەوێ بڕوا بە تۆ بێنن، یانی: بڕیاری پێش بیـرکردنەوەیان هەیـە، ئنجـا ئایا تـاکەی بڕوا نـاهێنـن؟

﴿ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴾، تـاکو سـزاو ئـازاری بە ئێشو ژانـی خـوا دەبینـنو دەیچێژن.

کەواتـە: بەهـۆی هەڵوێسـتی ئەوانـەوە، دڵـت نـاڕەحەت نەبـێ، هـەروەهـا ئـەی مسـوڵمـانینـە بەهۆی هەڵوێستی کەللە ڕەقانەی بێبـڕوایەکانەوە لە بەرنـامەو پەیامی پێغـەمبـەری خاتەم ﷺ لە ڕێبـازی خۆتـان، مەکـەونـە دوو دڵـیـو گومـانـەوە.

ئنجـا خـوا ﷻ باسی نموونەیەکمان بۆ دەکـات لـەو ئـاوەدانییـانەی کە بـەرلـەوەی خـوا سزای دنیاییان بدات، بڕوایان هێناوەو گەڕاونەوە، کە بریتیە لە گەلی یونوس دەفەرموێ:

﴿ فَلَوۡلَا كَانَتۡ قَرۡيَةٌ ءَامَنَتۡ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوۡمَ يُونُسَ ﴾، دەبووایە ئـاوەدانییـەك بڕوابێنـێو ئیمانـەکەی سـوودێکی پێ بگـەیـەنـێ، واتە: پێش ئەوەی سزای خـوا ببینـنو سزای خـوایان بەسەردا بچەسپێ، ئەگەر بـڕوابێنـن بڕوایـەکەیـان سـوودیان پێدەگەیەنێ، کەس وای نەکرد، جگە لە گەلـی یونـوس، تـەنها کۆمەڵـگاکەی یونـوس وایانکرد، ﴿ لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفۡنَا عَنۡهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، دوای ئـەوەی بڕوایـان هێنـا، سزای ڕیسواییمان لە ژیانی دنیادا لەسەر لابردن، ﴿ وَمَتَّعۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ حِينٖ ﴾، وە تـا کاتێکی دیارییکـراو (واتە: تـا تەمەنی سروشتیی خۆیـان تەواو کرد) ژیـانـدمـانو گوزەرانـدمانو هێشـتمـاننـەوە.

لێرەدا مەبەسـت پێـی بێبـڕوایەکـانە، هـەم لـە ڕۆژگـاری پێغـەمبـەردا ﷺ، هـەم لـە هـەموو ڕۆژگـارەکـانـدا، کە ئێوەش وەك گەلـی یونوس بکەن، بەرلەوەی سـزاتـان بەسەردا

بچەسپێ‌و بەڵاتان بەسەردا بێ، بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بۆئەوەی گەڕانەوەکەتان‌و ئیمان هێنانەکەتان، سوودتان پێبگەیەنێ، هەروەها ترساندنیشیانە لەوەی کە ئەگەر وەك گەلی یونوس نەکەن، وەك گەلانی دیکە بکەن، ئەوە ئەوان بەڵایان بەسەر هاتوەو ئێوەش نیزیکە بەڵاتان بەسەربێ، ئەگەر بەڵای بنەبڕو فەلاچۆکرانیش نەبێ، وەك هی گەلانی پێشوو، بەڵاو گرفتاریی دیکەتان بەسەر دێ، لە ئەنجامی لادان دا، لە بەرنامەی خواو دوورکەوتنەوەدا، لە هیدایەتی خوا، وەك ئێستا دەیبینین : کە دنیا پڕ بووە لە فەسادو خراپەو زوڵم خوێنڕێژیی‌و خراپەکاریی.

ئنجا خوا ﷻ باسی بابەتێکی دیکە دەکات، کە پەیوەستە بە بابەتی پێشووەوە، کە ڕەنگە یەکێك بڵێ: باشە ئەوانە بۆچی بڕوایان نەهێناوە؟ یان بۆچی خوا ﷻ ناچاری نەکردوون بڕوابێنن؟

بۆیە دەفەرموێ : ﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ﴾، ئەگەر پەروەردگارت ویستبای، هەموو ئەوانەی لەسەر زەویین، وێکڕا بڕوایان دەهێنا، واتە: بەیەکەوە بڕوایان دەهێنا، بەڵام خوا نەیویستوە، واتە: نەیویستوە زۆریان لێبکات‌و ناچاریان بکات، بڕوا بێنن‌و، ئەگەر ویستبای ناچاریان بکات، ئەوە دەیتوانی ناچاریان بکات، بەڵام نەویستوە، بەڵکو ویستوویەتی ئازادیان بکات‌و سەرپشکیان بکات‌و، دەستیان بکاتەوە، ئەوانیش ئەو کاتی بوونە دوو بەشەوە: بەشێکیان بڕوایان هێناوەو، بەشێکیان بڕوایان نەهێناوە.

ئنجا ڕوو دەکاتە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺو، هەرکەسێکی دیکەش کە قورئان دەخوێنێ‌و، بە ڕێی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەڕواو، ئەرکی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجام دەدات، لە کۆمەڵگاکەی خۆیدا، ڕووی دواندنی تێدەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴾، بە سەرسوورمان‌و بە نکوولیی لێکردنەوە، دەپرسێ: ئایا تۆ زۆر لە خەڵك دەکەی، تاکو ببنە بڕوادار ؟ واتە: خوا بە خوایەتیی خۆی کە خاوەن‌و بەدیهێنەرو پەروەردگارو بەخێوکەرو ژیێنەرو مرێنەریانە، زۆری لێنەکردوون، ئایا کە تۆ نوێنەرو ڕەوانەکراوێکی خوای، وە بەندەیەکی خوای، زۆر لە خەڵك دەکەی؟ واتە: بۆت نیە زۆریان لێ بکەی‌و، بۆشت

ناکرێنە بڕوادار، ئەگەر زۆریان لێ بکەی‌و ناچاریان بکەی، دەیانکەی بە موونافیق، واتە: خراپتر لە کافری ئاشکراوە، دەیانکەیە کافرێکی پەنهان.

ئنجا هەر لەو سیاقەدا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ﴾ وە هیچ کەسێك بۆی نیە بڕوا بێنێ، مەگەر بە مۆڵەتی خوا.

هەڵبەتە لێرەدا (بِإِذْنِ) مەبەست پێی (إذن)ی تەکوینیی‌و قەدەرییە، ئەگەرنا (إذن)ی ئەمریی‌و شەرعیی خوا، بڕاوەتەوە، کە خوا هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)ی ناردوون‌و، هەموو کتێبەکانی بۆیە دابەزاندوون، تاکو خەڵك ئیمان بێنن، کەواتە: وەك (إذن)ی ئەمریی‌و شەرعیی، خوا مۆڵەتی فەرمووە، بەڵکو فەرمانیشی کردوەو پێویستیشی کردوە، بەلام لێرەدا مەبەست لە (إذن) واتە: مۆڵەتی قەدەریی‌و تەکوینیی، یانی: دەبێ خوا بیەوێ، ئنجا ئەو ئینسانە دەتوانێ بڕوا بێنێ، ئەگەر خوا نەیەوێ، ناتوانێ بڕوا بێنێ، دوایی ڕوونی دەکەینەوە، حیکمەتی ئەم تەعبیرە چییە؟ ﴿ وَيَجْعَلُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴾، وە خوا پیسیی لەسەر ئەوانە دادەنێ، کە نافامن، واتە: پیسیی کوفرو بێبڕوایی‌و شیرك.

دوایی بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلِ انظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾، بلێ: سەرنج بدەن! چی هەیە لە ئاسمانەکان‌و لە زەویدا، واتە: زۆر لە دیاردە سروشتییەکان، دیمەنە سەرنج ڕاکێشەکان هەن، کە نیشانەی باڵادەستیی خواو میهرەبانیی خواو دەسەلاتی خواو، حیکمەتی خواو، سیفەتە بەرزەکانی خوان، ﴿ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴾، بەلام نیشانەکان‌و ئاگادار کردنەوەکان، یاخود ترسێنەرو وریاکەرەوەکان، کە پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام)، چ سوودێك دەگەیەنن بە کۆمەڵێك کە بڕوا ناهێنن !

یان (ما) (ما)ی (النافیة)یە، واتە: نیشانەکان‌و ئاگادارکردنەوەکان‌و ترسێنەرەکان، هیچ سوودێك بە کەسانێك‌و کۆمەڵێك ناگەیەنن، کە خۆیان بڕوا ناهێنن‌و، نایانەوێ ئیمان بێنن.

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ : ﴿ فَهَلۡ يَنتَظِرُونَ إِلَّا مِثۡلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾، ئایا ئەو بێبڕوایانە چاوەڕێی چی دەکەن؟ ئایا هەر چاوەڕێی وێنەی ئەو ڕۆژانە ناکەن کە بەسەر ئەوانەدا هاتوە، کە لە پێش ئێوەدا ڕابردوون، واتە: ئایا ئەو کارەساتانەی کە بەسەر گەلانی پێش ئەواندا هاتوون، ئەوانیش هەر چاوەڕێی وێنەی ئەوە ناکەن، کە خوا سزایان بدات ! ﴿ قُلۡ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ ﴾، تۆ بڵێ: دە ئێوە چاوەڕێ بن، منیش لەگەڵ ئێوە لە چاوەڕوانانم، ئەگەر لەسەر هەڵوێستی بێبڕوایانەی خۆتان بەردەوام بن‌و، گوێ نەدەنە نیشانەکانی خواو، گوێ نەدەنە ئاگادارکردنەوەکانی خواو، گوێ نەدەنە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام)، ئەوە هەمان یاسای خوا، کە بەسەر گەلانی پێشودا چەسپیوەو، هەمان کارەسات‌و بەڵا، کە بەسەر ئەواندا هاتوە بەسەر ئێوەش دێن، ئێوە چاوەڕێ بن‌و منیش چاوەڕێم.

ئەوەش جۆرێکە لە تەواو باوەڕو متمانە بەخۆ بوون، کە ئەوەی خوای پەروەردگار دەیفەرموێ، وایەو، سەرەنجام بەو شێوەیە دەبێ، کە خوا ﷻ هەواڵتان پێ دەدات.

دوایی دەفەرموێ : ﴿ ثُمَّ نُنَجِّي رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، دوای پێغەمبەرانی خۆمان (علیهم الصلاة والسلام)و، ئەوانەی بڕوایان هێناوە، ڕزگار دەکەین‌و دەربازیان دەکەین، واتە: لە چنگی کافرە ملهوڕە زۆردارەکان دەربازیان دەکەین، لەو تەنگانەو نارەحەتییانە، یاخود لەو بەڵایەی کە خوا ناردوویەتی، بۆ ئەو گەل‌و کۆمەڵگایە کە بفەوتێ، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و ئەوانەی بڕوایان هێناوە لە خزمەتیاندا، دەربازیان دەکەین.

﴿ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيۡنَا نُنجِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، هەر بەو شێوەیە لەسەرمان پێویستە، کە بڕواداران ڕزگار بکەین، واتە: ئەوە یاسایەکی گشتی ئێمەیە لە ژیانی بەشەردا، کە خوا هەرکاتێك ویستبێتی کۆمەڵگایەکی کافرو لاڕێ‌و کەللە ڕەق، لە بەرانبەر پێغەمبەرەکەیدا ﷺ سزا بدات، پێغەمبەرەکە ﷺو ئەوانەی کە لە خزمەتیدابوونە لە بڕواداران، ڕزگاری کردوون‌و، ئەوانی دیکەشی سزا داون.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە خوا دەفەرموێ : ﴿ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٩٤﴾ ﴾.

واتە: ئەگەر لە دوو دڵیدای لە بارەی ئەوەوە، کە ناردوومانەتە خوار بۆ لای تۆ، پرسیار لەوانە بکە کە لەپێش تۆدا کتێبیان خوێندۆتەوە، بە دڵنیایی لە پەروەردگارتەوە حەقت بۆ هاتوە، دەجا لە دوو دڵان مەبە.

(الشَّكُّ : التَرَدُّد) (شک) بریتیە لە دڵ لە دڵدان، (شَكٍّ) بریتیە لەوە کە تۆ لە دوو دڵییدابی: ئەو شتە وابێ، یان وانەبێ؟ واتە: لای بوونیو لای نەبوونی لەلای تۆ یەکسان بن.

ئنجا توێژەرەوانی قورئان زۆر مشتومڕیان لەبارەی ئەم ئایەتەوە بووە، لە سۆنگەی ئەوەوە ئێمە کە شوێنکەوتووی پێغەمبەرین ﷺ دوو دڵ نین لەوەدا، کە خوا قورئانی بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دابەزاندوە، وە دوو دڵ نین، لەوەدا کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، ئەدی خۆی چۆن دەبێ دوو دڵ بێ؟ چۆن دەبێ دڵی لە دڵدا بێ؟! بێگومان شتی وا نیە، ئەدی مانای ئەم ئایەتە چۆنە؟

زانایان سێ جۆرە واتایان بۆ لێکداونەوە، کە من هەرسێکیانم پێ جوانن، بەڵام دیارە جوان هەیەو جوانتریش هەیە :

١/ پێشەوا (طبري) لە تەفسیرەکەی خۆی[١]دا دەڵێ: واتاکەی ئاوایە :

{قَوْلُ الرَّجُلِ مِنْهُمْ لابْنِهِ : (إِنْ كُنْتَ ابْنِي فَبَرَّنِي)، وَهُوَ لا يَشُكُّ فِي ابْنِهِ أَنَّهُ ابْنُهُ، كَمَا قَالَ اللهُ تعالى: ﴿ وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ... ﴿١١٦﴾ ﴾ المائدة، وَقَدْ عَلِمَ جَلَّ ثَنَاؤُهُ أَنَّ عِيسَى لَمْ يَقُلْ ذَلِكَ، وَهَذَا مِنْ ذَلِكَ، لَمْ يَكُنْ ﷺ شَاكّاً فِي حَقِيقَةِ خَبَرِ اللهِ وَصِحَّتِهِ، وَاللهُ تَعَالى ذِكْرُهُ بِذَلِكَ مِنْ أَمْرِهِ كَانَ عَالِماً، وَلَكِنَّهُ جَلَّ ثَنَاؤُهُ خَاطَبَهُ خِطَابَ قَوْمِهِ بَعْضُهُم بَعْضاً، إِذْ كَانَ القُرْآن بِلِسانِهِم نَزَل).

واتە: ئەمە وەك ئەوە وایە پیاوێك بە كورەكەی دەڵێ: ئەگەر كوڕی منی، لەگەڵم چاك بە، هیچ گومانێكی لەوەدا نیە كە كوڕیەتی، (بەڵام ئەوەیان شێوازێكە لە دەربڕین)، ئەمە وەك ئەوە وایە، خوای بەرز دەفەرموێ : ﴿ وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ... ﴿١١٦﴾ ﴾ المائدة، واتە: كاتێك خوا ﷻ فەرمووی: ئایا ئەی عیسای كوڕی مەریەم! تۆ گوتووتە منو دایكم لە خوار خواوە (لە جیاتی خوا) بكەنە دوو پەرستراو؟! بێگومان خوا (جَلَّ ثَنَاؤُهُ) زانیویەتی كە عیسا شتی وای نەگوتوە، ئەمەش بە هەمان شێوە، {واتە: موحەممەدیش ﷺ خوا دەزانێ لە دوو دڵییدا نیە، بەڵام شێوازەكە وا هاتوەو ئەو قسەیە بۆ جگە لە خۆیەتی}، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا ﷺ لەوەدا كە خوا هەواڵی بۆ ناردوەو وەحی بۆ ناردوە، هیچ لە دوو دڵییدا نەبووە، خوای بەرزیش ئەوەی زانیوە، بەڵام خوا بەو شێوەیە دواندوویەتی كە شێوازی كۆمەڵگایەكەی وابووە، كە بەو جۆرە یەكدییان دواندوە، قورئانیش بە زمانی ئەوان هاتۆتە خوار.

دەڵێم: بەڵكو ئەوە نەك هەر وەك شێوازێكی دەربڕین بووە لە نێو زمانی عەرەبیدا، بەڵكو بەگشتی لە نێو گەلاندا ئەو شێوازە هەیە.

---

١) جامع البیان، ج ١١، ص ١٨٣.

٢/ هەر (طبري) لە تەفسیرەکەی دا[١] دەڵێ: (وَلَوْ قَالَ قَائِلٌ: إِنَّ هَذِهِ الآيَةَ خُوطِبَ بِهَا النَّبِيُّ ﷺ، والمُرَادُ بِهَا بَعْضُ مَنْ لَمْ يَكُنْ صَحَّتْ بَصِيرَتُهُ بِنُبُوَّتِهِ ﷺ، مِمَّنْ كَانَ قَدْ أَظْهَرَ الإِيْمَانَ بِلِسَانِهِ، تَنْبِيهاً لَهُ عَلَى مَوْضِعِ تَعَرُّفِ حَقِيقَةِ أَمْرِهِ الَّذِي يُزِيلُ اللَّبْسَ عَنْ قَلْبِهِ، كَمَا قَالَ جَلَّ ثَنَاؤُهُ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ۝١﴾ الأحزاب، كَانَ قَوْلاً غَيْرَ مَدْفُوعَةٍ صِحَّتُهُ).

واتە: ئەگەر کەسێکیش بڵێ: ئەم ئایەتەی پێغەمبەری خوای ﷺ پێ دوێنراوە، بەڵام مەبەست پێی هەندێك لەوانەن کە تەواو دڵیان ڕۆشن نەبۆتەوە، بەراستیی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ لەوانەی کە بڕواو مسوڵمانەتییان دەربڕیوە، بەڵام جاری تەواو ئیمانەکەیان ساغ نەبۆتەوە، خوا ئەوانی ئاگادار کردۆتەوە، کە چۆن ئەو دوو دڵییو گومانە لە دڵی خۆیاندا لابەرن، بەهۆی ئەوەوە کە لە خاوەن کتێبە پێشووەکان پرسیار بکەن، کە نیشانەکانی موحەممەد ﷺ لەوێدا هاتوون، هەروەك خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ۝١﴾، واتە: ئەی پێغەمبەر! ﷺ پارێز لە خوا بکەو، بە قسەی کافرو مونافیقەکان مەکەو فەرمانبەرییان مەکە، بێگومان خوا بەوەی کە ئەنجامی دەدەن شارەزایە.

{کە بە تەئکید پێغەمبەری خوا ﷺ لە لووتکەی تەقواو پارێزکردن لە خوادا بووە، هەرگیزیش فەرمانبەریی کافران و مونافیقەکانی نەکردوە، ئەدی مەبەست پێی کێیە؟ واتە: مسوڵمانینە، ئەوانەی کە لە پشت پێغەمبەرەوەن ﷺ} ئەگەر واش بگوترێ، ئەو قسەیە کەس ناتوانێ ڕاستێتییەکەی ڕەت بکاتەوە.

١) جامع البيان، ج ١١، ص ١٨٣.

٣/ (محمد الطاهر بن عاشور) ڕایەكی دیكە دێنێ لە تەفسیرەكەی خۆی[1]دا، دەڵێ: {الـمَقْصُودُ بِهَذَا الكَلاَمِ التَّعْرِيضُ بِالكُفَّارِ وَالـمُشْرِكِينَ، وَهَذِهِ طَرِيقَةٌ فِي الإِلْقَاءِ التَّعْرِيضِيِّ يَسْلُكُهَا الحُكَمَاءُ وَأَصْحَابُ الأَخْلاَقِ، مَتَى كَانَ تَوْجِيهُ الكَلاَمِ إِلَى الَّذِي يُقْصَدُ بِهِ مَظَنَّةَ نُفُورٍ، كَمَا فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٦٥﴾﴾الزمر}.

واتە: مەبەست لەم قسەیە لەبەر ڕاهاویشتنی كافرو موشریكەكانە (واتە: بە كنارە قسەكردنە لەگەڵیان) ئەمەش ڕێبازێكە {لەبەر ڕاهاویشتن بە كنارەوە لە پەنادا پێگوتن} كە كەسانی حەكیمو كارزانو ئەوانەی ڕەوشتی بەرزو جوانیان هەیە، كاتێك بیانەوێ قسە لەگەڵ كەسێك بكەن، مادام بزانن ئەو قسەیە ئەگەر ڕووبەڕوو لەگەڵ خۆی بیكەن، ببێتە هۆی سڵەماندنەوەو دڵ بریندار بوونی، لەگەڵ یەكێكی دیكە قسە دەكەن، بەڵام مەبەستیشیان پێی ئەوە، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (الزمر)دا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٦٥﴾﴾، واتە: ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی كردەوەكەت هەڵدەوەشێتەوە، بێگومان لە زیانبارانیش دەبی.

كە بە تەئكید خوا زانیویەتی پێغەمبەر ﷺ هاوبەش بۆ خوا دانانێ، بەڵام یانی: تەنانەت ئەی موحەممەد! ﷺ تۆش ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی، لە زیانباران دەبی! كەواتە: ئەی موشریكەكان! ئێوە بە هیچ جۆرێك بە تەما مەبن، كە چاوپۆشیی لە شیركو هاوبەش بۆ خوا دانانو كوفرو لادانەكەتان بكرێ، تەنانەت خوای پەروەردگار ئەوە لە پێغەمبەر ﷺیش قبووڵ ناكات، كە بە تەئكیدیش پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەوەی لێ ناوەشێتەوە.

كە دیارە من ئەو مانایەی سێیەمیانم لە هەموویان پێ باشترە، لەگەڵ مانای یەكەمیشیان تاڕادەیەك تێك دەكاتەوە.

---

١) التحرير والتنوير، ج ١١، ص ٢٨٥.

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكَ ﴾، لەوانە بپرسە کە لە پێش تۆدا کتێبیان خوێندۆتەوە، یەکێك بۆی هەیە، بڵێ :

ئنجا چۆن پرسیار لە کەسانێك بکرێ‌و، کەسانێك بکرێنە شایەد کە دژو بێبڕوا بوون، کە جوولەکەو نەصرانییەکان بوون؟

لێرەدا دەگونجێ بە چوار جۆر وەڵام بدرێتەوە، وەك (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) لە تەفسیرەکەی : (تیسیر الکریم الرحمن في تفسیر کلام المنان)[1]دا هێناویەتی :

---

١) منها: أن الشهادة إذا أضيفت إلى طائفة، أو أهل مذهب، أو بلد ونحوهم، فإنها إنما تتناول العدول الصادقين منهم، وأما من عداهم، فلو كانوا أكثر من غيرهم فلا عبرة فيهم، لأن الشهادة مبنية على العدالة والصدق، وقد حصل ذلك بإيمان كثير من أحبارهم الربانيين، كـ (عبد الله بن سلام) {وأصحابه وكثير ممن أسلم في وقت النبي ﷺ، وخلفائه، ومن بعده} . و(كعب الأحبار) وغيرهما.

ومنها: أن شهادة أهل الكتاب للرسول ﷺ مبنية على كتابهم التوراة الذي ينتسبون إليه.

فإذا كان موجودًا في التوراة، ما يوافق القرآن ويصدقه، ويشهد له بالصحة، فلو اتفقوا من أولهم لآخرهم، على إنكار ذلك، لم يقدح بما جاء به الرسول.

ومنها: أن الله تعالى أمر رسوله أن يستشهد بأهل الكتاب على صحة ما جاءه، وأظهر ذلك وأعلنه على رءوس الأشهاد.

ومن المعلوم أن كثيرًا منهم من أحرص الناس على إبطال دعوة الرسول محمد ﷺ، فلو كان عندهم ما يرد ما ذكره الله، لأبدوه وأظهروه وبينوه، فلما لم يكن شيء من ذلك. كان عدم رد المعادي، وإقرار المستجيب من أدل الأدلة على صحة هذا القرآن وصدقه.

ومنها: أنه ليس أكثر أهل الكتاب، رد دعوة الرسول، بل أكثرهم استجاب لها، وانقاد طوعًا واختيارًا، فإن الرسول بعث وأكثر أهل الأرض المتدينين أهل كتاب.

فلم يمكث دينه مدة غير كثيرة، حتى انقاد للإسلام أكثر أهل الشام، ومصر، والعراق. وما جاورها من البلدان التي هي مقر دين أهل الكتاب، ولم يبق إلا أهل الرياسات الذين آثروا رياساتهم على الحق، ومن تبعهم من العوام الجهلة، ومن تدين بدينهم اسمًا لا معنى. كالإفرنج الذين حقيقة أمرهم، أنهم دهرية منحلون عن جميع أديان الرسل، وإنما انتسبوا للدين المسيحي، ترويجًا لملكهم، وتمويهًا لباطلهم، كما يعرف ذلك من عرف أحوالهم البينة الظاهرة.

یەك : مەبەست پێی ئەوانەیانە کە دادگەرو بە ئینصافن، چونکە هەر ئەوان شایستەی ئەوەن کە شایەدیی بدەن، وەك عەبدوڵڵای کوڕی سەلامو کەعبولئەحبارو، غەیری ئەوانیش لە جوولەکەکانو لە نەصرانییەکان، کە بڕوایان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هێناوە، واتە: مەبەست پێی ئەوەیە: لەو خاوەن کتێبانە بپرسە کە بە ئینصافو بە ویژدانن، لەگەڵ زانیارییەکەی خۆیاندا ڕاست دەکەن.

دوو : دیارە شایەدیی خاوەن کتێبەکان، لەسەر کتێبەکانیان بنیات دەنرێو، لە کتێبەکانیان دا نیشانەکانی پێغەمبەر ﷺ هەن، شایەدیی دان بە ڕاستیی موحەممەد ﷺ هەیە، کەواتە: با ئەوانیش دانی پێدانەهێنن، بناغەی شایەدیی دانەکە، بریتیە لە کتێبەکانیان، کە لە کتێبەکانیشیاندا ئەوە هەیە.

سێ : پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکراوە کە خاوەن کتێبەکان بکاتە شایەد، وە نەمانبیستوەو هیچ کام لەوان نەهاتوون بڵێن: ئەوە بۆچی خوا ئێمەی کردوە بە شایەد، ئێمە شایەدیی دەدەین کە تۆ پێغەمبەر ﷺ نی؟ کەس بەرپەرچی نەداوەتەوە، چونکە زانیویانە کە لە کتێبەکانیاندا نیشانەکانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ هەن، بەڵام ئەم بەزمو بازاڕەی کە پێکیانەوە ناوەو، بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانیان دەستو پێی گرتوون.

چوار : زۆربەی خاوەن کتێبەکانیش لە ڕاستییدا لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ بڕوایان هێناوە، ئەوانەی کە لە نیوە دوورگەی عەرەبیی دابوونو، ئەوانەی لە شام بوونو، ئەوانەی لە شوێنەکانی دیکە بوون، بە تایبەت زانایەکانیانو، خەڵکی شارەزایان، بەڵام کەسانێکیش کە بەرژەوەندیی ناشەرعییو، بەزمو بازاڕێکی ناشەرعییان پێکەوەناوە دەستو پێی گرتوون، ئەوە شتێکی دیکەیە.

ئنجا خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ جَآءَكَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ﴾، واتە: بێگومان لە پەروەردگارتەوە هەقت بۆ هاتوە، تۆ بە هیچ جۆرێك لە دوو دڵان مەبە، لەمەوە دیارە کە مەبەست خودی پێغەمبەر ﷺ نیە، بەڵکو مەبەست پێی غەیری خۆیەتی، بە تایبەت بێبڕوایەکان.

(المِرْيَةُ: التَرَدُّدُ فِي الأَمْرِ وَهُوَ أَخَصُّ مِنَ الشَّكِّ)، پێشتریش باسمان کرد، جیاوازیی (مِرْيَة) لەگەڵ (شَكّ) ئەوەیە کە دوو دڵییەکی تایبەتترەو، بریتییە لەوەی جاری وایە ئینسان لە شتێك دوو دڵ دەبێ، بەڵام ڕێی تێدەچێ دوو دڵ بێت، لە ئەگەرو نەگەردا بێ، بەڵام جاری وایە دەکەوێتە دوو دڵیی، لە شتێکدا، کە نابێ‌و، جێی خۆی نیە تێیدا بکەوێتە دوو دڵیی، (مِرْيَة) لەو حاڵەتانەدا بەکاردێ.

<u>مەسەلەی دووەم</u> : کە خوا دەفەرموێ : ﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٩٥﴾﴾.

واتە : وە لەوانە مەبە کە ئایاتەکانی خوایان بەدرۆ دانـاو درۆیان داوەتە پاڵ ئایەتەکانی خوا، کە سەرەنجام لە زیانباران بی.

واتە: ئەگەر بێت‌و لە بەدرۆ دانەرانی ئایەتەکانی خوا بی، سەرەنجام لە زیانباران دەبی‌و، لەوانە دەبی کە لە خەسارەت‌و زیانبارییدا نغرۆ بوون، ئەمەش وەك : گوتمان : لەبەر ڕاهاویشتنەو، بە کنارەو لە پەنـادا قسەکردنە لەگەڵ بێبڕوایەکان داو، خوا لە پشت پێغەمبەری خواوە ﷺ بێبڕوایەکان دەدوێنێ، وەك لە سوورەتی (الزمر)دا پێشتریش هێنامان، کە دەفەرموێ : ﴿لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾﴾، واتە: ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی، (واتە: هاوبەش دابنێی لە پەرستنیدا، لە بەندایەتیی بۆ کردنیدا) کردەوەکەت هەڵدەوەشێتەوەو، بێگومان لە زیانبارانیش دەبی.

کە بە تەئکید خوا ﷻ زانیویەتی کە هیچ ئەگەرو شیمانەی نیە، کە پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ هاوبەش بۆ خوا دابنێ، بەڵام واتە: ئەی موشریك‌و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان! تەماشا بکەن خوا پێغەمبەری خۆی ﷺ ئاوا دەدوێنێ، کەواتە: ئێوەش ئاگاداربن، کە ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێن. ئەوە خوا بەپێی ئەو یاسایە، مامەڵەتان لەگەڵدا دەکات.

**مەسەلەی سێیەم**: کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴿٩٧﴾﴾.

واتە: بێگومان ئەوانەی وشەی پەروەردگارتیان لەسەر چەسپاوە، بڕیارو یاسی خوایان لەسەر هاتۆتە دی، ئەگەر هەرچی نیشانەیە بۆیان بێنی، هەر بڕوا ناهێنن، تاکو ئازارو سزای بە ئێشی خوا دەبینن، واتە: دەیچێژن‌و لەگەڵیدا دەستەو یەخە دەبن.

وشەی: (كَلِمَتُ رَبِّكَ) زۆرجار گوتوومانە: ڕواڵەتەکەی واتە: وشەی پەروەردگارت، بەڵام مەبەست یاساکانی خوا (سنن الله)یە، چونکە یاساکانی خوا، وەك چۆن حوکمڕانێك دەسەڵاتدارێك لە ڕێی تەعبیرکردن‌و نووسین‌و بەکارهێنان‌و وشەکانەوە، ئیرادەی حوکمڕانیی جاری دەبێ، لێرەش دا خوا بۆ نیزیك خستنەوەی بابەتەکە لە عەقڵی ئێمە، بە هەمان شێوە، ئێمە تێدەگەیەنێ‌و، مەبەست پێی فەرمانی تەکوینیی‌و قەدەریی خوای پەروەردگارە، واتە: ئەوانەی کە یاسای خواو ئیرادەی خوایان لەسەر هاتۆتە دی، ناتوانن بڕوا بێنن، ئەگەر هەرچی موعجیزەو نیشانەشە بۆیان بێ، تاکو سزای خوا نەبینن‌و نەیچێژن.

ئەمە بۆ نیزیك خستنەوەیە لە عەقڵی ئێمە، دەتوانین بڵێین: وەك چۆن لە هەر فەرمانگەیەك دا پەیڕەوێکی نێوخۆ (النظام الداخلي)ی هەیە بۆ وێنە:

١/ دەبێ کارمەندەکان لە سەعات هەشتی بەیانییەوە بێن بۆ دەوام، تاکو چواری دوای نیوەڕۆ.

٢/ لە مانگێکدا دوو ڕۆژ مۆڵەتیان هەیە.

٣/ لەساڵێدا هەندێك مۆڵەتیان هەیەو ...هتد.

ئنجا هەر کەسێك لەو پەیڕەوی نێوخۆیەی ئەو دامەزراوەیەو فەرمانگەیە لابدات، کە تێیدا دیاریکراوە: کە هەر کەسێك ئەوەندە غائیب بێ، ئەوە سزایەکەیەتی، ئەوەندە پارەی لێ دەبڕدرێ، یان بەو شێوەیە سزا دەدرێ،

خواش ﷻ بۆ ئەم بوونە بە تەئکید سیستەمو پەیڕەوو بەرنامەیەکی داناوە، کە بە (كَلِمَتُ رَبِّكَ) تەعبیری لێدەکات، یان بە (سنن الله) یاساکانی خوا، تەعبیری لێدەکات، ئنجا هەر کەسێك پێچەوانەی یاسایەکی خوا بجووڵێتەوە پێچەوانەی ئەو سیستەمە بجووڵێتەوە کە خوا دایناوە، ئەمە بێگومان یەکێك لە یاساکانی خوای بەسەر خۆیدا چەسپاندوە، هەروەك لە دامەزراوەو فەرمانگەکەدا، ئەگەر هەر کەسێك سەرپێچیی بکات، بە ئەندازەی سەرپێچییەکەی، سزا دەدرێ، ئەویش بەهۆی لادانی لە سیستەمی خواوە سزا دەدرێت.

ئنجا لێرەدا بەتەئکید مەبەست لە (ءَايَةٍ) ئەو موعجیزانەن کە بە پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دراون، چونکە کافرەکان زیاتر داوای ئەو جۆرەیان لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکرد، داوای ئەوەیان نەدەکرد کە خوای کارزان ئایەتی دیکە، واتە: ئایەتی دیکەی خوێنراوە (مقروءة) بۆ موحەممەد ﷺ دابەزێنێ، بەڵکو داوایان دەکرد کە موعجیزەیەك وەك موعجیزەکانی پێغەمبەرانی پێشووی بۆ بێ، بێخەبەر لەوە کە ئەو قۆناغە تێپەڕیوە، ئەو قۆناغەی کە بەشەر تێیدا لە قۆناغێکی ساواییدا بووەو، تەنیا بە موعجیزە بەرهەستەکان، کە بە هەستەوەرەکان مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، بەوانە قەناعەتی دەهات، ئێستا بەشەر چۆتە قۆناغێکی دیکەوە، خوای کارزانیش دروستکراوەکانی خۆی بەردەوام بەرەو کەمال دەبات، بەرەو پێشکەوتنی زیاتر دەبات، بەشەرییەتیش بەرەو پێگەیشتنو کامڵ بوون چووە، نابێ چیدیکە لە ڕێی چاوو گوێو هەستەوەرەکانیەوە بدوێنرێ، کە منداڵ ئاوا دەدوێنرێو، ئاژەڵو ژیاندارانی دیکە بەو شێوەیە دەدوێنرێن، کاتی خۆی بەشەرییەت لە قۆناغێکی ساواییدا بووە، خوا لەو ڕێیەوە دواندوویەتیو موعجیزەکانی کە بۆ پێغەمبەرانی ناردوون، زیاتر لەگەڵ چاوو گوێو هەستەوەرکانیاندا سەروکاریان بووە، بەڵام ئێستا خوا بۆ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ کە بۆ کوێ بەشەرییەت نێردراوە، لە قۆناغی بەرەو کامڵ چوونیدا، دەبێ موعجیزەیەکی بۆ بنێرێ کە عەقڵی، هەستی، ناخی بدوێنێ، کە ئەم قورئانەیە، ئەم قورئانە کە لە هەموو ڕوویەکەوە دەستەوسانکەرە، وەك من لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) لە باسی ئیعجازی قورئاندا

باسم کردوە، کە لە ڕاستیدا ڕووەکانی دەستەوسانکردنی قورئان، ڕووەکانی ئیعجازی قورئان، ناژمێردرێن، هەڵبەتە لەوێ من دە (١٠) لایەنم لێی ژماردوون، بەڵام گوتوومە : لە ڕاستییدا ڕووەکانی ئیعجازی قورئان سەرژمێر ناکرێن، چونکە مادام قورئان موعجیزەی پێغەمبەرە ﷺ بۆ سەلماندنی ڕاستێتیی ئەو، دەبێ ئەو قورئانە لە بارانیدا هەبێو شایستەی ئەوە بێ، بۆ هەر چاخو سەردەمێك، بۆ هەر کۆمەڵگایەكو ڕۆژگارێك، لە هەموو ئاستەکاندا ببێتە بەڵگەیەکی ئیقناعکەرو بەڵگەیەکی دەستەوسانکەر بۆیان، کە نەتوانن لە بەرانبەریدا بوەستن، کە لە ڕاستییش دا وایە، بەڵام بۆ کەسانێك کە عەقڵی خۆیان بەکاربێنن، بەڵام ئەوانەی کە ویستوویانە مرۆڤایەتیی بەرەو دواوە بچێتەوەو، بە هەمان شێوازی کە پێشتر بەشەر دوێنراوە، لە ڕێی هەستەوەرەکانیەوە، بەو شێوەیە بدوێنرێ، ئەوە پێچەوانەی ئەو سیستەمو بەرنامەیەن، کە خوا دایناوە، بۆ بەشەر کە دەبێ ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو کامڵ بوونو بەرەو پێگەیشتنی زیاتر بچێ.

ئنجا خوا ﷻ ئەمە بۆیە دەفەرموێ : تاکو :

١/ هەم پێغەمبەر ﷺ دڵی نارەحەت نەبێ، کە لەو شێوە موعجیزەیەی کە ئەوان داوای لێدەکەن، پێی نادات.

٢/ هەم بڕوادارانیش نەکەونە حاڵەتی دوو دڵیو گومانەوە.

٣/ هەم بێبڕوایانیش چیدیکە ئەو داوا بێجێیە نەکەن.

چونکە خوا ﷻ سیستەمو بەرنامەیەکی داناوە بۆ بەشەر، کە بەگوێرەی ئەو سیستەمو بەرنامەیەو بەپێی ویستی ڕەهای خوا ﷻ دەبێ بەشەر بەرەو کامڵ بوونو پێگەیشتن بچێ.

<u>مەسەلەی چوارەم</u> : کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُوا۟ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٩٨﴾ ﴾.

**سەرەتا چەمکی چەند وشەیەك شی دەکەینەوە:**

١ـ ﴿ فَلَوْلَا ﴾، لێرەدا بەمانای (هلاّ)یە، (للتحضیض) بۆ هاندانە، واتە: دەبووایە وا بووایە : ﴿ فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ ﴾، واتە: دەبووایە ئاوەدانییەك، کۆمەڵگایەك بڕوا بێنێ‌و بڕوایەکەی سوودی پێبگەیەنێ، پێش ئەوەی خوا سزایان بدات، بڕوا بێنن، جگە لە گەلی یونوس، کەس وای نەکرد.

٢ـ ﴿ قَرْيَةٌ ﴾، بریتیە لە ئاوەدانییەکی زۆرو کۆمەڵگایەکی گەورە، جا هەم بە شوێنەکە دەگوترێ : (قریة) هەم بە خەڵکەکە دەگوترێ‌و، هەم بە هەردووکیشیان دەگوترێ.

٣ـ ﴿ كَشَفْنَا ﴾، واتە: لامان برد، یانی : (أزَلنا) لێمان لادان‌و دوورمان خستەوە.

٤ـ ﴿ ٱلْخِزْيِ ﴾، (الهَوَانُ وَالذُّل) زەبوونیی‌و ڕیسوایی.

٥ـ ﴿ وَمَتَّعْنَٰهُمْ ﴾، واتە: پێمان گوزەراندن، یانی: هێشتمانننەوە لە ژیاندا.

٦ـ ﴿ حِينٍ ﴾، واتە: (مُدّة الحَيَاة الطّبيعيّة) ئەو ماوەیە کە ژیانی سروشتیی‌و ئاساییانی پێ دەگوزەرێنن، واتە: هێشتمانننەوە کە بە مردنی ئاسایی خۆیان کۆتاییان بێت، ئەو جیل‌و وەچەیە، کە یونوس (علیە سلام)یان بۆ نێردراوە، نەك بە بەڵایەکی ناگەهان، وەك ئەو گەلانەی کە خوا سزای داون، هەموویان تەخت بکات.

ئنجا ئێمە لێرەدا بەسەرهاتی یونوس‌و گەلەکەی باس دەکەین، چونکە ئێمە خوا پشتیوان بێ لەم تەفسیرەماندا لە هەر سوورەتێکدا کە بە پێویستی بزانین. بەسەرهاتی یەکێك یان زیاتر لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە هەموو

ڕووەکانیەوە دەتوێژینەوەو هەموو ئەو ئایەتانەی لەوبارەوە هاتوون، کۆیان دەکەینەوە، وەك لە سوورەتی (الأعراف)دا وامان کرد، دەربارەی بەسەرهاتی : مووسا (علیه السلام)، وە بەسەرهاتی : ئادەم، کە بە تەفصیل قسەمان لێکردن، ئنجا هەرچەندە وەك دوایی باسی دەکەین، لە شەش شوێن دا باسی یونوس (علیه السلام) کراوە، بەڵام بۆیە لێرەدا بەسەرهاتەکەی یونوس دەگێڕینەوە، چونکە:

یەکەم : ئەم سوورەتە بە ناوی (یونس)ەوە ناونراوەو هەر ئەو ناوەشی هەیە.

دووەم : پاشانیش خوا ﷻ وەك حاڵەتێکی ڕیزپەڕو دەگمەن باسی گەلی یونوس دەکات، کە بڕوایان پێی هێناوە، بەرلەوەی خوای باڵادەستتو دادگەر سزای دنیایان بەسەردا بسەپێنێ.

# بەسەرهاتی یونوس (علیه السلام) و گەلەکەی

بە پێویستی دەزانم بەسەرهاتی یونوس (علیه السلام)و گەلەکەی لە چوار بڕگەی سەرەکییدا بخەینە ڕوو:

**بڕگەی یەکەم : یونوس (علیه السلام) شەش جاران ناوی لە قورئاندا هاتوە :**

چوار جاران بە ناوی خۆی (یونُس)، کە دوایی دەقی ئایەتەکان دێنین:

١- سوورەتی (النساء) ئایەتی (١٦٣).

٢- سوورەتی (الأنعام) ئایەتی (٨٦).

٣- سوورەتی (یونس) ئایەتی (٩٨).

٤- سوورەتی (الصافات) ئایەتی (١٣٩)، لەو چوار ئایەتو سوورەتانەدا، ناوی یونوس هاتوە، دوو جارانیش بە وەسفەکەیو سیفەتەکەی ناوی هاتوە.

٥- لە سوورەتی (الأنبیاء) ئایەتی (٨٧)دا کە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَـٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَـٰتِ أَن لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَـٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾، ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ ﴾.

واتە: (صاحب النون) کە دیارە (نون) بە مانای نەهەنگو ماسیی یە، واتە: خاوەن ماسیی، یان هاوەڵی ماسیی، کاتێك بە تووڕەیی ڕۆیشت.

٦ـ هەروەها لە سوورەتی (القلم)یش لە ئایەتی (٤٨)دا، دیسان بە وەسفەکەی هاتوە، دەفەرموێ : ﴿ فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتە: بۆ بڕیاری پەروەردگارت خۆڕاگربەو، وەك هاوەڵی ماسیی مەبە، کاتێك بە تووڕەییو پەستیی، لە خوا پاڕایەوە، واتە: لە خەڵکەکەی تووڕەو پەست بووو، کە ماسییەکە قوتیدا، لە زگی ماسییەکەدا لە خوادا پاڕایەوە.

**بڕگەی دووەم : گەلی یونوس خەڵکی (نینوی) موصڵی ئێستا بوون:**

کە یەکێك لە پادشاکانی ئاشوور لە ساڵی (٢٢٢٢)ی پێش زایین، لەگەڵ (٢٠١٦)ی ئێستا، دەکاتە : چوار هەزارو دوو سەدو سیو هەشت (٤٢٣٨) ساڵ لەمەو پێش، ئەو شارەی بنیات ناوە، لەسەر کەناری چەپی ڕووباری دیجلە.

لەسەر زمانی پێغەمبەریش ﷺ ئەمە هاتوە، کە یونوس خەڵکی (نینوی) بووە، وەك لە: (سیرة ابن هشام)[1] لە بەسەرهاتی ڕۆیشتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ لای خەڵکی طائیفو، بەرپەرچدرانەوەی بەو شێوە ناشیرینەی کە هەر شایستەی ئەوان بووەو، بەردبارانکرانیو دەرکرانی، لەو بەسەرهاتەدا هاتوە عوتبەو شەیبەی کوڕانی ڕەبیعە، کە دیارە دەبێ ئەوێ وەك هاوینە هەوارێك بووبێ بۆیان، غولامێکیان کە نەصرانیی بووەو ناوی عەدداس بووە، کاتێك دەبینن پێغەمبەر ﷺ زۆر بە نارەحەتیی دەرکراوەو، بەردباران کراوەو، منداڵیان تێبەرداون، سۆزی خزمایەتییان بۆی دەجووڵێو، بەو غولامەی خۆیان، دەڵێن: بچۆ هەندێ ترێی بۆ بچنەو بۆی بخە سەر قاپێكو بۆی بەرە، دیارە پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا لەبەر سێبەری درەختێکدا دانیشتوە، ئنجا کە عەدداس دەچێو ترێیەکەی لە پێش دادەنێ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (بسم الله) ناوی خوا دێنێ، (عەدداس)یش دەڵێ: ئەو وشەیەی تۆ گوتت، خەڵکی ئەم وڵاتە، بەکاری ناهێنن !

---

١) السيرة النبوية لابن هشام، ج ٢، ص ٤٢٠،٤١٩.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: من پێغەمبەری خوام، ئەدی تۆ خەڵکی کوێی؟ ئیدی ئەم وتووێژەیان دەبێ: {فَقَالَ لَهُ رَسولُ اللهِ: ﷺ وَمِنْ أَهْلِ أَيِّ الْبِلادِ أَنْتَ يَا عَدّاسُ، وَمَا دِينُكَ ؟ قَالَ نَصْرَانِيّ، وَأَنا رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ نِينَوَى، فَقَالَ رَسولُ اللهِ: ﷺ مِنْ قَرْيَةِ الرَّجُلِ الصَّالِحِ يُونُسَ بْنِ مَتَّى؟ فَقَالَ لَهُ عَدّاسٌ: وَمَا يُدْرِيكَ مَا يُونُسُ بْنُ مَتَّى؟ فَقَالَ رَسولُ اللهِ: ﷺ ذَاكَ أَخِي، كَانَ نَبِيّاً وَأَنَا نَبِيّ، فَأَكَبَّ عَدّاسٌ عَلَى رَسولِ اللهِ ﷺ يُقَبِّلُ رَأْسَهُ وَيَدَيْهِ وَقَدَمَيْهِ، وَلَمَّا سَأَلَ صَاحِبا الْبُسْتَانِ (عُتْبَة وَشَيْبَة ابْنا رَبِيعَة) عَدّاسا عَنْ صَنِيعِهِ هَذَا، قَالَ لَهُمَا: لَقَدْ أَخْبَرَنِي بِأَمْرٍ مَا يَعْلَمُهُ إلاَّ نَبِيٌّ}.

واتە: پێغەمبەر ﷺ لێی دەپرسێ دەفەرموێ: تۆ خەڵکی چ شوێنێکی ئەی عەدداس‌و دینی تۆ چییە؟ (عەدداس)یش دەڵێ: من نەصرانییم‌و، پیاوێکم خەڵکی نەینەوام، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: خەڵکی ئەو شارەی پیاوە صاڵحەکەی یونوسی کوڕی مەتتا؟ عەدداس دەڵێ: جا تۆ چوزانی یونوسی کوڕی مەتتا کێیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ئەوە برامە، پێغەمبەر بووەو منیش پێغەمبەرم، ئیدی عەدداس دەکەوێتە سەر دەست‌و پێی‌و، سەری ماچ دەکات‌و هەر دوو دەستی ماچ دەکات‌و هەردوو پێیەکانی ماچ دەکات، ئنجا کاتێک دەگەڕێتەوە بۆ لای دوو خاوەنی باخەکە (عوتبەو شەیبە)و، لێی دەپرسن {لە عەدداس} ئەوە بۆچی ئەوەت کرد؟ دەڵێ : هەواڵێکی پێدام کە تەنیا، کەسێك کە پێغەمبەر بێ، دەیزانێ.

مەبەستی هەواڵی یونوسی کوڕی مەتتا بووەو، عەدداسیش نەصرانیی بووەو بڕوای بە هەموو پێغەمبەرانی پێش عیساش هەبووە، صەڵات‌و سەلامی خوایان لەسەر بێ.

**برگەی سێیەم : ئەو سوورەت‌و ئایەتانەی کە ناوی (یونس)یان تێدا هاتوە:**

کە وەك گوتمان: شەش شوێنن، دیارە بە سوورەتی (یونس)ەوە، شەش شوێنن‌و، بە پێی ڕیزبەندیی موصحەف دەیانهێنم :

١/ شوێنی یەکەمیان لە سوورەتی (النساء) لە ئایەتی (١٦٣)دا، کە خوا دەفەرموێ:

﴿إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ

إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَـٰرُونَ وَسُلَيْمَـٰنَ ۚ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئێمە سروشمان بۆ تۆ کرد، وەك چۆن سروشمان کرد بۆ لای نووحو بۆ لای پێغەمبەرانی دوای وی‌و، سروشمان کرد بۆ لای ئیبراهیم‌و ئیسماعیل‌و ئیسحاق‌و یەعقووب‌و ئەسباط‌و عیساو ئەییوب‌و یونوس‌و هاروون‌و سولەیمان، زەبووریشمان بە داوود دابوو. صەلات‌و سەلامی خوا لەسەر هەموو پێغەمبەران بێ.

٢/ شوێنی دووەم لە سوورەتی (الأنعام) لە ئایەتی (٨٦)دا، کە خوا ﷻ ناوی هەژدە لە پێغەمبەران دێنێ، چواریان ئەمانەن، دەفەرموێ: ﴿ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾، واتە: وە ئیسماعیل‌و ئەلیەسەع‌و یونوس‌و لووط، هەرکامێك لەوانمان بەسەر جیهانییانی ڕۆژگاری خۆیاندا هەڵبژاردوون.

چونکە هەرکام لە پێغەمبەران گوڵبژێرو هەڵبژاردەی خەڵك‌و کۆمەڵگای ڕۆژگاری خۆی بووەو، بە هەمووشیان گوڵبژێرو سەرتۆپی باغی بەشەرن، واتە: چینی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە غەیری خۆیان، هەموویان لە خوا نیزیکترن‌و لای خوا پەسندترن‌و چاکترن، بۆیەش خوای پەروەردگار هەڵیبژاردوون، بۆ پلەی پێغەمبەرایەتیی.

٣/ شوێنی سێیەم لە سوورەتی (یونس) ئایەتی (٩٨)دا، کە ئێستا تەفسیری دەکەین، دەفەرموێ: ﴿ فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَـٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُوا۟ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَـٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٩٨﴾ ﴾.

٤/ شوێنی چوارەم لە سوورەتی (الصافات) ئایەتەکانی: (١٣٩ تا ١٤٨)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾

فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ
كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾ فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ
وَهُوَ سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ
أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١٤٨﴾.

**لێرەدا لە یازدە (١١) ئایەتدا، خوا ﷻ باسی یونوس دەکات، دەفەرموێ:**

**وە بێگومان یونوس لە ڕەوانە کراوان بوو، کاتێك کە بە تووڕەیی (وەك چۆن کۆیلەیەك لە گەورەکەی خۆی ڕادەکات)، {ئەویش بەبێ مۆڵەتی خوا}، ڕایکرد چووە نێو کەشتییە پڕەکەوە، قورعەی کێشاو، لەوانەبوو کە بە زیانی ئەو قورعە کێشانەکە، تەواو بوو، ئنجا نەهەنگ بەدەمییەوە گرت، لە حاڵێکدا کە لۆمەو سەرزەنشتی (خوای پەروەردگاری) هاتبووە سەریّو، ئەگەر ئەوە نەبووایە لە خوا بەپاکگران بوو، {خوای بە پاك گرت، وەك دوای باسی دەکەین لە سووڕەتی (الأنبیاء)دا چۆن خوای بە پاك گرتوە !}، لە زگی نەهەنگەکەدا هەتا ڕۆژی زیندووکرانەوە دەمایەوە، (واتە: لەوێدا گیانی دەسپارد).**

**ئنجا ئێمە ئەومان فڕێدایە دەشتێك، لە حاڵێکدا کە نەخۆش بووو، بڕکە کوولەکەیەکمان لەسەر ڕواند {(يَقْطِينٍ) بە عەرەبیی (قرع)یشی پێ دەڵێن، بە کوردیی، کوولەکەی پێ دەڵێن، جۆری کوولەکە گەورەکانە، کە مێش و مەگەز توخنی ناکەوێ، ئەویش لەشی هەموو برین بووە، بۆ ئەوەی کوولەکە سێبەری بۆ بکاتو، مێش و مەگەز لێی نیزیك نەکەوێتەوە، تاکو برینەکەی چاك دەبێتەوە}، وە ناردمان بۆ لای سەد هەزار کەس، بەڵکو زیاتریش {واتە: خەڵکی شاری (نینوی) موصلّ}، وە بڕوایان هێناو ئێمەش تا کاتێکی دیاریکراو، (واتە: تا کاتی تەمەنی سروشتییان بەسەر دەچێ) هێشتمانەوە.**

٥/ شوێنی پێنجەم ﷺ باسی (یونس) کراوە، لە سوورەتی (الأنبیاء) ئایەتەکانی (٨٧و ٨٨)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: وە هاوەڵی (ماسیی) نەهەنگ کاتێک بە توورەیی ڕۆیی (واتە: لە گەلەکەی خۆی تووڕە بوو، کە بڕوایان پێ نەهێناو وەڵامیان نەدایەوە لە سەرەتاوە)، پێی وابوو کە ئێمە شوێنمان لێی تەسک نەکردۆتەوە، (پێی وابوو کە ئێمە وڵاتمان لێی بەرتەسک نەکردوە کە هەردەبێ لەگەڵ خەڵکی نەینەوا خەریکی بانگەواز بێ، ڕەنگە گوتبێ: ئەگەر ئەوانە بە قسەم ناکەن، دەچم بانگەوازی پەیامی خوا لە شوێنێکی دیکە دەکەم، بەڵام لەبەرئەوەی بەبێ مۆڵەتی خوا ڕۆیشتبوو، خوا سزایدا، لە سکی نەهەنگدا سجنی کرد).

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾، واتە: ئنجا لە نێو تاریکاییەکاندا، {زانایان دەڵێن: شەوی بەسەردا هاتوە، بۆیە تاریکیی شەوو، تاریکیی دەریاو تاریکیی نێو هەناوی نەهەنگ، لەنێو ئەو سێ تاریکییەدا} پاڕایەوە، کە ـ ئەی خوایە ! ـ بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراو نین، پاکیی بۆ تۆ، بێگومان من لە ستەمکارانم {من ستەمم لەخۆم کرد، کە بەبێ مۆڵەتی تۆ ڕۆیشتمو گەلەکەمم جێهێشت، دەبووایە زیاتر خۆڕاگرییم لەسەر کردبانایەو، هەتا مۆڵەتم لە تۆ وەرنەگرتبایە، نە ڕۆیشتبام} ئاوا دانی بە هەڵەی خۆیدا هێنا، ئەوەش خوا بە پاک گرتنەکەیەتی، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَوۡلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ ﴾، لێرەدا خوا بە پاکگرتنەکەی ڕوونکردۆتەوە، کە لە سوورەتی (الصافات)دا، هەر بە وشەیەک باسی کردوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ ﴾، واتە: ئیدی وەڵاممان دایەوەو لەو خەم نارەحەتییەی کە تێیدابوو، دەربازمان کرد، ﴿ وَكَذَلِكَ نُنجِي الْمُؤْمِنِينَ ﴾، هەر بەو شێوەیەش بڕواداران ڕزگارو دەرباز دەکەین {یانی، کاتێك کە وەك یونوس هەڵەیەك دەکەن، ئەگەر خوا بە پاك بگرن و دان بە هەڵەی خۆیاندا بێنن و، بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەمە یاسایەکی خوایەو خوا لێیان دەبووری و قوتاریان دەکات}.

٦/ شوێنی شەشەم لە سووڕەتی (القلم) ئایەتەکانی : (٤٨ و ٤٩ و ٥٠)دا، خوا ﷻ باسی یونوس دەکات، کە دەفەرموێ : ﴿ فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ الْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ ﴿٤٨﴾ لَّوْلَا أَن تَدَارَكَهُ نِعْمَةٌ مِّن رَّبِّهِ لَنُبِذَ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ مَذْمُومٌ ﴿٤٩﴾ فَاجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَجَعَلَهُ مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿٥٠﴾ ﴾، {خوا پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەدوێنێ دەفەرموێ:} بۆ بڕیارو حوکمی پەروەردگارت خۆڕاگربەو، وەك هاوەڵی نەهەنگ مەبە، (واتە : یونوس)، کاتێك لە خوا پاڕایەوە، کە پێشتریش زۆر خەفەت و دڵ پڕو پەست بوو لە گەلەکەی و، ئەگەر چاکەیەك لە پەروەردگاریەوە دە فریای نەکەوتبایە، فڕێ دەدرایە دەشت، لە حاڵێکدا کە سەرزەنشتکراوو لۆمەکراو دەبوو (بەڵام خوا لێی خۆش بووو چاوپۆشیی لێکرد، واتە: ئەگەر نەهەنگەکەش فڕێی دابایە، ئەگەر چاکەو بەزەیی خوا بەفریای نەهاتبایە، لە لیستی پێغەمبەرایەتیی دا دەسڕایەوە)، بەڵام پەروەردگاری هەڵیبژاردو، خستیە نێو ڕیزی چاکەکارانەوە: {کە پێغەمبەرانن صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ}.

ئەمەش بە ڕاستی موژدەیەکی خۆشی تێدایە، کەواتە: ئینسان ئەگەر هەڵەیەك، کەم و کوڕییەکی کردو کەوت، با لە خۆی بێ ئومێد نەبێ، ئەوەتا پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) هەڵەو کەم و کوڕییان بەسەردا هاتوە، کە دیارە هەڵەی ئیجتیهادییە، چونکە یونوس نەیزانیوە کە ئەوە گوناهە،

بەس مۆڵەتی وەرنەگرتوەو، ئیجتیهادێکی کردوەو نەیپێکاوە، ئنجا خوا ﷻ بەو شێوەیە سزای داوە، بەلام دوایش کە گەڕاوەتەوە بۆ لای خوا ﷻ، خوا هەڵیبژاردوەو، ڕێزی لێناوەو، خستوویەتە نێو کۆمەڵی چاکانەوە.

**برگەی چوارەم: پوختەی بەسەرهاتەکەی یونوس (علیه السلام) لەبەر تیشکی ئایەتەکاندا، لەم حەوت خاڵەدا دەخەینە ڕوو:**

١) یونوس (علیه السلام) بۆ لای خەڵکی شاری (نینوی) نێردراوە (موصڵی ئێستا) کە ئەو کاتە ژمارەیان سەد هەزار (١٠٠,٠٠٠) کەس زیاتر بووە، وەك خوا لە سوورەتی (الصافات)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾ ﴾، واتە: ڕەوانمان کرد بۆ لای سەد هەزار کەس، بەڵکو زیاتریش، بۆچی دەفەرموێ: بەڵکو زیاتریش؟ چونکە دیارە وەچەی بەشەر لە هەر شوێنێك، مەگەر بەلایەکیان بێ، ئەگەرنا بەردەوام هەر لە زیادبوون دان، کاتی خۆی عێراق دوو سێ ملیۆن بووە، بەلام ئێستا سی و ئەوەندە ملیۆنەیە، کورد ئێستا نیزیکەی چل ملیۆنە، کاتی خۆی کەمتر بووە، بەشەر کاتی خۆی چەند بووە، ئێستا شەش ملیارو نیو زیاترە.

٢) وا پێدەچێ یونوس (علیه السلام) زۆر لەگەڵ خەڵکی نەینەوا دا خەریك بووبێ، بەلام هەرچەندە ماوەیەکی زۆر بانگی کردوون و ئامۆژگاریی کردوون و ترساندوونی و هۆشداریی پێداون، بەلام بە دەمیەوە نەهاتوون، ئەویش لێیان تووڕە بووەو، بەجێی هێشتوون، پێی وابووە مەرج نیە کە هەر لەوێ بانگەواز بکات، واتە: پێی وابووە، ئەگەر بڕواتە شوێنێکی دیکەش خوای پەروەردگار لێی تووڕە نابێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾الأنبياء، کە بە داخەوە هەندێك لە

توێـژەرەوان ڕسـتەی: ﴿فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ﴾یـان، وا لێکـداوەتـەوە، وەك ڕواڵەتەکەی، واتە: پێی وابووە کە ئێمە دەستەڵاتمان بەسەریدا نیە! کە بێگومـان ئەو جۆرە ماناکردنە هەڵەیە، چونکـە: مسوڵمانێکی عەوامیش وا بیـر ناکاتـەوە، چ جـای پێغەمبەرێکی پایە بەرزی خـوا؟! نەخێر، وانیـە، شایانی باسیشـە هـۆی بەهەڵـەدا چـوونەکە، ڕاسـت تێنەگەیشـتنە لـە مانـای وشەی: (نَّقۡدِرَ)کـە ئـەم وشەیە دوو مانـای هەن‌و بەگوێرەی سـیاق یەکێکیان دیـاری دەکـرێ :

١ -قَدَرَ يَقْدِرُ: ضَيَّقَ يُضَيِّقُ .

٢ -قَدَرَ يَقْدِرُ: قَوِيَ يَقْوى: قـدر عليه: قوى عليه وغَلَبَهُ.

شـتێکی ئاشکراشـە کـە مانـای دووەمیـان کـە بـە کوردیی دەبێتـە: پێـی وێـرا، توانـای بەسـەرداشـکاو، بەپێـی ئـەم مانـا لێکدانەوەیە، مانـای ڕسـتە قورئـانییەکە ئـاوای لـێدێ:

یونس پێی وابـوو ئێمە پێـی نـاوێرین، توانـامان بەسـەری دانـاشکێ !

بەڵێ ئەم مانـایەی دووەم، لەگەڵ سـیاقی ئایەتەکەو کەسایەتیی پێغـەمبـەرێکی خـوادا نـاگونجێ !

کەواتە : مەبەسـت مانـای یەکـەمی وشـەکەیـە :

یونوس پێی وابـوو ئێمە سـەرزەمینمان لـێ تـەنگ نەکـردوە، کە بـۆی نـەبێ بەمـلاولادا بچـێ، بۆیـە ڕۆیشـت، یـانی : ئەگـەر زانیبای لەسـەرمان کردۆتە مـەرج، کە نـابێ خەڵکی نەهێنـەوا بەجێ بهـێڵـێ، نەدەڕۆیشـت.

دیارە وێنەی بەکـارهێنـانی ئـەو وشـەیەش لـە قورئـان دا زۆرە، بـۆ وێنـە: خـوا دەفـەرموێ: ﴿ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ﴾القصـص، ﴿وَيَقۡدِرُ﴾، واتـە: (يُضيِّق) واتـە: کـەمی دەکاتـەوە، ﴿يَبۡسُطُ﴾، واتـە: خـوا ڕزقیان بۆ فراوان دەکات، کەواتـە: ﴿فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ﴾، پێـی وابـوو کە

ئێمە ولاتمان لێ تەنگ نەکردۆتەوە کە هەر دەبێ لەوێ خەریکی بانگەوازبێ، نەك پێی وابێ کە ئێمە دەستەلاتمان بەسەریدا ناشکێت، چونکە خوا لە هەموو شوێنێك دەسەلاتەکەی وەك یەکە، چۆن پێغەمبەرێکی پایەبەرز گومانێکی وای دەبێ، کە ئەگەر لە نەینەوا بڕوات، خوا دەستەلاتی بەسەردا ناشکێ ! بەداخەوە هەندێك لە زانایان هەندێك شتیان هێناوە، کە هەر نەدەبوو پەڕیان پێ ڕەشکردبایەو، نەدەبوو خەڵکیان پێوە سەرقاڵ کردبایە، بۆ ئەوەش ئاماژەم پێدا، تاکو ئەگەر کەسێك کەوتە بەرچاوی، پێی وانەبێ ئەو قسەیە تەواوە! نەخێر بە هیچ شێوەیەك مسوڵمانێکی عادەتیش پێی وانیە : ئەگەر بگوازێتەوە بۆ شوێنێکی دیکە، دەستەلاتی خوا بەسەریدا ناشکێ ! مسوڵمانی عادەتیش ئەو قەناعەتەی نیە، چ جای پێغەمبەری خوا (علیه السلام).

٣) خوا ﷻ لەسەر ئەوەی کە یونوس بەبێ پرس ڕۆیشتوەو خەڵکی شارەکەی بەجێهێشتوە، لە قورگی نەهەنگدا سجنی کرد، دوای ئەوەی قورعەی بەرکەوت، وەك دەفەرموێ : ﴿ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ الْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ ﴾ الصافات، واتە: قورعەی کێشاو، لە تێشکاوان بوو، واتە: قورعەکە بە زیانی ئەو تەواو بوو، ﴿ فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴾، نەهەنگ بەدەمیەوە گرت.

جێی سەرنج ئەوەیە کە زانایانی شارەزای دەریاو ماسیو نەهەنگ، دەڵێن: گەروو (بلعوم)ی نەهەنگ زۆر تەسکە بەرەو نێو زگیو، ئینسانی پێوە ناچێ، بۆیەش خوا دەفەرموێ: ﴿ فَالْتَقَمَهُ ﴾، بە دەمیەوە گرت، واتە: وەك لوقمەیەك بە دەمیەوە گرت، نافەرموێ: (فَابْتَلَعَهُ) قوتیدا، ﴿ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴾، وە لە کاتێکدا کە سەرزەنشتکراو بوو.

هەڵبەتە خوای پەروەردگار دەیتوانی کارێك بکات نەهەنگەکە قوتیشی بداتو لە زگی دا بە سەلامەتیی هەر بیهێڵێ، بەلام دیارە لە زگی نەهەنگدا هەوا نیە، بۆیە بە دەمیەوە گرتوەو وا پێدەچێ هەوای بۆ چووبێ، بەلام ئایا چەند شەوو ڕۆژان لە دەمی نەهەنگەکەدا بووە؟ کە بە تەئکید ئەوە هەموو

کاریگـەریی هەبووە بۆ پێستیو لەشی، کە دوایی خـوای میهرەبان دەفـەرموێ: نەخۆش کەوتوەو خـوا برکە کوولەکەیەکی لەسەر ڕوانـدوە، وەك پێشـتریش باسـمان کرد.

٤) پێغـەمبەر یونوس کە دەکەوێتە قورگی نەهەنگەکە، لە خوا دەپاڕێتەوەو پەشێمان دەبێتەوەو، پاکیی بۆ خـوا دەردەبڕێو، ستەم دەداتە پاڵ خـۆی، وەك دەفـەرموێ :

﴿فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٨٧ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ۝٨٨﴾الأنبیـاء، واتـە: لـە تـاریکاییەکـاندا پـاڕایـەوە (واتـە: بانگـی پـەروەردگـاری کرد)، کە بێجگە لە تـۆ هیچ پەرسـتـراو نین، پاکیـی بـۆ تـۆ مـن لە ستەمکاران بـووم، ئێمـەش وەڵامـان دایـەوەو لەو خەمو نـاڕەحەتییـە دەربازمـان کـرد، هەر بەو شێوەیەش بڕواداران دەربـاز دەکـەین.

هـەر لەوبـارەوە دەفـەرموێ : ﴿فَلَوۡلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُسَبِّحِينَ ۝١٤٣ لَلَبِثَ فِي بَطۡنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ۝١٤٤﴾الصـافات، واتـە: ئەگـەر لـە خـوا بـە پاکگـران نەبووایـە، لە سکیدا دەمایەوە، تـاکو ئەو ڕۆژەی کە زیندوو دەکرێنەوە، واتـە: لـە دەمی ماسییەکەدا، چونکە ماسیو نەهـەنگ دەمو سکی بەسـەر یەکـەوەن.

هـەروەها لـە سـوورەتی (القلـم)دا دەفـەرموێ : ﴿لَّوۡلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعۡمَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلۡعَرَآءِ وَهُوَ مَذۡمُومٞ ۝٤٩﴾، واتە: ئەگەر چاکـەیەك لـە پەروەردگاریـەوە، دە فریـای نەکـەوتبـایە، فڕێـدەدرایە دەشـت، لە حاڵێکدا کە سـەرزەنشت کـراوە.

بـەڵام هـەر لـە سـوورەتی (القلـم)دا دەفـەرموێ: ﴿فَٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ۝٥٠﴾، واتـە: پەروەردگـاری هەڵـیبژارد، (مـادام گەڕایـەوەو خـوای

بەپاکگرتو خۆی بە خراپەکار داناو، خۆی بە هەڵەکار دانا، کە ئیجتهادێکی کردوەو، نەیپێکاوەو، پەلەی کردوە لە بەجێهێشتنی گەلەکەیدا، خوا هەڵیبژاردو، گێڕای لە چاکان).

٥) ئنجا خوا کە لە قورگی نەهەنگەکە دەریدێنێ، کە دیارە نەخۆش بووە، بۆیە ڕووەکی ﴿يَقْطِينٍ﴾، واتە: کوولەکەی لەسەر دەروێنێ، کە سێبەری لێبکات، وەك لە سووڕەتی (الصافات)دا، دەفەرموێ: ﴿فَنَبَذْنَـٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ١٤٥ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ١٤٦﴾، واتە: نەهەنگەکە فڕێی دایە دەشت، لە حاڵێکدا کە نەخۆش‌و دەردەدار بوو (هەر خوا دەزانێ، چەند شەوو ڕۆژان بە دەمی نەهەنگەکەوە بووە، کە وەك گوتم: کاریگەریی هەبووە بۆ سەر پێستی‌و، کەوتۆتە حاڵەتی نەخۆشیی‌و ناڕەحەتیی) بۆیە ئێمە ڕووەکی (يَقْطِينٍ)مان لەسەر ڕواند.

{(يَقْطِينٍ) کە (قرع)یشی پێ دەڵێن، واتە: کوولەکە، کە زانایانی ڕووەك ناس دەڵێن: سروشتی کوولەکە وایە مێش‌و مەگەز لێی نیزیك ناکەوێتەوە، ئنجا ئەویش لەشی هەموو برین بێ‌و، فڕێ بدرێتە ئەو دەشتە، مێش‌و مەگەز تێی دەورووکێ‌و برینەکانی زیاتر خراپ دەبن، بۆیە بۆ سارێژبوونەوەی برینەکانی، خوای کارزان، برگە کوولەکەی لەسەر ڕواند، کە ڕەنگە کوولەکەشی دەرکردبێ‌و، کولەکەکانیشی لێ کردبنەوەو خواردبنی}.

٦) پاشان یونوس دەگەڕێتەوە بۆ لای گەلەکەی، گەلەکەشی سەد هەزار کەس، بەڵکو زیاتر بوون‌و، ئیمانیان پێ هێناوە، وەك لە سووڕەتی (الصافات)دا دەفەرموێ: ﴿وَأَرْسَلْنَـٰهُ إِلَىٰ مِا۟ئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ١٤٧ فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَـٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ١٤٨﴾، واتە: وە ناردمان بۆ لای سەد هەزار کەس، یان زیاتریش، ئەوانیش بڕوایان پێ هێنا، ئێمەش ئەوانمان هێشتەوە، تاکو کاتێکی دیاریکراو.

٧) لە ئاکامی ئیمان هێنانیشیاندا خوای میهرەبان بەڵای ڕیسواکەریی دنیای لەسەر هەڵگرتنەو، تا ماوەیەکی دیارییکراو ژیاندنی، کە لە سووڕەتی (یونس)دا دەفەرموێ : ﴿إِلَّا قَوۡمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفۡنَا عَنۡهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَمَتَّعۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ حِينٖ ٩٨﴾، واتە: تەنیا گەلی یونوس، پێش ئەوەی بەڵای ڕیسواکەر لەبەینیان بەرێ، ئیمانیان هێنا، کاتێک کە بڕوایان هێنا، سزای ڕیسواکەرمان لەسەر لابردنەو، تا کاتێکی دیارییکراو ژیاندمانن. (کاتێکی دیارییکراو، واتە: تا تەمەنی سروشتیی خۆیان تەواو دەبێ).

**مەسەلەی پێنجەم :**

# کورتە باسێک لەبارەی ئازادی بڕواهێنانەوە

دیارە ئەم بابەتە لەبەر ڕۆشنایی ئایەتەکانی : (٩٩ و ١٠٠ و ١٠١)دا دەتوێژینەوە، ئەم سێ ئایەتە بەپێزە چەند ڕاستییەکی گرنگو گەورە لەبارەی ئازادیی مرۆڤەوە لە بواری ئیمان هێنانو نەهێناندا، دەخەنە ڕوو، کە ئێمە بە پێی ڕیزبەندیی برگە (مقطع)کانیان، دەیاننووسین، لە حەوت برگەدا :

**ڕاستیی یەکەم :** کە خوا دەفەرموێ : ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا﴾، ئەگەر پەروەردگارت ویستبای، هەموو ئەوانەی لەسەر زەوین، تێکڕاو وێکڕا بڕوایان دەهێنا.

پێشتریش باسمان کردوە، (لَوْ: حَرْفُ امْتِنَاعٍ لاَمْتِنَاعٍ)، (لَوْ) پیتێکە بەکاردێ، ڕێگریی لە دووەم دەکات، لەبەر یەکەمیان[1]، بۆ وێنە: دەگوترێ: (لَوْلاَ زَيْدٌ لَهَلَكَ عَمْرو) واتە: ئەگەر زەید نەبووایە، عەمر دەفەوتا، واتە: ڕێ لە فەوتانی عەمر گیراوە، بەهۆی بوونی زەیدەوە.

لێرەش خوا دەفەرموێ : ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا﴾، ئەگەر پەروەردگارت ویستبای، واتە: ویستبای زۆر لە خەڵك بکاتو، بە زۆر ئیمان بە خەڵك بێنێ، ئەوە هەموو ئەوانەی لەسەر زەوین، تێکڕاو وێکڕا بڕوایان دەهێنا، یانی: بۆیە تێکڕای خەڵك ئیمانیان نەهێناوە، چونکە خوا

---

١) دەشگونجێ (لو) بۆ هاندان (تحضيض)یش بەکاربێ، بەڵام لێرەدا بۆ ئەو مانایە ناگونجێ.

نەیویستوە، بەڵام بۆچی خوا نەیویستوە؟ چونکە نەیویستوە ناچاریان بکاتو، ویستوویەتی ئازادو سەرپشکیان بکات، کەواتە: ئەم ڕستە موبارەکە ئاوای لێ دێتەوە : (ولو شاء ربک مشیئة إجبارٍ وإکراهٍ، لآمَنَ مَنْ فِي الأرض کلهم جمیعاً)، ئەگەر پەروەردگارت ویستبای زۆر لە خەڵک بکاتو ناچاریان بکات، هەموو ئەوانەی لەسەر زەوین، تێکڕاو وێکڕا بڕوایان دەهێنا.

چونکە وشەی (کُلُّهم) کە دەفەرموێ : ﴿لَآمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ﴾،

واتە: تێکڕای تاکەکان، وە کە دەفەرموێ : ﴿جَمِيعًا﴾، واتە: پێکەوەو وێکڕا.

**ڕاستیی دووەم :** پێغەمبەریش ﷺ بۆی نەبووە خەڵك ناچار بکات لەسەر بڕوا هێنان وەك خوا دەفەرموێ: ﴿أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ﴾، دیارە ئەو هەمزە (أ)یە، هەمزەی پرسیارکردنی نکوولیی لێکەرانەیە، (الهَمْزة للإستفْهام الإنکاري) خوای پەروەردگار بە نکوولیی لێکردنەوە، بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ئایا تۆ زۆر لە خەڵك دەکەی، تاکو بیانکەیە بڕوادار، واتە: خوا نکوولیی لێ دەکات، یانی بۆت نیە.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺو، هیچ کەسێکی دیکەش بۆی نیە، خەڵك ناچار بکات لەسەر بڕوا هێنان، لە ڕاستییشدا خەڵك هەر ناچار ناکرێ لەسەر ئیمان هێنان، چونکە ئیمان هێنان پەیوەندیی بە دڵو دەروونو دیوی پەنهانی ئینسانەوە هەیە، بەڵکو ئەو کاتە خەڵك ناچار دەکرێ، لەسەر دەربڕینی ئیمانێکی بە درۆ، دەربڕینی مسوڵمانێتییەکی بە درۆ، واتە: خەڵك ناچار دەکرێ لەسەر ئەوە کە ببن بە موناقیقو دووڕووو دەغەڵو، بەتەئکید ئیمان بە زۆر پەیدا نابێ.

**ڕاستیی سێیەم :** هیچ کەس بەبێ ویستو مۆڵەتی قەدەریی خوا، ناتوانێ بڕوا بێنێ : ﴿وَمَا كَانَ لِنَفۡسٍ أَن تُؤۡمِنَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾، هیچ کەسێك بۆی نیە بڕوا بێنێ، مەگەر بە مۆڵەتی خوا.

دەبێ وریا بین: وشەی (إذن) لە قورئاندا کە بەکارهاتوە، واتە: مۆڵەت، ئنجا جاری وایە مەبەست پێی مۆڵەتی شەرعییە، جاری واشە مەبەست پێی مۆڵەتی تەکوینیی‌و قەدەرییە.

(مۆڵەتی شەرعیی) واتە: ئەوەی کە خوا لە شەریعەتدا بەیانی کردوە، بۆ وێنە: مۆڵەتی شەرعییە، ڕوخسەتە کە کەسێك لە ڕەمەزاندا سەفەری کرد، یان نەخۆش بوو، ڕۆژوو نەگرێ‌و، دوایی ڕۆژووەکانی بگرێتەوە، ئەوە مۆڵەتی شەرعییەو لە شەریعەتدا بەیان کراوە.

(مۆڵەتی قەدەریی یان مۆڵەتی تەکوینی) ئەوەیە: کە بە پێی ئیرادەو ویستی خوا بێ، کە لێرەدا مەبەست لەو مۆڵەت (إذن)ە، مۆڵەتی قەدەریی‌و تەکوینییە، بۆچی؟

ئنجا ئێمە بۆ ڕاست‌و دروست تێگەیشتنی ڕستەی: ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ﴾، ناچارین بڵێین : لێرەدا مەبەست لەو مۆڵەت (إذن)ە مۆڵەتی قەدەریی‌و تەکوینی خوایە، نەك مۆڵەتی شەرعیی، چونکە خوا لە ڕووی شەرعییەوە، نەك هەر مۆڵەتی داوە، کە خەڵك ئیمان بێنێ، بەڵکو فەرزیشی کردوە، لە چەندان ئایەتدا، بۆ وێنە: خوا دەفەرموێ : ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾﴾البقرة، واتە: ئەی خەڵکینە! ئەو پەروەردگارەتان بپەرستن، کە ئێوەی وەدی هێناوەو، ئەوانەی پێش ئێوەشی بەدی هێناوە، بۆ ئەوەی پارێزی لێ بکەن.

کەواتە: خوای کاربەجێ، وەك مۆڵەتی شەرعیی، نەك هەر مۆڵەتی داوەو ڕێی داوە، بەڵکو پێویستیشی کردوە، کە هەموو خەڵك ئیمان بە خوا بێنێ‌و، بیپەرستێ‌و بەندایەتیی بۆ بکات، کەواتە: لێرەدا مەبەست پێی مۆڵەتی قەدەرییە، یانی: بەبێ ویستی خوا، کەس ناتوانێ ئیمان بێنێ، بەبێ ئەوەی خوا ﷻ لە ڕووی قەدەرییەوە، لە ڕووی تەکوینییەوە ڕێ بدات.

ئنجا حیکمەتی ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییەش ئەوەیە، کە بزانرێ: بڕوا هێنان‌و بڕوا نەهێنانی خەڵك، بە پێی یاساکان (سنن)ی خوایەو، لە ژێر ڕکێفی ویستی ڕەهای خوا دایە، واتە: کەسێك کە ئیمان ناهێنێ، دیارە خوا نەیویستوە، نەك ئەوە کە ئیمان ناهێنێ، خوا ناچار بکات ئیمان نەهێنێ ! بەڵکو خوا بۆخۆی بە ویستی ڕەهای خۆی مۆڵەتی داوەو ئەو توانایەی پێداوە، کە هەرچەندە خوا پێی ناخۆشە، بەلام ئیمان نەهێنێ، یان هەرچەندە خوا پێی ناخۆشە، بەلام گوناح بکات، یان هەرچەندە خوا پێی خۆشە، بەلام فەرمانبەریی‌و تاعەت بۆ خوا ئەنجام نەدات، خوا بۆخۆی توانای بە مرۆڤەکان داوە، ئنجا بۆچی ئەو توانایەی بە مرۆڤان داوە؟ بۆ ئەوەی بەکەڵکی تاقیکردنەوە بێن، بەکەڵکی جێنشینایەتیی خوا بێن لەسەر زەوی‌و، بە کەڵکی هەڵگرتنی ئەمانەتی خوا بێن.

<u>ڕاستیی چوارەم</u> : ئەوانەی عەقڵ‌و هۆشیان ناخەنە کار بۆ ناسینی خوا، شایستەی پیسیی‌و بێبڕوایی دەبن، وەك دەفەرموێ : ﴿ وَيَجۡعَلُ ٱلرِّجۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ ﴾، واتە: خوا پیسیی دادەنێ لەسەر ئەوانەی کە نافامن، واتە: عەقڵ‌و هۆشیان بەکارناهێنن.

وشەی (الرّجس، القَذَر) واتە: پیسیی، بە مانای سزاو ئازار دێ‌و، بە مانای تووڕەیی خواو، کوفریش دێ، واتە: خوا ﷻ لە ئەنجامی بەکارنەهێنانی عەقڵدا بە شێوەیەکی ڕاست‌و دروست، بۆ ناسینی خوای پەروەردگارو، ناسینی پێغەمبەران (علیهم الصلاة وسلام)و، زانینی ڕاستیەتیی پەیامی خوا، لە ئەنجامی ئەوەدا، ئەوانە بە شایستە دەزانێ، کە پیسیی بێبڕواییان بخاتە سەر، واتە : خۆیان وا دەکەن، کە شایستەی ئەوە بن.

<u>ڕاستیی پێنجەم</u> : مرۆڤ لە ڕێی سەرنج دانی بەهۆشانەی دروستکراوەکانی خواوە، لە بوونەوەرو دەوروبەریدا، دەستی لە خوناسیی گیر دەبێ، ئینسان چۆن پەی بە خواناسیی دەبات؟ ئەگەر بڵێی: بەهۆی پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام)، مرۆڤ ئەگەر جارێ خوای نەناسیبێ، نوێنەری خوا چۆن

دەناسیێ؟! ئنجا ئەگەر بڵێی : لە ڕێی کتێبەکانی خواوە، خوا دەناسێ، دیسان دەگوترێ : ئەو جارێ ئەگەر خوای نەناسیبێ، چۆن دان بە کتێبەکەی دا دێنێ؟ کەواتە: پێشێ ئینسان دەبێ خوا بناسێ، بەڵام ئایا مرۆڤ لە ڕێی چییەوە خوا دەناسێ؟! خوای پەروەردگار ڕوونی کردۆتەوەو دەفەرموێ : ﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، واتە: بڵێ: با تەماشا بکەن، چی لە ئاسمانەکانو لە زەوییدا هەیە.

بۆیە من کاتی خۆی لە شیعرێکدا گوتوومە :

سروشت ئاوێنەی تەجەللای خوایە     باش سەرنجی بدە بزانە چی تیایە

لە ڕێی کرەوە کردگار دەناسرێ     سروشت کرێکە کردگاری خوایە

ئەم بوونەوەرە بەرهەمی خوای پەروەردگارە، وەدیهێنراوی خوای پەروەردگارە بە پەنهانو ئاشکرایەوە، وە بە سەرو خواریەوە، بۆیە ئەگەر بمانەوێ خوای باڵادەست بناسین، دەبێ تەماشای دروستکراوەکانی بکەین.

لە ڕاستییدا دروستکراوەکانی خوا، ئاوێنەی تێدا دەرکەوتنی ناوو سیفەتەکانی خوان ﷻ، ئەگەرنا ئێمە ڕاستەوخۆ پەیوەندییمان بۆ بە خواوە ناکرێ! کەواتە: ئێمە دەبێ لە ڕێی شوێنەوەرەکانیەوە خوای پەروەردگار بناسین، ئنجا ئێمە نەك هەر خوا ﷻ کە : (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْء) هیچ شتێك وەك خوا نیە، بەڵکو بەشێکی زۆر لە دروستکراوەکانی خواش، لە ڕێی شوێنەوارەکانیانەوە، دەیانناسین.

بۆ نموونە :

١/ هێزی کێشندە، کە ئەم بوونەوەرەی ڕاگرتوە، ئەو هەموو کەهکەشانو ئەستێرەو خڕۆکانە بەیەکەوە دەبەستێ، کێ هێزی کێشندەی بینیوە؟ کەس نەیبینیوە، بەڵام لە ڕێی شوێنەوارەکانیەوە دەیزانین.

٢/ هەروەها هێزی موگناتیسیی.

٣/ ئنجا تیشکی ژێر سوورو تیشکی سەرومنەوشەیی.

٤/ هەروەها گەردیلە (ذرة)، کێ گەردیلەی بینیوە؟ کە بە میکرۆسکۆبی ئەلیکترۆنییش کە نیزیکەی ملیۆنێك جار شت گەورە دەکات، گەردیلە نەبینراوە، بەلام لە رووی شوێنەوارەکانەوە دەزانین، کە بچووکترین پێکهاتەی مادده گەردیلەکانن‌و، گەردیلەش بۆخۆی لە چەند پێکهاتەیەك پێکدێ، ئنجا بە چەند ملیۆن گەردیلە مۆلکۆل (جُزَيء)ێك پێکدێنن، ئنجا لەوانیش توخمەکان (عناصر) پێك دێنن، کەواتە: هەموو ئەو دروستکراوانە لە رێی شوێنەوارەکانیانەوە دەیانزانین، چ جای خوا ﷻ!!

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، واتە: ئەگەر دەتانەوێ خوا بناسن، رێی رێك‌و راست‌و تەندروستی ئیمان بە خوا هێنان‌و خواناسین: سەرنجدانی دروستکراوەکانیەتی، لە رێی ئەو دەوروبەرو بوونەوەرەوەیە، بە سەرو خوارەوە، ئاسمانەکان‌و زەوی، کە دەتوانین پەی بە بەدیهێنەرو خاوەن‌و مشورخۆری بەرزو مەزن‌و تاك‌و پاك‌و بێ وێنەیان، ببەین.

<u>راستیی شەشەم</u> : کەسێك نەیەوێ ئیمان بێنێ، هیچ کام لە نیشانەکانی خوا لە بوونەوەرداو، ترساندن‌و ترسێنەرەکان، سوودیان بۆی نابێ، وەك دەفەرموێ: ﴿وَمَا تُغۡنِي ٱلۡأٓيَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ﴾، (ما) دەگونجێ (نافية) بێ، واتە: نیشانەکان‌و ترساندنەکان سوود ناگەیەنن بە کۆمەڵێك کە بڕوا ناهێنن، یاخود دەگونجێ (ما)ی (الإستفهامية) بێ، واتە: نیشانەکان‌و ترساندنەکان‌و وریاکەرەوەکان، بۆ کۆمەڵێك کە نایانەوێ ئیمان بێنن، چ سوودێ دەگەیەنن؟ بەدڵنیایی هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنن.

وشەی (ٱلۡأٓيَٰتُ) لە ئەسڵدا :

١/ دەگونجێ مەبەست پێی نیشانەکانی خوا بێ، دیاردەو دیمەنە سروشتییەکان.

٢/ دەگونجێ مەبەست پێی رستەکان‌و برگەکانی فەرموودەی خوا بێ.

٣/ دەشگونجێ مەبەست پێی موعجیزەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة وسلام) بێ.

بەڵام بە پێی سیاق بۆمان دەردەکەوێ، کە زیاتر مەبەست پێی دیاردەو دیمەنە سروشتییەکانن، وەك لە سوورەتی (یوسف)دا دەفەرموێ : ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾﴾، واتە: زۆر نیشانە هەن لە ئاسمانەکان‌و زەویدا، بەلایاندا ڕەت دەبن، بەڵام بە پشت تێکردنیانەوە، واتە: هیچ سوودیان لێ نابینن، چونکە: شوێن دەستی خوایان تێدا نابینن‌و، سیفەت‌و ناوەکانی خوای پەروەردگاریان تێدا ناخوێننەوە.

وشەی ﴿ٱلنُّذُرُ﴾ دوو واتای هەن :

١ـ کۆی (إنذار)ە، واتە: (إنذارات) یانی : ترساندنەکانی خواو وریا کردنەوەکانی.

٢ـ یاخود کۆی (نذیر)ە، واتە: (الـمُنذِرون) یانی: وریاکەرەوان‌و ترسێنەران، کە مەبەست پێی پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام).

<u>ڕاستیی حەوتەم</u> : کە دەفەرموێ : ﴿عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ﴾، کۆمەڵێك کە بڕوا ناهێنن، ئەمە بە ڕوون‌و ڕاشکاویی دەیگەیەنێ کە خوای زاناو توانا، ئازادیی تەواوی لە بواری ئیمان هێنان‌و ئیمان نەهێنان دا، بە مرۆڤ داوە، چونکە فەرموویەتی: نیشانەکان‌و ترساندنەکان، سوود بە کۆمەڵێك ناگەیەنن کە بڕوا ناهێنن، واتە بڕوا نەهێنانەکەی پاڵداوەتە لای خۆیان (لای مرۆڤەکان)، هەروەك ئەگەر ئیمانیش بێنن، خۆیان بڕوا دێنن: (یُؤمِنُون باللە) واتە: خۆیان ئیمان دەهێنن، یاخود (آمَنوا باللە) خۆیان ئیمانیان هێناوە.

<u>مەسەلەی شەشەم</u> : کە خوا دەفەرموێ : ﴿فَهَلْ يَنتَظِرُونَ إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِهِمْ ۚ قُلْ فَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ

نُنَجِّي رُسُلَنَا وَالَّذِينَ ءَامَنُوا كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾﴾، واتـــە: ئایا چاوەڕێی چی دەکـەن، جگـە لـە وێنـەی ڕۆژانێـك كە بەسـەر پێشووەكانیان هاتوون؟

(أیـام) كـۆی (یـوم)ە، (یـوم)، واتـە: ماوەیـەك لـە كـات، دیـارە ئـەو كارەسـاتو بەڵایانـەی كە بەسـەر میللەتـە پێشووەكـان هاتوون، لەسـەر بـڕوا نەهێنـانیان، لە ماوەیەكو زەرفێكدا بـووە، كە پێـی گـوتراوە: (یَوْم) كات، ئنجـا ڕۆژێكی خایانـدوە، دووی خایاندوە، مانگێك، كەمتـر، یـان زیـاتری خایـاندوە، یـان : چـركەیەك بـووە، گرنـگ ئەوەیە كاتـی فـەوتاندنەكەیـان پێـی دەگـوترێ : (یـوم) واتـە : ماوەیـەك لـە كـات، كە مەرج نیە تەنیـا بیستو چـوار (٢٤) سـەعات بـێ، ئەوە بەگوێـرەی عـورفی ئێستـای ئێمـەی خەڵكـی سـەر زەوی وایـە: (یـوم) بریتیـە لـە كاتێـك كـە زەوی خـولێك بە دەوری خۆیدا دەكات، لە بەرانبەر خۆرداو، شـەوو ڕۆژ پێكـدێن، كە بـە هەمووی دەگوترێ: (یوم)، ئنجـا بـە شـەوەكەی دەگـوترێ : (لـیل)و بـە ڕۆژەكەشـی دەگوتـرێ : (نهـار)و، بە هەردووكیان دەگوتـرێ: (یـوم) واتـە : شـەوو ڕۆژێـك، ئـەوە بـە نسـبەت ئێمـەوە وایـە.

كەواتـە: كـە دەفـەرموێ : ﴿فَهَلْ يَنتَظِرُونَ إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلِهِمْ﴾، واتـە: چاوەڕێی چی دەكەن، جگە لەوە كە ئـەوەی بەسـەر ئـەوانی پێشـی واندا هـات، بەسەر ئەوانیش دا بێ، واتـە: جگە لەو سزایەی بەسـەر میللەتـە پێشـووەكاندا سەپێنـرا، لـە كـاتێكی دیاریكـراودا، ئـەوانیش ئەگـەر هـەر لەسـەر ڕێچكەی ئەوان بڕۆنو لەسـەر ئەو كەللە ڕەقییـەی ئێسـتـایـان بـەردەوام بـن، جگە لـەوە چاوەڕێی چی دیكـە دەكـەن؟!

﴿قُلْ فَانتَظِرُوا إِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُنتَظِرِينَ﴾، واتـە: بڵـێ: چـاوەڕێ بـن، منیش لە چاوەڕوانـانم.

وشـەی (الأَيَّام: الـمَشَاهِد، الوَقَـائِع وَالأَحْـدَاث) واتـە: ئـەو دیمەنـە سامنـاكو ڕووداوو كارەساتـانەی كە بەسـەریان هـاتوون، لە كاتێكی دیـاریكـراودا.

وشەی (خَلَوْا ) یانی: (مَضَوا) واتە: تێپەڕیون، واتە: لە پێشی واندا ڕابردوونو تێپەڕیون، مەبەست پێی کۆمەڵگا ڕابردووەکانە، واتە: گەلی نووحو گەلی هوودو گەلی صالحو گەلی شوعەیبو گەلی لووطو... هتد، باقی ئەو گەلانەی کە خوای دادگەرو باڵادەست فەوتاندوونی.

کە دەفەرموێ : ﴿ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ ﴾، واتە: ئێوە چاوەڕێ بن، منیش لە چاوەڕوانانم، واتە: من دڵنیام کە ئەگەر ئێوە لەسەر کەللەڕەقیی‌و خراپەکاریی بەردەوام بن، شێوەیەك لە شێوەکانی سزادان لەلایەن خوای دادگەرەوە، بۆ ئێوەش دێتە پێش.

دوایی دەفەرموێ : ﴿ ثُمَّ نُنَجِّي رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، واتە : دوایی پێغەمبەرانی خۆمان (علیهم الصلاة والسلام)و ئەوانەی بڕوایان هێناوە، دەرباز دەکەین، واتە : سوننەتو یاسای ئێمە وابووە کە پێغەمبەرانو ئەوانەی کە لەگەڵیاندا ئیمانیان هێناوە، دەربازمان کردوون، واتە: کاتێك کە سزامان ناردوە بۆ کۆمەڵگایەك، پێغەمبەرەکەو، ئەو کۆمەڵە کەمەی کە لەگەڵیدا ئیمانیان هێناوە، دەربازمان کردوونو قوتارمان کردوونو، ئەوانی دیکەشمان فەوتاندون.

﴿ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيۡنَا نُنجِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، واتە : هەر ئاوا بەو شێوەیە لەسەرمان پێویستە، کە بڕواداران ڕزگار بکەین.

لێرەدا خوا ﷻ باسی یاسایەکی خۆی دەکات، کە لە ژیانی بەشەردا بەردەوام جێبەجێ بووەو جێبەجێ دەبێ، چونکە وشەی :

(كَذَٰلِكَ ) واتە: هەر بەو شێوەیەی کە لە ڕابردوودا کردوومانە، ئێستاشو لەمەودواش ئەوانەی بڕوایان هێناوە، دەربازیان دەکەینو ڕزگاریان دەکەین، کاتێك کە بەڵا بنێرین بۆ ئەو کۆمەڵگایانەی کە دەمانەوێ بیانفەوتێنین.

هەڵبەتە دەشگونجێ لێرەدا مەبەست ئەوە بێ، کە خوا ﷻ وەك چۆن دەفریای پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و ئەو کەمینە بڕوادارانە کەوتوە کە لە

خزمەتیاندا بوون، بە هەمان شێوەش دەفریای ئیماندارانی دیکەش دێ، لە هەر چاخو سەردەمێکدا، بەو شێوەیەی کە حیکمەتی خوا دەیخوازێ، سەریان دەخاتو دەربازیان دەکاتو چەپاڵەیان دەدات.

کە دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيۡنَا نُنجِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، ئاوا بەو شێوەیە لەسەرمان پێویستە، دیارە ئەشعەرییەکانو موعتەزیلەکان کاتی خۆی زۆر مشتومڕیان بووە، لەوبارەوە کە ئایا خوا هیچ شتێکی لەسەر پێویستە، یان نا؟

ئەشعەرییەکان گوتوویانە: ناگونجێ هیچ شتێك لەسەر خوا پێویست بێ.

موعتەزیلەکانیش گوتوویانە: بەڵێ دەگونجێ، خوا شتی لەسەر پێویست بێ، ئەوەتا خوا دەفەرموێ: لەسەر خۆمانمان پێویست کردوە.

کە دیارە ئەم تەعبیرە لە شوێنی دیکەشدا هاتوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الروم) دەفەرموێ : ﴿وَكَانَ حَقًّا عَلَيۡنَا نَصۡرُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٤٧﴾، واتە: وە ئاوا لەسەرمان پێویستە یارمەتیدانو سەرخستنی بڕواداران.

بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە هیچ کەس جگە لە خوا، ناتوانێ شتێك لەسەر خوا پێویست بکات، وەك دەفەرموێ : ﴿لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ ٢٣﴾ الأنبیاء، واتە: خوا لێی ناپرسرێتەوە، بەڵام ئەوان لێیان دەپرسرێتەوە، بەڵام دەگونجێ خوا بۆخۆی شتێك لەسەر خۆی پێویست بکات، واتە: لە ڕووی بەخشندەییو کەرەمی خۆیەوە، بۆخۆی شتێك لەسەر خۆی پێویست بکات، یانی: بە پێی ئەو سیستەمو بەرنامەیەی کە دایناوە، خوا مامەڵە لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەکاتو، ئەوەی دەکەوێتە سەر خوا ﷻ، خوا جێبەجێی دەکات، بەو واتایە کە: خوا بۆخۆی وای داناوە، وەك لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ : ﴿إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٥٦﴾، واتە: بێگومان پەروەردگارم لەسەر ڕێیەکی ڕاستە.

هەروەها لە سوورەتی (الحجر)دا خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسۡتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ ﴾، واتە: (خوا) فەرمووی : ئەوە ڕێیەکی ڕاستە لەسەر من.

یانی : بە لای مندا دێ، یاخود: ئەوە ڕێیەکی ڕاستەو من هەر من بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ بەندەکانم دا دەکەم.

چونکە بە دڵنیایی: مامەڵەی خوا لەگەڵ دروستکراوەکانیداو، بەتایبەت لەگەڵ مرۆڤدا کە سەرتۆپی دروستکراوەکانیەتی، مامەڵەیەکی هەڕەمەکیی و ناسیستماتیك نیە، بەڵکو سیستماتیكو ڕێكو پێکە.

وشەی (نُنَجِّي) بە (نُنْجِ)یش خوێنراوەتەوە: (ثُمَّ نُنْجِ رُسُلَنا).

ئەوەی دیکەش: ﴿ حَقًّا عَلَيۡنَا نُنجِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، دیسان بە: (نُنَجِّي)یش خوێنراوەتەوە، واتە: هەردووکیان بە دوو شێوە خوێنراونەوە.

خوا بە لوتفو کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە بە دەسەڵاتی خۆی، بە عیززەتی خۆی، ئێمەش چەپاڵە دەدات لە دەست ئەهلی کوفرو نیفاقی ڕۆژگاری خۆمان، پێش هەموو شتێك: ئیمانمان بپارێزێو، ئیرادەمان بپارێزێو، کەرامەتمان بپارێزێو، ئیعتباری لای خۆیمان بپارێزێ، لەوە کە لەکەدار بین، یان هەڵوێستێك بنوێنین، شتێك بکەین، کە شایستەی بەیداغی بەرزی ئیسلامو، شەریعەتی بێ هەڵەو پەڵەی خوای پەروەردگار نەبێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دوازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان کە دەرسی کۆتایی یە، لە شەش (٦) ئایەت پێکدێ، کە بریتین لە: (١٠٤ تا ١٠٩) لەو شەش ئایەتەدا، خوای کارزان دوو جاران تێیاندا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات، کە بە: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، بانگی مرۆڤایەتیی بکات :

جاری یەکەم : پێیان بڵێ ؛ کە ئەگەر ئێوە دوو دڵن لە بارەی بەرنامەو ئایینەکەمەوە، ئەوە بزانن کە من تەنیا ئەو خوایە دەپەرستم کە دەتانمرێنێ، نەك ئەو شتانەی ئێوە لە خوار خواوەو لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، کە نەك هەر ژیانو مردنی ئێومیان بە دەست نیە، بەڵکو هی خۆشیانیان بە دەست نیە، ئەگەر ژیانداربن، ئەگەر بێ ژیانیش بن، وەك: دارو بەردو خۆرو مانگو ئەستێرەو ... هتد، ئەوە هەر هیچ.

پاشان خوا فەرمانی پێدەکات کە خۆی بۆ بەندایەتیی خوا ساغو یەکلا بکاتەوەو، وە لە هاوبەشداران نەبێو، لە شتانێك نەپارێتەوە کە سوودو زیانیان نیە، ئەگەرنا لە ستەمکاران دەبێ، کە بێگومان لێرەدا مەبەست قسەکردنە لەگەڵ هاوبەش دانەرانو بێبڕوایاندا، واتە: مەبەست پێی غەیری پێغەمبەری خاتەمە، بۆچی؟

چونکە خوا زاناو شارەزا، دەزانێ کە پێغەمبەر ﷺ، غەیری خوا ناپەرستێو لە غەیری خواش ناپارێتەوەو، بێگومان بەندایەتیی خۆیشی بۆ خوا ساغو

یەکلاکردۆتەوە، کەواتە : بەڕواڵەت بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، بەلام لە پەنای ئەوداو بە کنارە، قسە لەگەڵ خەڵکی دیکەدا دەکات !

ئنجا پێشیڕادەگەیەنێ: کە زیانێك خوا بیهێنێ، بە کەس لاناچێ‌و، خێرێك کە ئەو بە قسمەتی بکات، بەرپەرچدەرەوەی نیە...

دوایی بۆ جاری دووەم : خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: پێیان بڵێ : ئەوە لە پەروەردگارتانەوە هەقتان بۆ هات، ئنجا هەر کەس وەریبگرێ، خۆی بەهرەمەندەو، ئەوەی ڕەفزیشی بکات، خۆی زەرەرمەندەو، پێغەمبەری خوا ﷺ وەکیل‌و چاودێر نیە بەسەریانەوە.

لە کۆتایی دا خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: شوێن پەیامی خوا بکەوەو خۆڕاگربە، هەتا خوا حوکم دەکات، کە ئەو باشترین حوکمڕان‌و بڕیاردەرە.

﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ مِّن دِينِى فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ
ٱللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُمْ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٤﴾ وَأَنْ أَقِمْ
وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٥﴾ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ
مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ۖ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ
بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ۚ يُصِيبُ بِهِۦ
مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ
ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ
وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٨﴾ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَٱصْبِرْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ ۚ وَهُوَ
خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿١٠٩﴾ ﴾.

# مانای وشــە بە وشـەی ئایـەتەکـان

{بڵێ: ئـەی خەڵکینـە! ئەگەر ئێوە لـە دوو دڵییـدان لـەبارەی ئایینەکەمـەوە، (ئـەوە بزانـن کـە) من ئەو شتانە نـاپەرستم کە ئێوە لە خوار خـواوە دەیانپەرسـتن، بەڵکـو تەنیـا ئەو خـوایەی کـە دەتـانژیەنـێو دەتـانمرێنـێ، دەیپەرسـتم، فەرمانیشـم پێکــراوە کـە لـە بـڕواداران بـم ﴿١٠٤﴾ وە (فـەرمانم پێکـراوە، پێمگـوتراوە) کـە: ڕووی خـۆت بـە ساغیی لەگەڵ ملکەچیی دا (بۆ خـوا) ڕاسـت بکەو، لە هـاوبەش دانـەران مەبە ﴿١٠٥﴾ وە لـە خــوار خــواوە لـە شـتێك مەپاڕێـوە، کـە نـە سـوودت پێدەگەیـەنێو نـە زیانـت پێدەگەیەنێ، چونکە ئەگەر واتکرد، کەواتـە تـۆ لـە ستەمکارانـی ﴿١٠٦﴾ وە ئەگـەر خـوا زیـانێکت تـووش بکات، جگـە لە خۆی لابەری نیـەو، ئەگـەر چاکەیەکی بـۆت بـوێ، هیچ بەرپـەرچ دەرەوەیـەك بـۆ بەخششـی وی نیـە، بەخشـشی خـۆی دەدات بـە هەرکـام لـە بەندەکـانی، کـە بیـەوێو، ئــەو لـێبوردەی بـە بەزەییـە ﴿١٠٧﴾ بڵــێ ئـەی خەڵکـینە! بەدڵنیـایی لە پەروەردگارتـانەوە هەقتـان بۆ هـاتوە، ئنجا هەر کەس ڕێی ڕاست بگرێ، ســوودی ڕێــی ڕاســت گرتنەکــەی بــۆ خۆیــەتیو، هــەر کــەس گومڕابــێ، زیــانی گومڕابوونەکـەی هـەر بـۆ خۆیـەتیو، مـن بەسـەرتـانەوە پـارێزەر نـیم (کـە نەهێڵـم گومـڕابن) ﴿١٠٨﴾ وە (ئەی موحەممـەد !) بە دوای ئـەو (پەیـام)ە بکـەوە، کە بۆت سـروش دەکرێو، خۆڕاگربـە، هـەتـا خـوا بڕیـار دەداتو، ئەو باشـترین بڕیـاردەرە}.

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(شَكٍّ ): (إعتدال النقيضين عند الإنسان وتساويهما) (شك) ئەوەیە كە: دوو شتی پێچەوانەی یەكدی هاوسەنگ بن‌و، لەلای ئینسان‌و، یەكسان بن، بە كوردیی دەگوترێ: دوو دڵیی، واتە: شتێك لە نێوان ئەگەرو نەگەردا بهێڵیەوە، نە ئەگەری بوونی بەسەر نەبوونیداو، نە ئەگەری نەبوونی بەسەر بوونیدا، زاڵ بكەی.

(دِينِي ) : (دین) لێرەدا بە مانای ملكەچیی دێ، (دینـي) واتە: ملكەچیی خۆم، یاخود ساغ بوونەوەی خۆم، یان فەرمانبەریی خۆم، (بۆ خوا ساغ كردۆتەوە).

(يَتَوَفَّىٰكُمْ ) : واتە: (يُمِيتُكُم) یانی: بە تەواویی وەرتاندەگرێ، كە لێرەدا مەبەست پێی گیانكێشان‌و مراندنە.

(حَنِيفًا): (الحَنَفُ: هُوَ مَيْلٌ عَنِ الضَّلَالِ إلى الإِستِقَامَةِ، عَكْسُ الجَنَف: هُوَ مَيْلٌ عَنِ الإِستِقَامَةِ إلى الضَّلَالِ، والحَنِيفُ: هُوَ المَائِلُ إلى ذَلِكَ)، واتە: (حَنَف) بریتیە لە مەیلكردن‌و بەلادا چوون لە گومڕاییەوە بەرەو ڕاستە ڕێگا، بە پێچەوانەوەی (جَنَف)ەوە، وشەی (جَنَف) بریتیە لە مەیلكردنی كەسێك بۆ وازهێنان لە گومڕایی‌و لە ڕێی لارو خوار، بەرەو ڕاستە شەقامی خوا. (حَنِيف)یش بابای مەیلكەرە بەرەو هەق

(بِوَكِيلٍ ): (التَّوْكِيلُ أَنْ تَعْتَمِدَ عَلَى غَيْرِكَ وَتَجْعَلَهُ نَائِباً عَنْكَ، وَالوَكِيلُ فَعيلُ بِمَعْنَى: الْمَفْعُول، قَالَ تَعَالَى : ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ١٣٢﴾ النساء، أَي: اكتَفِ بِهِ أَن يتولى أمركَ وَيَتَوَكَّل لَكَ، وَالتَوَكُّلُ يُقَالُ عَلَى وَجْهَيْنِ: تَوَكَّلْتُ لِفُلان بِمَعْنَى: تَوَلَّيْتُ لَهُ، وَيُقَالُ: وَكَّلتهُ فَتَوَكَّلَ لِي، وَتَوَكَّلْتُ عَلَيهِ بِمَعْنَى: اعتَمَدتُ عَلَيْهِ)، (تَوكيل) یانی: وەكیل گرتن، ئەوەیە كە تۆ كەسێك بكەی بە وەكیلی

خۆت، یان نوێنەری خۆت بۆ ئەنجامدانی شتێك، (وكيل) لەسەر كێشی (فَعِيل)ە، بە مانای (مَفْعُول)ە، واتە: (مُوكَّلُ إِليهِ) واتە: کەسێك کارەکەی خۆتت پێ سپاردوە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾ ﴾النساء، واتە: خوا بەسە کاری خۆتانی پێ بسپێرن، یانی: خوای کاربەجێ بەسە سەرپەرشتیی کاروباری تۆ بکاتو کاروبارت بەڕێوەبەرێ‌و، لەجیاتی تۆ کارەکان هەڵسووڕێنێ‌و، وشەی : (تَوَكَّل)یش بە دوو واتایان بەکاردێ:

١ـ دەگوترێ: (تَوَكَّلْتُ لِفُلانٍ، بِمَعْنى: تَوَلَّيْتُ لَهُ) واتە: سەرپەرشتیی کارەکەیم کرد، لە جیاتی ئەو (وَيُقَالُ: وَكَّلتهُ فَتَوَكَّلَ لِي) واتە: ئەومکرد بە وەکیل.

٢ـ (وَتَوَكَّلتُ عَلَيهِ، بِمَعْنى اعتَمُدتُ عَلَيهِ) واتە: پشتم پێ بەست (وَتَواكَل القَوْم: اتكل كلٌّ عَلَى الآخر) واتە: هەرکامێکیان پشتی بەویدیکە بەست، واتە: خۆیان بەیەك هەڵواسی (وَوَاكَلَ فُلانٌ: إِذَا ضيّع أَمْرهُ متَّكِلاً عَلَى غَيْرِهِ) واتە: فلان کەس کارەکەی خۆی زایە کرد، بەهۆی ئەوەوە کە پشتی بە خۆی نەبەستوەو شتەکەی حەواڵەی کەسێکی دیکە کردوە.

(ضَلَّ) : (ضَلَّ: أَي غَابَ وَخَفِيَ، ضَلَّ الكَافِرُ : عَدَلَ عَنِ الطَّرِيقِ وَغَابَ، وَضَلَّ المُسَافِرُ الطَّرِيقَ: فَقَدَهُ)، (ضَلَّ) بە مانای پەنهان بوو، شێردراوە بوو، دێ، کە دەگوترێ: (ضَلَّ الشَّيءُ عن فُلانٍ) واتە فلان کەس ئەو شتەی لەلا ون بوو.

(ضَلَّ) لە حاڵەتی (لازم)دا بە مانای ون بوون دێ، بەلام لە حاڵەتی (متعدّي)دا بەمانای ونکردن (فقْد) دێ، دەگوترێ: (ضَلَّ الكَافِرُ الطَّرِيقَ) واتە: بێبڕوایەکە ڕێیەکەی ونکرد.

یانی: دەگونجێ بگوترێ : (ضَلَّ المسافِرُ الطريق) واتە: ڕێبوارەکە ڕێیەکەی ون کرد، دەشگونجێ بگوترێ : (ضَلَّ عَنِ الطَّرِيقِ) واتە : خۆی لە ڕێیەکە ون بوو.

کەواتە: (ضَلَّ) وەك گوتم: هەم حاڵەتی (لازم)ی هەیە، واتە: ون بوون، هەم حاڵەتی (مُتَعَدّي)شی هەیە، واتە: ون کردن.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

خـوا ﷻ لەم شەش ئایەتەی کۆتـایی دا، دووجاران فەرمان بـە پێغـەمبـەری خاتـەم ﷺ دەکات: بـانگی مرۆڤایـەتیی بکاتو پێیـان بڵێ: ئـەی خەڵکـینە! ئـەی مرۆڤەکـان! هەمووتـان بە نێـرو مێـوە، بـە وردو درشـتەوە، بـە عـەرەب و غەیـری عەرەبـەوە، بـە هـەموو چینو توێژەکانەوە، بە هـەموو ڕەنگو زمانەکـانەوە، چونکە (النـاس) نـاوی کۆ (إسم جمع)یە هـەموو مرۆڤەکانو، تـاکی لە خۆی نیە.

﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، بڵێ: ئەی خەڵکـینە! ئـەی مرۆڤەکـان ! ﴿ إِن كُنتُمۡ فِي شَكّٖ مِّن دِينِي ﴾، ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیی دانو، سەراسیمەن، داخـو ملکەچیی مـن، یاخـود ڕێبـازو بەرنـامەی مـن، چییـەو چۆنــە؟ ﴿ فَلَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِينَ تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، بێگومان من ئەوانـەی لە خـوار خـواوە دەیانپەرستنو، لـە جیـاتی خـوا دەیانپەرسـتن، مــن ئەوانــە نـاپەرسـتم، ﴿ وَلَٰكِنۡ أَعۡبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُمۡ ﴾، بەڵکـو ئـەو خـوایە دەپەرستم کە دەتـانمرێنـێ.

هەڵبەتـە پـێش ئـەوەی بیـانمرێنــێ دەشیانژیەنــێ، بـەڵام خـوا ﷻ باسـی ژیـانی نەکـردوە، چونکە ئـەوەی کە بـۆ ئینسـان زۆر جێگای مەترسییەو، ئینسـان دەبـێ لـە بەرانبـەری دا هەڵوەسـتە بکـات : مردنەکـەیەتـی، ئـایـا کـێ مەرگـی تـۆی بەدەسـتە؟ ئەگـەر [illegible] بڕ عـەقڵت هـەبێ، ئەگـەر لەبەر ئەوەش نەیپەرسـتی، کە تۆی ژیـانـدوە، دەبێ لەبەر ئەوە بیپەرستی، کە دەتمرێنـێ، مردنو لە بەین چوونی تۆ بەدەسـتی ئەوە، ئـەو ڕووحە ئەمانەتەی بەبەر جەسـتەی تۆیـدا کـردوە، تـەنیا بـە مۆڵـەتی وی، ئـەو ڕووحـە دێتـەوە دەر، ئنجـا ئـەوەش گـەورەترین کارەساتە لە ژیـانی هەر مرۆڤێکـدا، کە ئینسان ئەم ژیـانەی دنیا بەجێبهێڵـێ، هەر وەك چۆن مەزنـترین شــت بـووە، کە هــاتوە بـۆ ئـەم ژیانـە، گـەورەترین ڕووداویـش لـە ژیــانی هـەر مرۆڤێکـدا، بەنسبەت خۆیـەوە،

بریتیە لەوەی ئەم دنیایە بەجێبهێڵێ، ئنجا ئا ئەوە، بەدەست ئەو خوایەیە کە من تەنیا بەندایەتیی بۆ وی دەکەمو، تەنیا بۆ وی ملکەچم.

﴿وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، فەرمانیشم پێکراوە کە لە بڕواداران بم، مرۆڤ پێشی دەبێ خوا بناسێ، ئنجا بڕوای پێ بێنێ، دەبێ پێشێ خوا بناسی، کە ژیانو مردنی بەدەستە، کەونو کائیناتی بەدەستە، بەدیهێنەرە، پەروەردگارە، خاوەنە، خاوەنی هەموو ناوو سیفەتە بەرزو جوانەکانە، ئنجا ئەو ئیمانەی لەسەر ئەو مەعریفەتو ناسینە، لەسەر ئەو ئاشنابوونە بە خوا، بنیات دەنرێ، ئەوە ئیمانی پێ دەگوترێ، هەر بۆیەش من لەو مەوسووعەیەی کە لە زیندانی ئەمریکادا نووسیومە، کە لە چاپی دووەمیدا، دەبێتە دوازدە کتێب، کتێبی یەکەمی کە (٤٠٠ ـ ٥٠٠) لاپەڕەیە، تەرخانم کردوە بۆ بووناسیی {ئەوەی کە زۆر کەس پێی دەڵێن: (جیهان بینیی)و (دنیا بینیی) کە من ئەو وشەیەم پێ هەڵەیەو (بووناسیی)م پێ تەواوە، چونکە مەبەست ئەوەیە کە تۆ خۆتو ئەو بوونەی کە تێیدای، بیناسی، بە بەدیهێنەرەکەیەوە، کە خوایە ﷻ و، بە هەموو بەدیهێنراوەکانەوە، بۆیە ئەگەر بگوترێ: بووناسیی (علم الوجود، معرفة الوجود)[1] ڕاستتر دێتەوە، لەوەی بڵێی: دنیا بینیی، چونکە دنیا لە بەرانبەر دوارۆژدایە، یاخود: جیهانبینیی، (جیهان) واتە: ئەوەی کە ئێمە دەیبینین، بەڵام کە گوتت: بوون (وجود) هەم (خالق) دەگرێتەوە، هەم (مخلوق)}.

ئنجا ئەو مەوسووعەیە ناوونیشانەکەی ئاوایە: (الإسلام معرفة صحیحة بالخالق والخَلْق) {ئیسلام زانیاریی و شارەزاییەکی ڕاستە، بە بەدیهێنەرو بەدیهێنراو} بۆیە من پێش ئەوەی باسی ئیمان بکەم، لە کتێبەکانی {دووەمو سێیەمو چوارەمو پێنجەمو شەشەمو حەوتەمو هەشتەم} دا، هەڵساوم باسی بووناسییم کردوە، کە بەداخەوە زۆرێك لە مسوڵمانان، بەتایبەتی ئەوانەی کە خۆیان لە ژێر ناوونیشانی: (سەلەفیی)دا دەبیننەوە، دێنن یەکسەر لە ئیمانو پایەکانی ئیمانەوە دەست پێدەکەن، ئەویش زیاتر لەبەر ڕۆشنایی کتێبەکانی: (محمد بن عبدالوهاب)و غەیری ویش دا، ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، کە ئەوە هەڵەیە، چونکە ئەو خەڵکە هەرچەندە ئیمانی هێناوە بە

[1] بە ئینگلیزیی Ontology.

خوا، بەڵام جارێ خوای چاك نەناسیوەو، پێغەمبەری ﷺ باش نەناسیوەو، خۆی نەناسیوەو، ئەم بوونەوەرو بوونەی نەناسیوە! بەڵام قورئان پێشێ بوونت پێ دەناسێنێ، خوات پێ دەناسێنێ، خۆتت پێ دەناسێنێ، ژیانی دنیات پێ دەناسێنێ، دوارۆژت پێ دەناسێنێ، فریشتەکانو پێغەمبەران ... هتد، ئنجا لەسەر بناغەی ئەو ناسینو زانینو مەعریفەتە دەڵێ: وەرە ئیمان بێنە، تۆ پێشتر خوات ناسیوە، دەزانی ئیمان بە چی دێنی، فریشتەکانت ناسیونو دەزانی کێن؟ ئەوجار ئیمانیان پێ دێنی، هەروەها کتێبەکانی خوا، دەزانی خوا کتێبەکانی بۆچی ناردوون؟ وە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دەزانی کێنو چۆنن؟ وە ڕۆژی دوایی، دەزانی بۆ چییە؟ ئنجا دەفەرموێ: بەو شێوەیە ئیمانیان پێ بێنە، واتە: ئیمان دەبێ لەسەر بناغەی مەعریفەتو زانیاریو شارەزایی، بنیات بنرێ.

بۆیە لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، فەرمانیشم پێکراوە کە لە بڕواداران بم، دوای ئەوەی خوام ئاوا ناسی، ئنجا بەندایەتیی بۆ دەکەمو ئیمانی پێ دەهێنم.

﴿ وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ ، وە فەرمانم پێکراوە کە: ڕووی خۆت بە پاکیی ڕاست بکە بەرانبەر بە ئایین.

لێرەدا (ال)ی سەر وشەی (لِلدِّينِ ) (ال)ی (عَهْد)ە، واتە: ئەو ئایینو بەرنامەیەی کە دەزانین کامەیە، ئەوەی کە خوا بە هەموو پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) ناردوویەتی، ئەوەی کە لە بناغەکەیو لە هێڵە گشتیەکانیدا هەر یەکە، وەك دەفەرموێ: ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ...﴿١٣﴾ ﴾.

بەڵێ ئەو ئایینەی خوا ناردوویەتی لە ئادەمەوە تا خاتەم، بۆ هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەر یەکە لە بناغەکەیداو لە هێڵە گشتییەکانیدا، بەڵام لە وردەکارییەکان دا لە یەك جیا بوونەوە.

(حَنِيفًا) واتە: وازبێنم لە هەرچی ڕێی پووچەو، ڕێک ڕوو وەرگێڕم بۆ ڕاستە شەقامی خوا، ﴿ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، وە بەجەختکردنەوە پێشم گوتراوە کە: لە هاوبەش بۆ دانەران نەبی، ﴿ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ﴾، وە پێشم گوتراوە: کە لە خوار خواوەو لە جیاتی خوا، لە شتانێک نەپاڕێیەوە، کە نە سوودت پێدەگەیەنن، وە نە زیانت لێدەدەن، ﴿ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، وە پێم گوتراوە: ئەگەر وات کرد، ئەوە بێگومان تۆ لە ستەمکارانی.

وەک پێشتر گوتمان : لێرەدا ﴿ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ مەبەست پێی بێبڕوایەکانە، کە ئەوە لەبەر ڕاهاویشتنی ئەوانەو بە (کنارە) قسەکردنە لەگەڵ ئەوان دا، واتە: ئێوە لە جگە لە خوا مەپاڕێنەوە، لە شتانێک، کە نە سوودتان پێدەگەیەنن و نە زیانتان لێدەدەن، ئەگەر وا بکەن، لە ستەمکاران دەبن، هەڵبەتە ئەوانەی کە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە هەر لە ستەمکارانیش بوون.

پاشان دەفەرموێ : ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ ﴾، وە ئەگەر خوا زیانێکت تووش بکات، جگە لە خۆی لادەرێکی نیە، جگە لە خۆی ناتوانێ ئەو زیانەت لێ دووربخاتەوەو لێت لابەرێ، ﴿ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ﴾، وە ئەگەر چاکەیەکی بۆت بوێت، بەرپەرچدەرەوە نیە بۆ چاکەو بەخششی خوا، هیچ کەس ناتوانێ ڕێی لێ بگرێ و بەرپەرچی بداتەوە، ﴿ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ﴾، (خوا) بۆ هەرکامێک لە بەندەکانی بیەوێ، ئەو خێرو چاکەو بەخششەی تووش دەکات و بۆی دێنێتە پێش، ﴿ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، بێگومان خوا لێبوردەی میهرەبانە.

جێـی سـەرنج ئەوەیـە كـە لـە مەسـەلەی زیـانـدا، تەنیـا فەرموویـەتی : ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ ﴾، ئەگـەر خـوا بیـەوێ زیـانێكـت تـووش بكـات، (مَسَّهُ) واتـە: شتێكی تووش بوو، با كەمیش بێ، بەڵام لە مەسـەلەی خێـرو سـوود دا، فەرموویـەتی : ﴿ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ ﴾، وە ئەگەر چـاكەیەكی بـۆت بـوێ، ئەمـەش ئـەوە دەگـەیەنـێ، كە: بۆ خـوا خێرو چاكەو سوود گەیاندن بە بەندەكانی، وەك زانـایان دەڵێن: (مقصود بالذات) واتە: لە خـودی خۆیدا ویسـتـراوە، بەڵام زەرەرو زیان تووش بوونـی مرۆڤەكـان، بەڵـێ بەپێی یاساو سوننەتی خوایەو، خـوا پاڵیداوەتە لای خـۆی، بـەڵام وەك خـودی خۆی، خـوا مەبەسـتی نیـە، ئـەوەی كـە خـوای بەخشـەر پێـی خۆشـەو، دەیـەوێ بۆمـان بێـنێتـە پـێش، خێـرو سـوودو بەخشـشـی خۆیـەتـی، وە هـەر ئـەوەش لـە خـوایەك چاوەڕێ دەكرێ، كە لـێبوردەیـەو بەخشـندەیە.

لە كـۆتـایی دا دەفەرموێ : ﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ﴾، بڵێ: ئەی خەڵكینـە! بـە دڵنیاییـەوە لـە پەروەردگارتـانەوە هەقتـان بـۆ هـاتوە، واتـە: شـتێكی هـەق، كـە پێچـەوانەی هـەق بریتیـە لـە پـووچ (باطل)، هـەق: واتـە: شتی چەسپاو، واتە: دادگەریی تێدایە، بەرژەوەنـدیی تێدایـە، خێـرو خۆشـیی دنیـاو دواڕۆژی تێدایە، هەقی ڕەهاتان بۆ هاتوە لەلایەن پەروەردگـارتـانەوە.

﴿ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ﴾، ئنجا هەر كەسێك ڕێی ڕاستی گـرتو، ئـەو هەقـەی خـوای قـبووڵ كـرد، ئەوە بۆخـۆی ڕێـی ڕاسـتی گرتـوە، واتـە: سـوودەكەی بۆخۆیەتی، ﴿ وَمَن ضَلَّ ﴾، هەر كەسێكیش لـەو ڕێیـە ون بوو، یاخـود ئەو ڕێیەی ون كرد، ئەو هەقـەی ون كرد، ﴿ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ﴾، ئەوە بە زیانی خۆی ڕێی ون كردوە، بە زیـانی خـۆی سـەرگەردانو گومڕا بـووە، ﴿ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴾، وە پێیـان بڵـێ: كە من بەسـەر ئێوەوە وەكیل نیـم.

(وکیل) کەسێکە کە لە جیاتی کەسێك شتێك بکات، واتە: من نەهاتووم بەرژەوەندییەکانی ئێوە بپارێزم، نەهاتووم نەهێڵم بێبڕوا بن، نەهاتم بە تۆبزیی بتانکەمە دیندار، من بەسەر ئێوە چاودێرو وەکیل نیم، بەڵکو من دڵسۆزی ئێوەو، پەیامی خوام پێ ڕاگەیاندوونو ئامۆژگارییم ئاڕاستە کردوونو، دڵسۆزییم بۆ نواندوون، هەر ئەوەندەم لەدەست دێ، بەڵام خوا دەتوانێ بە زۆر ئیمانتان پێ بێنێ، یاخود لە ڕێی چەوت لاتان بدات، ئەوە بەدەست من نیە، تەنیا بە خوا دەکرێ، خوای کارزانیش وای بڕیارداوە، کە ئەوە لەگەڵ بەندەکانیدا نەکات، بەڵکو ئازادیان بکاتو سەرپشکیان بکات.

لە کۆتایی دا خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ ﴾، وە بکەوە شوێن ئەوەی کە بۆت سروش دەکرێ، ﴿ وَٱصۡبِرۡ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُۚ ﴾، وە خۆڕاگربە تاکو خوا بڕیار دەدات، ﴿ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴾، خواش چاکترینی بڕیاردەرانو حوکمڕانانە، چونکە خوا ﷻ مەگەر بەندەکانی خۆیان ڕێی چەوت بگرن، ئەگەرنا خوای دادگەر جگە لە ڕەحمەتو بەزەییو بەخششو چاکە، هیچی دیکەی لەلا نیە بۆ بەندەکانی.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي شَكٍّ مِّن دِينِي فَلَا أَعْبُدُ الَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ اللَّهَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُمْ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٤﴾﴾.

**دیارە ئەمە دوا پەیامی خوایە ﷻ کە بە پێغەمبەری خاتەمدا موحەممەد ﷺ دەینێرێ بۆ خەڵك، لەم سوورەتە موبارەکەی یونوسدا، دەفەرموێ: بڵێ ئەی خەڵکینە! ئەگەر لە دوودڵیی دان لەبارەی ملکەچیی بۆ منەوە، ئایا بۆ کێیە؟ یان لەبارەی ئایینو بەرنامەی منەوە، کە چییەو چۆنە؟! ﴿فَلَا أَعْبُدُ الَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾، بێگومان من ئەوانەی ئێوە لە جیاتی خوا، لە خوار خواوە دەیانپەرستن، ناپەرستم، مل بۆ ئەوانە کەچ ناکەم، ﴿وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ اللَّهَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُمْ﴾، بەڵکو هەر ئەو خوایە دەپەرستم کە دەتانمرێنێ (واتە: دەتانژیەنێو دەتانمرێنێ، ژیانو مەرگی ئێوەی بەدەستە) ﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾، وە فەرمانیشم پێکراوە کە لە بڕواداران بم.**

**هەڵبەتە لەم سێ ئایەتەدا، ئایەتەکانی: (١٠٤ و ١٠٥و ١٠٦) کە پێشتریش لە مانا گشتییەکەیدا تیشکمان خستنە سەر، خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: کە جاڕ بدە بە نێو خەڵکداو بانگیان بکەو، خۆتو بەرنامەی خۆتیان پێ بناسێنە، کە تۆ چی دەپەرستی؟ بەرنامەکەت چییە؟ ڕێبازی تۆ چۆنە؟ ئەوەیان پێ بڵێ، لە دوا پەیامو قسەتدا لەو سوورەتە موبارەکەدا.**

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، بلێ ئەی خەڵکینە! واتە: هەموو مرۆڤایەتیی بە هەموو ڕەنگ‌و زمانەکانەوە، بە هەردوو ڕەگەزەکەوە، لەهەر شوێنێکی ئەم سەر زەوییە هەن، لە هەر کات‌و ڕۆژگارێکدا دەژین، لە دوای هاتنی پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ هەموو مرۆڤایەتیی ئوممەتی موحەممەدە ﷺ، هەموو مرۆڤایەتیی لەسەر میلاکی موحەممەد پێغەمبەرە ﷺ، بۆیان نیە بەدوای هیچ پێغەمبەرێکی دیکە بکەون‌و، بۆیان نیە بەدوای هیچ بەرنامەیەکی دیکە بکەون، جگە لەوەی موحەممەد ﷺ هێناویەتی، ئەوەی موحەممەدیش ﷺ هێناویەتی: کتێب‌و بەرنامەکەی، هەموو کتێب‌و بەرنامەکانی پێش خۆی بە ڕاست دەزانێ وەك ئەسڵەکەیان‌و، ڕێز دەگرێ لە هەموو پێغەمبەرانی پێشووو، هەموویان بە ڕاست دەزانێ‌و، لە هەر شوێنێك دا هەڵەو کەم‌و کورییەك، لەو کتێب‌و بەرنامانەو، لەو ڕێبازانەی پێغەمبەرانی پێشوودا پەیدا کرابێ، پێغەمبەر ﷺو، کتێبەکەی‌و ڕێبازەکەی، ئەو کەم‌و کوریی‌و هەڵەو لادانانە، ڕاست دەکاتەوە.

ئنجا دوای ئەوەی مرۆڤایەتیی گەیشتۆتە دوا قۆناغی پێگەیشتن‌و ڕوشدو کامڵ بوونی، خوا بەرنامەیەك‌و کتێبێك‌و پێغەمبەرێکی لە قەدەر خۆی بۆ ناردوە، بۆیە لەسەر مرۆڤایەتیی پێویستە کە بە دوای ئەو کتێب‌و بەرنامەیەو، بە دوای ئەو پێغەمبەرە ﷺ بکەوێ، کە بۆ ئەم قۆناغەی ئێستای نێردراوە، پێغەمبەرەکان‌و کتێب‌و بەرنامەکانی دیکە، بۆ قۆناغەکانی دیکە نێردرا بوون، کە بە نسبەت ئەم قۆناغەوە، ئەوان قۆناغی سەرەتایی‌و تەمەنی ساوایی بوون بۆ مرۆڤایەتیی.

ئنجا دەفەرموێ : ﴿ إِن كُنتُمۡ فِي شَكّٖ مِّن دِينِي ﴾، ئەگەر ئێوە لە دوو دڵییدان، لەبارەی بەرنامەکەمەوە.

دەشگونجێ (دین) لێرەدا بە مانای ملکەچیی بێ، واتە: ئەگەر لە دوو دڵیی دان: ئایا ملکەچیی من‌و فەرمانبەریی من بۆ کێیە؟ ئەگەر لەبارەی بەرنامەو ئایینەکەمەوە لە گومان‌و دوو دڵییدان، با بۆتان باس بکەم، کە بەرنامەی من چییەو چۆنە؟

﴿ فَلَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِينَ تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، ئەمە لێی وەردەگیرێ: کە کاکڵی بەرنامەو ڕێباز لە ڕاستییدا، ئەوەیە کە ئایا ئینسان لەسەر بناغەی وی بەندایەتیی

بۆ کێ دەکات؟ بۆ خوای دەکات، یان بۆ غەیری خوای دەکات؟ چونکە: بەندایەتیی‌و ملکەچیی مرۆڤ ، یان دەبێ بۆ خوا بێ، یان دەبێ بۆ جگە لە خوا بێ، لە خوار خواوەش هەر دروستکراوەکانی خوا ﷻ هەن.

بۆیە دەفەرموێ : ﴿فَلَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِينَ تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾، باسی حەڵاڵ‌و حەرامی نەکردووە، باسی شتەکانی دیکەی نەکردووە، یەکسەر دێتە سەر بەندایەتیی‌و ملکەچیی: ئەوانەی ئێوە لە خوار خواوە دەیانپەرستن‌و بەندایەتییان بۆ دەکەن‌و، ملکەچییان بۆ دەکەن، من بۆ ئەوانە ملکەچ ناکەم‌و نایانپەرستم بەندایەتییان بۆ ناکەم، ﴿وَلَٰكِنۡ أَعۡبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُمۡ﴾، بەڵکو هەر ئەو خوایە دەپەرستم‌و، هەر بۆ ئەو ملکەچم‌و هەر بۆ ئەو بەندەم، کە ئێوە دەمرێنێ.

ئنجا وەك پێشتریش گوتمان: دیارە خوا پێش ئەوەی مرۆڤەکان بمرێنێ دەشیانژیەنێ، واتە: ئێوە دەژیەنێ‌و دەمرێنێ، بەڵام لێرەدا باسی مراندن دەکات، چونکە ئەوەی جێی هەڵوەستەیەو جێی ئەوەیە کە ئینسان چاکی لێ وردبێتەوە، ئەوەیە کە بزانێ: دوای ئەوەی کە دەمرێنرێ، ڕووحەکەی بۆ کوێ دەچێ؟ چۆنی مامەڵە لەگەڵ دا دەکرێ؟ کێ دەیمرێنێ؟ بۆ کوێ دەچێ؟ کێ خاوەنیەتی؟

کەواتە: پەرستراو (معبود) دەبێ ژیان‌و مردنی بەدەست بێ، پەرستراو (إله) دەبێ پەیدا کردن‌و لەبەین بردن‌و، زیندووکردنەوەی بەدەست بێ.

﴿وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، فەرمانیشم پێکراوە، کە لە بڕواداران بم، واتە: بچمە نێو ڕیزی ئەو کاروانەی بڕوادارانەوە، کە لە ئادەمەوە زنجیرەیان بەستوە هەتا ئێرە، یاخود : تەنیا خۆم نەبم بەندایەتیی بۆ خوا بکەم، بەڵکو هەوڵبدەم خەڵکی دیکەش پەیدا بکەم، بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، خەڵکی دیکەش پەیدابکەم بڕوا بە خوا بێنن، منیش یەکێك بم لەوان، واتە: شوێنکەوتووان پەیدا بکەم‌و، هاوەڵان بۆ خۆم پەیدا بکەم، ﴿وَأَنۡ أَقِمۡ وَجۡهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفٗا﴾، وە پێم گوتراوە کە ڕووی خۆت بەرانبەر بە ئایین ڕێك‌و ڕاست ڕابگرە.

وشەی (وَجْه) یانی: دەمو چاو، ڕوو، لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە ڕووی ڕواڵەتیی خۆت بکەیە شوێنێك! بەڵکو: یانی: زاتی خۆت، کەینوونەی خۆت تەسلیمی ئایینو بەرنامەی خوا بکەو، لەگەڵ ئایینو بەرنامەی خوادا ڕێکبە، ڕاستبە، ئایین چی دەفەرموێ، با بوونی تۆ، ئەوە لە خۆیدا بەرجەستە بکات.

وشەی (حَنِيفًا) لە (حَنَف)وە هاتوە، (حَنَف) واتە: لە ڕێی چەوتەوە لایدا بۆ ڕێی ڕاست، کە پێچەوانەی (جَنَفَ)یە، واتە: لە ڕێی ڕاستەوە لایدا بۆ ڕێی چەوت، (حنیف)یش کەسێکە لە ڕێی چەوتەوە گەڕاوەتەوە بۆ ڕێی ڕاست، لە گومڕاییەوە بۆ هەق، لە ڕێی چەوتەوە بۆ ڕێی ڕاست.

کە دەفەرموێ : ﴿ وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ﴾، واتە: بە تەواویی خۆت بۆ خوا ساغ بکەوەو، بە گرنگیی پێدانەوە، چونکە تۆ وەختێك ڕوو لە شتێك دەکەی، واتە: گرنگیی پێدەدەی، بۆیە لە قورئاندا: وشەی (تَوَلّى) پشتی تێکردو، وشەی (أَعْرَضَ) لاملی تێکرد، بۆ کوفرو لادانو دوورکەوتنەوە لە خوا بەکارهێنراوە، واتە تۆ شتێك گرنگیی پێنەدەی، لاملی تێدەکەیو لاتەنیشتی تێدەکەیو، ڕووی لێ وەردەگێڕی، بەڵام کە شتێك بتەوێ بایەخو گرنگیی پێبدەی، ڕووی تێدەکەی، دوایی دەفەرموێ : ﴿ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴾ وە بە جەخت کردنەوە پێت دەڵێین ، کە لە هاوبەش بۆ خوا دانەران مەبە.

وە لە کۆتاییدا دەفەرموێ : ﴿ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ﴾، وە لە خوار خواوە (یاخود لە جگە لە خوا) لە شتانێك مەپاڕێوە کە نە سوودت پێدەگەیەننو، نە زیانت پێدەگەیەنن، ﴿ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ الظَّالِمِينَ ﴾، ئەگەر کردت (واتە: ئەگەر جگە لە خواو، لە خوار، خواوە لە دروستکراوەکان پاڕایەوە) ئەوە ئەو کاتە تۆ لە ستەمکارانی، چونکە پاڕانەوە وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە : {إِنَّ الدُّعَاءَ هُوَ العِبَادَةُ} {رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨٢٨)، عَنْ النُّعمَانِ بنِ بَشِيرٍ رضي الله عنه، وَحَسَنهُ الألباني في (سنن أبي داود)} .

واتە: پاڕانەوە خودی خوا پەرستییە، یانی : بەشێکی گەورەو گرنگی خوا پەرستیی، بریتیە لە پاڕانەوە لە خوا، بۆیە دەفەرموێ : ﴿ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، وە لە خوار خواوە لە شتێك مەپاڕێوە ﴿ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ﴾، کە نە سوودت پێدەگەیەنێ، وە نە زیانت لێدەدات، واتە: ئەگەر تۆی خۆشبوێ، سوودت پێ ناگەیەنێ، وە ئەگەر لێت تووڕەبێ، زیانت پێ ناگەیەنێ. ﴿ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، وە ئەگەر واتکرد، ئەوە بێگومان تۆ لە ستەمکارانی.

لێرەدا بە ئاشکرا دیارە کە هەرچەندە ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ، بەڵام بە تەئکید مەبەست پێی ئەو نیە، بەڵکو مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، بەڵام بە کنارەو لە پەنادا خوای کاربەجێ قسە لەگەڵ ئەواندا دەکات، وەك پێشتریش باسمان کرد، بەڵام بۆ ئەوەی نەسڵەمنەوە، بۆیە ناڕاستەوخۆ دوێنراونو بە کنارە پێیان گوتراوە، چونکە ئەگەر فەرمووبای: ئەگەر غەیری خوا بپەرستن، ئێوە ستەمکارن ! ئەگەر غەیری خوا بپەرستن ئێوە گومڕان ... هتد، دیارە ئەو کاتە دەسڵەمینەوە.

بەڵام خوای کاربەجێ بەو جۆرە دواندنەی پێغەمبەر ﷺ، شتەکە دێنێتە سەر خودی وی، بۆ ئەوەی ئەوان لەو قسەیە نەسڵەمنەوە، بەڵام بە تەئکید مەبەست پێی ئەوانە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە ئاشکرا دیارە کە نە لە غەیری خوا پاڕاوەتەوەو، نە دەپاڕێتەوەو، نە دەگونجێ کە هاوبەش بۆ خوا دابنێو، نەدەگونجێ کە چاوەڕوانیی سوودو قازانج لە غەیری خوا بکاتو، نەدەگونجێ چاوەڕوانیی زیان لێ دوورخرانەوە لە غەیری خوا بکات، کەواتە: ئاشکرایە کە مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە.

ئنجا لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، واتە: وە فەرمانم پێکراوە لە بڕواداران بم، یاخود لە ملکەچان بم، بەڵام لە سووڕەتی (النمل)دا دەفەرموێ : ﴿ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩١﴾ ﴾، واتە: وە فەرمانم پێکراوە لە مسوڵمانان بم.

ئایا ئەوە هۆکارەکەی چییە؟

(الخطيب الإسكافِي) کتێبێکی هەیە بە ناوی : (درة التنزيل وغرة التاويل)[١] کە ئەو کتێبەی تەرخان کردوە، بۆ قسەکردن دەربارەی ئەو ئایەتانەی کە وەك یەك دەچن، بەلاّم لە یەك جیاوازن، وە حیکمەتی جۆراوجۆر لە جیاوازییەکانیان دا هەن.

لێرەدا دەڵێ : هۆکارەکەی ئەوەیە، کە لە سوورەتی (یونس)دا لە پێش ئەم ئایەتە: ﴿ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ئەوە هاتوە کە دەفەرموێ : ﴿ ثُمَّ نُنَجِّى رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، واتە: وە دوایی ئێمە پێغەمبەرانمان (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) وە ئەوەی بڕوایان پێهێناون، ڕزگاریان دەکەین، هەر بەو شێوەیەش ئێمە بڕواداران ڕزگار دەکەین.

بۆیە جێی خۆی بووە کە ئەم ئایەتەی بەدوادا بێ : ﴿ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بەلاّم لە سوورەتی (النمل)دا کە دەفەرموێ : ﴿ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩١﴾ ﴾، دە (١٠) ئایەت لە پێش ئەوەدا، واتە: لە ئایەتی (٨١)دا ئاوا هاتوە:

﴿ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِى ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ ﴾، واتە: وە تۆ ناتوانی کوێران ڕێنمایی بکەی‌و لە گومڕایی دەریان بێنی، تۆ تەنیا دەتوانی بە وانە ببیستێنی، کە بڕوا بە ئایەتەکانی ئێمە دێنن‌و لە ملکەچانن، کەواتە: لە سوورەتی (النمل)دا، وا گونجاو بوو کە بفەرموێ: ﴿ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾، چونکە ئەوەی پێشی، دەفەرموێ: ﴿ يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ ﴾.

١) ص ١٥٥.

**مەسەلەی دووەم**: کە خوا دەفەرمویَ: ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُ إِلَّا هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَادَّ لِفَضْلِهِ يُصِيبُ بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ ﴾، واتە: وە ئەگەر خوا زیانێکت تووش بکات، بە جگە لەو لانابردریَو، ئەگەر (خوا) خێرو سوودێکی بۆ تۆ بویَ، بەرپەرچ دەرەوە بۆ بەخششی خوا نیە، (خوا) هەر کەسێك لە بەندەکانی کە بیەویَ، بۆی دێنێتە پێش‌و، خوا ﷻ لێبوردەی بەخشندەیە.

وشەی (مَسْ) حَقِيقَتُهُ وَضْعُ اليَدِ عَلَى جِسْمٍ، لاخْتِبَار مَلْمَسِهِ، ويُطْلَقُ مجازاً مُرْسَلاً عَلَى الإصَابَةِ).

واتە: وشەی (مسّ) ئەوەیە کە ئینسان دەست لەسەر شتێك دابنیَ، بزانیَ: داخو نەرمە، رەقە، گەرمە،ساردە، چۆنە؟ بەلاّم دوایی بە شێوەی مەجازیی مورسەل بەکارهێنراوە بۆ تووش بوون (مَسَّهُ) واتە: تووشی بوو، بەڵکو جاری وایە بە مانای سەرجێیش دیَ، واتە : پێکەوە جووتبوونی ژن‌ومێرد، وەك خوا دەفەرمویَ :

﴿ ... مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ ... ﴿٢٣٦﴾ ﴾ البقرة، واتە: مادام دەستتان نەیانگەیاندبنیَ، کە مەبەست پێی سەرجێی کردنە.

وشەی (المَسُّ : اللَّمْسُ باليَد، مَسِسْتُ الشيء، وَمِسْتُهُ، وَمَسْتُهُ) هەر سێکیان بەکاردێن، واتە : دەستم لەو شتەدا.

(جمال الدين القاسمي) لە تەفسیرەکەی خۆی (محاسن التأويل)[1] دا، سیَ مەسەلەی رەوانبێژیی باس دەکات لەبارەی ئەم ئایەتەوە :

مەسەلەی یەکەم: دەڵیَ: (ذِكْرُ المَسِّ فِي أَحَدِهِمَا، والإرَادَةُ فِي الثَّانِي، للإشَارَةِ إِلَى أَنَّهُمَا مُتَلَازِمَان فَمَا يُرِيده يُصِيبُه، وَمَا يُصِيبُه، لاَ يَكُونُ إلاَّ بِإرَادَتِهِ) کە لە

---

١) ج ٦، ص ٨٨ و ٨٩.

ڕستەی یەکەمیاندا وشەی (مسّ) بەکاردێنێ‌و لە هی دووەمیاندا، وشـەی (إرادة) بەکاردێنـێ: ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ﴾، ئەوە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە ئەم دووانە پێکەوەن، یانی: هەر شتێك خوا بیەوێ، دێتە پێش‌و، هەر شتێك خوا نەیەوێ، نایەتە پێش.

مەسەلەی دووەم: (الخَيْرُ مَقْصُودٌ بالذَّاتِ للهِ تَعَالَى، وَالضُّرُّ إنَّمَا وَقَعَ جَزَاءاً لَهُمْ عَلَى أَعْمَالِهِم، وَلَيْسَ مَقْصُوداً بالذَّات، وَالإِرَادَةُ بالخَيْرِ: تَقْدِيرُهُ وَالقَصْدُ إليْهِ) دەڵێ: بۆیە خوای بەرز وشەی (إِرَادَة)ی بۆ خێر بەکارهێناوە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ ﴾، چونکە خێرو خۆشیی‌و چاکەو سوود گەیاندن بە مرۆڤەکان، خوا مەبەستیەتی‌و ئامانجیەتی، بەڵام زیان‌و زەرەر، بەهۆی کردەوە خراپەکانیانەوەیەو سزای خراپەکانیانەو، دەرهاویشتەی خراپەکانیانە، ئەگەرنا لە خودی خۆی دا مەبەست نیە.

منیش دەڵێم:

خوا لە سوورەتی (النساء)دا، دەفەرموێ: ﴿ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾ ﴾، واتە: خوای چی داوە لە سزادان‌و ئازاردانی ئێوە، ئەگەر ئێوە شوکرانە بژێربن‌و ئیمان بێنن.

واتە: خوا پێی خۆش نیە سزاتان بدات، بەڵام خۆتان سزا بۆ خۆتان فەراهەم دێنن، وەك یەکێك بە یەکێك دەڵێ: (من لێم نەدای، بۆخۆت دارت دایە دەست من)، واتە: بۆخۆت ناچارت کردم.

دوایی دەڵێ: (والإِرادة بالخير: تقديرُهُ والقَصْدُ اليه) واتە:

مەبەست لە ڕستەی: ﴿ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ ﴾، واتە: خوا بۆت ئەندازەگیریی بکات‌و، بیەوێ بۆت بێنێتە دی.

مەسەلەی سێیەم: دەڵێ: (ذِكْر الإِصَابَةِ فِي الفَضْلِ، إِظْهَارٌ لِكَمَالِ العِنَايَةِ بِجَانِبِ الخَيْرِ).

واتە: کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾، لێرەدا وشەی: (يُصِيبُ) بەکاردێنێ، ئەمە دەرخستنی گرنگیی‌و بایەخدانی تەواوە بە لایەنی خێرو چاکەی مرۆڤەکان.

لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە گێڕدراوەتە: {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: اطْلُبُوا الْخَيْرَ دَهْرَكُمْ كُلَّهُ، وَتَعَرَّضُوا لِنَفَحَاتِ رَحْمَةِ اللهِ تَعَالَى، فَإِنَّ لِلهِ نَفَحَاتٍ مِنْ رَحْمَتِهِ، يُصِيبُ بِهَا مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ، وَسَلُوا اللهَ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يَسْتُرَ عَوْرَاتِكُمْ، وَيُؤَمِّنَ رَوْعَاتِكُمْ} {أَخْرَجَهُ الحَكِيم (٢٩٣/٢)، وَالبَيْهَقِي فِي شُعَبِ الإِيمان برقم: (١١٢١)، وَأَبُو نُعَيْم (١٦٢/٣)، وابن عساكر (١٢٣/٢٤)، وَضَعَّفَهُ الأَلْبَانِي}.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خێرو قازانج‌و خۆشیی لە هەموو کاتەکانتاندا داوا بکەن، (لە پەروەردگارتان)، وە خۆتان بخەنە بەر پشووە بای ڕەحمەتەکانی خوا[1].

(فَإِنَّ لِلهِ نَفَحَاتٍ مِنْ رَحْمَتِهِ) چونکە خوا چەند گوڵاو پرژێنێکی هەن، لە

---

١) {الرازي دەڵێ: (نَفَحَ الطِّيبُ: فَاحَ، وَلَهُ نَفْحَةٌ طَيِّبَةٌ وَنَفَحَتِ الرِّيحُ: هَبَّتْ)، (نَفَحَ الطِّيب) واتە: ئەو بۆنە خۆشە، بۆنەکەی ڕۆیشت، (وَلَهُ نَفْحَةٌ طَيِّبَة) واتە: بۆنێکی خۆشی دێ، (وَنَفَحَتِ الرِّيحُ: هَبَّتْ)، بایەکە هەڵیکرد.

ئنجا دەڵێ: (مَا كَانَ مِنَ الرِّيَاحِ، فَهو برد) یانی: هەر کاتێك وشەی (نَفْح) بۆ بایەکان بەکاربێ، ئەوە مەبەست پێی فێنکایەتییە، (وَمَا كَانَ لَهُ لَفْحٌ، فَهُوَ حَرٌّ، نفحة من العذاب: قطعة)، یانی: بەڵام ئەگەر وشەی (لَفْح) بەکاربێ، مەبەست پێی گەرمییە، (لَفْحَةٌ مِنَ الرِّيَاحِ)، واتە: گەرمیی ئەو گڕە بایە گەرمەی کە دێ، وەك لە ئایەتی (٤٦)ی سووڕەتی (الأنبياء)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ﴾، یانی: (قِطْعَة) پارچەیەك لە سزا}. مختار الصِّحاح، لفظ: ن ف ح.

بەزەییەکەی خۆی {هەمیشە ڕەحمەتی خوای بەخشەر هەمووو شتێکی گرتۆتەوە، بەڵام لە هەندێ کاتی تایبەتو، لە هەندێ شوێنی تایبەت داو، بۆ هەندێ کەسی تایبەتو، لە هەندێ هەلومەرجی تایبەتدا، ڕەحمەتی پەروەردگار زیاتر دێ، ئێوەش خۆتانی بدەنە بەرێ، بۆیە لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە لە قووڵایی شەودا، شەونوێژ بکرێ، هەروەها زۆر جەخت کراوەتەوە لەسەر زیکری ئێواران‌و بەیانیان، وە کە دوای نوێژە فەرزەکان، دوعا بکرێ، کە مەبەست تەحییاتی کۆتایی یە، زۆربەی زانایان وایان لێکداوەتەوە، هەروەها ئەو کاتەی کە ئینسان ڕۆژوو دەشکێنێ‌و، کاتێك کە لە سەفەرەو، کاتێك کە بایەك هەڵدەکاتو، کاتێك کە بەڵا لێدراوێك دەبینێ، داوا لە خوا بکات، کە خوا سەلامەتی بکات، ئەوانە چەندان کاتو حاڵەتی تایبەتن}.

(فَإِنَّ لِلهِ نَفَحَاتٍ مِنْ رَحْمَتِهِ، يُصِيبُ بِهَا مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ) خوا چەند پشوویەك لە ڕەحمەتو بەزەیی خۆی هەن، چەند گوڵاو پرژێنێکی هەن، هەرکامێك لە بەندەکانی کە خوا بیەوێ، تووشی دەکاتو بە نسیبی دەکات.

(وَسَلُوا اللهَ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يَسْتُرَ عَوْرَاتِكُمْ) واتە: داوا لە خوای زاڵی پایەدار بکەن، کە عەیبو عارتان داپۆشێ.

(وَيُؤَمِّنَ رَوْعَاتِكُمْ) واتە: ترس‌و مەترسییتان نەهێڵێ.

<u>مەسەلەی سێیەم</u>: کە خوا دەفەرموێ : ﴿ قُلۡ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۖ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِوَكِيلٖ ١٠٨ ﴾، بڵێ : ئەی خەڵکینە! بێگومان لە پەروەردگارتانەوە هەقتان بۆ هات، هەر کەسێك ڕێی ڕاستی گرتو ئەو هەقەی وەرگرت، ئەوە سوودو بەهرەی ڕێی ڕاستگرتنەکەی بۆ خۆیەتی‌و، هەر کەسێك گومڕا بوو، ئەوە زیانی گومڕا بوونەکەی بۆ خۆیەتی‌و، من بەسەرتانەوە چاودێرو وەکیل (کار پێسپێردراو) نیم، (کە نەهێڵم تووشی زەرەربن‌و هەمیشە قازانجتان بۆ بێنمە پێش).

دیارە ئەمە بانگ کردنی کۆتایی پێغەمبەری خاتەمە موحەممەد ﷺ بە فەرمانو ڕێنمایی خوای بە بەزەیی، بۆ مرۆڤایەتیی، دەفەرموێ : ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، بڵێ : ئەی خەڵکینە! ﴿ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ﴾، بێگومان لە پەروەردگارتانەوە هەقتان بۆ هاتوە {بەدڵنیایی مەبەست لە (حق) لێرەدا هەقە بە چەمکی گشتگیرو ڕەهای، لە هەموو ڕووەکانەوە: لە ڕووی فیکریی، لە ڕووی بوونناسیی، لە ڕووی عەقیدەیی، لە ڕووی ڕەوشتیی، لە ڕووی عیبادەت، لە ڕووی سیاسەتو حوکمڕانیی، لە ڕووی ئابووریی، لە ڕووی کۆمەڵایەتیی، لە هەموو ڕووەکانەوە، هەقتان بۆ هات}.

﴿ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ﴾، هەرکەس ڕێی ڕاست بگرێ، سوودی ڕێی ڕاستگرتنەکە بۆ خۆیەتی، (ٱهْتَدَىٰ) یانی چی؟

(الإهتداء : أَخْذُ الهِدَايَة)، لەسەر کێشی (إفتعال)ە، وەك : (الإشتغال) واتە ئیشکردن، یان (الإشتعال) واتە : کڵپەسندن، کەواتە : (ٱهْتَدَىٰ)یش واتە: هیدایەت وەرگرتن، وەك (الإغتذاء)، واتە : خۆراك خواردن، ئنجا هەر کەسێك هیدایەتو ڕێنمایی خوا وەربگرێ، بچێتە سەر ڕاستە ڕێی خواو وەریبگرێ، ئەوە سوودەکەی بۆ خۆیەتی.

﴿ وَمَن ضَلَّ ﴾، وە هەر کەسێك ون بێ، ﴿ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ﴾، زیانی ونبوونەکەیو گومڕابوونەکەی بۆ خۆیەتی.

وشەی (ضَلَّ) وەك پێشتر باسمان کرد: هەم بە (لازم) هاتوە، هەم بە (متعدِّي)، نموونەی (لازم): (ضَلَّ البعيرُ) حوشترەکە ون بوو. (ضَلَّ أَحْمَد) ئەحمەد ون بوو.

نموونەی (مُتَعدِّي) : (ضَلَّ المُسافِرُ الطَّرِيقَ) ڕێبوارەکە ڕێیەکەی ون کرد، واتە: لە ڕێیەکەی لاداوەو سەرگەردان بوو.

کەواتـــە: ئـــەوەی کـــە گومڕابـــێ‌و ون بـــێ، ئـــەوە بێگومـــان زیـــانی گـــومڕایی‌و ونـبوونەکەی بۆ خۆیەتی.

﴿ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِوَكِيلٍ ﴾، وەك گوتمـــان (وكيـــل) (فعيـــل)ی بـــە مانـــای (مفعـول)ە، یانی: من کار پێسپێردراوی ئێوە نیم، بەسەرتانەوە پارێزەر نیم، کە نەهێڵم زیان بکەن‌و هەمیشە بە تۆبزیـی بتانهێنمـەوە سەر ڕێ، من ئەوەم پـێ نەسپێردراوە، بەڵکو ئەوە بەس بە خوا دەکرێ‌و خوای پەروەردگاریش ئەوەی نەکردوە، بۆ ئەوەی مرۆڤەکان ئازادو سەربەست بن‌و، بتوانن تاقیکردنەوەی خۆیان لەم سەر زەوییە، ئازادانە بکەن.

لـە ئایـەتی پێشـێ دا کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ ﴾، (سيد قطب) ڕەحمەتی خوای لێبێ لە (في ظِلال)ەکەی خۆیدا[١] عیبارەتێك دێنێ، پێم چاك بوو نەقڵی بکەم‌و تەرجەمەی بکەم، دەڵێ: (فَإِنْ مَسَّكَ اللهُ بضُرٍّ عَنْ طَرِيقِ جَرَيَانِ سنتِهِ، فَلَنْ يَكْشِفَهُ عَنْكَ إِنْسانٌ، إِنَّمَا يُكْشَفُ بِاتِّبَاعِ سُنَّتِهِ، وَتَرْكِ الأَسْبَابِ المُؤَدِّيَةِ إِلى الضُّرِّ إِنْ كَانَتْ مَعْلُومَةً، أَو الإِلتِجَاء إِلى اللهِ لِيَهْدِيَكَ إِلى تَرْكِهَا إِنْ كَانَتْ مَجْهُولَةً، وَإِنْ أَرَادَ بِكَ الخَيْرَ، ثَمَرَةً لِعَمَلِكَ وِفْقَ سُنَّتِهِ، فَلَنْ يَرُدَّ هَذَا الفَضْلَ عَنْكَ أَحَدٌ مِنْ خَلْقِهِ، فَهَذَا الفَضْلَ يُصِيبُ مِنْ عِبَادِهِ مَنْ يَتَّصِلُونَ بِأَسْبَابِهِ وِفْقَ مَشِيئَتِهِ العَامَّة وَسُنَّتِهِ المَاضِيَة).

واتە: ئەگەر خـوا زیانێکت بێنێتـە ڕێ، بەهـۆی یاسـایەکەی خۆیـەوە، (لـە میانی جێبـەجێ کردنـی یاساکانی خۆیدا) هیچ مرۆڤێك ناتوانـێ ئـەو زیانـەت لـێ دوور بخـاتەوە، بەڵکو ئـەو زیـانە بـەوە لـە تـۆ لادەچـێ، کە تـۆ شـوێن یاسـاکانی خـوا بکـەوی‌و، وە ئـەو هۆکـارانەی دەبنـە مایـەی زیانبـاریی، وازیان لـێ بێنـی، ئەگـەر زانـراوبن، یاخـود داوا لـە خـوا بکـەی‌و پەنـا بـۆ خـوا بـەری، کـە ڕێنماییت بکات‌و پێشانت بدات، کە واز لەو هۆکارانە بێنـی، ئەگەر نەزانراوبن.

---

١) في ظلال القرآن، ج ٣ ، ص ١٨٢٥، ١٨٢٦.

ئنجا ئەگەر خوا وەك بەروبوومو بەرهەمی کردەوەکەی خۆتو، بە پێی یاساکەی خۆی، بیەوێ، چاکەت تووش بکات. ئەوە ئەو بەخششو چاکەیەی خوا، هیچ کام لە بەندەکانی خوا، ناتوانن لە تۆی بگێڕنەوە، بەڵکو خوا ئەوە بۆ هەرکامێك لە بەندەکانی دێتەدی، بەهۆی گرتنەبەری هۆکارەکان، بە پێی ویستی گشتی خوای پەروەردگارو، یاسای خوا لە بوونەوەردا.

دوایی من تەماشای (تفسیر القرآن الحکیم)ی (محمد رشید رضا)م کرد، لە بەرگی (١١) لاپەڕە (٤١٠ و ٤١١)، بینیم ئەوەی کە (سید قطب) ڕەحمەتی خوای لێبێ، هێناویەتی ئەویش هەر بە هەمان شێوە هێناویەتی، واتە : (سید قطب) ڕەحمەتی خوای لێبێ لە تەفسیرەکەی ئەوی وەرگرتوە، بەڵام دیارە لەبیری چووە، یان بە پێویستی نەزانیوە ئاماژەی پێ بکات، بەڵکو (محمد رشید رضا) وردتری شیکردۆتەوەو باسی چارەسەری نەخۆشییو گرفتو کێشەی سیاسییو ئابووریی‌و، چۆنیەتی چارەسەریان دەکات، کە خولاصەکەی ئەوەیە کە خوا ﷻ کاتێك مرۆڤەکان تووشی زیان دەکات، یاخود تووشی خۆشییو قازانجیان دەکات، ئەوە بەدەر نیە لەو سیستەمە گشتییەی کە لە بوونەوەردا دایناوە، لە ژیانی بەشەردا، بۆیە ئەگەر تۆ بتەوێ قازانجو سوودەکان بۆ خۆت دەستەبەر بکەی‌و، لە زەرەرو زیانەکان پارێزراوبی، دەبێ هەوڵبدەی لە سیستەمی خوا، لەو قانوونانەی کە خوا لە ژیانی بەشەردا دایناون، شارەزابی بەرچاو ڕوون بی، بۆئەوەی ئەو هۆکارو ئەو یاسایانەی خوا بگریەبەر کە تووشی قازانجو خێرت دەکەن‌و، خۆت لەو هۆکارانە بپارێزی، کە تووشی زیان‌و خراپەت دەکەن.

**مەسەلەی چوارەم** : کە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ وَٱصۡبِرۡ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُۚ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ١٠٩ ﴾، لە کۆتاییدا خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ : وە شوێن ئەوە بکەوە کە بۆ لات سروش دەکرێ، بۆ لات دەنێردرێ، ﴿ وَٱصۡبِرۡ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ ﴾، وە خۆڕاگربە تاکو خوا بڕیار دەدات.

ئنجا ئایا خوا چۆن بڕیار دەدات؟ بێگومان لەمیانی جاری بوونی یاساکانی خۆیدا، کە خوازیاری ئەوەن ئەوانەی ئەهلی ئیمانن مادام خۆڕاگربن، مادام پشوو

درێژبـن، سەرەنجـام ئەهلـی ئیمـان سەردەکـەون، سـەرەنجـام هـەق دەچەسپـێو، ناهـەق دەپووکـێتەوەو سـەرەنجـام : ئـەو حوکمـەی خـوا دێتـە دیو ئـەو ویسـتو خواسـتەی خـوا دێتـە دی.

لێرەدا ﴿ وَٱصۡبِرۡ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُۚ ﴾، وا پێدەچێ مەبەست پێی حوکمی قەدەریی‌و تەکوینـیی بـێ، نـەك حـوکمی تەشریعیی، دەشگونجـێ کە مەبەسـت پێی حـوکمی تەشـریعیی بێ، واتـە : تـاکـو خـوا بـە جۆرێکی دیکە بڕیـار بۆ تـۆ دەداتو یاسـای دیکەت بۆ دەنێـرێ، کە ئەوە هی قۆنـاغی مەککەیـەو، لـە قۆناغـی مەدینـە، خـوای کـارزان، کۆمەڵێـك ڕێنمـاییو یاسـای دیکـەی شـەرعیی بـۆ پێغـەمبـەری خـۆی ﷺ نـاردن، کە یەکێك لەوانە بریتـی بـوو لـە بەرپەرچـدانەوەی سـتەمی ستەمکـارانو، دەسـت درێـژیی دەسـت درێژکـاران، ﴿ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡۚ ﴿١٩٤﴾ ﴾ البقـرة[1]، واتـە : جـارێ خۆڕاگـربەو هـیچ بەرهەڵسـتیی مەکەو، هەرچەند زیانو نـاڕەحەتییت بەسـەر بێنـن، بەرپەرچیـان مـەدەوە، تـاکـو خوا بڕیارێکی دیکـەت بۆ دەدات.

بـەڵام مـن وای تێدەگـەمو، بـە تێـوەڕامانـی سـیاقی ئایەتـەکان زیـاتر وا دێتـە زەینمـەوە، کە مەبەست پێی بڕیـاری قـەدەریی‌و تەکوینیـی خـوایە، واتـە: تـاکـو خوا ﷻ بە ئیـرادەی خۆی، لە میانی یاسـاکانی خۆیدا ﷻ جاری دەبـن، کە یەکێکیان ئەوەیـە : ئەگــەر بـڕواداران خۆڕاگــر بـنو، مەبدەئیــی بـنو بـڕواو قەنــاعەت دامەزراوبـن بە ئایینـی خۆیـان: ئەوانەی کە ڕێی خوایان گرتوە سەرکەوتوو دەبنو دەمێننەوەو ئـەوانی دیکە دەپووکێنـەوەو دەپووچێنەوە، ویسـتی تـەکوینیی ڕەهـای خواو حوکمو بڕیـاری قەدەریـی خـوای پەروەردگار وایـە، لە ژیانی بەشـەردا.

---

١) واتـە : ئنجا هەرکەس دەسـتدرێـژیی کـردە سـەرتان، وەك دەسـتدرێـژییەکەی خـۆی دەسـتدرێژیی بکەنەوە سەر (یانـی: بەرپەرچـی بدەنەوە).

﴿ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴾، وە بێگومـــان خـــوا باشتـــرینی بەرنـــامەدانەران و بڕیاردەرانە، چ مەبەست بڕیارو حوكمی یاسایی و تەشریعیی بن، یان چ مەبەست هی قەدەریی و تەكوینیی بێ.

ئەمە لێی وەردەگیرێ كە: پابەندیی بە ئیسلامەوەو، پابەندیی بە وەحیی و پەیامی خـوای پەروەردگـارەوە، بەبێ خۆڕاگـریی نابێ، لە ڕاستیدا كەسانی خۆڕانەگر، ناتوانن لەسەر ڕاستە شەقامی خوای باڵادەست بەردەوام بن، ئینسان دەبێ خۆڕاگرو پشوو درێژو بە حەوسەڵە بێ.

هەندێك لە زانایان لێرەدا باسی نەسخیان كـردوە، گوتوویـانە : خـوا كـە دەفەرموێ : خۆڕاگـربە! تاكو خوا بڕیار دەدات، واتە: ئەو بڕیارەی دیكە كە خـوا ناردوویەتی (كە مەبەستیان پێی بڕیاری شەریعـەت بووە) ئەمەیان ئەوی نەسخ كردۆتەوەو لایبردوە!

بەڵام من پێم وایە: ئەگەر مەبەست لە حوكم، حوكمی شەریعەتیش بێ، مانـای وانیـە ئەمە نەسخ بۆتەوە، چونكە لە نێوانیـان دا هیـچ تێكگیرانێك نیـە:

تۆ لە كاتێكدا لە هەلومەرجێك دای، كە چەوسێنراوەی، بێ دەسەڵاتی، هەردەبێ ئیش بەم ئایەتە بكەی، واتە: ئەم ئایەتە پێویست ناكـات بڵێین: نەسخ بۆتەوەو كـاری پێ ناكـرێ، بەڵكو هەر كاتێك ئەو هەلومەرجە كە ئەم ئایەتەی تێدا هاتۆتە خوار، هاتەوە پێش و، مسوڵمانان لە قۆناغ و هەلومەرجێكدا بوون، وەك هی ئەو كـاتەبوو، كە خوا بەم شێوەیە دواندوونی، دەبێ هەر ئیش بەم ئایەتە بكەن، با ئایەتە مەدەنییەكانیش هاتبنە خوار، كە: لە بەرانبەر مستێدا درێشە بۆ كافراندا ڕابگرن و، هەر كەسێك دەستدرێژیی كردە سەرتان، بەرپەرچی بدەنەوە، بەڵێ ئەویش هەر هەیە، بەڵام كاتێك هەلومەرجی مسوڵمانان ڕێگەیان نەداو گونجاو نەبێ، كە وەڵامی مست بە درێشە بدەنەوە، وەڵامی ئاسن بە ئاسن بدەنەوە، وەڵامی هێز بە هێز بدەنەوە، بە ناچاریی دەبێ هەر ئەم ئایەتە جێبەجێ بكەن و، شێوەی ئەم ئایەتە موبارەكانە جێبەجێ بكەن.

كەواتە: دەگونجێ بڵێین: كاتێك كە هەلومەرجێك دێتە پێش بە شێوەیەكی دیكە مامەڵە دەكرێ‌و، ئەو ئایەتانەی دیكە جێبەجێ دەكرێن، بەڵام ئەم ئایەتەش لانەچووە، بۆچی؟ چونكە: مەرج نیە مسوڵمانان هەر لەو قۆناغەدا بمێننەوە، بەڵكو هەركات كەوتنەوە شێوەی ئەم قۆناغە، دەبێ خۆڕابگرن‌و لە بەرانبەر هێزدا هێز بەكارنەهێنن‌و، لە بەرانبەر هەڕەشەو گوڕەشەیاندا خۆڕاگریی بكەن‌و صەبرو حەوسەڵە بەكاربێنن، واتە: دەبێ ئیش بەم حوكمە بكەن، لەبەر ئەوە مەسەلەی نەسخ هەر لە گۆڕێدا نیە.

ئنجا ئەگەر مەبەستیش لە حوكم، حوكمی قەدەریی‌و تەكوینیی خوای پەروەردگار بێ، بە دڵنیایی ئەوكاتە مەسەلەی نەسخ هەر لە گۆڕێدا نامێنێ.

كە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴾، خوا باشترینی بڕیاردەرانە، دەڵێ: (خَيْرُ : تَفْضِيلٌ، أَصْلُه: أَخْيَر، فَحُذِفَتِ الهَمْزَةُ لِكَثْرَةِ الإِسْتِعْمَال)، وشەی (خَيْر) و (شَرّ) هەردووكیان بۆ هەڵبژاردن (تفضیل)ن‌و، ئەسڵی وشەی (خیر) (أخیر) بووەو، ئەسڵی وشەی (شر) (أشر) بووە، بەڵام دوایی كە زۆر بەكارهێنراون، هەردووكیان هەمزەكەیان لێ لاچووە، (أخیر) بۆتە (خیر) و (أشر)یش بۆتە (شر)، واتە: باشتر، وە ئەوی دیكەش خراپتر، كە دیارە پێچەوانەی یەكدین.

(محمد الطاهر بن عاشور) لە (تحریر والتنویر)ەكەی خۆیدا دەڵێ:

(وَالأَخْيَرِيَّةُ مِنَ الحَاكِمِينَ أَخْيَرِيَّةُ وَفَاءِ الإِنْصَافِ فِي إِعْطَاءِ الحُقُوق، وَهِيَ هُنَا كِنَايَةٌ عَنْ مُعَاقَبَةِ الظَّالِم، لأَنَّ الأَمر بالصَّبْر مُشْعِرٌ بِأَنَّ المَأْمُور بِهِ، مُعْتَدَىً عَلَيْهِ)[1].

واتە: كە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴾، چاكتر بوون لە حوكمڕان‌و بڕیاردەرەكان، مەبەست ئەوەیە كە خوا ﷻ لە هەموو بڕیاردەرەكان، لە هەموو

---

١) ج ١١، ص ٣١٠.

حکومڕانەکان باشتر دادگەریی هەیەو مافی خاوەن مافان دەداتو، مافی خاوەن مافان دەگەیەنێتە جێ، کە لێرەدا مەبەست پێی سزادانی ستەمکارە چونکە کاتێك خوا دەفەرموێ: خۆ ڕابگرە، ئەمە وات لێ دەکات هەست بەوە بکەی، کە ئەوەی فەرمانی پێ دەکرێ خۆڕاگربێ، دیارە دەستدرێژیی کراوەتە سەرو ستەمی لێ دەکرێ، بۆیە پێی دەگوترێ: خۆڕاگربەو بە حەوسەڵەبەو دان بەخۆت دا بگرە.

خوایە! بە لوتفو کەرەمی خۆت! ئێمە لەو کەسانە بین کە پابەند دەبن بە ڕێبازو بەرنامەو پەیامی تۆوەو، لە هەر قۆناغو هەلومەرجەدا، ئەو ئەرکە شەرعییانەی دەکەونە سەرشانیان، جێبەجێیان دەکەن.

خوا بە کەرەمی خۆی سەرەنجاممان خێر بکاتو، لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە سەربەرزانە دەژین، سەربەرزانە دەڕۆن، وە لەو کەسانەمان بگێڕێ کە بە هۆی قورئانەوە بەرز دەبنەوە، لەلای خواو لەلای خەڵك، کە ئەوەش بەوە دەبێ ئەو ڕاستییانەی کە قورئان دەیانفەرموێ، وەریانبگرینو، کاریان پێ بکەینو بڵاویان بکەینەوە، هەوڵبدەین لە واقیعو دەوروبەری خۆماندا بیانچەسپێنین، بە تەئکید هەر کەسێك ئاوا مامەڵە لەگەڵ کتێبی خواو، ئایەتەکانی خوادا بکات، دەبنە مایەی بەرزبوونەوەی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# سەرچاوەکان

١) تفسير الطَّبَرِي الْمُسمى جامع البيان في تأويل القُرآن ، لأَبي جَعفَر محمد بن جرير الطَّبَري، تحقيق: هاني الحاج، عماد زكي البارودي، خَيْري سعيد، المكتبة التوفيقية، ٢٠٠٤ القاهرة.

٢) المِصبَاحُ الْمُنِير في تَهْذِيب تفسير ابن كثير للإمام الجليل عِماد الدِّين أَبي الفِداء إسْماعيل بن عُمَر بن كَثير القرشي الدمشقي ، إعداد جماعَة مِنَ العُلَماء ، بإشراف الشيخ صَفي الرحمن المباركفوري ، دار السلام ، الطبعة الثانية (١٤٢١هـ - ٢٠٠٠ م).

٣) التفسير الكبير أَو مَفَاتيحُ الغَيْب للإمام فَخْرالدِّين محمد بن عُمَر بن الحسين بن الحسن ابن علي التميمي البكري الرازي الشافعي ، حَقّقَهُ وَعلّقَ عَلَيْهِ وَخَرَّجَ أَحَاديثهُ عِماد زكي البارودي المكتبة التوفيقية.

٤) الجامع لأحكام القُرآن، تفسير القُرطُبي لأبي عبدالله محمد بن أحمد الأنصاري القُرطُبي، حَقّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ عِماد زكي البارودي، خَيْري سعيد، المكتبة التوفيقية.

٥) أَحْكَام القُرآن ، لأبي بَكر محمد بن عبدالله المعروف بابن العربي، راجع أصولهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ وَعَلّقَ عَلَيْهِ محمد عبدالقادر عطا، الطبعة الأولى (١٤٠٨هـ - ١٩٨٨م).

٦) فتح القدير، الجامع بين فني الرواية و الدراية من عِلم التفسير (تفسير الشوكاني) تأليف : الإمام العلامة محمد بن علي بن محمد الشوكاني ، تحقيق : عبدالرزاق الْمَهدي ، دار الكتاب العربي ، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

٧) زاد المسير في علم التفسير : لابن الجوزي .

٨) روح المعاني : للآلوسي .

٩) تفسير القاسمي الْمُسمى محاسن التأويل ، تأليف : علامة الشام محمد جمال الدين القاسمي ، دار الفكر الطبعة الأولى (١٣٩٨هـ - ١٩٧٨م).

١٠) تفسير المراغي ، تأليف أحمد مصطفى المراغي ، دار الفكر ، بيروت .

١١) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المَنان ، تأليف : العلامة الشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي ، تحقيق : عبدالرحمن بن معلا اللويحق مؤسسة الرسالة ، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

١٢) صفوة البيان لِمَعَاني القُرآن ، تأليف : الشيخ حسين محمد مخلوف الطبعة الثالثة.

١٣) صفوة التفاسير ، تأليف : العلامة محمد بن علي الصابوني ، مكتبة الهداية ، أربيل/ العراق ، الطبعة الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤م).

١٤) تفسير القُرآن الحكيم الشهير بـ (تفسير المنار) تأليف : محمد رشيد رضا ، دار المعرفة، الطبعة الثالثة.

١٥) الأساس في التفسير ، تأليف : سعيد حوى ، دار السلام ، الطبعة الثانية (١٤٠٩ هـ - ١٩٨٩م).

١٦) في ظِلال القُرآن، تأليف: سيد قطب دار الشروق، الطبعة الشرعية الخامسة والعشرون (١٤١٧ هـ - ١٩٩٦م).

١٧) التفسير المُنير في العَقِيدة والشَّرِيعَة والمَنْهَج ، تأليف : الأستاذ الدكتور وهبة الزحيلي ، دار الفكر الطبعة الثالثة (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٥م).

١٨) التحرير والتنوير ، محمد الطاهر بن عاشور .

١٩) تفسير النابلسي، د . مجد راتب النابلسي.

٢٠) الميزان ، محمد حسين الطباطبائي .

٢١) تفسير الشعراوي ، محمد متولّي الشعراوي .

٢٢) تفسير نمونه ، ناصر مكارم شيرازي .

٢٣) الكاشف ، محمد جواد مغنية .

٢٤) التفسير التوحيدي ، د. حسن الترابي .

٢٥) مُفرَدات ألفاظ القُرآن ، تأليف : العلامة الراغب الأصفهاني ، تحقيق : صفوان عدنان داوودي ، دار القلم ، الطبعة الثالثة (١٤٢٣ هـ - ٢٠٠٢م).

٢٦) الإستيعاب في بيان الأسباب .

٢٧) أسباب النزول ، للنيسابوري .

٢٨) لُباب النقول في أسباب النزول، للإمام الحافظ جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي خَرَّجَ أَحاديثهُ وَعَلّقَ عَلَيْهِ عبدالرزاق الْمَهْدِي ، دار الكتاب العربي (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٦م) ، (أسباب النزول) للنيسابوري .

٢٩) مختار الصِّحاح ، للرازي .

٣٠) المعجم الوسيط ، دار الدعوة ، الطبعة الثانية.

٣١) الْموطأ للإمام مالك بن أنس برواية يحيى بن يحيى الليثي ، تحقيق : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار المعرفة ، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨ م)، (أسباب النزول) للواحدي .

٣٢) الْمُسنَد للإمام أحمد بن محمد بن حنبل ، الناشر مؤسسة قرطبة ، القاهرة ، الأحاديث مذيلة بأحكام شعيب الأنؤوط عليها .

٣٣) صَحِيح البُخَارِي للإمام أبي عبدالله محمد بن إسماعيل البُخَارِي ، تحقيق : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار الْمعرفة ، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٣٤) صَحِيح مسلم للإمام الحافظ مسلم بن الحجاج النَّيسابوري ، حقوق أصولُهُ و خَرَّجَ أَحاديثهُ على الكتب الستة : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار المعرفة ، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٥) سُنَن أبي داود للإمام أبي داود سُليمان بن الأشعث السجستاني ، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، مكتبة الْمعارف ، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٦) سُنَن التِّرمِذِي للإمام الحافظ محمد بن عيسى بن سورة التِّرمِذِي، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة الْمعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٧) سُنَن النَّسَائي للإمام أبي عبدالرحمن أحمد بن شعيب بن علي الشهير بـ(النَّسَائي)، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، مكتبة الْمعارف ، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ – ٢٠٠٨م).

٣٨) سُنَن ابْنُ مَاجَهْ، للإمام أبي عبدالله محمد بن يزيد القزويني الشهير بـ (ابْنُ مَاجَهْ)، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، مكتبة الْمعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ – ٢٠٠٨ م).

٣٩) سُنَن الدار قُطني، للإمام الحافظ علي بن عُمر الدار قُطني ، تحقيق : مجدي بن مَنصور بن سي الشورى ، دار الكتب العلمية ، الطبعة الثانية (١٤٢٤هـ - ٢٠٠٣ م).

٤٠) الْمُستَدرَك على الصحيحين للإمام الحافظ أبي عبدالله الحاكم النَّيسابوري ، تحقيق : صالح اللحَّام ، دار ابن حزم ، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٤١) صَحيح ابْنُ حبَّان للإمام أبي حَاتِم محمد بن حبَّان الخُراساني ، تحقيق : حقوق أصولَهُ وخَرَّجَ أَحاديثه : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار المعرفة ، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٤٢) الْمُعجم الكبير للحافظ أبي القاسم سُليمان بن أحمد الطَّبَراني ، حَقَّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ حمدي عبدالمجيد السلفي ، مكتبة الأصالة والتُّراث ، الطبعة الأولى (١٤٣١هـ - ٢٠١٠ م).

٤٣) سُنَن الدَّارمي للإمام أبو محمد بن عبدالرحمن بن الفضل بن بهرام الدَّارمي ، حَقَّقَهُ وَشَرَحَ ألفَاظَهُ وَجُمَلَهُ وَعَلَّقَ عَلَيهِ وَوَضَعَ فَهارِسَهُ : الأستاذ الدكتور مصطفي ديب البغا ، دار المصطفى ، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٤٤) مشكاة المصابيح، تأليف : محمد بن عبدالله الخطيب التبريزي ، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، المكتب الإسلامي ، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٤٥) إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل ، تأليف : محمد ناصر الدين الألباني، المكتب الإسلامي، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٤٦) السراج الْمُنير في ترتيب أحاديث صحيح الجامع الصغير ، للحافظ جلال الدين السيوطي، العلامة محمد ناصر الدين الألباني، رتبهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ : عصام موسى هادي، دار الصديق، الطبعة الثانية (١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩م).

٤٧) السنن الكبرى تصنيف : الامام أبي عبد الرحمن أحمد بن شعيب النسائي، تحقيق : دكتور عبدالغفار سليمان البنداري، وسيد كسروي حسن، دار الكتب العلمية بيروت – لبنان، الطبعة الاولى (١٤١١ هـ - ١٩٩١ م).

٤٨) سلسلة الأحاديث الصحيحة، تأليف: مُحَمَّد ناصر الدّين الألباني، رحمه الله، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع، الرياض، الطبعة الأولى.

# نێوەرۆک


| لاپەڕە | بابــەت |
| --- | --- |
| ٥ | پێشـەکی ئەم تەفسـیـرە بەگشـتی. |
| ٩ | پێشـەکی ئەم بەرگـە. |
| ١٠ | دەسـتپێك : پێناسـەی سـوورەتی (یونس)و بابەتەکانی لە هەشـت بڕگـەدا. |
| ٣٦ | **دەرسـی یەکەم :** ئایەتەکانی (١- ١٠) خسـتنەڕووی حـەوت بابـەتی گـرنگ وەك پێشـەکی کۆی بابەتەکانی سـوورەتی (یونس). |
| ٥٦ | حەوت هەڵوەسـتە لەبەردەم ئەم ئایەتە موبارەکەدا (ئایەتی : ٢). |
| ٦٢ | ١/ کـورتـە باسـێك لەبارەی (وحي)یەوە. |
| ٩١ | ٢/ کـورتە باسێك دەربارەی بوونەوەرو حیکمەتی خوا لە دروست کردنیدا. |
| ١١٣ | ٣/ کورتـە باسێك لەبارەی شـەفاعەتەوە. |
| ١٣١ | ٤/ کـورتە باسـێك لەبارەی خۆرو زەوی‌و مانگـەوە. |
| ١٣٢ | خـۆر |
| ١٣٤ | زەوی |
| ١٣٨ | مانـگ |
| ١٤٤ | پێناسـەی بێبـڕوایان بە چـوار سـیفەتی بنەڕەتـییـان |
| ١٥٢ | **دەرسـی دووەم :** ئایەتەکانی (١١- ٢٠) خسـتنەڕووی چەنـد ڕاسـتیی یەك‌و چەند یاسـایەکی خـوا لە ژیانـی بەشـەردا ... . |
| ١٧٣ | چـوار هەڵوەسـتە لەبەردەم ئەم ئایەتە موبارەکەدا (ئایەتی : ١٢)دا. |
| ١٧٩ | شـەش هەڵوەسـتە لەبەردەم ئەم ئایەتە موبارەکەدا (ئایەتی : ١٣)دا. |

| لاپەڕە | بابـــەت |
|---|---|
| ١٨٥ | چوار هەڵوەسـتە لەبەردەم ئەم ئایەتە موبارەکەدا (ئایەتی : ١٥)دا. |
| ٢٠٥ | **دەرسـی سێیـەم :** ئایەتەکانی (٢١- ٣٠) ڕوونکردنەوەی هەشـت بابەتـی جۆراوجۆر. |
| ٢٢٤ | چوار هەڵوەسـتە لەبەردەم ئەم ئایەتە موبارەکەدا (ئایەتی : ٢١)دا. |
| ٢٢٨ | شـیکردنەوەی ئایەتەکانی ژمارە (٢٢، ٢٣) لە یازدە (١١) بـڕگـەدا. |
| ٢٣٧ | شـیکردنەوەی ئایەتی ژمارە (٢٤) لە نـۆ (٩) بـڕگـەدا. |
| ٢٥٥ | **دەرســی چـوارەم :** ئایەتـەکانی (٣١- ٤٠) ڕوونکردنـەوەی هــەردووك بابەتــی گــەورەو گرنگ: خـوا بەیەکگرتن (توحید)و قورئان ... . |
| ٢٧٢ | ئاماژەیەکی کـورت بە چەند چاکـەو نیعـمەتێکی خـوا لە ژیانـی بەشـەردا. |
| ٢٩٢ | **دەرســی پێنجــەم :** ئایەتـەکانی (٤١- ٤٧) چەنــد ئامۆژگـاریی‌و ڕێنمــاییەکی خــوای میهرەبــان بــۆ پێغـەمبـــەرەکەی دڵنیـــاکردنەوەی، سەرەنجـــامی باشــی خــۆی‌و شـوێنکەوتوانی‌و، مایەپووچیی ناحەزانـی... . |
| ٣٠٩ | وەڵامدانەوەی دوو پرسـیار. |
| ٢٩٢ | **دەرسی شەشـەم :** ئایەتەکانی (٤٨- ٥٦) باسـی مسـۆگەربوونی هاتنــی هــەر کـام لـە ئاخیـرزەمان (ساعة) و هەڵسـانەوە (قیـامة)... . |
| ٣٣٣ | **دەرسی حـەوتـەم :** ئایەتـەکانی (٥٧- ٦١) باســی هاتنــی قورئــان وەك ئامۆژگـاریی‌و شـیفاو هیـدایەت‌و ڕەحـمـەت بۆ بەشــەر ، ســەرزەنشــتکردنی کافــران‌و زانیــاریی‌و ڕوو گشـتگیـریی خـوا ... . |
| ٣٥٣ | **دەرسی هـەشـتـەم :** ئایەتەکانی (٦٢- ٧٠) پێناسـەی دۆسـتانی خـواو، باسـی شـەوگارو ڕۆژگـارو، بەرپەرچـدانەوەی هەندێـك قسـەوقاڵی کـافـرەکـان ... . |
| ٣٦٣ | کـورتـە باسـێك لەبارەی دۆسـتانی خوا (أولیاء الله)وە. |
| ٣٦٣ | برگـەی یەکـەم: پێنـاسـەی دۆسـتـانی خـوا (أولیاء الله). |
| ٣٦٥ | بـرگـەی دووەم : خەسـڵـەتـە سـەرەکـییەکـانی دۆسـتـانی خـوا ﷻ. |
| ٣٧٠ | بـرگـەی سـێـیـەم : چـەند فـەرموودەیـەك دەربـارەی دۆسـتـانی خـوا ﷻ. |

| لاپەڕە | بابـــەت |
|---|---|
| ٣٧٣ | بـڕگـەی چـوارەم : پوختـــەی ڕاو تێگـەیشـــتنم لەبـــارەی دۆســـتـانی خـواوە. |
| ٣٨٩ | **دەرسـی نـۆیـەم :** ئایەتەکانی (٧١- ٧٤) کـورتەیەك لە بەسەرهاتی (نـوح) ـعلیە السلام ـ و گەلەکەی ، ئاماژەیەك بە پێغـەمبـەرانی دوای وی ... . |
| ٤٠٧ | **دەرسـی دەیـەم :** ئایەتـەکانی (٧٥- ٩٣)، باسـی بەسـەرهاتی مووســـاو هـارِوونی بـرای ـ علیهما الســلام ـ و گەلـــەکەیانو ڕووبەڕووبوونـەوەیان لەگـەڵ فیـــرعەونو دارودەســـتەکی دا... لە حـــەوت بڕگـەدا... . |
| ٤٢٥ | قۆناغـی یەکـەم : لە چوارده (١٤) بـڕگـەدا. |
| ٤٣٢ | قۆناغـی دووەم : لە چـوار (٤) بـڕگـەدا. |
| ٤٣٦ | قۆناغـی سـێـیـەم : لە شـەش (٦) بـڕگـەدا. |
| ٤٤١ | قۆناغـی چـوارەم : لە چـوار (٤) بـڕگـەدا. |
| ٤٤٥ | قۆناغـی پێنجـەم : لە چـوار (٤) بـڕگـەدا. |
| ٤٤٩ | قۆناغـی شـەشـەم : لە شـەش (٦) بـڕگـەدا. |
| ٤٥٥ | قۆناغـی حەوتـەم : لە سـێ (٣) بـڕگـەدا. |
| ٤٥٧ | **دەرسـی یـازدەیـــەم :** ئایەتـەکانی (٩٤- ١٠٣) ڕێنمـــایی کردنـی خـــوای میهرەبـــان بـۆ پێغـەمبــەرەکەیو لــە پــەنای وی دا دوانـــدنی خەڵـــکی دیکـــەو، باســـی بەســـەرهاتی (یونس)و، باسـی بێبـڕوایانو خسـتنەڕووی چەنـد یاسایەکی خـوا لە ژیـانی بەشەردا ... . |
| ٤٨٢ | بەسەرهاتی یونوس (علیە السلام)و گەلەکـەی. |
| ٤٨٢ | بـڕگەی یەکـەم : یونوس (علیە السلام) شـەش جـاران نـاوی لە قورئاندا هـاتوە. |
| ٤٨٣ | بـڕگەی دووەم : گەلـی یونوس خەڵـکی (نینـوی) موصـڵی ئێسـتـا بوون. |
| ٤٨٤ | بـڕگەی سـێـیـەم : ئەو سـووڕەتو ئایەتانەی کە نـاوی (یونس)یان تێدا هـاتوە. |
| ٤٨٩ | بـڕگەی چـوارەم : پوختەی بەسەرهاتەکەی یونوس (علیە السلام) لەبەر تیشکی ئایەتەکـــاندا، لـە حـەوت خاڵـدا دەخەینە ڕوو. |

| لاپەڕە | بابـەت |
| --- | --- |
| ٤٩٥ | کـورتـە باسـێك لەبـارەی ئـازادی بـڕواهـێناوە . |
| ٥٠٦ | **دەرســـی دوازدەیـــەم :** ئایەتـەکانی (١٠٤- ١٠٩) فـەرمانکردنی خـوای کـــارزان بــە پێغـەمبـەری خاتـەم ـ دوو جـارن لەم ئایەتانەدا کە بە ئەی خەڵـکیـنە! (یـا أیهـا النـاس) مرۆڤـەکان بدوێنـیێو، چەند ڕێنمایی یەکی خـوا بۆ پێغـەمبـەرەکیو لە بـــواری چۆنیـــەتی دوانـدنـی بۆ کافرەکانو مامەڵەکردنی لەگەڵیـان دا ... . |
| ٥٣٥ | سـەرچـاوەکان . |
| ٥٣٩ | نێـوەڕۆك . |